# دەستەوارەیێ نان
# بۆ مێژوو

## وردبوونەوەو لێکۆڵینەوە
( بابی لالۆ )

**کەمال ڕەئووف محەممەد**

2004

کوردستان - سلێمانی

بەنێوی خودای گەورەو باڵا دەستەوە

پێشکەشی....

- گیانی پاکی خوشك‌و برا گیانفیداو ئازادیخوازەکانی سەرانسەری مێژووی کوردو کوردستان.
- گیانی پاك‌و ئازادی برایانم (کاکە ریباز کۆسرەت رەسووڵ عەلیی)و (کاکە دڵشاد محەمەد عەلیی)و کوڕی پێگەیشتووم‌و زاوای ناکام (لالۆ) کە لەماوەی پێنج مانگدا بەکارەساتی ئۆتۆمووبیل شەهیدو جوانەمەرگ بوون.
- دایك‌و براو خوشکی (لالۆ): نەسرین مستەفا ئەمین، کامۆ، ڤیان، شاهۆ.

**بابی لالۆ**

**٢٠٠٤/٤/٢٠**

## ناواخن

# پێشەکیی

-١-

یێکێ لەئامانجە گەورەو گرنگو ترسناکەکانی داگیرکەرانی کوردستان سەرکوێر و
ێل کردنی مرۆڤی کوردە.. لەلایێك بە پەیڕەوکردنی زۆر و ستەم و توندوتیژیی
یاسییو ئابووریی، لەلاییکی دیەوە سەپاندنی ستەمی ڕۆشنبیریی قەدەغەکردنی
وێندنو نووسینو چاپو بڵاوکراوەی کوردییو کۆڵینەوە لە ڕۆشنبیریی نەتەوەیی کۆن
نوێ. پێچەوانەیشی ناچارکردنی بۆ خوێندن و تێگەییشتن و پەیڕەوکردنی زمان
ۆشنبیریی خۆیان..

تەنانەت کارگەییشتووەتە ڕادەییێ –لەهەزارەی سێیەمدا– هەیانە هێشتا باوەڕ
شوناسنامەی نەتەوەیی ملیۆنەها کوردی چەوساوەو ژێردەستە ناهێنێت!

دەی لە ئەو تەنگانانەی ژین و هەڵکردی مرۆڤی کورددا، داخۆ ناسینی مێژوو،
ەلەپووری کۆنو نوێمان، ئاگەداربوون لەقەوماوەکانی ڕۆژگارو کردەوەکانی خەڵکی ئەم
ش و ئەو بەشی دی کوردستان، ون نەکردنی ڕاستییەکان، سەخت و ئاڵۆز، بگرە دژوار
یە؟

با دوور نەڕۆین.. بۆ وێنە دەست دەبەیت بۆ مێژووی فەلسەفەو سەرهەڵدانی
یینەکان، ڕێبازە جۆربەجۆرەکان –هێندێکیشیان ماون– هەرگیز وەڵامێکی ئاسان،
اقووڵ و پەسەند، خێرات نایێتە بەردەست!!

دەست دەبەیت بۆ مێژووی سیاسییو قەوماوەکان، لافاوەکانی خوێنی لە ناهەق
ژاوی کورد لەشەڕەکانی –بەنێو– پشتیوانیی ئیسلام، یان لە شەڕەکانی دەوڵەتە
اگیرکەرەکاندا، لەهەڵپژانەکانی تیرەکانی نێوخۆدا، لەشۆڕشەکانی ئازادیخوازییدا،
ەچیی هەرگیز وێنەیێکی ڕوون، وەڵامێکی بەئینساف، بەڵگەی تەواو باوەڕ پێ کراوت
یێنە بەردەست و چاو!!

دەست دەبەیت بۆ مێژووی ئەدەب، هونەرەجوانەکانی دی، کەچیی تا هەڵەیێ ڕاست دەکەیتەوە، هەڵەییکی دی سەر هەڵدەداتو بەڵگەییکی نویێ بەڕێگەوەیە هەڵیبوەشێنێتەوە.. هتد!

دەست دەبەیەت بۆ لێکۆڵینی باری کۆمەڵیی، ئابووریی، تەندروستیی، خوێندەواریی، کەچیی ئەوپەڕی بەڵگەی باوەڕ پیێکراویشت بەکاربردبێت بۆ سەرکەوتن، لەدڵدا نارەحەتیت و کارەکەت بە ناتەواو دەزانیت چونکە لە سنووری بەشێکی کوردستاندا بووە و ئاگات لە بەشەکەی دی نییە!

دەست دەبەیت بۆ پیاوە بەنێوبانگەکانی ڕابردوو تا بەهرەو زانست، ڕەفتارو هەڵس‌وکەوت، بارستایی چاکەو خراپەیان بناسێتەوەو ئاشنایان بکەیت، کەچیی دەیان پرسیارت لیێ ئاستەمە و وێڕاش کەس چاکە و خراپەیانی لە تەرازوو نەداوەو گشتیان بە (فریشتە!!) لە قەڵەم دراون!! هتد...

-٢-

ئەز زۆر درێژی ناکەمەوە و چەند وێنەییکی پچکۆلانە دەهێنمە بەرچاو:

١. تۆفیق وەهبیی موتەسەڕڕیفی سلێمانی ساڵی ١٩٣٠، لەلای چەند نووسەرو ڕۆشنبیریێ، هەروەها خەڵکانێکی زۆر بەفەرماندەی کوشتارەکەی (شەڕی بەردەرکی سەرا-٦ ئەیلوولی ١٩٣٠) ناسرابوو.. کەچیی بەڵگەنامەی ڕەسمیی-لە گۆڤاری کاروان: س ١٩٨٥ دا بڵاوم کردەوە-دەیسەلمێنێت کە کابرا نەك لە ئەوکاتەدا موتەسەڕڕیفو لەسلێمانییدا نەبووە، بەڵکو بەر لە قەوماوەکە لە موتەسەڕڕیفیەتیی خراوە و لە بەغدادا دەست بەسەر بووە!

٢. هەر زمانەوانی زانا -خاوەندی دەستووری زمانی کوردیی-تۆفیق وەهبیی، لە ژمارەییکی گۆڤاری (دەنگی گێتیی تازە) ی دووای دووەم جەنگی گێتییدا، تەنانەت جارێکی دی لە گۆڤاری (پێشکەوتن/التقدم - س١، ژ٦، نیسان ١٩٥٨) دا هاواری

کردووە کە(مەنووسن برایەك، بنووسن برایێك)، کەچیی تا ئەورۆ نووسەران پەیڕەوی‌هەڵە دەکەن‌و گوێ لەڕاستیی ناگرن! خودا هەڵناگرێت، هێندێ نووسەری دۆستم تا ئەورۆ — ڕەنگبێ خوێندەوارانیش—ڕەخنەیان لە من گرتووە کە دەنووسم (بێك!).

٣. نووسەرێ لەڕۆژنامەی (ئاویەر— س٢، ژ٤٣، نێوەندی ئەووەڵی بەفرانباری ١٩٨٨/١٣٧٧، تاران) گوتارێکی بەسەر نێوی " مستەفا شەوقی خەڵکی کوێیە؟ " نووسیوە.. کەچیی هەر من لە گۆڤاری (کاروان—س ١٩٨٦ /هەولێر) دا نیوە وەڵامێکی ڕاستم داوەتەوە کە "مستەفا شەوقی " ی خاوەندی گۆڤاری "پەیژە"م ئاشنا کردووە!

٤. نووسەرێ لەگۆڤاری (ڕابوون—ژ٢٦، س١٩٩٩/سوید) لەمەڕ (حیزبی هیوا، س١٩٣٩—١٩٤٥ " گوتارێکی نووسیوەو لەپەراوێزی "ژ—٣" دا لەمەڕ ئەفسەرێکی کورد نووسیوییێتی، (هێشتا ڕووننەبووەتەوەکەچیی ئەم کوردە نیشتیمانپەروەرە، عەبدولعەزیز یامەلکیی هان داوە بۆ بەشدار بوون لە تیرۆر کردنی بەکر سدقی؟)... کەچیی هەر ئەو نووسەرە ئاگای لەچاپ کراوی (مذکرات عبدلعزیز یاملکي/بیرەوەرییەکانی عەبدولعەزیز یامەلکیێ—س١٩٥٧. بەغداد) نییە کە هەر خۆی بێ‌سڵەمینەوە، بەئاشکرا نووسیوییێتی: (لەفەوجە عێراقییەکانی هاریکاری نێرووەکانی ئینگلیز، لە حوزەیرانی ١٩٢٤ دا بەشدار بووە بۆ داگیرکردنی سلێمانیی—پێتەختی مەملەکەتی کوردستانی باشوور!) تەنانەت ئەوێکی تەوری دەستی داگیرکەران، گەوجانە توانجی ناڕەوا لە حەفید زادە مەحموود گرتووە!

-٣-

ئەز هەرگیز خۆم بە مێژوونووس نازمێرم، بەڵام بۆم هەیە هەمیشە خۆم بە شاگردێکی پچووکی زانستی مێژوو بزانم، چونکە پڕ باوەڕم ئەو زانستە—چۆن چاکەی مرۆڤایەتیی دەوێت—توانایێکی‌گەورەیە،کەڵکی تێگەییشتن‌و پێ‌گەییشتنی نەتەوەکەم دەگرێت!

بە ئەو ڕۆشنابیە-وەك لەبەرچاوانە-ئەم بابەتانەی دوویان کەوتووم، چەندم توانیی بێ زانستانە ڕەفتارم لەگەڵ کردوون.

ئەم کرد و کۆشانەشم بەتەنێ بەری ڕەنجی من نییە، بەڵکو -وەك سروشتی ژیانە- بەری ڕەنجی دانوستاندە..ڕەنجی کەسانیدیو منە کەپێکەوە کردەوەیێکی ڕۆشنبیریمان نواندووە.

-٤-

ئەم وردبوونەوەو لێکۆڵینە هەمە جۆرانەش، بۆییێکا لەبن ئەو سەرنێوەدا، (دەستەوارەیێك نان بۆ مێژوو) کۆمکردوونەتەوە، چونکە بێپشوودان لە هەموویاندا بۆ (ڕاستیی) تێ کۆشاوم کە ڕاستییش چەشنی نانە بۆ ژیان، بۆ ژیریی و کەڵك چارەنووسی مرۆڤ پێویستە.هەر ڕاستو ڕاستییش دەچێتە ئامێزی مێژووی ڕاستەقینەوە.

نانیش هەیە تەواوە، نیوەیە، کەرتە، گوێچکەییێکە، دەی هەر کام لە ئەم نانە کوردیانە - بابەتو ڕاستییانە- بەری دڵی خوێندەوار بگرێت، بەختەوەرم.

هیواشم بەخودا هەیە کە هەر کەم و کورتیی و ناتەواویێ هەمبێ - بەتایبەتی هێندی بابەت دەرگەی لەسەرپشتە و پرسیاری زۆری بەدەمەوە هەیە!!-یێکێکی دی، ژیرانە، ڕاستپەروەرانە، زانستانە ڕەخنەی لێ بگرێت، وردببێتەوە، ڕاستیی بکاتەوە، تەواوی بکات، چونکە دڵنیام هەر (ڕاستیی) نانە، ژیانە، پێشکەوتنە، سەرکەوتنە!

کەمال ڕەئووف محەممەد
مەنفا /هۆڵاند-ڤەنلو Venlo
٢٠ /١١/ ١٩٩٩

# ١
# مەزبەتەییکی بێزاریی سلێمانیی بۆ سوڵتانی عوسمانیی

## پێشەکیی

لاپەڕەکانی مێژوو پڕن لە نووسراوی مێژوویی نووسەرەکانی خۆ و بێگانە و یادگاری شاعیرەکانی پێشینان.. لەئەوانە وردببیتەوە، هەرییێکە بەشێوەییێ — هێندێ کەسیش وەك شایێتی حالێ — باسی زۆر و ستەم و تاوانەکانی دەوڵەتی عوسمانییان کردووە کە سێ سەدە پتر کوردستان و کوردی داگیر و ژێر دەستەی کردو قڕی خستە میرنشیینە سەربەخۆکان، بنچینەکانی شارستێنی، ئاوەدانیی، ئابووریی کاوول و تاڵان کرد. تەنانەت— لەگەڵ ڕمانی خۆی— بوو بە مایەی دابەش بوونی ئەم گەلو نیشتیمانە بەسەر چەند وڵاتێکدا کەهێشتا ئینسانی کورد دەچەوسێننەوە و سڵ لە قەلاچۆکردنی ناکەنەوە.

لەئەم هەلەدا ڕەنگبێ هەتا نهوو —وەك جارانی جلخوارەکانی سەر بە عوسمانییەکان لە سەردەمی حەفیدزادە مەحموودا — خەڵکانێکی ئەوتۆ هەبن کە لە ژێرییەوە یان گەمژەییەوە باوەڕ بە مێژوو، بە یادگاری بیری نووسەران و شاعیران نەکەن و بڵێن: ئەوانە نووسراوی داتاشراون، یان مایەی هەستی سۆزی ڕووتن! ! بەڵام داخۆ ئەوانە لەئاستی (بەڵگەی مۆرکراو) و حاشا هەڵنەگردا چ دەڵێن و چییان بۆ دەمێنێتەوە؟

ئەز ئەم مەزبەتە بەڵگەنامەیە بۆ یێکەم جار ئاشنا دەکەم کە نووسراو و مۆر لێدراوی (زاناکانی ئایینی ئیسلام، بازرگانەکان، پیاوە ناسراوەکانی سلێمانیی — س ١٩٠٢)ـەـ، ئەوانەی مەردانە لەڕووی تاوانەکانی (جەمال بەگ) نێوی موتەسەڕیفی سلێمانیی،

هەڵگەڕاونەتەوەو "بە ئاشکرا!" مەزبەتەی بێزارییان لێنووسیوەو بەرەوڕووی (سوڵتانی عوسمانیی) عەبدولحەمیدی دووەمیان کردووەتەوە!

ئەنجامی مەزبەتەکەش هەرچیی بووبێ، هێندەی ئەو ڕاستییە گرنگ نییە کە چ دەوڵەتی عوسمانیی، چ موتەسەڕڕیفی نێوبراو، دەسەڵاتی زمان بڕینی خەڵکی کوردو مێژوویان نەبووە! ئەوەتە دوای نزیکەی سەدەیێ، بازێڕی سلێمانیی ئاوەدانترەو مەڵبەندی کوردایەتییە و خەڵکیش دلێر و سەرکەشن. یادگاری پیاوانی مەردیش وەك ڕۆژی ڕووناك پڕیشکدارە!

# بەشی یەکەم

## مەزبەتە – بەڵگەنامەکە[1]

مەزبەتەکە لەسەر قاقەزێکی زەردباوی ٥٦ X٤١ سم و لە بەرێکی ٥٦ X١٣ سمدا سکالاییێکی گرتووەتە خۆی. لەژێرەوە نێو و مۆری سەد و شەش کەسی خەڵکی سلێمانیی پێوە هەیە کە نۆزدەیان – لەبەر هەر هۆیێ بووبێ! –مۆری خۆیان لێ نەداوە...

ڕۆژی نووسینی مەزبەتەکە دیاریی نەکراوە، بەڵام بەڕۆشنایی سێ مێژووی دی، وێ دەچێ کە دووای ئەوان و لە سنووری ئەو ڕۆژانەدا، بەشێوەی برووسکە بۆ سوڵتان و سەروەزیران–سەدری ئەعزەم لێ درابێ!

ئەم مەزبەتەیە وەك لە گەنجینەی ناسراوێکی گەورەی سلێمانییدا هەڵگیراوە–خۆیشی یێکێ بووە لە بەشدارەکانی–لای من دیارە کە پاکنووسێکی تەواوە و دووای سێ مەزبەتەی بە برووسکە لێ دراوی ڕۆژانی (١٥ و ٢٠ و ٢٤ /١ /١٩٠٢) بۆ سوڵتان لێ دراوە! باوەڕیش دەکەم–وەك ئەنجامەکەش ساخی دەکاتەوە–کە بە فیتی موتەسەڕیفی نێوبراو، چ ئەو سێ برووسکەیە و چ ئەم مەزبەتەیە لە (تەلگرافخانە) دا دەستیان بەسەردا گیرابێ و هەرگیز نەگەیشتبنە جێگەی مەبەست! (موتەسەڕیفێ هێندە غەڕاو زۆردار بێ، چۆن ڕێگە دەدا لای سوڵتان–مەزبەتەی خەڵکیی–شکاتی لێ بکات!).

ئەز چەندم کرد سەرچاوەیێکی ئەوتۆ وردم نەدیت کە (باری (سلێمانیی) ڕۆژگاری مەزبەتەکەو شێوەی فەرمانڕەوایی موتەسەڕیفەکەم بۆ ڕوونترو دەستگیر بکا، بۆیێکا ناچار–لە ناسینی باسەکانی نێو مەزبەتەکە پتر–دەسەڵاتی ناسینی تەواوی بارو کێشەکەو هۆو بنچینەکانیم نییە. وێڕای ئەوە، باسەکانی مەزبەتەکە–بۆ دووا ڕۆژ–

مەودای لێ پرسینەوە و وردبوونەوەیان بە بەرەوە هەیە و دەرگەش والآیە بۆ هەرکەسێ کە زانستانە خۆی پێوە خەریك بکات!

- هێندێ تێ ڕامان و بایەخ پێ دانی وردە خالآن

١. هەرچەندە سەرچاوەیێ بەدەستەوە نییە ژمارەی دانیشتوانەکانی سلێمانیی سالّی ١٩٠٢ ز بنوێنێ، ئەوە (سالّنامەی هەرێمی مووسڵ-سالّی ١٣٢٥ر/١٩٠٩ ز) بەدەستەوە هەیە و ژمارەی دانیشتووەکانی سالّی ١٩٠٩ ی ئەو بازێڕەی بە(٨٩٦٣) کەس خەملآندووە. {٧ /ل٢٢٧-٢٢٨}.. بە ئەو ڕۆشنایییەش دەتوانم بلّێم، ژمارەی دانیشتووەکانی سالّی ١٩٠٢ی بازێڕەکە لە نێوان ٦-٧ هەزار کەسدا بووە. بە ئەم ڕۆشناییە و تیشکی مەزبەتەیێکی سەد و یێك کەسی هەلّبژاردەی بازێڕەکە، دیارە کە شکاتەکە گەورە و قورساییەکەی گرانە و بەنێوی زۆربەی دانیشتووەکانەوەیە، ئەگەرچی وەك - مەزبەتەکە لەبەرچاوە-نێو و مۆری (شێخانی بەرزنجەیی) پێوە نییە کە وێ دەچێ لەبەر هەر هۆیێ، تێکەلّی ئەو باسە نەبووبن. شایانی باسە بە قسەی حەفیدزادە مەحموود، سالّی ١٣١٧ر/١٩٠١ ز {٦/ل١٢١} هەروەها بە قسەی زێوەری شاعیر سالّی ١٣١٩ك/١٩٠١ز، کۆمەلّی شێخانی بەرزنجەیی و یاوەریان، بە سەرۆکایێتی مەرحووم شێخ سەعیدی حەفید چوونەتە ئەستەنبووڵ و دیدەنیی کردنی سولّتان. {٤/ل٥٩}

٢. مەزبەتەکە هاوشانی ڕستە گوتار و بانگەوازەکانی یێکەم ڕۆژنامەی کوردیی (کردستان:س١٨٩٨-١٩٠٢ز)ە کەگەلێ جار داوا لە چینە دەسەلآتدارەکان و زاناکانی ئایین و خەلّکانی گەلی کورد کردووە تا لەڕووی سولّتان و کاربەدەست و دام و دەزگەکانی دەولّەتی عوسمانیی هەلّگەڕێنەوە و ڕەفتاری چەوت و تاوان و دزی و بەرتیل خواردنیان ڕیسوا بکەن!

٣. وەك هەڵوێستەی یێکگرتووی نووسەرانی مەزبەتەکە نرخی زۆرە، هێندێ وشە و ڕستەی توندو بەهێز – لەدژی موتەسەڕڕیف – لەڕووی سوڵتان، (خەلیفەی سەر ڕووی زەمین) دا کراوە، ئەوە مەزبەتەکە گەورەتر و بەنرختر دەکات!

بەکورتیی‌و بەهەر پێوانێکی مێژوویی‌و زانستیی هەڵوێستەی ئەو مەردانە بپێورێ، ئەوە کارەکەیان دەچێتە خانەی ڕەنج‌و سەرپێچیی کوردایەتییەوە، بۆییێکا لە مێژووی گەلی کورد و بازێڕی سلێمانییدا قەدری زۆر گەورە و گرانە!

## مەتنی تەواوی مەزبەتەکە: [٢]

بسم الله الرحمن الرحيم

–بۆ بارەگای میری ئیمانداران، خەلیفەی سەر ڕووی زەمین، سوڵتانی پشتیوانی عالەم!

–سەدارەتی–سەروەزیران /کەمال–ئەعزەم!

خاوەندی چەتەکان‌و یارو یاوەریان، موتەسەڕڕیفی سلێمانیی جەمال بەگ لەبەر نالەباریی ئیدارەی، بەتەواوەتیی ئاسایشی نەهێشتووە و مەملەکەتەکەمانی تووشی کارەسات کردووە!

موتەسەڕڕیفی نێوبراو بووەتە مایەی کوشتن‌و تالانکردنی سەرو ماڵی خەڵکیی زوڵم لێکراو، ئاسایشی نێوخۆ و دەرەوەیشی پەرێشان و نابووت کردووە.

ئەم بارەکارەساتاویە، ئەگەر ئەوها بڕوات، هەروەها وەڵام نەدانەوەی ئەومەزبەتە ڕەسمییانەی پێشکەشمان کردن، هەموو لەئاستی مەرحەمەتی حوکوومەتدا هیوا بڕاومان دەکەن! خەڵکی ئەم بازێڕە بەشیان گریانەو خەڵکانێکی دیش کە ڕووی تێ دەکەن، هەناسەی حەسرەتی لە بۆ هەڵدەکێشن کە لەوەتەی مانگێکەوە بازاڕەکانیان هەڵگرتووەو چاویشیان بڕیوەتە داد پەروەریی حوکوومەت!! ئەوەتە داهات و کڕین و

فرۆتن پەکیان کەوتووەو هەر ئەوەمان بۆ ماوەتەوە، بۆ ئاسوودەیی و پاراستنی عەرز و ناموسمان خۆ بدەینە دەست باری تەعالا!

دووای مەزبەتەکانمان کە ڕۆژانی (٢، ٧، ١١ ی کانوونی دووەمی ١٣١٧ ر: = ١٥، ٢٠، ٢٤ ی کانوونی دووەمی ١٩٠٢ ز /کەمال) بەتەلگراف ناردمانن بۆ بارەگەی شاهانەتان چ ئەنجامێکمان دەستگیر نەبووە، بۆیێکا تووشی دڵشکاویی‌و داماویی بووین و کەوتووینەتە دەریای سەرسامیی و پەرێشانیی و پەشیمانیی، پەژارەش دوو قات گیرۆدەی دڵشکاویی کردووین... سا مردن لە ئەم بارەدا وەك نیعمەتێکی مەزنە و (لە تەعالای حەق داواکارین کە دوژمنانی دین و کەسانێکی هۆی ئەم کارە ناڕەوایە تەفر و توونا و لە ئاگری دۆزەخ ئێمەش ڕستگار بکات‌و بمانخاتە بەهەشتی عەدالەت وحورییەتەوە!).

لەخاوەند تواناو دەسەلات –ساحیبولشەوکە–دەپاڕێینەوەو ڕەحمەت‌و شەفاعەتی پێغەمبەری ئەکرەمیش پشتیوانمانە تا بە زووترین کات چارەسەرێکمان بکریٚ!

سەرلەنویٚ بارمان بۆ بارەگای شاهانەتان دەنوێنین و دەپاڕێینەوە کە فەرمانیٚ لە ئەم ڕووەوە دەربکەن...

## زاناکان و خەڵکی سلێمانیی {٢}

١. محەممەد: (محمد عبده).

٢. مەعرووف: (معروف – ١٢٩٥).

٣. محەممەد عارف: (محمد عارف).

٤. مەحموود: (؟ /مۆری لیٚ نەداوە).

٥. ئەحمەد: (أحمد عزت).

٦. سالح: (؟ /مۆری لیٚ نەداوە).

٧. مستەفا: (؟ /مۆری لیٚ نەداوە).

٣. وەك هەڵوێستەی یێکگرتووی نووسەرانی مەزبەتەکە نرخی زۆرە، هێندێ وشە و ڕستەی توندو بەهێز — لەدژی موتەسەڕریف — لەڕووی سوڵتان، (خەلیفەی سەر ڕووی زەمین) دا کراوە، ئەوە مەزبەتەکە گەورەتر و بەنرختر دەکات!

بەکورتیی‌و بەهەر پێوانێکی مێژوویی‌و زانستیی هەڵوێستەی ئەو مەردانە بپێورێ، ئەوە کارەکەیان دەچێتە خانەی ڕەنج‌و سەرپێچیی کوردایەتییەوە، بۆیێکا لە مێژووی گەلی کورد و بازێڕی سلێمانییدا قەدری زۆر گەورە و گرانە!

## مەتنی تەواوی مەزبەتەکە؛ [٢]

بسم الله الرحمن الرحیم

—بۆ بارەگای میری ئیمانداران، خەلیفەی سەر ڕووی زەمین، سوڵتانی پشتیوانی عالەم!

—سەدارەتی—سەروەزیران /کەمال—ئەعزەم!

خاوەندی چەتەکان‌و یارو یاوەریان، موتەسەڕڕیفی سلێمانیی جەمال بەگ لەبەر نالەباریی ئیدارەی، بەتەواوەتیی ئاسایشی نەهێشتووە و مەملەکەتەکەمانی تووشی کارەسات کردووە!

موتەسەڕڕیفی نێوبراو بووەتە مایەی کوشتن‌و تالانکردنی سەرو ماڵی خەڵکیی زوڵم لێکراو، ئاسایشی نێوخۆ و دەرەوەیشی پەرێشان و نابووت کردووە.

ئەم بارەکارەساتاویە، ئەگەر ئەوها بڕوات، هەروەها وەڵام نەدانەوەی ئەومەزبەتە ڕەسمییانەی پێشکەشمان کردن، هەموو لەئاستی مەرحەمەتی حوکوومەتدا هیوا بڕاومان دەکەن! خەڵکی ئەم بازێڕە بەشیان گریانەو خەڵکانێکی دیش کە ڕووی تێ دەکەن، هەناسەی حەسرەتی لە بۆ هەڵدەکێشن کە لەوەتەی مانگێکەوە بازاڕەکانیان هەلگرتووەو چاویشیان بڕیوەتە داد پەروەریی حوکوومەت!! ئەوەتە داهات و کڕین و

فرۆتن پەکیان کەوتووەو هەر ئەوەمان بۆ ماوەتەوە، بۆ ئاسوودەیی و پاراستنی عەرز و ناموسمان خۆ بدەینە دەست باری تەعالا!

دووای مەزبەتەکانمان کە رۆژانی (٢، ٧، ١١ ی کانوونی دووەمی ١٣١٧ ر: = ١٥، ٢٠، ٢٤ ی کانوونی دووەمی ١٩٠٢ ز /کەمال) بەتەلگراف ناردمانن بۆ بارەگەی شاهانەتان چ ئەنجامێکمان دەستگیر نەبووە، بۆیێکا تووشی دڵشکاویی‌و داماویی بووین و کەوتووینەتە دەریای سەرسامیی و پەرێشانیی و پەشیمانیی، پەژارەش دوو قات گیرۆدەی دڵشکاویی کردووین... سا مردن لە ئەم بارەدا وەك نیعمەتێکی مەزنە و (لە تەعالای حەق داواکارین کە دوژمنانی دین و کەسانێکی هۆی ئەم کارە نارەوایە تەفر و توونا و لە ئاگری دۆزەخ ئێمەش رستگار بکات‌و بمانخاتە بەهەشتی عەدالەت وحورییەتەوە!).

لەخاوەند تواناو دەسەلات —ساحیبولشەوکە— دەپارێینەوەو رەحمەت‌و شەفاعەتی پێغەمبەری ئەکرەمیش پشتیوانمانە تا بە زووترین کات چارەسەرێکمان بکرێ!

سەرلەنوێ بارمان بۆ بارەگای شاهانەتان دەنوێنین و دەپارێینەوە کە فەرمانێ لە ئەم رووەوە دەربکەن...

## زاناکان و خەڵکی سلێمانیی [٢]

١. محەمەد: (محمد عبده).

٢. مەعرووف: (معروف — ١٢٩٥).

٣. محەمەد عارف: (محمد عارف).

٤. مەحموود: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٥. ئەحمەد: (أحمد عزت).

٦. سالح: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٧. مستەفا: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٨. قادر: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٩. عەبدولفەتتاح: (هو الفتاح العليم).

١٠. عەبدالله: (عبدالله وجدی).

١١. سەعید: (محمد سعيد).

١٢. ئیسماعیل: (اسماعيل).

١٣. مەحموود: (محمود).

١٤. ئەمین: (محمدأمين).

١٥. ساڵح: (محمد سالح).

١٦. مەحموود: (محمود).

١٧. حسێن: (محمد حسين).

١٨. فەرەج: (فرج).

١٩. محەممەد ئەمین: (محمدأمين).

٢٠. بابا عەلی: (السيد بابا على).

٢١. عارف: (محمد عارف خالد النقشبندى).

٢٢. حاجی مەلا ڕەسووڵ: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٢٣. ئەمین: (محمد أمين).

٢٤. علی: (محمد علي العثماني).

**بازرگانەکانی سلێمانیی**

٢٥. محەممەد: (محمد عبده).

٢٦. ڕەحیم: (محمد رحيم).

٢٧. تۆفیق: (محمد توفيق).

٢٨. فەرەج: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٢٩. ئیبراهیم: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٣٠. مەحموود: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٣١. عەبداللە: (عبدالله).

٣٢. مەعرووف: (معروف عبده).

٣٣. عەبدولقادر: (عبدالقادر).

٣٤. ئەحمەد: (أحمد).

٣٥. عەبدولعەزیز: (عبدالعزیز).

٣٦. ئەمین: (محمدأمین).

٣٧. ئەحمەد: (أحمد).

٣٨. ساڵح: (محمد صالح).

٣٩. عەبداللە: (عبدالله).

٤٠. سەعید: (محمد سعید).

٤١. مستەفا: (مصطفى).

٤٢. فەتح اللە: (فتح الله).

٤٣. عەبدولعەزیز: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٤٤. عەبدولغەفوور: (عبدالغفور).

٤٥. ساڵح: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٤٦. عەلی: (علي صابر).

٤٧. ساڵح: (محمد صالح).

٤٨. مستەفا: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٤٩. حەسەن: (حسن).

٥٠. مەحموود: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٥١. محەممەد: (محمد).

٥٢. عەبدوڕڕەحمان: (عبدالرحمن).

٥٣. ساڵح: (محمد صالح).

٥٤. قادر: (عبدالقادر).

٥٥. ئەحمەد: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٥٦. سەعداللە: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٥٧. حەسەن: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٥٨. ئەمین: (محمدأمين).

٥٩. عەبدولعەزیز: (عبدالعزيز).

٦٠. عەبداللە: (عبدالله).

٦١. عەلی: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٦٢. مەحموود: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٦٣. ئەمین: (محمدأمين).

٦٤. قادر: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٦٥. ئەمین: (محمد أمين).

٦٦. ساڵح: (محمد صالح).

٦٧. سەعید: (محمد سعيد).

٦٨. عەبدوڕڕحمان: (عبدالرحمن).

٦٩. ساڵح: (صالح ابن عزيز ).

٧٠. ئەمین: (محمد أمين).

٧١. قادر: (عبدالقادر).

٧٢. عەلی: (محمد على).

٧٣. سالّح: (صالح صدقی).

٧٤. سەعید: (محمد سعید).

٧٥. ڕەشید: (محمد رشید).

٧٦. سالّح: (محمد صالح).

٧٧. محیەددین: (محی الدین).

٧٨. عەبداللە: (عبدالله).

٧٩. عەزیز: (عبدالعزیز).

٨٠. عەبداللە: (عبدالله).

٨١. محەممەد: (عبده محمد).

٨٢. ئەحمەد: (أحمد معروف).

٨٣. محیەددین: (یا محی الدین).

٨٤. عەزیز: (محمد عزیز).

٨٥. محەممەد: (محمد).

٨٦. عارف: (عارف).

٨٧. شەریف: (محمد شریف).

٨٨. ئەمین: (؟ /مۆری لێ نەداوە).

٨٩. محیەددین: (محی الدین).

٩٠. عەلی: (بابا علی).

٩١. فەتاح: (یا فتاح).

٩٢. ڕەشید: (محمد رشید).

٩٣. فەرەج: (فرج).

٩٤. ئەمین: (محمد أمین).

٩٥. فەرج الله: (فرج الله).

٩٦. ئیبراهیم: (عبده إبراهیم).

٩٧. فەتاح: (عبدالفتاح).

٩٨. لاوە: (عبده لاوه).

٩٩. مەحموود: (یا محمود).

١٠٠. فەیزاللە: (فیض الله).

١٠١. ئەمین: (محمد أمین).

١٠٢. کریم: (عبدالکریم).

١٠٣. ئەمین: (محمد أمین).

١٠٤. عزیز: (عبدالعزیز).

١٠٥. ئیبراهیم: (عبده إبراهیم).

١٠٦. عەبدالله: (عبدالله).

"تەواو"

**موتەسەرڕیف جەمال بەگ؟**

موتەسەرڕیفی سلێمانیی ساڵی ١٩٠٢ ز بووە.{١ /ل١٣٨} . بڕوام زۆر کە ئەم نێوە هەر ئەو (جەمال بەگ)ە بێ کەعەباس عەززاوی بەئەم جۆرەی ئاشناکردووە:

(والیی بەغداد جەمال بەگ "١٩١١/٨/٢٦–١٩١٢/٨/١٧"دووای دەستەبەر دار بوونی لە هەرێمی بەغدادا، لەدووا مێژوودا ڕووی کردە ئەستەنبووڵ.

خاوەندی گۆڤاری "لوغەتولعەرەب/لغةالعرب"ستاییشی ئیدارەو کارگێڕانی کردووە و بە لێ زانی ژە

نووسەر مەحموود حەموش ئەوهای باس کردووە: "نێوبانگی خراپە، لەگەڵ خانمی ڕێبەری بانکی عوسمانیی خەریکی دانس-سەما-کردن بووە! ". لەنێو عەرەبدا نێوبانگی بەخوێنڕێژ ڕۆیشتووە، چونکە لە"شام" دا خەڵکێکی زۆری کوشتووە!

خۆی وەك پێگەییشتووی مەکتەبی -حەربییە- جەنگاوەریی بووە، ئەندامێکی "کۆمەڵەی ئیتتحادو تەرەققیی عوسمانیی"بووە. چەندجارێ " فەرمانی موتەسەڕڕیفی"و "والییەتیی" بەرکەوتووە تا بووە بەوەزیری دەریا. وەك فەرماندەی بەرەیێ چووەتە سوریاو پەلاماری "کەناڵی سوێس"ی داوەو شکاوە. خەڵکەکەش لێی بێزار بووە و ناچار گەڕاوەتەوە بۆ وەزیریەتیی دەریا!

دووای ئاگربەستی یێکەم جەنگی گێتیی، لە ئەستەنبووڵ دوورکەوتووەتەوە و ماوەیێ لە ئەورووپادا ژیاوە. دووایی چووە بۆ ئەفگانستان و بەتەمای ڕێکخستنی سوپا بووە. دووایی چووە بۆ "بەرلین" بۆ دیدەنیی ماڵ و منداڵیو لێپرسینەوەی هێندێ کاروباری تایبەتی خۆی. لەڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ ئەفگانستان و لە بازێڕی "تەفلیس"دا، ئەرمەنەکان ڕاویان کردووە و خۆی و دوو کوڕیان کوشتووە. وێ دەچێ لە کوشتاری ئەرمەندا تاوانی زۆر بووبێ!). {٥/ل٢٥}

**ئەنجام**

ئەگەرچیی ئەم مەزبەتە بێزاریەی مەردانی سلێمانیی بەڵگەیێکی ئاشکراو بەهێزە بۆ زۆرداریی کاربەدەستەکانی دەوڵەتی عوسمانییو دەنگی سەرپێچیی کوردایەتیی سلێمانیی کۆنە مەڵبەندی بابان، ئەوە هەر خۆیشی بەڵگەی حاشا هەڵنەگرە کەسێ مەزبەتەی ڕابردووش وەڵامی نەدراوەتەوە و دام و دەزگەکانی سوڵتان خۆیو سەدارەتی ئەعزەم بێ ئاگەن!! لەئەمەش گرنگتر، وەك پەرۆشی (ئەنجامی ئەم مەزبەتەیەم) ئەوە سەرنجی کۆمەڵێ نامەی ڕەسمییانە و تورکیی زمانی موتەسەڕڕیفییەتی ئەوکاتەی سلێمانیم دا-لەبەردەستمن-و بۆم دەرکەوت کە بەڕۆشنایی دوو نامەی ڕەسمیی

موتەسەڕیفی سلێمانیی و ئیمزاکراوی (موتەسەڕیف جمال پاشا – محمد جمال) لە ١١ ی زیلقەعیدەی ١٣٢٠ "ك" ٢٧ی کانوونی سانیی سالّی ١٣١٨ "ر" (١ /٩ /١٩٠٢ ز /کەمال)، هەروەها نامەی ١٩ی ڕەبیعولئاخیری ١٣٢١ "ك" ٢ی حوزەیرانی ١٣١٩ "ر" (= ١٦/٥/١٩٠٣ز/کەمال) ئەو (موتەسەڕیفە هەر لە سلێمانییدا بووە) و دیارە کە مەزبەتەکەی ئەم مەردانە چ ئەنجامێکی نەبووە، سا یا وەك ئەوانی دی وەلاّم نەدراونەتەوە، یان بە فەرمانی هەمان موتەسەڕیف ئەم مەزبەتەیەش–لەتەلگرافخانەوە– نەگەییشتووەتە پێتەختی سولّتان: (خەلیفەی سەر ڕووی زەمین!!).

## پاشکۆ

بۆ پتر تێگەییشتنی باری دامەزراندنی دەسەلاّتدارەکان، بەتایبەتیی "موتەسەڕیفەکان"ی سەردەمی عوسمانیی، هەروەها بۆ ناسینی شێوەی ڕەفتاریان، دوو بەلّگە نووسراو دەنوێنم:

١. عەبدوڕڕەحمان بەدرخان پاشا، سەرگوتارێکی لە ڕۆژنامەی (کردستان – س١٩٠٠) نووسیوە و ئەوها دەبێژێت: (خونکار – سولّتان–بیست سیی هەزار زێڕەکی ڕیشوەت ژ وەزیرەکی دستینە، دکە سەدری ئەعزەم، پاشی ئەو سەدری ئەعزەم – سەروەزیران– چەند هەزار زێڕەکی ڕیشوەت دستینە، وەزیرا دکە نازیر. پاشی پاشایێك هەزار زێڕەکی ڕیشوەت دەیدە سەدری ئەعزەم، دبە مەسەلا والییێ دیاربەکرێ، ئەو والیی دا حەیفا وان پەرەیی –پارەیی– دایێ سەدری ئەعزەم دەریەنە، دڤێ ڕیشوەتا بخۆە، حەچییێ گەلەك ڕیشوەتا دا وی دکە "موتەسەڕیف"، پاشی ئەو موتەسەڕیفە ژی دا حەیفا وی ڕیشوەتا دایێ والیی دەرەینە، هەرچی یێ گەلەك پەرا –پارا– بدە وی دکە قائیمقام. د ڤێجا قایمقام ژی حەیفا پەرەیێن –پارەکانی– دایێ موتەسەڕیف ژ "کوردێن ڕەبەن" دستینە! گەلی کوردنۆ، مەئموورێن حوکوومەت ڕێ دکە ولاّتێن کوردستانی، ئەغلەب هوونە! ئەو مەئموور تەدریجیی ولاّتی وە خراپ دکەن! گەلی

عولەمایێن کوردادا ئەوون چ ڕە دەنگی خۆ هەلّنایێن؟ دلّی خۆ فەنا کەن! ئەوون عالمن، دزانن پێغەمبەر علیه صلاة والسلام فەرمان کرییە، " ولا یکون المرء عالما حتی یکون بعلمه عاملا! " هتد..(٢/ل١-٢).

٢. خاوەنـد جزدانـی تـەقاویتیی ژمـارە:٣٥٥/٢٥٥: تۆفیـق بـەگی موتەسـەڕڕیفی ئەماسیه (پیرەمێرد) لەسەر گوتارێکی خۆیدا لە (ژین -١٢/٨/١٩٤٨) دا دەبێژێت:

....لـەو سایشـەوە -مەبەسـتی سـالّی ١٢٦٦ک/١٨٤٩ زاییـنـە کەئیسـماعیل پاشـای تـورکی عوسمـانیی دامـەزرا بەیێکـەم موتەسـەڕڕیفی سـلێمانیی/کەمال - حوکومـەتی عوسمانیی نابەدلْ ئیدارەی ئێرەی کرد، هـەر موتەسـەڕڕیفێکیان دەنـارد بـە سـێ مـانگ دەگەییشت و تا دەگەییشت فرۆشرابوو. یێکێکی دیان لە شـوێن دەنـارد، هیچیان دلّنیـا نەبوون تا تەشەببوساتێکی - کردارێکی - ئیعماری تێدا بکەن! {٣/ل١}.

**پەراوێز**

{١}. لە هاوینی سالّی ١٩٨٨ - سلێمانییدا، لە کاك فەرەیدوون تۆفیـق حـاجی ئاغـا فـەتح اللهم وەرگرت. (گەنجینەی حاجی ئاغا فەتح الله).

{٢}. مەتنە تورکییەکە کاك عوسمان محەممەد ڕەشاد موفتی لـە ٢ /٦ /١٩٩٦-هـەولێردا بۆ منی کرد بە عەرەبیی و منیش کوردییەکەیم دارشتووە !سوپاسی دەکەم،

{٣} مخـابن شـێوەی مۆرەکـان لـە چـاپ کردنـدا زۆر ئاشـکرا نـەبوون، بۆیێکـا (نێـوە هەلّکەنـدراوەکانی نێـو مۆرەکـە) م وەك خـۆی نووسـیووەتەوە تـا هـەر بنەمالّـەیێ مـۆرێکی نووسراوی ئەوتۆیان هەیە بەشکو (ئاگادارم بکـەن) و منـیش لـەلای خۆسـەوە وردبیمـەوە پیـاوە ڕاستەکان نێو و نەوەیان لە مێژوودا ون نەبێ!

موتەسەڕڕیفی سلێمانیی و ئیمزاکراوی (موتەسەڕڕیف جمال پاشا – محمد جمال) لە ١١ ی زیلقەعیدەی ١٣٢٠ "ك" ٢٧ی کانوونی سانیی سالّی ١٣١٨ "ر" (١ /٩ /١٩٠٢ ز /کەمال)، هەروەها نامەی ١٩ی ڕەبیعولئاخیری ١٣٢١ "ك" ٢ی حوزەیرانی ١٣١٩ "ر" (= ١٦/٥/١٩٠٣ز/کەمال) ئەو (موتەسەڕڕیفە هەر لە سلێمانییدا بووە) و دیارە کە مەزبەتەکەی ئەم مەردانە چ ئەنجامێکی نەبووە، سا یا وەك ئەوانی دی وەلاّم نەدراونەتەوە، یان بە فەرمانی هەمان موتەسەڕڕیف ئەم مەزبەتەیەش–لەتەلگرافخانەوە– نەگەیشتووەتە پێتەختی سولّتان: (خەلیفەی سەر ڕووی زەمین! !).

## پاشکۆ

بۆ پتر تێگەیشتنی باری دامەزراندنی دەسەلاّتدارەکان، بەتایبەتیی "موتەسەڕڕیفەکان"ی سەردەمی عوسمانیی، هەروەها بۆ ناسینی شێوەی ڕەفتاریان، دوو بەلّگە نووسراو دەنوێنم:

١. عەبدورڕەحمان بەدرخان پاشا، سەرگوتارێکی لە ڕۆژنامەی (کردستان – س١٩٠٠) نووسیوە و ئەوها دەبێژێت: (خونکار – سولّتان–بیست سیی هەزار زێڕەکی ڕیشوەت ژ وەزیرەکی دستینە، دکە سەدری ئەعزەم، پاشی ئەو سەدری ئەعزەم – سەروەزیران– چەند هەزار زێڕەکی ڕیشوەت دستینە، وەزیرا دکە نازیر. پاشی پاشایێك هەزار زێڕەکی ڕیشوەت دەیدە سەدری ئەعزەم، دبە مەسەلا والییێ دیاربەکرێ، ئەو والیی دا حەیفا وان پەرەیی –پارەیی– دایێ سەدری ئەعزەم دەریەنە، دڤێ ڕیشوەتا بخۆە، حەچییێ گەلەك ڕیشوەتا دا وی دکە "موتەسەڕڕیف"، پاشی ئەو موتەسەڕڕیفە ژی دا حەیفا وی ڕیشوەتا دایێ والیی دەرەینە، هەرچی یێ گەلەك پەرا –پارا– بدە وی دکە قائیمقام. د ڤێجا قایمقام ژی حەیفا پەرەیێن –پارەکانی– دایێ موتەسەڕڕیف ژ "کوردێن ڕەبەن" دستینە! گەلی کوردنۆ، مەئموورێن حوکوومەت ڕێ دکە ولاّتێن کوردستانی، ئەغلەب هوونە! ئەو مەئموور تەدریجیی ولاّتی وە خراپ دکەن! گەلی

عولەماییَن کورددا ئەوون چ ڕە دەنگی خۆە هەڵنایینن؟ دلّی خۆە فەنا کەن! ئەوون عالمن، دزانن پێغەمبەر علیه صلاة والسلام فەرمان کرییە، " ولا یکون المرء عالما حتی یکون بعلمه عاملا! " هتد..(٢/ل١-٢).

٢. خاوەند جزدانی تەقاویتیی ژمارە:٢٥٥/٣٥٥: تۆفیق بەگی موتەسەڕیفی ئەماسیە (پیرەمێرد) لەسەر گوتارێکی خۆیدا لە (ژین -١٢/٨/١٩٤٨) دا دەبێژێت:

....لەو سایشەوە -مەبەستی سالّی ١٢٦٦ك/١٨٤٩ زایینە کەئیسماعیل پاشای تورکی عوسمانیی دامەزرا بەیێکەم موتەسەڕیفی سلێمانیی/کەمال - حوکومەتی عوسمانیی نابەدلّ ئیدارەی ئێرەی کرد، هەر موتەسەڕیفێکیان دەنارد بە سێ مانگ دەگەییشت و تا دەگەییشت فرۆشرابوو. یێکێکی دیان لە شوێن دەنارد، هیچیان دلّنیا نەبوون تا تەشەببوساتێکی - کردارێکی - ئیعماری تێدا بکەن! {٣/ل١}.

**پەراوێز**

{١}. لە هاوینی سالّی ١٩٨٨ - سلێمانییدا، لە کاك فەرەیدوون تۆفیق حاجی ئاغا فەتح اللەم وەرگرت. (گەنجینەی حاجی ئاغا فەتح الله).

{٢}. مەتنە تورکییەکە کاك عوسمان محەممەد ڕەشاد موفتی لە ٣ /٦/ ١٩٩٦-هەولێردا بۆ منی کرد بە عەرەبیی و منیش کوردییەکەیم دارشتووە !سوپاسی دەکەم،

{٣} مخابن شێوەی مۆرەکان لە چاپ کردندا زۆر ئاشکرا نەبوون، بۆییکا (نێوە هەڵکەندراوەکانی نێو مۆرەکە) م وەك خۆی نووسیووەتەوە تا هەر بنەماڵەییَ مۆرێکی نووسراوی ئەوتۆیان هەیە بەشکو (ئاگادارم بکەن) و منیش لەلای خۆمەوە وردبیمەوە پیاوە ڕاستەکان نێو و نەوەیان لە مێژوودا ون نەبیَ!

## تەماشاکراو

(١). بابـان: جـەمال (نەخشـەی سـلێمانیی لەسـەردەمی بابانەکانـدا لەگـەڵ نـاوی حـاکم و وتەسـەرپیفەکان /گۆڤـاری کـۆڕی زانیـاری عێـراق-دەسـتەی کـورد. بـەرگ ١٦ و ١٧، بەغـداد ١٩٨١).

(٢). بدرخان پاشا: عەبـدالرحمن (کردسـتان – س١، ژ١١، پێنجشـنبە ٢٤ رمضـان ١٣١٦ رس ١٩٠٠از " سەرگوتار: واعتصموا بحبل الله جميعا !".

(٣). پیرەمێرد: حاجی تۆفیق، (ژین.. ١٢ /٨ /١٩٤٨ سلێمانیی)

(٤). زێوەر: عەبدالله: (یادی ڕۆژانی دەربەدەری و.../لێ نووسینی محەممـەدی مـەلا کـەریم. بەغداد ١٩٨٦).

(٥). العزاوی: عباس المحامی: (تاريخ العراق بين احتلالين – ج٧، بغداد ١٩٥٥).

(٦). کاروان – س ١٩٨٥. (مقابلة فريدة نـادرة مـع الشـيخ محمـود الحفيـد-اجراهحبزبـوز في سنة ١٩٣٦. بغداد – ص ١١٩ـ ١٢٨).

(٧). موصل سالنامه ویلایتی – سنة ١٣٢٥.

# ٢

# جەمعییەتی ئیتتیحاد و تەرەققیی عوسمانیی

## لقی سلێمانیی – س ١٩٠٨

### ڕێڕەوی باس

در. رامـزور Ernest. E. Ramsuar لەمـەڕ مێـژووی بزاڤـی سیاسـیی (تورکـانی لاو) بـاس دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت: لـە مایسـی ١٨٨٩ز.دا بەشـێوەییێکی نهێنیـی، چـوار خوێنـدکاری مەکتـەبی پزیشـکی سـەربازیی، ئیـبراهیم تیمـۆی ئـەلبانیایی دامـەزرێن و هاوەڵەکانی محەممەد ڕەشید چەرکەسیی و ئیسحاق سکوتی و عەبدالله جەودەت – هەردووك کورد – بوون بەنێوکی ئەو کۆمەڵە–پارتە سیاسیەی کە دوواتـر نێوبانگی بـە (جەمعییەتی ئیتتیحاد و تەرەقیی /کۆمەڵی یێکگرتن و پێشکەوتن) ڕۆیشت! {٣/ل٥٠}.

بەڵێ هەر ئەم کۆمەڵەیە لە ١٩٠٨/٧/٢٣ دا شۆڕشێکی سپیی کرد و دەستووری بڕیـاردراو و لـەکارخراوی سـاڵی ١٨٧٦ و ژیـنی پەرلـەمانیی بووژانـدەوە و لەسـاڵی ١٩٠٩ز.شدا سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی کارکەنار کرد. هەروەها بـە دروشمـەکانی "ئـازادیی. دادپـەروەریی. یێکسـانیی!!" جـەماوەری نەتـەوەکانی ژێـر دەسـتەی عوسمانییـەکانی لـەخۆ گـرد کـردەوە و ئیدی بەئاشـکرا لـە سەرانسـەری ئـەو دەوڵەتـە بەرینـەدا (لقەکانیکۆمەڵەکـە)ی دامەزرانـدو مەکینـەی سیاسـیی –فرۆفێلاویـی– خستەگەڕ!! زۆربـەی گـەلی کـوردیش –بەشـی ژێر دەستەی عوسمـانیی–گـەرمو گـوڕ پێشـوازیی ئـەم بـارە نوێیـە و ئـەم پارتـەی کـرد! لەلاییێکـەوە بەڕۆشـنایی پێوەنـدیی و هاریکاریی کوردە بەنێوبانگ و ڕۆشنبیرەکان لەگەڵ ئـەم پارتـە، هـەروەها بـە ڕۆشـنایی یاساکانی نوێ و ئازادیی پـارت پێکـەوەنان، پـارتێ–کۆمەڵـەییێکی کوردانـەی سـەربەخۆ بـەنێوی (کـورد تعـاون و ترقـی جمعـیتی/کۆمەڵـەی هاریکـاریی و پێشـکەوتنی کـورد–

ئەستەنبوولێ ۱۹۰۸/۹/۱۹) بەسەرۆکاییێتی شەهیدی نەمر شێخ عەبدولقادری شەمزینیی دامەزرا. {۱۳/ل۱}.

هەواڵەکانی سەرەتای ئەم کۆمەڵەیە لەبەردەستن‌و ڕادەگەیێنن کە لە بازێڕەکانی کوردستانی باکووردا، وەك دیاربەکر–بەدلیس، مووش، ئەرزرووم، هتد.. –لقی هاویشتووەو چالاکیی نواندووە. وێڕاش ڕۆژنامەییێکی تورکیی–کوردیی حەوتۆیی لە۱۹۰۸/۱۱/۹دا دەرکرد. {-/۸} بەڵام مخابن تائێستە چ سەرچاوەییێ بەدەستەوە نییە کەنێوی لقەکان‌و شێوەو سنووری چالاکیی ئەو کۆمەڵەیە لەکوردستانی باشووردا ڕوون بکاتەوە! ! تۆ بڵێیت هەر نەبووبێ؟ لەلاییێکی دیەوە، وەك ئەو پارتە–کۆمەڵەیە دامەزرا. لەهەمان ڕۆژگاردا – ڕەنگبێ زووتر – لە هەرێمەکانی وڵاتی ئێستەی عێراقدا (مووسڵ، بەغداد، بەسرە) مەڵبەندی هەرێمایێتیی (جەمعییەتی ئیتتیحادو تەرەققیی عوسمانیی) دامەزراوە. مخابن تائێستە سەرچاوەییێکی بێگانە تا کوردیی، لەمەڕ شوێن و مێژووی دامەزراندنی (لقەکان)ی ئەم کۆمەڵەیە و چالاکیەکانیان لەبازێڕەکانی کوردستانی باشوور–هەرێمی مووسڵ–هەواڵی بەدەستەوە نادەن! ! بەڵێ هێندکۆکەیێ سەرچاوەی کوردیی–بەبۆنەی لێقەومانێکی شێخانی بەرزنجەییەوە–نێوو باسی (لقی سلێمانیی) کۆمەڵەی باس کراویان نووسیوە، بەڵام هێشتا هەتا ئەورۆ بەڵگەییێکی ڕاست و نووسراو دەرنەکەوتووە کە مێژووی دامەزراندنی ئەم لقە – نەخوازەڵا پێوەندیی ڕاستی بە لێقەومانەکەوە–ڕوون بکاتەوە!

من –بەدەم پەرۆشیمەوە بۆ زانست‌و ڕاستیی–چەند بەڵگە نامەییێکی تورکیی زمانم دەستگیر بووە و ئەوەتە یێکەم جارە ئاشنایان دەکەم. هەڵبەت وەك گرنگن، دەستمایەی گەورەش نین بۆ وەڵام دانەوەی هەموو پرسیارێ!

هیوام زۆرە بەڵگەنامەناسەکان و مێژووناسەکانی دی بکەونە خۆیان بەشکو ئەوانیش لاپەڕەکانی مێژووی بزاڤی سیاسیی کوردان و شێوەی تێکەڵیی و ئەقڵ و ماریفەتیان بدۆزنەوەو بناسنەوەو نەوەکانمان لەسەرسامیی‌و زەین کوێریی ڕستگار بکەن‌و پەند لەمێژوو وەربگرن!

---

# بەشی یێکەم
## لەنێوان قسە و بەڵگەنامەدا

### ١. چیی لەمەڕ کۆمەڵەکە نووسراوە؟

نێوو باسی(جەمعییەتی ئیتتیحادو تەرەققیی عوسمانیی—لقی سلێمانیی) بەتایبەتیی بەبۆنەی لێقەومانەکەی شێخانی بەرزنجەییەوە لەسێ سەرچاوەدا دیارە.. یێکێ یاداشتی ڕەفیق حیلمیی ناسراوە. ئەوانی دی یاداشتەکانی شێخ ڕەئووفی کوڕی حەفیدزادە مەحموودو شێخ قادری برای حەفیدزادەیە، م. ر. هاواریش —لەدانراوی خۆیدا— لەئەوانەوە قسە و باسی وەرگرتووە و گێڕاوەتەوە، بەڵام خۆی شتێکی نوێی نەهێناوە و نەسەلماندووە.

جێگەی گوتنە، ڕاپۆرتێکی کونسوڵی بەریتانیا لە مووسڵ کە لە ١٩٠٩/١/١٤ ز. دا ناردوویێتی بۆ باڵیۆزی بەریتانیا لە ئەستەنبووڵ، مێژووی ڕاست و باسێکی کورتی لێقەومانەکەی گێڕاوەتەوە. {١١/ل١٦٢}.

من — بەتایبەتیی لەبەر پێویستیی و دووبارە نەبوونەوەی نووسینیش—بەشە نووسینەکانی ڕەفیق حیلمیی و شێخ ڕەئووفی حەفید و نووسینەکانی ڕاپۆرتەکەش دەنوێنم:

١/١: ڕەفیق حیلمیی دەبێژێت: (لقی ئیتتیحادو تەرەققیی سلێمانیی کە بەتایبەتیی لەناحەزانی خانەوادەی شێخ سەعید، واتە لە تیجارەکان و هەندێ لەو زابتانەی هات بوونە نێو کە تازە لە مەکتەبی حەربییە دەرچووبوون و مەیلی ئازادیی و بەربەرەکانێی خاوەن نوفووزەکانیان دەکرد لەبەرئەمە لەگەڵ بەرەی شێخان کەوتنە دوژمنایەتیی و دەستیان کرد بەهان دانی حوکوومەت لەعاستیاندا! زۆری پێنەچوو کە بە" کەین وبەین"ی لقی کۆمەڵ و ئەو کاربەدەستانەی لە کۆمەڵدا ئەندام بوون، بیانوویان بۆ

دۆزینەوەو شێخ سەعیدی حەفیدو هەندێ کەسوکارو دەستو دائیرەی لەگەڵ شێخ مەحموودی قارەمان لەژێر چاودێریی هێزێکی زۆری حوکوومەتیدا نێررانە مووسڵ!

کاربەدەستەکانی ئیتتیحادو تەرەققیی لەمووسڵدا بۆ هەلێك دەگەڕان کە بیکەن بە بیانوو بۆ لەنێوبردنی شێخ سەعید. لەبەرئەمە لەسەرەتای هاتنیانەوە بۆ ئەوە تێ دەکۆشان دڵی خەڵکی مووسڵیان لێ کرمێ بکەن! وەك دەڵێن، گەلێ شتی درۆو ناڕاستیان بۆ هەڵدەبەستن‌و بەنێو خەڵقدا بڵاویان دەکردەوە. زۆری پێ‌نەچوو دەربارەی ئەم غەریبو لێقەوماوانە "لەشاری مووسڵدا فیتنەیێکی گەورە هەڵگیرسا".). ر ٢ /ل٣٨}.

ڕەفیق حیلمیی لە زمانی نووسەر عەبدولمونعیم غولامیەوە دەشڵێت: (شێخ مەحموود دوای هەڵڵاکە لە ئەوێوە دەچێتە ماڵی حاجی محەممەد چەلەبی جادر و ئەوان لەماڵی خۆیانەوە دەیگەیێننە سەرای حوکوومەت!). {٢/ل٤٤}.

٢/١: شێخ ڕەئووف شێخ مەحموود لەیاداشتەکانیدا باسی لەیاداشتی عیززەت کاکەیی باوکی قوتبەددینی دوکتۆری بەیتەرە وەرگرتووە-عیززەت کاکەیی گۆیا خۆی سکرتێری شێخ سەعید بووەو ئەو یاداشتەیشی لەساڵی ١٩١٠ز.دا بەتورکیی نووسیوە- دەڵێت:(دوای ئەوەی بنەماڵەی بەرزنجەیی نێوبانگیان دەرکرد، ئەوانەی ڕقیان لێبوو، لە هەلو دەرفەت دەگەڕان‌و ساتێك کەدەسەڵاتی عەبدولحەمید -سوڵتان- کزبوو، ئیدی " ئیتتیحادیەکان " هەوڵیان دا دەسەڵات و توانای ئەو کەسانە کەم بکەنەوە کەسەر بە عەبدولحەمید بوون! بۆ ئەمە لەهەموو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییدا "لقی ئیتتیحادو تەرەققیی" دانراو لەنێوچەی سلێمانیی "شدا" لقێك"پێك هاتو ئەندامەکانی دژی بنەماڵەی شێخانی بەرزنجەیی بوون و بەتایبەتیی دژی شێخ سەعید. "مەحموود پاشای جاف سەرکردەی ئەو لقەی سلێمانیی بوو"!!" دەستیان کرد بەناردنی ئەخبارییاتی پڕ

لــە درۆ و دەلەســە و بــە مەزبەتــە کردنــەوە دژی شــێخان و دۆســت و دەســت و پێوەندەکانیان.

شێخ سەعیدو کوڕەکانیو سەیید ئەحمەدی بابا ڕەسوولو شێخ سالحی موفتیی بانگ کران بۆ سەرا. لەسەرادا هەموویان دەست بەسەر کران لەلایێن پۆلیسو سەربازی تورکەوە. بازرگانەکان چوونە پۆستەخانە و تەلگرافیان بۆ شکات لە دژی شێخانو ناڕەزایی لێدا. لەهەمان کاتدا دوکتۆر زیادو ئەفسەرێك فەهمی! ! " کە خەڵکی سلێمانیی بوون لەگەڵ قول ئاغاسیی چوونە بازاڕ و بەنێو خەڵکدا بڵاویان کردەوە کەوا حوکوومەتی عوسمانیی شێخانی گرتووە و ئێوەش هەڵستن و بچنە بەر سەرا کە لەوێدا فەرمانی شاهانە دەربارەی ئەو گرتنە دەخوێندرێتەوە و هەرکەسێ دوکانەکەی دانەخات و نەچێت بە پیسترین شێوە سزا دەدرێ! !". بە ئەو جۆرە نێوشار خرۆشاو شێخانیان بەهێزی سوپا و بەزۆر نارد بۆ مووسڵ و کاربەدەستان، خەڵکیان هان دەدا پەلاماری ماڵەکانیان بدەن و دەست درێژیی بکەنە سەر کەس و کاریان! "). {١١/ل٤٧٠}

٣/١: ڕاپۆرتی کونسولی بەریتانیا دەبێژێت، (لە نێوەڕۆی سێشەممەی کانوونی دووەم: ١٩٠٩/١/٥ ز.دا ئەو هەرایە قەوما.. وێڕای ئەو هەموو کوشتار و برینداریی و تالانیەی کرا، حوکوومەت — لە مووسڵدا — بەئاشکرا دەستەوسان ڕاوەستا و هیچی نەکرد. بۆ بەربەست کردنی ئاژاوەکە لە ڕۆژی ١٩٠٩/١/٥ دا تەلگرافێ لە ئەستەنبووڵەوە هات بوو کە شێخ سەعید ئازادە و دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی لەسلێمانیی، بەلام وادیارە"پیلانەکە ڕێك خرابوو تا شێخ سەعید نەگەڕێتەوە سلێمانیی! ! ".. شێخ مەحموود ئەویی لە هەراکەی مووسڵدا ڕستگاری بوو، لە ١٩٠٩/١/٦ز.دا لەژێر چاودێریی لە حامیەدا مایەوە، بەلام لە هەفتەی پێشوودا —واتە کۆتایی مانگی کانوونی دووەم— لەلایێن کاربەدەستانەوە بەرەلاکراو بەبێ دەنگیی بەرەو کەرکووك ڕۆیشت! ). {٩/ل١٦٥}.

**دوو بەڵگەی (لقی سلێمانیی)**

وەك لە چ سەرچاوەییێکدا مێژوو، نێوی دەستەی (لقی سلێمانیی ئیتتیحادو تەرەققیی) دەرنەکەوتووە، مـن لەمـەڕ دامەزرانـدنی لقەکـە، لەلاییێکـەوە چـوار مـۆر و لـەلاییێکی دیەوە "فەرمانێکی هەرێمی مووسڵی ئیتتیحادو تەرەققیی" بۆ دامەزراندنی لقی سلێمانیی بەردەستم کەوتوون و ئەمەن:

**١/٢: چوار مۆر! ***

مۆرەکان، یێکێکیان گەورە و ئەوانی دی پچووکن و بە ئەم جۆرەن:

"١". مۆرێکی خڕ و گەورە–گۆیا زیو بووە–لێی نووسراوە:

(عثمانلی اتحاد وترقي جمعيتي–سليمانية ١١ تموز سنة ١٣٢٤.ع ١٣٢٦)[١].

"٢". مۆرێکی خڕ و پچوك، نێوی (فتح الله چلبی) تێدا نووسراوە[٢].

"٣". مۆرێکی خڕ و پچوك، نێوی (فائق توفيق) تێدا نووسراوە[٣].

"٤". مۆرێکی خڕ و پچوك، نێوی (احمد درويش) تێدا نووسراوە[٤].

**ماناکانی مۆرەکان** {١}

(١) جەمعییـەتی ئیتتیحـاد و تـەرەققیی عوسمـانیی–سـلێمانیی ١١ی تـەمووزی ساڵی١٣٢٤"ڕۆمیی"ع ١٣٢٦ (کۆچیی=٢٤ی تەمووز ١٩٠٨ زاییینی /کەمال).

(٢) فـتح اللـه چـلبی=حـاجی ئاغـا فـەتح اللـە چـەلەبیی– ١٨٧٤ز. گـەڕەکی دەرگەزێنیسـلێمانیی.. کـوڕی حـاجی عەبداللەیـە. بەپێیسـەردەمەکەی لەفێرگـەکانی ئاییناسەکاندا خوێندەواریی دەستگیر بـووە. بەڕۆشـنایی هێنـدی بەڵگەنامـەی تـورکیی زمـانیی بەردەسـتم لـەنێوان ١٩١١–١٩١٤ز.دا سـەرۆکی بەلەدییـەی سـلێمانیی و لـەنێوان ١٩١٤–١٩١٧ز.دا ئەنـدامی (ئەنجوومـەنی ئیـداریی سـلێمانیی)و لـە ٢٤/٥/١٩١٩ز.شـ ـندامی (هەیئـەتی ئیـدارەی حوکوومـەتی میللییـە–بەشـی دارایـی) سـلێمانیی بـووە ١٩٢١ز.دا –سەردەمی ئینگلیزی داگیرکەری سلێمانیی–یێکێ بووە لەخۆ هەڵبـژێرەکاز

بۆ ڕیزی (ئەنجوومەنی ئیداریی سلێمانیی)و سەرنەکەوتووە. دوواتر ئەندامی هەڵبژێردراوی (جەمعییەت کوردستان - س١٩٢٢) بووە، دوواتریش لە سەردەمەکانی دی حوکمڕانی حەفیدزادە شێخ مەحمووددا لە کۆڕ و فەرمانگێڕاندا نێوی دەرنەکەوتووە. تا مردن بە موڵکداریی خۆیەوە خەریك بووە. حاجی ئاغا فتح الله بابی نووسەرو بازرگانی ناسراو تۆفیقی ئاغا فەتح الله و باپیری سیاسیی ناسراو شەهید دارا تۆفیقە. (ئەم ژیننامەیە پێکەمە کە بخرێتە ڕوو!).

(٣) فائق تۆفیق = ئەحمەد فائیق کوڕی تۆفیق، خەڵکی سلێمانیی. ڕەفیق حیلمیی لە(یاداشت-ب١،ل٧٢) دا وێنەی بڵاوکردووەتەوەو لێی گوتووە، لەدەورەی عوسمانییدا ئەندامی (دادگەی سلێمانیی) بووە. ماوەییێکیش لە بەغداد دا ڕێبەری تاپۆی بەغداد بووە. لەلاییێکی دیەوە ڕاپۆرتی **A.T.Wilson** وێڵسن حاکمی سیاسیی ئینگلیز لە عێراقدا (پەراوێزی جەعفەر خەیاتی وەرگێڕی: فصول من تأريخ العراق القريب-ص٣٧) دەگێڕێتەوە کە لە١/٤/١٩١٩دا دانراوی بە ڕێبەری تاپۆی سلێمانیی. من خۆم سەرنجی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢٣ م داوە و تا دوا مێژوو هەر ڕێبەری تاپۆی سلێمانیی بووە. نەجمەددین مەلا لە (کەشکۆڵی١٩٣٧-١٩٣٨)ی دەستنووسیدا- پارێزراو لەلای دۆستم عەبدوڕڕەقیب یووسف-دەگێڕێتەوە کەئەحمەد فایەق یاوەری گەشتەکەی ئەفسەری سیاسیی ئینگلیز نۆییل **Noeil** بووە کە لە ١/٤/١٩١٩ دا دەستی پیَ کرد بەنێو کوردستانی باکووردا. ڕاپۆرتێکی بەڵگەداری ١٣/١١/١٩٢٧ی نێرووی هەوایی ئینگلیز لەعێراقدا -بڵاوکراوەی دۆستم تاریق جامباز، گوڵان ١٩٩٧) باسێکی گرنگی لیَ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (ئەحمەد فایەق بگە ڕێبەری تاپۆی بەغداد - دیارە لە ١٩٢٧ز.دا دیسان چووەتەوە بەغداد-ئێستە خەریکی دانانی کتێبێکە لەمەڕ مێژووی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، هەر لەسەرەتایەوە تا نەوو. کتێبەکەیشی ڕاستیەکانی مێژووی تێدا هەیە لەگەڵ تۆمارکردنی هێندیَ ڕووداو و نیازیشی هەیە بە کوردیی و

عەرەبیی و تورکیی بڵاوی بکاتەوە. ئارەزووش دەکات کاتێ کتێبەکەی تەواو کرد مافی کتێبەکە بە هەندێ پیاوی ئینگلیز بفرۆشێ!!). جێگەی باسە وەك ئەم کتێبە لە کورد خۆی ونە و هەرگیز باسی چاپیشی نەکراوە. ئەحمەد فایەق، یان فایەق تۆفیق-وەك نەجمەددین مەلا لێی گوتووە-بە کوردیی و تورکیی و فارسیی شیعری داناوە و دیوانی یان بەرهەمەکانی دیاریی و چاپ نەکراون.. هێندەی دیارە قەسیدەیێکی بەنێوبانگی زۆر بڵاوە کە بەسەرەتای شیعری سیاسیش دەناسرێت و دەستپێکی ئەمەیە:

**بەمەعمووریی کە مەشهووری جیهان بوو خاکی کوردستان**

**هەموو وێرانەیە ئێستە لە زوڵم و وەحشەتی تورکان.**

دواجار ئەحمەد فایەق، فایەق تۆفیق نەك هەر شاعیر بەڵکو تێکەڵی ڕۆژنامە نووسیی بووەو. جاری یێکەم خاوەند ئیمتیازی گۆواری (دەنگی گێتی ی تازە - ب٥، ژ١ دووشەموو ١٢ تەشرینی دووەم ١٩٤٥-١٩٤٧). جاری دووەم خاوەند ئیمتیازی ڕۆژنامەی عەرەبیی بەغداد (لواء الجهاد -س١٩٤٨) کە فایەق بەتتی ڕۆژنامەوان و زاهیدە ئیبراهیمی ڕۆژنامەناس لێیان گوتووە لە ١٩٥٤/١٢/١٧دا ئیجازەکەی هەڵوەشاوەتەوە. هەڵبەت-باوەڕ دەکەم - ئەمە ئەنجامی مردنیەتی کە لە سەرەتای بەهاری ١٩٥٣دا کۆچی کردووە و "مەحموودی فەقێ محەممەدی هەمەوەند" ی شاعیر و نووسەر لە (ژین - س ٢٨، زژ ١١٤٢، پێنج شەموو ١٩٥٣/٣/٢٦)دا لەمەڕ (دووا کۆچی مامۆستا ئەحمەد فایەقی محامیی) پەخشانێکی ئەدەبیی جوان و ناسکی لێ نووسیوە و بۆی لاواوەتەوە و بە نیشتیمانپەروەری ژماردووە.

مخابن وەك ساڵی مردنی دەزانرێ، ساڵی لەدایك بوونیم لێ ونە.. ژنیشی هێناوە و منداڵی هەبووە، بەڵام نەژیاون بۆییکا وەجاخی کوێرە. (ئەم ژیننامەیە هەرە کۆکە کە بخرێتە ڕوو!).

(٤) احمد درويش!! (لێم ڕوون نییە کێ بێ!!) چونکە چەند سەرنجم داوە لەڕیزی ئاییننـاس، بازرگانـان، دەسـەلاتداراندا دەرنەکـەوتووە.. ڕەنگـبێ ئەفسـەرێ یـان کاربەدەستێکی موتەسەڕڕیفیەت بووبێ! پێ ویستیشی دەبینم بڵێم کە ئەم ئەحمەد دەروێشە (ئـەخۆل) ی شـاعیر نییـە کـە هـەمان نێوی هەیـە، چـونکە ئـەخۆل لـە سـاڵی ١٩١١ز.دا هاتووەتە دنیاوە.).

**٢/٢: بەڵگەنامەی دامەزراندنی لقی کۆمەڵەکە!**

فەرماننامەیێکی دەستنووس و مۆرلێدراوی (عثمانلى اتحاد وترقـي جمعـيتي-موصـل ولایـتي هیئـة مرخصـه سـی /کۆمەڵـەی یێکگـرتن و پێشـکەوتنی عوسمـانیی-دەسـتەی متمانە پێکراوی هەرێمی مووسڵ)

## مەتنی نووسراوەکە ئەمەیە: [٢]

٩٠٠ (بسم الله)

| ژمارە | نێوەکان "٣" |
| --- | --- |
| ١ | حاجی ئاغا فەتح الله |
| ٢ | مەئمووری نوفووس عەزمی بەگ (کوڕی مستەفا بەگ کوڕی سلێمان پاشای بابان/کەمال) [٣] |
| ٣ | مووسڵیی محەممەد جادر چەلەبیی! (کوڕی حاجیی ئەمیز ئاغا /کەمال) |
| ٤ | ئیبراهیم بەگ زادە فەتاح بەگ. |
| ٥ | وەکیلی تابوور ئاغاسیی یوزباشیی فەهمی ئەفەندیی! (فەهمی فەرەج قـادر ئاغای خەڵکـی سلێمانیی بـە پلەی |

یوزباشـیی –سـەرۆکی یێکـەم–ەوە تـا پلـەی بێکباشـیی–موقـەددەم–بەرزبووەتـەوە. بـەڵام لـە ڕۆژگـاری یێکـەم جـەنگی گێتیـیو لـە گونـدی " زینـوێی شـێخ " دا لـە سـاڵی ١٩١٦ز.دا کۆچـی دوایـی کـردووە. فـەهمی فـەرەج–بـەپێی بەڵگەنامـەی بەردەسـتم–فاتیمـەی هاوسـەر بـووە و سـێ کیـژیان بـووە. یێکێکیـان کابـانی کۆنـە ئەفسـەری عوسمـانیی و ڕێبـەری ناحیـە لەسـەردەمی مەملەکـەتی عێراقـدا، شـاعیر و نووسـەر عەبداللـە عەونیی بووە !/کەمال).

٦ نووسـەری ئـەژمارگری بانـك عەبـدوڕڕەحمان بـەگ (کـوڕی ئەحمەد ئاغا/کەمال).

٧ ئەدیب ئەفەندیی (؟).

بەڕێز حاجی عەبدالله زادە حاجی ئاغا فەتح الله چەلەبیی.

ئەم زاتە بەڕێزانەی لە ڕۆشنبیرانی سلێمانین و لە سەرەوە نێویان نووسراوە، لە ٩ ی کانوونی ئەووەلی ١٣٢٤ ی ڕۆمییدا لە بۆ (جەمعییەتی ئیتتیحاد و تەرەققیی عوسمانی–مەرکەزی سلێمانیی) دانراون و دامەزراون–نصب و تعین–و ئامۆژگاریشیان بەسەردابەش کـراوە "!!"! لـە ٨ ی زیلقەعیـدەی ١٣٢٦ ك /٩ ی کـانوونی ئـەووەلی ١٣٢٤ (ر = ٢٠ /١٢ /١٩٠٨ ز /کەمال) دەست بەکارن.

دەستەی متمانە پێکراوی هەرێمی
مووسڵی کۆمەڵەی یێکگرتن و
پێشکەوتنی عوسمانیی
مۆری (عثمانلی اتحاد و ترقي جمعیتی–موصل ولایتی هیئة
مرخصه سی)

**ئەنجام**

١. بەهۆی چوار مۆرەکەوە، مێژووی (یێکەم دەستەی لقی سلێمانیی کۆمەڵەی یێکگرتن و پێشکەوتن) دەرکەوت کە رێکەوتی ١١ ی تەمووزی ١٣٢٤ ی رۆمیی-١٣٢٦ ی کۆچیی (= ٢٤ی تەمووز ١٩٠٨ ی زایینیە ! /کەمال). هەروەها نێوی سێ ئەندامی ناسرانەوە ! گومانیش نییە لەرێزی ئەو یێکەم دەستەیەدا نێوی کەسانی دی هەبووە و لە ئێمە ونن! ! ئایا – وەك مقۆ مقۆ هەیە-یێکێ لە نێویاندا مەحموود پاشای جافە کە گۆیا سەرۆکی کۆمەڵەکە بووە؟ یان حاجی مەلا سەعیدی کەرکووکیی-کەرکووکلی زادە بووە کە – وەك عەباس عەززاوی مێژووناس باسی کردووە-خۆی ئەندامی کۆمەڵەی یێکگرتن و پێشکەوتنی عوسمانیی و لە یێکەم سووری مەجلیسی مەبعوسانی عوسمانیی-پەرلەمان-دا نوێنەری سلێمانیی بووە، ١٩٠٨/١٢/١٧.{٦/ل١٦٦ و ١٧٨} جێگەی سەرنجە حاجی مەلا سەعیدی کەرکووکیی{٥}، لە سێیەم کابینەی ئەنجوومەن-وەزیران-ی حوکوومەتی مەلیکی کوردستان حەفید زادە شێخ مەحموود لە ساڵی ١٩٢٣ ز.دا (رەئیس – وەزیر) ی تیجارەت و مەعاریف و نافیعە بووە ! {١٢/ل٣}. لە لایێکی دیەوە-وەك بەڵگەنامەی دی لەبەرچاوە-تۆ بڵێیت کەسانی وەك دادوەر یاسین ئەفەندیی، هەروەها دوو پیاوی ناسراوی دی سلێمانیی، عەبدوررەحمان ئاغا، حاجی میرزا فەتاح ئەوانیش ئەندامی یێکەم دەستە بووبن بەتایبەتیی کە لە راپێڵەی باسێکی گرنگ و راسپاردەی لقی کۆمەڵەی نێوبراویش نێویان هاتووە؟

٢. بەهۆی فەرماننامەکەی دەستەی متمانە پێکراوی هەرێمی مووسڵی کۆمەڵەکەوە، ئەوە دووەم دەستەی (لقی سلێمانیی-کۆمەڵەی یێکرگرتن و پێشکەوتنی عوسمانیی:١٩٠٨/١٢/٢٠ن) بە حەوت ئەندامی ناسراوەوە، ئاشنا بوو. زۆریش وێدەچێ کە حاجی ئاغا فەتح اللە-وەك فەرماننامەکەی بەرەو رووکراوەتەوە- هەر خۆی سەرۆکی دەستەی دووەم بووبێ!

---

یوزباشـــیی –ســـەرۆکی یێکـــەم–ەوە تـــا پلـــەی بێکباشـــیی– موقـــەددەم–بەرزبووەتـــەوە. بـــەلآم لـــە ڕۆژگـــاری یێکـــەم جـــەنگی گێتیـــیو لـــە گونـــدی " زینـــوێی شـــێخ " دا لـــە ســـالّی ۱۹۱٦ز.دا کۆچـــی دوایـــی کـــردووە. فـــەهمی فـــەرەج–بـــەپێی بەلّگەنامـــەی بەردەســـتم–فاتیمـــەی هاوســـەر بـــووە و ســـیٚ کیـــژیان بـــووە. یێکێکیـــان کابـــانی کۆنـــە ئەفســـەری عوســـمـانیی و ڕێبـــەری ناحیـــە لەســـەردەمی مەملەکـــەتی عێراقـــدا، شـــاعیر و نووســـەر عەبداللـــە عەونیی بووە !/کەمال).

٦ نووســـەری ئـــەژمارگری بانـــك عەبـــدوڕڕەحمان بـــەگ (کـــوڕی ئەحمەد ئاغا/کەمال).

٧ ئەدیب ئەفەندیی (؟).

بەڕێز حاجی عەبدالله زادە حاجی ئاغا فەتح الله چەلەبیی.

ئەم زاتە بەڕێزانەی لە ڕۆشنبیرانی سلێمانین و لە سەرەوە نێویان نووسراوە، لە ٩ ی کانوونی ئەووەلی ١٣٢٤ ی ڕۆمییدا لە بۆ (جەمعییەتی ئیتتیحاد و تەرەققیی عوسمانی–مەرکەزی سلێمانیی) دانراون و دامەزراون–نصب و تعین–و ئامۆژگاریشیان بەسەردابەش کـراوە "!!"! لـە ٨ ی زیلقەعیـدەی ١٣٢٦ ك /٩ ی کـانوونی ئـەووەلی ١٣٢٤ (ر = ٢٠ /١٢ /١٩٠٨ ز /کەمال) دەست بەکارن.

دەستەی متمانە پیٚکراوی هەرێمی
مووسلّی کۆمەلّەی یێکگرتن و
پێشکەوتنی عوسمانیی
مۆری (عثمانلی اتحاد و ترقي جمعيتی–موصل ولايتی هيئة
مرخصه سی)

**ئەنجام**

١. بەهۆی چوار مۆرەکەوە، مێژووی (یێکەم دەستەی لقی سلێمانیی کۆمەڵەی یێکگرتن و پێشکەوتن) دەرکەوت کە ڕێکەوتی ١١ ی تەمووزی ١٣٢٤ ی ڕۆمیی-١٣٢٦ ی کۆچیی (= ٢٤ی تەمووز ١٩٠٨ ی زایینیە ! /کەمال). هەروەها نێوی سێ ئەندامی ناسرانەوە ! گومانیش نییە لەڕیزی ئەو یێکەم دەستەیەدا نێوی کەسانی دی هەبووە و لە ئێمە ونن! ! ئایا - وەك مقۆ مقۆ هەیە-یێکێ لە نێویاندا مەحموود پاشای جافە کە گۆیا سەرۆکی کۆمەڵەکە بووە؟ یان حاجی مەلا سەعیدی کەرکووکیی-کەرکووکلی زادە بووە کە - وەك عەباس عەززاوی مێژوونا‌س باسی کردووە-خۆی ئەندامی کۆمەڵەی یێکگرتن و پێشکەوتنی عوسمانیی و لە یێکەم سووڕی مەجلیسی مەبعوسانی عوسمانیی-پەرلەمان-دا نوێنەری سلێمانیی بووە، ١٩٠٨/١٢/١٧. {٦/ل١٦٦ و ١٧٨} جێگەی سەرنجە حاجی مەلا سەعیدی کەرکووکیی{ە}، لە سێیەم کابینەی ئەنجوومەن-وەزیران-ی حوکوومەتی مەلیکی کوردستان حەفید زادە شێخ مەحموود لە ساڵی ١٩٢٣ ز.دا (ڕەئیس - وەزیر) ی تیجارەت و مەعاریف و نافیعە بووە! {١٢/ل٣}. لە لایێکی دیەوە-وەك بەڵگەنامەی دی لەبەرچاوە-تۆ بڵێیت کەسانی وەك دادوەر یاسین ئەفەندیی، هەروەها دوو پیاوی ناسراوی دی سلێمانیی، عەبدوڕڕەحمان ئاغا، حاجی میرزا فەتاح ئەوانیش ئەندامی یێکەم دەستە بووبن بەتایبەتیی کە لە ڕاپێڵەی باسێکی گرنگ و ڕاسپاردەی لقی کۆمەڵەی نێوبراویش نێویان هاتووە؟

٢. بەهۆی فەرماننامەکەی دەستەی متمانە پێکراوی هەرێمی مووسڵی کۆمەڵەکەوە، ئەوە دووەم دەستەی (لقی سلێمانیی-کۆمەڵەی یێکرگرتن و پێشکەوتنی عوسمانیی:١٩٠٨/١٢/٢٠ز) بە حەوت ئەندامی ناسراوەوە، ئاشنا بوو. زۆریش وێدەچێ کە حاجی ئاغا فەتح اللە-وەك فەرماننامەکەی بەرەو ڕووکراوەتەوە- هەر خۆی سەرۆکی دەستەی دووەم بووبێ!

---

# بەشی دووەم

## (لێکۆڵینەوە)

ناسینی کردەوەکانی (لقی سلێمانیی) کۆمەڵەی نێوبراو، بەتایبەتیی لەنێوان ساڵانی ١٩٠٨-١٩١٨ ز.دا بۆ ئێمە گەلێ گرنگە.. هەڵبەت لەبەرنەبوونی هەواڵ و باسی مێژوویی ورد و باوەڕ پێکراو، توانای ناسینیمان نییە، بۆیێکا بەش بە حاڵی خۆم پتر بە باسی گرنگی (لێقەومانەکەی شێخانی بەرزنجییەوە) خەریك دەبم کە وێڕاش - وەك لێکۆڵینی ڕەسمیی و باوەڕ پێکراومان لەبەردەست نییە-بڕیاری دواجار هەر بۆ بەڵگەنامە و لێکۆڵینەوەی زانستیی دەهێڵمەوە.

**کۆمەڵەکە و لێقەومانەکەی شێخان؟**

بەش بەحاڵ خۆم-لەڕووی چۆنییێتی لێقەوامنەکە و ئەنجامەکانیەوە نا - خولیای دوو باسی ئەم کێشەیەم:

١. ئایا کۆمەڵەکە خۆی و (لقی سلێمانیی) ش دەستیان لە ئەم لێقەومانەدا هەیە؟ کام دەستەی لقیش-یێکەم یان دووەم-دەستی تێکەڵە؟

٢. پێوەندیی مەحموود پاشای جاف بە (کۆمەڵەکە) و بە (لێقەومان)ەکەوە چییە؟

بەر لە خەریك بوون بە وەڵامەوە، پێویستی دەبینم-بۆ یێکەم جار-ئەم بەڵگەنامە تورکی زمانەی (موتەسەڕڕیفی سلێمانیی) بخەمە بەرچاو کە وەرگێڕانە تورکیەکەی ئەمەیە:

موتەسەڕڕیفییەتی سلێمانیی

٢٤٠ نومیروسی

بارزگانی پایەبەرز حاجی ئاغا فەتح الله چەلەبیی

ئەفەندیی پایەبەرز

لە سلێمانیی و قەزاکانیدا، گەلێ مزگەوت و تەکیەی ڕەسمیی و ناڕەسمیی و زەوی و موڵکی تایبەتیی و وەقف کراو هەن کە شایانی لێوردبوونەوە و ئامار ڕاگرتنن. ئەم جۆرە وەقف کراوە تایبەتیانەش هەندێ خەڵکیان لەسەر دەژێ و ئەمەش لەگەڵ ڕەووشتی ئیسلامەتیی نادروستە و ئەو کەسانەش ئاگادارنین کە مزگەوت و تەکییەکان وەك هاوتایان لە لیواکانی دیدا لەلایێن دەزگەی ئەوقافەوە شایانی لێپرسینەوە و ناسینی پێویستییەکانیانن.

ئەوە لە ئەم بارەیەشەوە لەلایێن (جەمعییەتی ئیتتیحاد و تەرەققیی سلێمانیی) یەوە یاداشتێکمان بۆ هاتووە. لەبەرئەوە پێویستمان زانیی کە دەستەیێ — کۆمیسیۆنێ — بۆ ڕاگرتنی جۆر و ئاماری وەقف کراوەکان و کۆڵینەوە لە مەرجەکانی وەقف کردنیش پێك بێت! ئەوە فەزیڵەتی دادوەر یاسین ئەفەندیی، موفتیی، ئەندامان عەبدوڕڕحمان ئاغا، حاجیی میرزا فەتاح ڕاسپێردران کە بەڕای گشتیان دەستەیێ دروست بێ! تکایە خێرا هیممەت بفەرموون و بکەونە کار و ئەنجوومەنی ئیداریی لیوا ئاگادار بکەن!

نووسراو لە ١٥ ی شەووالی ١٣٢٦، بەرامبەر ٢٧ی تەشرینی ئەووەلی ١٣٢٤ (ڕۆمیی = ٣ /١١ /١٩٠٨ " کەمال")./تەواو

مۆری....

موتەسەڕڕیفی سلێمانیی

(محەممەد تۆفیق)

• **وەڵام دانەوە...**

بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارە گەورەکانی ڕابوردوو، چەند بتوانم ورد دەنۆڕم و کورت دەئاخوێم:

١/١: قسە نووسراوەکانی سەرچاوەکانی (بەشی یێکەم)، ڕایگەیاندووە کە کۆمەڵەی ئیتتیحادو تەرەققی و (لقی سلێمانیی/"بێنیشانەکردنی کام دەستەی لق!!) پیلانیان لە

ێخانی بەرزنجەیی و شێخ سەعیدی حەفیدی سەرکردەیان کردووە، تا ئەوێکی –گۆیا–
ەر بە سولتانو خاوەند تواناو دەسەلات سستو لاواز بکرێ! بۆ ئەوەیش گەلێ
اتۆرەو قسە و قسەلۆکیان دواخستووە.
ردبوونەوە نیشانی دەدات کە – دیارە – ئەم بڕوبیانووانە ڕاست بن، بۆیێکا تادوای
قەومانەکە و تێداچوونی ئەو سەردارە، قسە و نێو و ناتۆرەی توند و تیژ بەردەوام
ووە. بۆ وێنە – بەر لەسەر هەلادانی کێشەی ناکۆکیی کورد و ئینگلیز – بالیۆزی
ینگلیز لە بەغداد، لە ڕاپۆرتی سیاسیی گشتی سالی ۱۹۰۹ ی خۆیدا و لە ڕاپێلەی باس
کردنی لیَقەومانەکەدا، ئەوها توند و تیژ و خراپ باسی مەرحووم شێخ سەعیدی کردووە
ی دەلێت: (هەرێمی مووسلێ باری تەواو پەشۆکاو بوو. لەسەرەتای بەهاردا " لەنێوان
هێندێ پیاوی سوپا و لایێنگرەکانی پیرەمێردی کورد شێخ سەعیددا، ڕووداوێ قەوما کە
بەرێگەوە بوو بەرەو ئەستەنبوولێ بچێ تا لەسەر تاوانەکانی و تالان و برۆ حسابی لەگەلێ
بکرێ کە لە لیوای سلێمانییدا کردبووی و هیچی لێ نەپێچرابووەوە!!" وێڕای ئەو
کەلەپچانەی لە مەچەکی توندکرابوون، دەمەقالێ لەسەر ژنێکی چەکدار قەوما و بوو
بەهۆی کوشتنی خۆی و چل کەسی لایێنگری و یێکی لە کوڕەکانی، بەلام کوڕەکەی دی
" مەحموود " ڕێگەی ڕاکردنی درایێ تا بچێت بۆ کەرکووك و ئەم ببێ بە نیشانەیێ بۆ
کوردەکان و پەند وەربگرن تا نەخەلەتابن لەدووا ڕۆژدا کارێکی خراپ بکەن). {۹/ل۷۰
– ۷۱}.

۲/۱: بەڕۆشنایی باسە نووسراوەکانی بەشی یێکەم – وێڕای بەلگەنامەمان –
لەبارەی ڕێکخستنی پیلانەکە بە فەرمانی (ئیتتیحادییەکان) و جیَبەجیَکردنی لەلایێن
(هەرێمی مووسلی پارتەکە) و (لقی سلێمانیی پارتەکە) ش کە هەبووە، زۆر وێ دەچێ
کە باسەکە ڕاست بێ بەتایبەتی کە هێندە وردە باسی دی لە دوو تویێی باسەکان و
بەلگەنامەکاندا هەن، وەك:

(١). بڕیاردانی پێکهێنانی دەستەییێکی لێپرسینەوە لە مزگەوت و تەکیەکان — ورد بنۆڕە نێوی خانەقا نەهاتووە — کە بەدەست کەسانێکەوە بوون و کەلکیان لێ وەرگرتوون! جێگەی باسە گەلێ سەرچاوەی مێژوویی دەگێڕنەوە کە شێخانی بەرزنجەیی لەژێر سێبەری دەوڵەتی عوسمانییدا —بەتایبەتی بە فەرمانی سوڵتانەکان— لە کۆنەوە تا سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، گەلێ زەوی و زار و ڕووبار و چەم و گوندیان — لەسەرەتادا بەبێ تاپۆ — بۆ بڕاوەتەوە.

هەڵبەت — با مەبەستەکە ڕووالەتێکی قانوونیی هەبووبێ — دیارە هرووژاندنی ئەو باسەو تێکەوتنی (پێشنیازی لقی سلێمانیی پارتەکە)و تێهەڵکیشکردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی ئیداریی و لیوا و سووربوونی موتەسەڕڕیفییەت لەسەر باسەکە و ئەنجامی، ئەمانە بەڵگەی ساخن بۆ ڕاستیی پیلانەکە!

(٢). دامەزراندنی دەستەی لێپرسینەوە لە ٣ /١١ /١٩٠٨ دا وەك نزیکە لە مێژووی دامەزراندنی (دووەم دەستەی لقی سلێمانیی پارتەکە) لە ٢٠ /١٢ /١٩٠٨ دا، هەروەها دیاربوونی (ڕستەییێکی ڕوون) کە دەڵێت: (ئامۆژگاریش — بەسەر ئەندامەکاندا —بەش کراوە!!). هەروەها نێوهاتنی بازرگان، ڕۆشنبیر، ئەفسەرێکی وەك (فەهمی ئەفەندیی وەکیلی تابوور ئاغاسیی) چ لە دەستەی دووەمی لقەکەدا، چ لە یاداشتی باس کراوی شێخ ڕەئووف حەفیددا، دیسان بەڵگەیە بۆ ڕاستیی باسەکە!

(٣). یێکەم دەستەی لقی سلێمانیی دامەزراو لە ٢٤ /٧ /١٩٠٨ دا کە (پێشنیازی بۆ موتەسەڕڕیفییەتی سلێمانیی کردووە بۆ پێکهێنانی دەستەییێکی لێپرسینەوە) ئەمیش وەك دەستەی دووەمی لقی سلێمانیی پارتەکە، تێکەڵی باسەکەیە و بەشدارە بە ئەمەشدا ڕوونە کە (ئیتتیحادییەکان) لە زووەکەوە خەریکی چنینی پیلانەکەن کە سەرئەنجام لە ٥ /١ /١٩٠٩ دا لە بازێڕی مووسڵدا بەتەواوەتیی جێبەجێکرا!

## ٢. دیارنەبوونی نێوی مەحموود پاشای جاف!!

لە باسەکانی بەڵگەنامەکاندا — هەرسێیان — هەرگیز نێو و نیشانەییێکی مەحموود پاشای جاف و باسی پێوەندییەکیٚ بە ئەم لێقەومانەوٚە دەرنەکەوتووە.

ئەز چەند ورد دەبمەوە، دڵنیام — وێڕای ئەوەی سەرچاوەی بەڵگەدار و باوەڕ پیٚکراوی ئەوتۆ ڕاست و ڕەوان بەدەستەوە نییە کە هاریکاریی مەحموود پاشای جاف و ئیتتیحادییەکان و لقی سلێمانیی ڕوون بکاتەوە — مەحموود پاشای کوڕی محەممەد پاشای سەرخێڵی نێودار و توانای جاف، چەند لەلایێن دەوڵەتی عوسمانیی و بەتایبەتیی لەلایێن سوڵتانەوە ڕێزی گیرابیٚ و پایە و نیشانی خەڵات کرابیٚ، هێندەش پتر بەربەرەکانێی کراوە. لەلاییێکەوە چونکە ژێر و زیرەك و خاوەن هەستی بەرزی وڵاتپارێزیی بووە، بەڕادەییٚ هێندیٚ جار سەرپێچیی لە فەرمانی سوڵتان و والیەکانیشی کردووە.

بۆ ڕاستییش هێندیٚ سەرچاوەی بێگانە و خۆمانە شایێتی دەدەن:

مێژوونووسی سۆڤیەتیی — لازارێف دەگێڕێتەوە: (مەحموود پاشای سەرداری خێڵی جاف، هەمیشە لەگەڵ کاربەدەستەکانی دەوڵەتی عوسمانیی لە ناکۆکییدا بووە و دانووی لەگەڵیان نەکوڵاوە !). {١٠ /ل ١١٨}.

پیرەمێردی ڕۆژنامەوان — لەسەردەمی باسەکەدا نووسەری شێخ مستەفای نەقیب — لێی دەگێڕێتەوە: (لە ئەم هەموو تەجرەبە و چاوپیٚکەوتنی نەگبەتبی و سەعادەتدا، هات بوو بە خەیاڵیدا کە حوکوومەتی عوسمانیی حوکمی نەماوە، ئەو — پاشا — حوکوومەتێکی کوردیی تەشکیل بکا ! بە ئەو خەیاڵەوە هەرچیی نێودار و سەرکۆماری کوردستانی ئەم لایە هەیە، کۆی کردنەوە، لە ١ ی مایسی ١٣٠٩ ڕۆمیی /١٨٩١ ز.دا لە کەناری زەڵم کۆنگرەییێك بەستراو قەراریان دا کە بەڵیٚ هیچ مانیعێك نییە کوردستان حوکوومەت بیٚ!). {١ /ل١}.

مێـژوونووس محەممـەد ئـەمین زەکیـی دەبێـژێت، (مـەحمود پاشـایان کردبـوو بـە موتەسەڕڕیفی " ئۆرفە "، نیازی نەبوو بچێ، تا شەوێکی ڕەمـەزانی ١٣٠٦ ی کۆچیی — ١٤ ی مایسی ١٣٠٥ ی ڕۆمیی /١٨٨٩ ز لە ماڵە گـەورەی کـەناری زەڵـم مـەحموود پاشـا ئیقناع کرا کە بچێ بۆ ئەستەنبوولْ. هـەر ئـەو شـەوە دوای پارشـێو سـواربوو، ڕۆیـی... کەچیی لە ١٨٩٢ز.دا، لە ئەستەنبوولْ ڕایکرد و بـە ڕێگـەی " بـاکۆ " دا هاتـەوە !). {١ /ل١}.

لـەلایێکی دیـەوە چـونکە دەوڵـەتی عوسمـانیی بـۆ لاوازبـوونی خـۆی و تـەبایی نێـو خێڵەکەیشی، تێکۆشاوە. بۆییێکا لـە سـاڵی ١٨٨٩ ز.دا لـە سـەرۆکاییێتی خێڵـی جـاف و قایمقامیـەتیی بـاژێڕۆکی هەڵەبجـەی خسـتووە و عوسمـان پاشـا — بـرا پچـووکتر— ی لەجێگـەی دانـاوە ! هـەروەها چـەند جـارێکیش ڕاوودووی نـاوە بـە ڕادەیـێ لەشـکری خسـتووەتە دووی و خـزم و خۆیشـی لـێ کـراوە. بـەکورتیی دەتـوانم بلـێم پێوەنـدیی مەحموود پاشای جاف و دەوڵـەتی عوسمـانیی لـە هەڵکشـان و داکشـاندا بـووە. بۆییێکا چاوەنۆڕ دەکرێ لە پێوەندیی بە نەیارەکانی سوڵتانەوە هـەبووبێ! ڕاستییەکەیشـی در. حەسەن جاف — لەلێکۆڵینێکی خێرادا — ئەو پێوەندییەی دەسەلمێنێت کـە دەڵێـت: (وا دیارە مەحموود پاشا لەگەڵ ئەو کۆمەڵە سیاسیەنهێنانەدا —وەك ئیتتیحادو تـەرەققیی— پێوەندیی هەبووە ! !) {٧/ل٦٩}.

بەڵام هەر در. حەسەن جاف ڕووی پێوەندیی مەحموود پاشای جـاف لـەدووای سـاڵی ١٩٠٨ـەوە دەنوێنێنێتو دەبێژێت: (پاش لەسەر تەخت داگـرتنی سـوڵتان عەبدولحەمید لەسـاڵی ١٩٠٨ ز.دا مـەحموود پاشـای هەمیشـە دژی ڕژێمـی ئیسـتیبدادیی بـووە، بەتایبەتیی دووای ئەوەی حیزبی " ئیتتیحاد و تەرەققیی " دەست بە زوڵـم و زۆرداریـی دەکـەن و هـەر بـەڵێنێ بـە کـورد و میللـەتانی دیـان دابـوو بـە درۆ دەرچـوون و ئیـدی مـەحموود پاشـا لـە ئـەم قۆناخـەدا هـەوڵی داوە یێکیـێتی و یێکـدڵیی لـەنێوان سـەرۆك هۆزەکان و پیاوە ماقووڵانی کورددا پێك بهێنێ بۆئەوەی ماف کورد بپچڕێ! یێکێ لە ئەو

نامانەی بۆ ئەو ئامانجەی بۆ حاکمی بانەی نووسیی بوو، دابووی بە عەلی بەگی ڕۆستەم بەگی خزمی خۆی کە دایکی لە بەگزادەکانی بانە بوو.. تورکەکان لە جێگایێ ئەم نامەیان بەدەست عەلی بەگەوە گرت بوو. لەسەر ئەمە عەلی بەگیان دا بەمەحکەمەی مووسڵ. ئەگەر " ئیتتیحادییەکان " نەڕووخابان عەلی بەگ و مەحموود پاشا تێدا دەچوون!!). {٧/ل٧٨}.

لەمەڕ پێوەندییەکانی نێوان مەحموود پاشای جاف و شێخ سەعیدی حەفید و شێخ مەحموودی کوڕیشیەوە، چاکترە لەپێشدا تەماشای نووسینەکانی در. حەسەن جاف بکەین.. ئەو دەبێژێت: (وەك هەموو سەرچاوەکانی مێژوو دەریدەخەن، ململانێیێ لەسەر دەسەلات و سەرۆکایێتی لەنێوان جاف و بنەماڵەی شێخاندا هەبووە، بەتایبەتیی لەسەردەمی شێخ سەعید و شێخ مەحموودی کوڕیدا کە ویستوویانە دەست بەسەر هۆزی جافدا بگرن و بیانکەن بە هێزێ بۆ پاڵپشتی دەسەلاتی خۆیان. ئەمەش دووای ئەوەی کە دەسەلاتی شێخان بوو بە خاوەندی زەویٰ و زار!). {٧/ل٩١-٩٢}.

هەروەها در. حەسەن پتر دەڵێت: (مەحموود پاشا لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفید نێوانی خۆش نەبووە. لە حەقیقەتدا هۆی دووبەرەکیی سەرۆکەکانی هۆزی جاف لەگەڵ شێخ مەحموود لەسەر نوفووز و ئەرز و ئاو بووە، نەك لەسەر کوردایێتی!) ل{٧/ل٩٠}.

دەی ئایا چاوەنۆڕ دەکرێت بەڕاستیی مەحموود پاشای جاف پێوەندیی بە (لقی سلێمانیی) کۆمەڵەکە و (لێقەومان) ەکەوە هەبێت؟

ڕاستییێکەی — وەك زووتر گوتم چ بەڵگەنامەیێ بەدەستەوە نییە! — چاکترین سەرچاوەییێکی وردبین کە وەلامێکی بەدەستەوە بیٚ، خاوەندی (گەشتی خۆگۆڕیویٚ بە ولاتی نێوان هەردوو ڕووبارو کوردستاندا — س ١٩٠٩) میرزا غولام حسێن شیرازیی "سۆن Soane" ە کە دووای لێقەومانەکەی شێخان و لە مایيسی ١٩٠٩ بەدوواوە هاتووە بۆ دیدەنیی ئەم نێوچەیە و بە سلێمانیی و شارەزوور و هەڵەبجەدا گەڕاوە!

ئەم کابرا نهێنبڕە بەهیچ جۆرێ قسەی لەمەڕ پێوەندیی مەحموود پاشای جاف و (کۆمەڵە – پارت) ی نێوبراو و (لێقەومان) ەکەی شێخان نەکردووە و هەربەتەنێ هێندەی ڕاگەیاندووە، گۆیا کوشتنی شێخ سەعید (بە هرووژاندن – ئیستیفزاز – ی بازرگانەکانی سلێمانیی بووە !). { /ل٢٤٥}.

ئەدی چۆن نێوی (مەحموود پاشا) یان (مەحموود پاشای جاف) کەوتووەتە سەر زار و تێکەڵی ئەم باسە بووە؟

ڕاستییەکەی یاداشتەکانی شێخ قادری حەفید – م. ر. هاوار بە ئاڵۆز و تێکەڵ و پێکەڵیشی زانیوە – دەگێڕێتەوە: (.. عەلی سەعید بەگ – لەسەرای مووسڵدا – دەرگای داخست و تۆفیق بەگی تابوور ئاغاسیی تکای لێکرد کە دەرگا بکاتەوە، بەڵام هەر نەیکردەوە و عەلی بەگ گوت بووی، شێخ سەعید ئەو پیاوەیە کە لەسەر ئەهالیی – گوندیی– چنگیان مەحموود پاشای مودیری سرووچك شاربەدەر دەکا؟) کە ژنبرای موتەسەڕڕیفی ئەوکاتەی سلێمانیی بووە ! {١١/ل١٥١–١٥٢}..

کەواتە زۆر وێ دەچێ نێو و تێکەڵیی (مەحموود پاشا ! !) لە ئەو کەسە و ئەو قەوماوەوە داکەوت بێت بەتایبەتی کە بەڵگەیێکی بەنرخ بەشێکی قسەی (سۆن Soane) ە و لەمەڕ ئەو (موتەسەڕڕیفەیە) کە لە ڕاپێڵەی باس کردنی هاتنی والیی مووسڵ بۆ سلێمانیی و دووای لێقەومانەکە، باسی دەگێڕێتەوە و دەبێژێت: (والیی مووسڵ هاتووە بۆ سلێمانیی بۆ لێپرسینەوەی دووباس.. یێکەم: کۆشش بۆ ناسینەوەی ئەو ئاژاوە و پەشێویەی –دووای لێقەومانەکە– لەئەو بازێڕەدا لەنێوان بازرگانەکانو شێخاندا ڕووی داوە !... دووەم: سزادانی ئەوانەی دەستیان لەموتەسەڕڕیفیان کردووتەوەو لەئەوەشدا بووە سەری تێ بچێ!). {٥/ل ٢٤٦}.

شایانی باسە، بەقسەی (سۆن Soane) شێخان تاوانبار کراون بە پەلاماردانی موتەسەڕڕیف، ئەویی ڕاگۆسترایەوە و یێکێکی دی هاتووەتە جێگە !

ڕای ئەو باسانەش چ شتێکی دی لەبارەی مەحموود پاشای جافەوە بەدەستەوە نییە
نیامان بکات کە (سەرۆکی لقی سلێمانیی کۆمەڵ – پارت) ەکە بووە، بەڵام ئەگەر
و، واتە لەگەڵ دەست بکاربوونی "ئیتتیحادییەکان" شوێن و پایەی ڕەسمیی بەرزتر
روایە، ئەوە دەناسرایەوە و بەلایێنی کەمەوە – ئەگەر نەشکرابا بە ئەندامێکی
جلیسی مەبعووسان یان نەکرابا بە موتەسەڕڕیفی سلێمانیی ! ! – دەبوو بکرابایەوە بە
یمقامی هەڵەبجە ! ئەمەش هەرگیز ڕووی نەداوە و (سۆن Soane) هەر عوسمان پاشای
ە قایمقامی هەڵەبجە و شارەزوور ناسیوە و (مەحموود پاشا) ی برایشی لەڕیزی
ەسەلات و توانای ڕەسمیانەی براکەی دانەناوە. وێڕای ئەمەش (سۆن Soane) هەرگیز
ـەیێکی لەمەڕ پێوەندیی خراپی جافان و شێخان و ئەو (لێقەومان) ە نەکردووە !
کورتیی – لەگەڵ نەبوونی چ بەڵگەنامەیێکی ڕەسمیانە و سەرچاوەی ڕاست و باوەڕ
ێکراو – ئێستە بەهیچ جۆرێ پێوەندیی مەحموود پاشای جاف بە (لقی سلێمانیی
ەمەڵەی یێکگرتن و پێشکەوتن) ەوە پەسەند ناکرێت و ناشچێتە خانەی باوەڕەوە.
تایبەتیی کە زۆربەی سەرۆکو چەند ئەندامی کۆمەڵەکەش بە بەرچاوەوە دیارن !

## ئەنجامی گشتیی

١. ساخ بووەوە کە دوای ڕوودانی – مەشرووتە – شۆڕشە سپییەکەی ٧/٢٣
١٩٠٨ بە بیستو پێنج ڕۆژ، یێکەم دەستەی (لقی سلێمانیی کۆمەڵەی یێکگرتنو
ێشکەوتنی عوسمانیی – عثمانلی اتحاد وترقي جمعیتی) لە ١٩٠٨/٧/٢٤ دامەزراوەو
ووەم دەستەش لە ١٩٠٨/١٢/٢٠دا. دیاریشە بەشێوەی دانرانو دامەزراندن – نصب
نعین – دەستەکانی ڕێبەریی کۆمەڵەکە لەلایێن (دەستەی متمانە پێکراوی هەرێمی
ووسڵی کۆمەڵی یێکگرتن و پێشکەوتنی عوسمانیی /عثمانلی اتحاد وترقی جمعیتی –
وصل ولایتی هیئة مرخصە سی) یەوە فەرمانی پێ دراوە و (بەڵگەنامەی دووەم
ەستە) ش بەڵگەی تەواوە ! یێکەم دەستە (مۆری لقەکە و نیوی سێ ئەندام)ی

ئاشــکرایە. بەڵگەنامــەی دووەمــیش، (نێــوی حــەوت ئەنــدام)ی دەســتەی دووەم دەسەلمێنێت و نێوی یێکەمیش لە هەردوو دەستەکەدا، بازرگـانی ناسـراو حـاجی ئاغـا فەتح اللەیە کە زۆر وێ دەچێ خـۆی سـەرۆکی دەسـتەی دووەمـی لقەکـە بـووبێ ئەگـەر نەڵێم سەرۆکی دەستەی یێکەمیش بووە..

٢. بــەهۆی بەڵگەنامــەی تــورکیی زمانەکــەی موتەســەڕریفییەتی ســلێمانییەوە — هەروەها بـەهۆی باسـە نووسـراوەکانی هێنـدێ سەرچـاوە وە— ڕوونـە کـە بـە فـەرمانی (ئیتتیحادییــەکان) و (هــەرێمی مووســڵی کۆمەڵەکــە) و بەشــداریی موتەســەڕریفییەتی ســلێمانیی بیــانووگر، ئــەوە دیــارە (هــەردوو دەســتەی لقــی ســلێمانیی) بەشــدارن لــە (لێقەومانەکــەی شــێخانی بەرزنجــەیی) دا کــە لــە بــازێڕی مووســڵدا دووا گــوژمی بــە کارەساتێکی خوێناویی تەواو بوو!

٣. ساخ نەبوونەوەی تێکەڵیی مەحموود پاشای جاف لە (هـەردوو دەسـتەکەی لقـی سلێمانیی کۆمەڵەکە) و لە (لێقەومانەکەی شێخان) دا!

## پەراوێز

{١}. ڕۆژی ١٨/٤/ ١٩٩٨ زەرەنگەری ناسیاوم کاک کەمال حەمـە عـەلی خـەڵکی سـلێمانیی لە ئەو چوار مۆرەی ئاگادار کردم و دوایی (شێوەیانی بە ئیستەمپا لەسەر قاقەز) بـۆ وەرگـرتم و پێشکەشی کردم. گوتیشی گۆیا بەر لە سـاڵێ ئـەو (مۆرانـە) ی لـە یێکێکـی خـەڵکی سـلێمانیی کڕیوە — مۆرەکان پێکەوە گرێ دراو بوون و لە پریاسکەیێکدا بـوون — و نـاردوونی بـۆ لۆنـدۆن بۆ فرۆشتنیان.

من پێم وەیە ئەو ناسیاوە مۆرەکانی لە گەنجینەی نەوەکانی حاجی ئاغا فـەتح اللـە کڕیـوە و نیشان بە ئەو نیشانەیەی کە کاک فەرەیدوون تۆفیق حـاجی ئاغـا فـەتح اللـە (بەڵگەنامـەیێکی تـورکی زمـان) ی لـێ سـەندمەوە — مـن هێشـتا سـەرنجم نـەدابوو — گۆیـا لـەلایێن سـوڵتان عەبدولحەمیدەوە نێردراوە و (بە ئاوی زێڕ نووسراوەتەوە ! !).

دۆستم عەبدوررەقیب یووسفی زانا ئاگاداری کردم کە ئەو زەرەنگەرە ناسیاوە مۆرەکانی نیشان داوە و داوای پێنج هەزار دیناری لێکردووە ! ! هیوام بەخوایە مۆرەکان نەکەوتبنە دەستی ناحەز و بێگانەییکەوە و لەنێوچووبن!

{٢}. ئەم بەڵگەنامەیە و ئەوی دی موتەسەرریفییەتی سلێمانیی هەردووکیانم لە مانگی ئابی ١٩٨٨ دا لە سلێمانیی لە کاك فەرەیدوون تۆفیق حاجی ئاغا فەتح اللەم وەرگرت. هەر یێکەیان لەسەر قاقەزێکی زەردباوی ٣١ X ٢٠ سم بە نووسینێکی ئاسایی نووسراون.

مەتنە تورکیەکانی هەردوو بەڵگەنامەکەش لە ٣ /٦ /١٩٩٦ لە هەولێردا دۆستم عوسمان محەممەد رەشاد موفتی بۆ منی کرد بە عەرەبیی و خۆمیش کوردییەکەیم دارشتووە سوپاسی ئەویش دەکەم!

{٣}. نووسەر جەمال بابان لە (بابان فی التأریخ ومشاهیر البابان – س ١٩٩٣ /" بابان لە مێژوودا و بەنێوبانگەکانی بابان ") دا دەڵێت گۆیا: عەزمی بەگ لە ئەستەنبووڵدا گەورە بووە وساڵی ١٩٠٩ ز بە یێکجاریی هاتووەتەوە بۆ سلێمانیی! ! هەڵبەت ئەم هەواڵە راست نییە. وێراش هەمان نووسەر چ هەواڵێکی ئەو زاتە و (پێوەندیی بە لقی کۆمەڵەکەوە) باس نەکردووە !

جێگەی باسە ئەو نووسەرە تەمەنی عەزمی بەگی بە هەشتا ساڵ و ساڵی ١٩٥٠ یشی بە ساڵی کۆچی ماڵئاوایی ئاشنا کردووە !

{٤}. بۆ چەسپاندنی نێوەکان، رۆژی ٤ /١٠ /١٩٩١ لە سلێمانییدا پرسم بە مامۆستای کۆچ کردوو فوئاد رەشید بەکر کرد. (لەنێو دوو کەواندا نێوەکانم داناوە !).

{٥}. بنچینەی نێوناسی (کەرکووکلی زادە – کەرکووکیی) بە گێرانەوەی جەمال حەکیم – ناسراو بە جەمال ئاغا – ی نەوەی ئەو خانەدانە، لە بۆنەییکەوە هاتووە کە ئەمەیە: نەنکی حاجی مەلا سەعید – دایکی حەمە کەرکووکیی – ماوەیێ سکی نەکردووە و منداڵی نەبووە. ئەویش بۆ پیرۆزیی چووەتە سەر " بابە گورگور " لە کەرکووك. دوایی خوا کورێکی داوەتێ و نێوی " حەمە " یان بەبۆنەی چوونە کەرکووکەوە لێناوە و ئیدی بە (حەمە کەرکووکیی) بانگ کراوە. ئیدی لە ئەمەوە حاجی عەبداللەی کوری و خزمانی دی بە (کەرکووکیی) نێویان دەرکەوتووە، دەنا خانەدانەکە لە قەڵاچوالانی کۆنە پێتەختی باباندا ژیاون و لەگەڵ بنیاتنانی (سلێمانیی) ش هاتوونەتە خوار و یێکێکن لە هەرە ناسراوە دیارەکانی سلێمانیی کە خەریکە ونیش دەبن.

## تەماشاکراوەکان

(١). پیرەمێرد: حاجی تۆفیق. (ژین – س ٢٣. زژ ٩٥٣ پێنجشەموو ٣ ی شوبات ١٩٤٩ /سەرگوتار: دووبارەی تەئریخ).

(٢). حلمی: ڕەفیق. (یاداشت – بەرگ ١. بەغداد ١٩٥٦).

(٣). در. رامزور: ارنست. أ. (ترکیا الفتاة والثورة ١٩٠٨. ترجمة در. صالح أحمد العلي. بیروت ١٩٦٠).

(٤). زکی: محمد أمین. (مشاهیر الکرد وکردستان. ج٢. بغداد ١٩٤٣).

(٥). سۆن: میرزا غلام حسین شیرازی. (رحله متنکر الی بلاد مابین النهرین وکردستان Through Mesopotamia and Kurdistan in Disguise, E. B. Soane ترجمة فوئاد جمیل. ج ١. بغداد ١٩٧٠).

(٦). العزاوي: عباس المحامي. (العراق بین احتلالین. ج ٧. بغداد ١٩٥٥).

(٧). فتاح بك: کریم بك. (تەئریخی جاف. لێکۆڵینەوەی در. حەسەن جاف. بەغداد ١٩٥٥).

(٨). قادر: در. جبار. (ڕۆژنامەی کورد و چەند زانیارییەکی نوێ /کاروان: ژ ٧٤. س ١٩٨٥).

(٩). قزانجی: فؤاد. (العراق في الوثائق البریطانیة ١٩٠٥–١٩٣٠. بغداد. ١٩٨٩. " ترجمة").

(١٠). لازاریف: م. (کێشەی کورد /وەرگێڕانی در. کاوس قەفتان. بغداد ١٩٨٩).

(١١). هاوار: م. ر. (شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب ١. لۆندۆن ١٩٩١).

ڕۆژنامە و دیدار و بەڵگەنامە:

(١٢). امید استقلال – ژ ١، ٢٠ /٩ /١٩٢٣ سلێمانیی.

(١٣). کرد تعاون و ترقی غزتەسی – نومرو: ١، ٩ /١١ /١٩٠٨ ئەستەنبووڵ.

(١٤). هێندێ دیدار و بەڵگەنامەی – تورکیی زمانی عوسمانیی–بەردەستم و چەند دانراو و ڕۆژنامەی دی!

# ٣
# پیرەمێرد
# پیری ڕۆژنامەوانان

## پێشەکیی

تۆفیق مەحموودی نەوەی کوڕە ئاغا (٨٦٧—١٩٥٠ز)، کۆنە فەقێ، حاجیی، نووسەرێکی دیوانیی، پارێزەر، موتەسەڕریفی عوسمانیی، شاعیر، ڕۆژنامەوان، ساڵی ١٩١٨ز —موتەسەڕریفی ئەماسیە بوو—خۆی نێونابوو (پیرە کورد — تۆفیق)، دوای نەفرەت لێکردنی پێتەختی سوڵتان و چوونەوە ئامێزی سلێمانیی کۆنە مەڵبەندی بابان، لە ساڵی ١٩٢٥ بەدواوە و تا نۆشینی شەرابی مەرگ، خۆی نێونابوو (پیرەمێرد)، داخۆ لە خوتو خۆڕایی، بەڵام بە ئاشکرا نووسیوییێتی، (من پیری ڕۆژنامەوانان — شێخی سوحوفییینم؟) {٩ /ل٢}.

خەبات و ڕەنجی ساڵانی ٩٢٦—١٩٥٠ ی تۆمارە.. گەنجینەی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی، بەتایبەتیی چاپخانەکەی و هەردوو ڕۆژنامە سەربەخۆکەی، (ژیان و ژین) شاهید و مۆری ئەبەدبن بەنێوچەوانی مێژووەوە.. ناحەزانی ئەو خەبات و ڕەنجە، بیروباوەڕی کوردایێتی، بەهرە و بەرهەمی ئەدەبیی پیرەمێرد، هێشتا — تا ئەم هەل و هەڵکەوتە — گەلێ چاویان پێ هەڵنایەت! ! بۆ ئەوە هەرگیز ناڵێم ئەفسووس... بەڵام هەزار ئەفسووس کە لە نێو خۆماندا کەسانێ هەن — وەك بە گوێی خۆم بیستوومە—هێشتا نکوولیی لە خەباتی ڕۆژنامەنووسیی دێرینی دەکەن، تەنانەت لاف لێ دەدەن، گۆیا: (پیرەمێرد لە بزاڤی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی — ئەستەنبوولێ — دا دەوری نەبووە ! !)

ڕەنگبێ ببێژرێ کە ئەوە مایەی دیواری پۆلاییی نەزانینە، بەڵام خۆ لە ئەم چەند ساڵانەی دواییدا هێندێ نووسەری ڕاستیی پەروەر، تا ڕادەیێ ڕاستییەکەیان نواندووە و ئەو جۆرە بڕوبیانووانەیان داوەتە دواوە !

ئێستە—لەیادی ساڵڕۆژی نەوەدو هەشت ساڵەی تەمەنی ڕۆژنامەنووسیی کوردییدا— وادەی خۆییێتی وەڵام بدەینەوە بە ڕووداو بەڵگەی دیار و ڕاست بکەین بە شاهید و ڕاستیی مێژوو چەسپتر بکەین و بیسەلمێنین کە بەڕاستیی (پیرەمێرد پیری ڕۆژنامەوانان) بووە !

## بەشی یێکەم

### ١. شاهێدیی پیرەمێرد لەخۆی

دوای گەڕانــەوەی بــۆ کوردســتانی باشــوور و گەییشــتنەوە ســلێمانیی لــە شــەوی ١٩٢٥/١/٣٠ دا {٥/ل٢}، خــۆی لەڕۆژنامــەکانی (ژیــان، ژیــن –١٩٣٤–١٩٤٩) دا، چــەند جارێ لەمەڕ کردەوەی ڕۆژنامەنووسیی و پێوەندیی بە دووەمــین ڕۆژنامــەی کوردییــەوە: (کورد!) ئەوها شاهیدیی لە خۆی داوە:

١. لەســاڵی ١٣٢٤ ی ڕۆمییــدا /١٩٠٨ ز، کــە کۆمــەڵی کــوردان لــە ئەســتەنبووڵدا کۆبوونەوە، جگە لە سەیید و مەلا و بەگ، سەد و هەڤدە کەسیان لـە پاشـایان تێدابوو. غەزەتەیێکیان بەناوی (کورد) ەوە دەرهێنا. لەنوسخەی یێکەمدا مەقالەیێکی ئیسماعیل حەققی بەگی بابانی تێدابوو، نووسیی بووی (بـۆ کوردستان لـە پـێش هـەموو شتێکدا مـەعاریف، خوێنـدەواریی) حـەتتا بـە تەئکیـد وت بـووی، (ئـەووەڵ مـەعاریف، دووهـەم دیسان مەعاریف، سێهەم باز مەعاریف!). {٣/ل١}.

٢. ئێمە لەسەرەتای تەشکیلی (جەمعییەتی کورد) ەوە لـە ئەستەنبووڵدا، ڕوکـنی موهیممی جەمعییـەت و خاوەنـد و موحـەریری (غەزەتـەی کـورد) و عادەتـا تـەرجومانی ئەفکاری کوردستان بووین..هتد! {٦/ل١}.

٣. لە ئەستەنبووڵدا ئەووەڵ غەزەتەی کوردیی کە دەرچوو، سـەر مەقالەکـەی بـەر من کەوت بوو. لەوێدا وت بووم: (ئەم کوردە کە بە هەوەسـی خۆیـان گـەورەیی سوڵتان سـەلیمی یاوزیـان گرتـە ئەسـتۆ، خـەتی خوێنـدەوارییان، جەوهـەری تیغـی دەبـان و مەرەکەبیان ژاری دووکەڵی قلیان بوو.. هتد). {٦/ل ١}.

٤. بەوە دەنازم کە (غەزەتەی کورد) لە ئەستەنبووڵدا من خاوەند و سەرنووسەری بوۆم! {٢/ل١٣}.

٥. نۆبەرەی غەزەتەمان لە ئەستەنبووڵدا (غەزەتەی کورد) بوو کە ئیمتیازەکەی بەر من کەوت بوو! {٢ /ل ١٣-١٤}.

٦. من مەفتوونی زبانی فارسیم و کاتێ لە ئەستەنبووڵدا بووم، گەلێ خزمەتی غەزەتەی " شەمس"م دەکرد کە سەیید حسێنی ئێرانیی خاوەنی بوو. ئەو سەردەمە کە ڕۆژنامەی (شەفەق سورخ /شفق سرخ) و مەجەللەی (فەرهەنگ /فرهنگ) لە تاراندا دەردەچوو، من هەمیشە لە ئەستەنبووڵەوە مەقالە و شیعرم بۆ دەناردن بە ئیمزای (سلێمانیەلی تۆفیق) یاخود (س. ت)! {٨ /ل١}.

٧. لەپێش عومومی ئەم تەبەقەی ئێستایەی کوردەوارییەدا، ماخۆلانی کوردایێتی و قەومییەت و وەتەنییەتم کەوتە کەللەوە. لە ئەستەنبووڵدا نەعرەی وەتەنییم کێشا و لە فۆتۆگرافەکاندا کە دەمناردن بۆ کەس و کارم و ئێستاش لای جەمیلی خوشکەزام مەوجوودە، دەمنووسیی (أوج وطنمده أوجو شان روح روانم!)"١". ئینجا لە پایتەختدا (غەزەتەی کورد) م دەکرد و لە غەزەتەی (موستەووەر /مصور) میسردا و لە ڕۆژنامەی هەرە گەورەی پاریسدا (تان) و لە (شەفەق سورخ) و (فەرهەنگ) ی ئێراندا بانگی کوردیم دەدا و لە سەورەو (قۆمیتەی ئەرزرومی کوردان) دا لەگەڵ خالید بگ و یووسف زییا و دوکتۆر فوئاد و کەمالو لەخدمەت مەلا سەعیدی بەدیعولزەماندا ڕەنجم دەدا و ئیدارەی عورفییەی ئەستەنبووڵ بە ئیعدام مەحکوومی کردم! {١٠/ل ١}.

### ٢. شاهێدیی ژین: (١٣٣٤ ر /١٩١٨ز-ئەستەنبووڵ)

گۆڤاری تورکیی-کوردیی (ژین) ی ئۆرگانی نارەسمیی (کۆمەڵی پێشکەوتنی کوردستان) بوو. {١/ل١٠}. تۆفیقی کوڕی مەحموود - پیرەمێرد، لە ئەو هەلانەو لەسەرەتای ساڵی ١٩١٨ز.دا موتەسەرڕیفی بازێڕی "ئەماسیە" بوو {١١/ل٤١٩}، بە چوار ئیمزاوە: (سلێمانیەلی: تۆفیق، (س.ت.-سلێمانیەلی تۆفیق)، (محمود نژاد

تۆفیق)، سلێمانیەلی م. نژاد تۆفیق)، (پیرە کورد – تۆفیق) گوتاری کوردیی و تورکیی و شیعری بۆ نووسیوە ! !

جێگەی باسە، (مەحموود نەژاد تۆفیق) مانای: نەوەی مەحموودی بابی و (سلێمانیەلی م. نەژاد تۆفیق) یش مانای ئیمزاکەی پێشووە ! هەر ڕاییکیش بلێ (نەژاد) ی کوڕی دەگرێتەوە هەڵەیە چونکە کوڕەکەی ساڵی ١٩٠٤ ز لە دایك بووە و شانی ئەو توانای زانست وبەهرانە هەڵناگرێ!

بابەت و ئیمزاکانیشی لە ئەم ژمارانەدان:

١/٢: ژین – س١، ژ٤، ٢٨ تەشرین سانی ١٣٣٤ ر/١٩١٨ز.. ل١–٤ /گوتاری (کوردلر دائرلر: سلێمانیەلی تۆفیق).

گوتارە تورکیەکەیشی – وەك گوتارنامەیێ–دوای ڕستە گوتارێکی (کورد مناسبتیلە /–کورد بتلیسی) ی کەوتووە و لەسەرچاوە مێژوویییەکانی عەرەب و بیانەکانەوە، مێژووی کوردی ڕوون کردووەتەوە !

٢/٢: ژین–س١، ژ٦، ٢٥ کانوون ئەووەل ١٣٢٤ر..ل١٢–١٤/گوتاریێ– پێشەکیی و وەرگێڕان بۆ تورکیی – بەنێونیشانی (مکتوب منظوم – سلێمانیەلی تۆفیق). مەتنی بابەتەکەش شیعرنامەکەی (نالیی) شاعیرە بۆ(سالم) ی هاودەنگی و کوردییەکەیشی لە پاڵدایە.

٣/٢: ژین – س١، ژ٧، ٢ کانوون سانی ١٣٢٤..ل١–٤ /گوتارێکی کوردناسییە لەمەڕ مێژووی کورد و لەلاپەڕەی یێکەمدا ئیمزای (س. ت) و لە دوا لاپەڕەیدا (سلێمانیەلی تۆفیق) نووسراوە !

٤/٢: ژین: س١، ژ٨، ٩ کانوون سانی ١٣٣٥ر–١٩١٨ز.. ل١١–١٢/شیعرێکی تورکیی، (بر کُرد چوجغنك إحساساتی – سوگیلی کردستانمە – سلێمانیەلی مەحموود نەژاد) شیعرەکە هەستی منداڵێ بەنێوی " کوردستانی خۆشەویستم " ەوە دەگێڕێتەوە !

٥/٢: ژین–س١،ژ٢،١٠شوبات١٣٣٥..ل١–٥/گوتاری توركیی: (كورد بیوكلرندن: حەزرەت مەولانا خالید–سلێمانیەلی م. نەژاد تۆفیق).

٦/٢: ژین–س١،ژ١٢,٢٥ شوبات ١٣٣٥..ل٤–٨ /گوتاری توركیی بەنێونیشانی (كوردلردە وهبی زكا – پیرە كورد تۆفیق). بابەتەكەی لەمەڕ بەهرەی دەربەند فەقەرە دەدوێ. مەتنی شیعری (گلكۆی تازەی لەیل)ی بە كوردیی و بە وەرگێڕانی بۆ توركیی نیشان داوە!

---

## بەشی دووەم

## ( کورد ) دووەمین ڕۆژنامە و ( سلێمانیەلی تۆفیق )

### ١. وردبوونەوەییێکی خێرا!

نەوەی بەدرخان پاشای شۆڕشگێڕ و شەهیدو بزر، جووتە برا (میقداد و عەبدوڕڕحمان) ی نەتەوەپەروەر، وەستای بنیادی یێکەمین ڕۆژنامەی ئازادی کوردن. ڕۆژنامەی (کردستان:٢٢نیسان١٨٩٨-١٤ نیسان ١٩٠٢ن) {١٤/ل٣}. لە ئاوارەییدا دەنگ و ڕەنگی ناڕەزایی و داخوازی ماف نەتەوەی کورد بوو. پێتەختی عوسمانیی، ڕۆژنامەی کوردیی قەدەغەو تەنانەت هاتن‌و خوێندنەوەی (کوردستان)ی بەتاوان دەزانیی!

دوای هەلگەڕانەوە سپییەکەی تورکانی لاو و هەلکەوتنی ژینی دەستووریی، (مەشرووتە:١٠ تەمووز ١٣٢٤ ر — ٢٣ تەمووز ١٩٠٨) بارێکی نوێی پێشکەوتنخواز، کەشێکی خۆشیان هاتە پێشەوە.. دەیان کۆمەلەی سیاسیی، دەیان ڕۆژنامەی سەربەستی هەمە جۆرە دەرکەوتن. {١٦ /ل٢٢٤}. کوردە دلسۆزەکانی نەتەوە و نیشتیمان، لە ئەستەنبوولدا بەخۆکەوتن، بیروڕاو کۆششیان کۆ و یێکدگیر کرد. سەرئەنجام بەسەرۆکاییێتی شۆڕشگێڕی شەهید شێخ عەبدولقادری شێخ عوبێدوالڵەی نەهریی {١٢/ل٩} لە١٩/٩/١٩٠٨دا {١/ل٣٤} یێکەم کۆمەلی سیاسیی ئاشکرای کورد ( کورد تەعاون و تەرەققی جەمعییەتی) دامەزرا. {١٢/ل٩}. بۆ ئاشنابوونیشی ڕۆژی ٢٥/٩/١٩٠٨ لە ئەستەنبوولدا ئاهەنگێکی گێڕا، نزیکەی پێنج سەد کەسی ئەندامی چالاك و لایەنگر و دۆست و میوانی ئامادەبوون. نوێنەری بازێڕی " مووش " ڕەشید موفتی زادە، لە ئەو بۆنەیەدا گوتەییێکی داوە و گوتوویەتی، (لەبەر ئەوەی کورد وەك هەر میللەتانی دی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیی لەسایەی ڕژێمی نوێدا ماف یێکسانیی و پێشکەوتن و خوێندن و سەربەستیی پێ براوە، ئەوا خزمەت کردنی دەستوور و خەبات بۆ چەسپاندن و جێبەجێبوونی ئەرکێکی مێژوویی سەرشانی کوردە !). {١٢/ل٩}.

پێڕەوی کۆمەڵەکەش ئەوە دەنوێنێ کە (ئامانج فەرمانڕەوا بوونی دەسەڵاتی قانوونی ئەساسیی و پێشکەوتنی نەتەوەی کوردە!). {١٢ /ل٨}.

لە ئەو پێناوەشدا کۆمەڵەکە کرد و کۆشی نواندووە و لەچەند بازێڕێکی وەک دیاربەکر، بەدلیس، مووش، ئەرزرۆم و هتد.. لقی هاویشتووە. {١٢/ل٩}.

نووسەری ئەرمەنیی، شاهبازیان خاوەندی (مێژووی کوردو ئەرمەن– س١٩١١). {١٢/ل٩–١٠}و محەممەد ئەمین بوزئارسەلان {٢/ل٢٤} دەگێڕنەوە: (کۆمەڵەکە ڕۆژنامەیێکی حەوتۆیی تورکیی – کوردیی بەنێوی " کورد " و گۆڤارێکی بەنێوی "کوردستان"و قوتابخانەیێکی کوردیی –بۆ زارۆیان– لەئەستەنبووڵدا دامەزراند "١").

سەرچاوەی دی ڕادەگەیێنێ کە دوای کەمتر لە ساڵێ کە ڕووی ڕاستەقینە و ناحەزانەی تورکانی لاو دەرکەوت، ئەم پەنجەرە ڕووناکانە بەر شاڵاوی یاخیی بوونە سەربازییەکەیان کەوتن و هەموو داخران. یاخی بوونە ناسراوەکەش بە ڕۆم ئێلی: ٣١مارت ١٣٢٥ر/١٣نیسان١٩٠٩ ز، زۆربەی ئەندامەکانی دەستەی دامەزرێنەر و لایەنگرەکانی کۆمەڵەکە و پیاوە بەنێوبانگەکانی کوردی بەندکرد، هێندێکیشانی داوەتە دەست دادگای عورفیی و لە"زیندانی بلووکی بەکر ئاغا " دا توندی کردن! {١٥/ل١١} "٢". یێکی لەنێو بەندییەکاندا (پیرەمێرد) خۆی بووە کە یادی کردووەتەوە و لیی نووسیوە: (... کە لە زیندانی ژێر زەمین بلووکی بەکر ئاغای ئەستەنبووڵدا گیرا بووم، بیم – ترس – ی خنکاندنم بوو!). {٧ /ل٢}.

نووسەری ئەرمەنیی شاهبازیان، هەر شەش ژمارەی ڕۆژنامەی (کورد) ی بەسەر کردووەتەوە و نێوی هێندێ نووسەر و مەتنی چەند کەرتە بابەتێکی نواندووە، بەڵام وەک ڕایگەیاندووە کە بارستی ڕۆژنامەکە هەشت لاپەڕەی چوار ستوونییە، ڕوونی نەکردووەتەوە کە تا ڕاگیرانی چەند ژمارەی لێدەرچووە! باری سەرنجیشی هێند خێرایە وێ دەچێ کە هەر گوتارە تورکییەکانی ڕۆژنامەکەی خوێندبێتەوە!

نووسەرانی خۆمان، هەر لە عەلائەددین سەججادیەوە تا دەگاتە لێکۆڵەکانی دواتر (دیوانی پیرەمێرد- س ١٩٩٠) هەواڵی هەڵە و ڕاست و ناتەواویشیان لەمەڕ بڵاوکردووەتەوە. ڕیزکردنی نووسینەکانی نووسەران لە ئەو بارەیەوە بۆ ئێرە زۆر دەکێشێت، بەڵام گرنگە ڕوون بێ لێکۆڵی دڵسۆز محەممەد ئەمین بوز ئەرسلان لەوڵاتی سویددا هەموو ژمارەکانی لەئەم دوا ساڵانەدا بڵاوکردۆتەوە..

ئێرە-بۆ من- بەشی هەموو وردە باسێکی دی کۆمەڵەکە و بەتایبەتیی باسی ئەو (یێکەم ژمارە) ناکات، بۆییکا بە ئەندازەی پێویست و مەبەست، سەرنجی ئەو ژمارەیە دەدەم و بە ئەم جۆرە:

١/١. ڕۆژنامەکە شێوەی گۆڤاری هەیە، بەئەوەی پەڕەی یێکەمی بۆ نێونیشانی ڕۆژنامەکە و پێڕستی گوتارەکانە بە زمانی تورکیی. لە بنیشەوە نووسراوە: (چاپخانەی سەعادەت) ی سلانیك چاپی کردووە! پشتی دوا لاپەڕەیشی هێندێ کورتە هەواڵی تورکیی کۆمەڵەکە و ئەندامەکانی لێنووسراوە، بەڵام قەبارەی نێو ڕۆژنامەکە هەشت لاپەڕەی چوا ستوونییە و حەوت لاپەڕ سێ ستوون کەمی کەمی بۆ گوتارە تورکییەکانە. یێك لاپەڕە و ستوونێ -هەمووی پێنج ستوون - بۆ بەشە کوردییەکەی کورمانجیی باکوور و باشوورە!

٢/١. دووهەمین پەڕە -ل١- بە زمانیی تورکیی و بە ئەم مانا کوردییەوە ئەوها خۆی دەنوێنێ: نێونیشانی ڕۆژنامەکە بە خەتێکی فارسیی، لە نێوەڕاستیشدا نووسراوە: (کرد تعاون ترقی غزتەسی/"کورد ڕۆژنامەی هاریکاریی و پێشکەوتن"). لە ئەم بەرو ئەوبەری یێکەم دێڕی ژوورووی ڕۆژنامەکەشدا مێژووی دەرچوونی نووسراوە: (١١ ذیالقعدة ١٣٢٦. جمعە ایرتسی " شەممە " ٢٢ تشرین ثانی ١٣٣٤ "ر" /٩ تەشرینی دووهەم ١٩٠٨ ز"). لەژێریانەوە لە ئەم بەرو ئەوبەردا نووسراوی تورکیی، ئەم مانایە دەگرێتەوە:

(هەڵبژاردەی کۆمەڵەکە: خاوەن ئیمتیاز و ڕێبەر و نووسەر — سلێمانیەلی تۆفیق... سەرنووسەر دیاربەکرلی ئەحمەد جەمیل.. ئیدارەخانە لە مەڵبەندی گشتیی کۆمەڵی هاریکاریی و پێشکەوتن. نرخی دانەیێ، ٥ غرشە !). ئەوجا لە خانەیێکی لاکێشی نێوان تەوێڵی ڕۆژنامەکە و گوتارەکاندا، بە تورکیی هەواڵ و ڕێبازی ڕۆژنامەکە بە ئەم مانایەوە، نووسراوە:

(ژمارە:١،جلد١،حەوتۆیی،ئایینیی،زانستیی، سیاسیی، ئەدەبیی، کۆمەڵیی !). هەر لە ئەم لاپەڕەیەدا — وەك پێڕستەکە نێوی پێشەکیی لێناوە — سەرگوتارێکی تورکیی و ئیمزا لێدراوی (تۆفیق) بڵاوە. گوتاری دووهەمیش — بەشێکی — پێڕەو و بەرنامەی کۆمەڵەکەیە !

٣/١. بەشە کوردییەکەی (ل٧—٨) بەسەر دێڕی تورکیی (کردجە لسانمز/زمانی کوردی) یەوە دوو گوتاری کورمانجیی باکوور و باشووری نواندووە ! (کرد نیك نصایحی/ئامۆژگاریی کوردیی — بەدیعولزەمان مەلا سەعید/نەوڕسی و گوتاری کۆمەڵیی، (ئەی گەلی کوردان — سەییاح ئەحمەد شەوقیی) ی گوتاری کوردی باکوورن و بەسەر دێڕێکی تورکیی (بابان کرد جەسی/کوردی بابان) یشەوە گوتارێکی بێئیمزا و شیعرێکی ئیمزا لێدراوی (سلێمانیەلی تۆفیق) بڵاوە ! گوتارەکە بۆ ئاشناکردنی بەرنامە و ئامانجی کۆمەڵەکەیە، شیعرەکەش سیاسییە ! هەردووکیش لەڕووی شێوە زمان و ڕێنووسەوە یێکن !

## ٢. مەتنی گوتار و شیعرەکە! "٣"

### ١/٢. گوتار ( مەقسوودی گردبوونەوەی جەمعییەت )

جەمعییەتی ئێمە نیزامنامەی بۆ هەموو تەرەفێ ناردووە. وەك لەوەدا نووسیویە، مەقسوودمان ئەمەیە، حوکمی قانوونی ئەساسیی "٤" کە لەگەڵ شەریعەتدا ڕێ دەکەوێ موحافەزە بکەین! ئەویی لازمە بۆ تەرەققیی قەومی نەجیبی کورد، هەمووی ڕێك

بخەین، مەعاریفیان، حاڵ خۆشییان، ڕێککەوتنی ناوخۆیان، ئاشت بوونەوەی لەگەڵ هاووەتەنیان، با خوسووس لەگەڵ (ئەرمەن) یان بێتەجێ! لەڕێی موحافەزەی دەوڵەت و میللەتی عوسمانییدا، بە عەزمێکی مەحکەمی دینیی، بەیێك و جوودیی میللیی ڕۆح ببەخشین!

ئەگەر لەپاش گردبوونەوەی مەجلیسی مەبعووسان ببین بە فیرقەی سیاسیی، گۆڕینی قانوونی ئەساسیی بەڕەنگێ قوبوولێ دەکەین، ئەو حەققەی مەقامی گەورەی خەلیفەی موسڵمانان و سەڵتەنەتی عوسمانییان نەگۆڕێ، هیچ میللەتێ خۆی لە میللەتێکی تر زیاتر نەگرێ!

جەمعییەتی ئیتتیحاد و تەرەققیی عوسمانیی ئەو دەستوورولعەمەلەی کە نووسیویە بۆ سەلامەتیی وەتەن، بۆ تەرەققیی هەموومان چاکە. ئێمەش وا دەچین بەڕێوە!

"تەواو"

" بێ ئیمزا "

## ٢/٢. شیعر " بێ نیشان "

ئـــەمڕۆ ڕۆژی جـــەژنی هەموومانـــە ســـەر بەســـەر
کـــوردیش لەگـــەڵ گـــەلان لـــە چـــلەخانە هاتنـــەدەر
سیی ساڵ "٥" بوو ڕۆژوو، ڕۆژێ بە ساڵێ لەبەردەچوو
ڕۆژووی حەرام بوو، خێری لەبەر شەڕ دەبوو بە شەڕ
مـەتبووع و تـابیع وەك مـەم و زیـن بـوون لـە ڕێگـەدا
گـورگ و چـەقەڵ لـە چـقڵی بەکرمەرگـەوەر بەدتـەر
میللەت نەدەنگ و ڕەنگی خەلیفەی دەبیی و دەبیست
مـەزڵووم نەحـەددی بـوو بـە شـکات دەنگـی بێتـەدەر
عـالیم کـە بـوو بـووە، خزمـی خـەزووری سـەپانی شێخ

کورد دەستی گرت بۆ نۆبەیی، نۆبەی نەکەوتەبەر
هەرچییەك بیوتایە ئەمن کوردم، ئەو دەمە
رێگەی " تەرابولس " ی بە پێخواسیی دەگرتەبەر
تەعنەیان دەدا لە کورد کە شەقین، نابنە وەلیی
تا شەق بوو قەبر، کورد و شەقە شەقی هاتەدەر
بێدەسەلات و بەستەزبان بووین لە عالەما
هیچ چارەمان نەمابوو، دوعامان دەکردبەر
تیری دوعا کە گرتی کورتی کرد، ئێستە سەر دەکا
مەیدانی کورد کە کورت بوو، بووە دەشتی رێبەر
وەلحاسڵ هەر چ بوو، هەموو تەی بوو، شوکری خوا
ئێستە هەموو براین، گلەیی با بچێتەدەر
رۆژێکە دەست بدەینە دەستی یێکتری بەخێر
روو بکەینە رێیی ویفاق و نیفاقیش بکەینەدەر
زۆرین بەناو! چ فائیدە، خۆ خۆر و خۆپەسەند،
بۆییێکا زۆر لە پاشەوە ماین، ناکەوینە بەر.
بۆ خاتری خودا بەسە، ئەم جارە وەرن بەدڵ
بێغەل و غەش ببینە برا، ئێیش ببەینەسەر
واللە زەکیین، سەخیین، بەوەفاین، حەیفە ناتەباین
تاکەی، بخۆین، بنووین؟ وەرن بۆ عەشقی پێغەمبەر
هەڵسین لەخەو، نزیکە وەتەن بێتە زەلزەلە
وەك دایکمانە، خیدمەتی ئەو لازمە بەسەر
سەعیی دەوێ، تەرەققیی دەوێ، ئیتتیحاد بکەین

چونکە بە ئیتتیحاد هەموو ئێشێ دەچێتەسەر
ئەووەڵ مەعاریف، ئێستە مەعاریف لە عالەما
ڕووناکیی ڕێی سەعادەتە، پڕنەفعە بێ زەرەر
ئیقباڵی موڵک و میللەت تەدبیری ئیتتیحاد
سەرمایەی فەلاحەت و تەفریقی خێر و شەڕ
حەتتا درەختی باغ کە زڕو بێبەرە ئەویش،
زانینی پێدەوێ، بە مەعاریف ئەو بێتەبەر
ئێستە کە بۆ تەرەققیی ئیقباڵ، کوردەکان
گردبوونەوە لە مەرکەز، ئەوا پیاوی نامورەر
تەدبیر و فیکر و قووەت و ماڵ سەرف دەکەن هەموو
تا میللەت و وەتەن لە جەهالەتدا بێتەدەر!
ئێوەش لە هەر وڵاتێ بکەن ئیتتیفاق
تاکوو مووەفەقییەت، خوا بێتە ڕاهبەر
خیدمەت بە موڵک و دەوڵەت و میللەت بکەین بە دڵ
بەڵکو نەمێنین ئێمە، لەناومان ببێ ئەسەر!

/تەواو/

سلێمانیەلی: تۆفیق

### ئەنجام

کۆ و لێکدانەوە و بەراووردی گوتنەکانی خۆی، سەرچاوەکان، (کورد)، (ژین) ی ئەستەنبوول، ئەم ڕاستییانە دەخەنە دەستەوە:

١. ئیمزاکانی(سلێمانیەلی تۆفیق)،(س.ت)، (پیرەکورد—تۆفیق)، (مەحموود نەژاد—م.نەژاد تۆفیق) هەموو یێکن‌و هەر (پیرەمێرد)ن. وەك سەرنجیشم داوە، دوو

بیرەوەرییەکەی لەمەڕ سەر گوتارەکەی خۆی و لەمەڕ باسی خوێندەواریی نووسراوی (بابان زادە ئیسماعیل حەققی) لە ئەو ژمارەیەی (کورد) دا، نەك هەر وێنەی بیرتیژییەتی، بەڵکو ڕاستیشن! {بنۆڕە: فۆتۆکۆپیی!}.

٢. ئەگەر میقداد بەگی نەوەی بەدرخان پاشا، خاوەندی یێکەمین ڕۆژنامە و یێکەم کوردیی نووسی ڕۆژنامەش بێ، ئەوە (پیرەمێرد) خاوەند ئیمتیاز و ڕێبەر و نووسەری دووهەمین ڕۆژنامەی تورکیی — کوردییە. وێڕاش (پیرەمێرد) یێکەم کەسی گوتارنووسی کورمانجیی باشوورە لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردییدا. (هەروەها یێکەم نووسەری شیعری سیاسییە لە ڕۆژنامەدا).

٣. ڕۆژنامەی (کورد) و گوتنەکەی خۆیشی — هەروەك سەرچاوەکان — دەیسەلمێنن کە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری (کۆمەڵی هاریکاریی و پێشکەوتن) بووە. لە ئێرەشەوە خەباتی سیاسیی و ڕەنجی ڕۆژنامەنووسیی وەك ڕۆژی ڕووناکە!

٤. ئەگەر (پیرەمێرد) بەهۆی جم و جووڵی سیاسیی و فەرمانیەوە — لە تورکیای عوسمانییدا — لەپێشەی ڕۆژنامەنووسیی جویێ بووبێتەوە، ئەوە هەمیشە هۆش و بیر و قەڵەمی لێی نزیك بووە. هاریکاریی لە ڕۆژنامەکانی میسر، ئێران، فرنسەدا و ڕۆژنامە تورکیی زمان و کوردییەکانی دیدا، وەك ئیقدام /إقدام، ئیجتیهاد /اجتهاد، سەربەستیی/سربستی کە خۆی چەندجار یادی کردوونەتەوە، ئەمانە هەموو شاهێدی ئەو ڕاستییەن و لای من ئەم ماوەیەشی هەر لە خانەی کردو کۆشی ڕۆژنامەنووسییدا جێی دەبێتەوە. (مێژووی ئەدەبی کوردیی، پیرەمێردی نەمر، دیوانی پیرەمێرد —١٩٩٠.. دەبێژن کە زووتر و بەر لە ساڵی ١٩٠٨ ز خاوەندی ڕۆژنامەی تورکیی " ڕەسملی کیتاب /رسملی کتاب " بووە. من تا ئێستە بەڵگەی ڕاستیم بەرچاو و بەردەست نەکەوتووە.. بەڵام ئەگەر ڕاست بێ، ئەوە یێکەم قۆناغی ڕۆژنامەنووسیی پیرەمێرد، لە ئەو هەلەوەیە تا ساڵی ١٩١٨ ز).

٥. وێـڕای کۆششـی ئـەدەبیی (پیرەمێـرد)، هـۆش و بـیر و کـردار و قەڵـەمی ڕۆژنامەنووسیی ئـەوە دەنـوێنن —تاکۆچـی ماڵئـاوایی— بـە هـەموو بـاوەڕی ئەقڵناسـیی خۆیەوە، خۆی هەر بۆ کورد و خزمەتی کوردستان دانابوو. بۆیێکا دڵنیام بڵێم، پیرەمێرد نـەك هـەر (پـیری ڕۆژنامـەوانانی کـورد)ە، بـەڵکو بـە گیـان و دڵ و ئەقڵـەوە، نەتەوەپەروەرێکی گەورە و بەتەنێ هەر پیاوی کرد بووە!

## پەراوێز

(١). ئەو تاکە تورکییە، خۆی — بە ئـەم تاکـەوە — چـوارینێکە و کوردییەکـەی ئەمەیە:

**ڕۆحم فڕیی لەسەراوردی بەرزی نیشتیمانەوە بێدەنگ و سەنگ**

**وامزانیی کـە ئەم کـۆنە مەڵبەندە ئەگـاتـەوە شـوێنی دەنگ**

**بووبوون بـەیێك لـەش و ڕۆحـم بۆ دیدەنیـی دۆسـتـانـی کۆن**

ناڵە و نەوای دڵم بوو، داخم! لانەی بەڕۆحەکە هێنایە تەنگ! (١٧ /ل١٩)

(٢). من بە ئانقەست و بۆ ڕوون کردنەوەی باسێ پەنجەم بۆ ئەم سەرچاوەیە ڕاکێشاوە!!. باسـەکەش ئەمەیـە: در. کـەمال فوئـاد چـەند سـاڵێ لەمەوبـەر و لـە ئـەڵمانیادا بـە نێونیشـانی (مـژدەییێکی خـۆش — دۆزینـەوەی یـانزە ژمـارەی ڕۆژنامـەی " کوردسـتان " ەوە، مـەتنی تــەواوەتیی (کوردســتان — ژ ١، ١٥ زیلقیعــدە، ١٣٣٥ /١٢ ئــەیلوول ١٩١٧ /قــاهیرە) ی بڵاوکردووەتەوە. ئەو (١١ ژمارەیە)ش بەری سێهەم سووڕی ڕۆژنامەی نێوبراوە: سـوڕی یێکـەم ١٨٩٨ — ١٩٠٢، سـوڕی دووهـەم ١٩٠٨ — ١٩٠٩ کـە هێشـتا نەدۆزراوەتـەوە، سـووڕی سـێهەم ١٩١٧ — ١٩١٨ کە سورەییا بەدرخان پاشا، لە قاهیرەدا نواندوویێتی.

محەممەدی مەلا کـەریم — بێهێنـانی شـتێکی نـوێ — وێـڕای ئـەوەی بڵاونەکردنەوەکـەی کەڵکی گرتووە، لە گۆڤـاری (ڕەنگـین — ژ ٧٤ و ٧٥، س١٩٩٤) دا تـەواوی مـەتنی بـاس کـراوی وەك خۆی بڵاوکردووەتەوە و گوتوویێتی: (نووسراوەکە — ئەو مەتنە — بە تایپڕایتەر نووسـراوە

و لە ئەڵەنیاوە برادەرێکی بۆی ناردوە ! !). لە ئەوەش پتر گوتوویێتی گۆیا (نازانێ کێ ئەم ڕۆژنامەیەی دۆزیوەتەوە ؟ ناشزانێ نووسراوەکە کێ نووسیوییێتی ! !).

من ڕۆژی ٢٢ /٤ /١٩٩٥ لە ساڵڕۆژی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا در. کەمالم ئاگاداری ئەم باس کرد–کە ئەویش خۆی وەك لە ١٩٩٢ دا ئەو (مەتنە نووسراوە) ی لەمەڕ ئەو یێکەم ژمارەیە پێشکەش کردم – ئاگاداری بڵاوکراوەکەی محەممەدی مەلا کەریم و " ڕەنگین " نەبوو! هەڵبەت بۆ خوێندەوار ڕوونە کە باس وەرگرتن لە ئەم ژمارەیەی ڕۆژنامەکە و بڵاوکراوەکەی در. کەماله نەك لە محەممەدی مەلا کەریمەوە !

(٣). ڕێنووسم گۆڕیون و لێکۆڵ و خوێندەوارانیش بۆیان هەیە بەهۆی فۆتۆکۆپییانەوە، ڕێنووسی خۆیان تێبگەن!

(٤). قانوونی بنچینە یان (دەستوور) کە یێکەم جار لە ساڵی ١٨٧٦ ز.دا ئاشکرا کرا!

(٥). هەمان مەبەستی هەیە.

(٦). مەبەستی بازێڕی (تەرابلوس)ی وڵاتی لیبیایە کە بە فەرمانی سوڵتانی عوسمانیی، خێڵی هەمەوەندی کوردی باشوور ئاوارەی ئەو وڵاتە کرا... بەڵام خێڵەکە داستانێکی بێ وێنەی لە مێژوودا نواند و هەر گەڕایەوە کوردستانی نیشتیمانی!

## فەرهەنگۆکی شیعر.

| | |
|---|---|
| ئەسەر | : (أثر/ع)، یادگار. |
| ئیتتیحاد | : (اتحاد /ع)، یێکیەتیی. |
| ئیتتیفاق | : اتفاق /ع)، ڕێککەوتن. |
| ئیقباڵ | : (اقبال /ع)، مەبەست بەخت، پێشکەوتن. |
| باخوسووس | : (ع، ف))، بەتایبەتیی. |
| بەد تەر | : (ع، ف)، بەدتر، خراپتر. |
| بەکرمەرگەوەڕ | : دووزمانی نێوان مەم و زین. پیاو خراپ. |
| تابیع | : (تابع /ع)، سەربەیێکێ، لایێ. |

تو عەشقی پێغەمبەر : تو خۆشەویستیی پێغەمبەر.

تەدبیر : (تدبیر /ع) بەرزیی، پێشکەوتن.

تەعنە : (طعنە /ع) تانووت، پلار.

تەفریق : (تفریق /ع) جودایی.

تەی : (طی /ع) قەدکردن. پێچەوانە.

جەهالەت : (جهالة /ع) نەزانین.

چلەخانە : چلە، چل ڕۆژێکە لە جێگەیێکی تایبەتیدا خوا پەرستیی دەکریێ. چلەخانە، ئەو شوێنەیە کە چلەی تێدا بگیرێ.

خزمی خەزووری سەپانی شێخ: (ئێدیۆمێکی کوردییە) مەبەست لە خزمێکی یێکجار دوورە.

خیدمەت : (خدمة /ع) خزمەت. چاکە.

ڕاهبەر : (راهبر /ف) ڕەهبەر. ڕێبەر. سەرکردە.

زەرەر : (ضرر /ع) زیان.

زەکیی : (ذکی /ع) زیرەك.

زەلزەلە : (زلزلة /ع) لەرزە.

سەخیی : (لە: سخي /ع) بەخشندە.

سەرف : (صرف /ع) خەرج کردن.

سەعادەت : (سعادة /ع) خۆشیی.

شوکری خوا : سوپاسی خوا.

شەق : (شق /ع) هەڵدڕ.

شەق شەقە : خرنگە خرنگ. دەنگە دەنگ.

غەل و غەش : فرتوفێڵ.

فەلاحەت : سەرکەوتن.

فیکر : (فکر /ع) بیر.

قووەت : (قوة /ع) توانا. هێز.

مەرکەز : (مرکز /ع) لە ئێرەقدا مەبەست مەڵبەندە کە ئەستەنبووڵی پێتەخت دەگرێتەوە.

مەعاریف : (معارف /ع) خوێندەواریی.

موەفەقییەت : (موفقیة /ع) سەرکەوتن.

نامور : (نامور /ف) ناسراو. بەنێوبانگ.

نەفع : (نفع /ع) قازانج.

نیفاق : (نفاق /ع) دووڕوویی.

وەتەن : (وطن /ع) نیشتیمان.

ویفاق : (وفاق /ع) هاودەنگیی. دۆستیی.

## تەماشاکراوەکان.


١. بوز ئارسەلان: محەممەد ئەمین — ژین، جلد ١، ئوپسالا (سوید ١٩٨٥).

٢. دیوانی پیرەمێرد —کۆکردنەوەو هتد... فائیق هوشیار، مەحموود ئەحمەد محەممەد، مستەفا سالح کەریم، محەممەد نووری تۆفیق، ئەحمەد زرنگ مستەفا. (بەغداد ١٩٩٠).

٣. ژیان — س٩، ژ ٤١٥، شەممە ١٣ تەشرینی یێکەم ١٩٢٤ (سەرگوتار: مەعاریف و دانای و هونەرمەندیی).

٤. ژیان — س ١٢، ژ٥٣٤، دووشەممە، ١٢ تەمووز ١٩٣٧ (سەرگوتار: درۆ).

٥. ژیانەوە — س١، ژ١٤، دووشەممە، شوبات ١٩٢٥

٦. ژین — س١٤، زژ ٥٧٠، پێنجشەممە، ١٥ حوزەیران ١٩٣٩ (سەرگوتار: کریتیك).

٧. ژین — س ٢١، زژ ٨١٢، پێنجشەممە، ١٤ ئاب ١٩٤٦.

٨. ژین — س ٢٠، زژ ٨٥٥، ١٦ کانوون دووهەم ١٩٤٧. (گوتار: سەداییکی ئاشنا).

٩. ژین — س ٢١، زژ ٨٦٦، ٢ نیسان ١٩٤٧ (گوتار: هەڵوەڕیی)

١٠. ژین — س ٢٣، زژ ٩٥٣، ٣ شوبات ١٩٤٩ (سەرگوتار: دوو دوشمنی کوشندە: جەهل و حەسەد!).

١١. سەججادیی: عەلائەددین – مێژووی ئەدەبی کوردیی (بەغداد ١٩٥٢).

١٢. قادر: در. جەبار – ڕۆژنامەی کوزد و چەند زانیارییەکی نوێ (کاروان – س ٢، ژ ٣٢، مایسی ١٩٨٥ /ل٧–١١، هەولێر).

١٣. کورد تعاون و ترقی غزتەسی – نومرۆ: ١)

١٤. فوئاد: در. کەمال – کوردستان یێکەمین ڕۆژنامەی کوردیی، (بەغداد ١٩٧٢).

١٥. مەلا کەریم: محەممەد – لەبارەی ڕۆژنامەییێکی کوردستانی ترەوە. (ڕەنگین – ژ ٧٤، ساڵی ١٩٩٤).

١٦. مستەفا: ئەحمەد عەبدوڕڕەحیم – فیی ئوسوولێ ئەلتەئریخ ئەلعوسمانیی (أحمد عبدالرحيم مصطفى – في أصول التأريخ العثماني)، (بيروت ١٩٨٢).

١٧. هاوار: محەممەد ڕەسووڵ – پیرەمێردی نەمر (بەغداد ١٩٧٠).


## تێبینیی

١. وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی بێپرس کردن، بۆ کەس نییە.

٢. ئەم بابەتە لە ساڵڕۆژی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی و لە ٢٢ /٤ /١٩٩٦، هەولێردا پێشکەشم کرد. هەروەها لە: کوردستانی نوێ – ژ ١٢٨٢ و ١٢٨٨ ی یێکشەممە ١٢ /٥ /١٩٩٦ و ٢٠ /٥ /١٩٩٦ بڵاوکراوەتەوە.

٣. وێنەکەی پیرەمێرد لە گەنجینەی مستەفا سائیبەوە.. ئەم وێنەیەش – بێ دیاریی کردنی مێژووی ناردنی – پیرەمێرد لە ئەستەنبووڵەوە ناردوویێتی بۆ محەممەد تاهیر ئەفەندیی نێوێ کە بە قەڵەمە جوانەکەیشی ئەم دوو تاکە شیعرەی لە پشتەکەیدا نووسیوە:

هەرچەندە شکڵی تازە دەبینیی فەقەت دڵم

هێند پرو دڵشکستە، بەدڵ مائیلی گڵم

٤. نیشانەکان:

ر = ڕۆمیی (ساڵی دارایی عوسمانیی)

ز = زایینیی (ساڵی مەسیحایی)

| | |
|---|---|
| مەرکەز | : (مرکز /ع) لە ئێرەقدا مەبەست مەڵبەندە کە ئەستەنبووڵی پێتەخت دەگرێتەوە. |
| مەعاریف | : (معارف /ع) خوێندەواریی. |
| موەفەقییەت | : (موفقية /ع) سەرکەوتن. |
| نامور | : (نامور /ف) ناسراو. بەنێوبانگ. |
| نەفع | : (نفع /ع) قازانج. |
| نیفاق | : (نفاق /ع) دووڕوویی. |
| وەتەن | : (وطن /ع) نیشتیمان. |
| ویفاق | : (وفاق /ع) هاودەنگیی. دۆستیی. |

## تەماشاکراوەکان.


١. بوز ئارسەلان: محەممەد ئەمین — ژین، جلد ١، ئوپسالا (سوید ١٩٨٥).

٢. دیوانی پیرەمێرد —کۆکردنەوەو هتد... فائیق هوشیار، مەحموود ئەحمەد محەممەد، مستەفا ساڵح کەریم، محەممەد نووری تۆفیق، ئەحمەد زرنگ مستەفا. (بەغداد ١٩٩٠).

٣. ژیان — س٩، ژ ٤١٥، شەممە ١٣ تەشرینی یێکەم ١٩٣٤ (سەرگوتار: مەعاریف و دانای و هونەرمەندیی).

٤. ژیان — س ١٢، ژ٥٣٤، دووشەممە، ١٢ تەمووز ١٩٣٧ (سەرگوتار: درۆ).

٥. ژیانەوە — س١، ژ١٤، دووشەممە، شوبات ١٩٢٥

٦. ژین — س١٤، زژ ٥٧٠، پێنجشەممە، ١٥ حوزەیران ١٩٣٩ (سەرگوتار: کریتیک).

٧. ژین — س ٢١، زژ ٨١٢، پێنجشەممە، ١٤ ئاب ١٩٤٦.

٨. ژین — س ٢٠، زژ ٨٥٥، ١٦ کانوون دووهەم ١٩٤٧. (گوتار: سەدایێکی ئاشنا).

٩. ژین — س ٢١، زژ ٨٦٦، ٢ نیسان ١٩٤٧ (گوتار: هەڵوەڕیی)

١٠. ژین — س ٢٣، زژ ٩٥٣، ٣ شوبات ١٩٤٩ (سەرگوتار: دوو دوشمنی کوشندە: جەهل و حەسەد!).

١١. سەجادیی: عەلائەددین – مێژووی ئەدەبی کوردیی (بەغداد ١٩٥٢).

١٢. قادر: در. جەبار – ڕۆژنامەی کوزد و چەند زانیارییەکی نوێ (کاروان – س ٢، ژ ٣٢، مایسی ١٩٨٥ /ل٧–١١، هەولێر).

١٣. کورد تعاون و ترقی غزتەسی – نومرۆ: ١)

١٤. فوئاد: در. کەمال – کوردستان یێکەمین ڕۆژنامەی کوردیی، (بەغداد ١٩٧٢).

١٥. مەلا کەریم: محەممەد – لەبارەی ڕۆژنامەیێکی کوردستانی ترەوە. (ڕەنگین – ژ ٧٤، ساڵی ١٩٩٤).

١٦. مستەفا: ئەحمەد عەبدوڕڕەحیم – فیی ئوسوولێ ئەلتەئریخ ئەلعوسمانیی (أحمد عبدالرحيم مصطفى – في أصول التأريخ العثماني)، (بيروت ١٩٨٢).

١٧. هاوار: محەممەد ڕەسووڵ – پیرەمێردی نەمر (بەغداد ١٩٧٠).

## تێبینیی

١. وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی بێپرس کردن، بۆ کەس نییە.

٢. ئەم بابەتە لە ساڵڕۆژی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی و لە ٢٢ /٤ /١٩٩٦، هەولێردا پێشکەشم کرد. هەروەها لە: کوردستانی نوێ – ژ ١٢٨٢ و ١٢٨٨ ی یێکشەممە ١٢ /٥ /١٩٩٦ و ٢٠ /٥ /١٩٩٦ بڵاوکراوەتەوە.

٣. وێنەکەی پیرەمێرد لە گەنجینەی مستەفا سائیبەوە.. ئەم وێنەیەش – بێ دیاریی کردنی مێژووی ناردنی – پیرەمێرد لە ئەستەنبووڵەوە ناردوویێتی بۆ محەممەد تاهیر ئەفەندیی نێوێ کە بە قەڵەمە جوانەکەیشی ئەم دوو تاکە شیعرەی لە پشتەکەیدا نووسیوە:

هەرچەندە شکڵی تازە دەبینیی فەقەت دڵم

هێند پڕو دڵشکستە، بەدڵ مائیلی گڵم

٤. نیشانەکان:

ر = ڕۆمیی (ساڵی دارایی عوسمانیی)

ز = زایینیی (ساڵی مەسیحایی)

# ٤

# یێکەم قوتابخانەی کیژانی

# سلێمانیی — س ١٩١٥

## پێشەکیی

داناو زانای کورد: پیرەمێردی شاعیرو ڕۆژنامەوانی بیۆێنە، بەدەم یادی خوێندەواریی سەردەمی میرنشینیی بابانەوە دەڵێت: (.. ئەو ساتە کە دەورەی ڕمو شمشێرو لەشکرکێشیی بوو، بەحسابێکی دروست لەسەدا بیست٢٠٪ی خوێندەوار بووەو هەشتای ڕەشۆکیی‌و ئەوانیش کەپێیان خوێندوون بۆ ئەوە بووە کە کارێکیان بەلاوە بوبێ: کاغەزێ بنووسن، یا کاغەزێ هات بیخوێننەوە. باقیی دی یا سپاهیی یا ئەسناف یا سەنعەتکار بووە !).

هۆی ڕاستەقینەی ئەم بارەش یێکالآ دەکاتەوە و دەڵێت:

(ئەوسایە گوتوویانە: ئەویی نەخوێندەواربێ لەمەزییەتی حەیات تێ دەگا و نایەوێ بەخۆڕایی تەنها بۆ نێوی ئازایی‌و کوشندەیی خۆی بدات بەکوشت‌و بە ترسنۆکیان داناون‌و نەخوێندەوار بەجەسوور...خۆ کچان ببڕای ببڕ بهێڵن بخوێنن؟ نا ! گۆیا لەبەر ئەمە، ئەگەر خوێندەواربن، بە کاغەز عاشقێنیی لەگەڵ کوڕان دەکەن !). {٢٠ /ل١}. لە ئەو باسەوە پێویستە لەخۆ بپرسین، (کەی خوێندنی نوێ لەکۆنە پێتەختیبابان — سلێمانیی—دا هەڵکەوت؟). لەئەو پرسیارەش گرنگتر: (کەی خوێندنی کیژان لە سلێمانییدا هەڵکەوت و کەی یێکەم قوتابخانەی کیژان دامەزرا؟).

## ڕێڕەوی باس

در. کەمال مەزهەر ئەحمەد بەنێونیشانی(فاتیمە محیەددین پەریی— پێشڕەو و سەربازی نەناسراو)ەوە، دووجار لە (گۆڤاریی—ڕۆشنبیری نوێ: س١٩٧٩) {١٥/ل١٥—

١٨}و کتێبی (چەند لاپەڕیێ لەمێژووی گەلی کورد: س١٩٨٥)دا {٢/ل٢٥٩-٢٦٩} گفتوگۆیێکی بڵاوکردووەتەوەو دەڵێت: (ئەو خانمە بەڕێزە یێکەم ئافرەتی کوردی عێراقە کە بووە بە مامۆستاو ٣٥ ساڵی ڕەبەقی ژیانی بە ئەوپەڕی دڵسۆزییەوە بۆ پەروەردەکردنی سەدان کچ، وەك جگەگۆشەی خۆی، تەرخان کرد!).

ڕاستییەکەی در.کەمال لەئەو خانمە بەڕێزەوە چەند هەواڵێکی کورتو ناتەواوی وەرگرتووە کەوون نین! یێکێکیان ئەوە ڕادەگەیێنێ کە(یێکەم قوتابخانەی کیژان!)ی سلێمانیی بەنێوی (قوتابخانەی زەهرا؟)وە لە ساڵی ١٩٢٦ دا دامەزراوە و خاتوو گوزیدە-یێکەم ڕێبەری بووە!-کەچیی در. کەمال خۆی لە ڕاستیی ئەو هەواڵە ورد نەبووەتەوە، تەنانەت خۆیشی ماندوو نەکردووە لە(چۆنییەتیی دامەزراندنی ئەو قوتابخانە)یە بکۆڵێتەوەو (مێژووی دەرگاکردنەوە)یشی پیێ ڕانەگیراوە! !لەئەوانەیش سەیرتر در. کەمال گفتوگۆکەی بەکارێکی(تەواو مێژوویی و بنەبڕ) داناوە، بۆییێکا بیێ هیچ پێداچوونەوەو زیادە خستنەسەریێ، هەمان کفتوگۆی لە(کتێبە نێوبراوەکە)یدا بڵاوکردووەتەوە کەلەنێوان (هەردووجار) دا چەند ساڵیێ تیێپەڕیوە. ئەمە لە هەلێکدا بەرنامەی کاری لێکۆڵینی زانستیی، بەتەنیێ پشت نابەستیێ و باوەڕ ناهێنیێ بە تاوەکانی ڕاێیەڵەی بیرەوەریی، بەڵکو دوور دەنۆڕیێ و پشت دەبەستیێ بەبڵاوکراوەو بەڵگەنامەو دەستنووس، بەتایبەتیی ئەگەر هات و کارەکە پێوەندیی بە بارێکی ڕەسمییەوە هەبوو، وەك باری ئەو (قوتابخانە)یە کە وێنەیێکی زیندووی خوێندنی ڕەسمیی عێراقی عەرەبی دووای سەربەخۆبوونە!

لەلاییێکی دیەوە غەفووری میرزا کەریم، بەنێونیشانی (چۆن بۆ یێکەمین جار قوتابخانەی کچان لە سلێمانییدا کرایەوە؟) گوتارێکی لە ڕۆژنامەی (هاوکاریی: س ١٩٨٢) دا{٢٤/ل٨} بڵاوکردووەتەوە و بیێ سەرنج دانی باسەکانی در.کەمال - کە ئەویش لە چاپی کتێبەکەیدا لای لێنەکردووەتەوە-هێندەی پیێ بەس بووە کە لەگەڵ

چەند تیَبینییَ، هەواڵە بڵاوکراوەکانی چەند ژمارەییێکی ڕۆژنامەی (ژیان– س١٩٢٦) سەرلەنویَ ڕابگوێزێتەوەو بڵاوبکاتەوە. تەنانەت وەك وەڵامی (چۆن)ی خۆیشی نەداوەتەوە، ئەمیش لە دووتوێی قسەکانیدا – وەك در. کەمال–بڕواکەی هەمان مانا دەبەخشێت گۆیا ئەوە (یێکەمین قوتابخانەی کیژانە !).

من لەئێرەدا – لە چەند ئەستوونو چەند لاپەڕییێکی ڕۆژنامەو گۆڤاردا – بۆم ناکرێت باسی گەورەی (بزاڤی خوێندن لە کوردستان)دا، کۆن و نوێی بنوێنم، بەڵام ئەم هەلەم هەیەو لەدەستم دێت کە بەتەنیَ وەڵامی ئەو لافە بدەمەوە کە دەڵێت: (قوتابخانەی سەرەتایی کیژان –زەهرا – یێکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانییە)، کە بێگومان یێکەمە لەسەردەمی حوکوومەتی مەملەکەتی عێراقی عەرەبی تازە هەڵکەوتوودا!

# بەشی یێکەم

## سەرنج دانێکی کورتی مێژوو

ڕێگەگرتنی ڕاستیی کارێکم پێ دەکات کە بە خێراییش بێ، چاو بە مێژوودا بگێڕمەوەو بڵێم:(خوێندنی نوێ، لەنزیك سەدەی نۆزدەوە، بەهۆی چەند گۆڕینێکی گرنگی بارەکانی نێودەوڵەتی عوسمانییەوە) هاتووەتە کوردستانی عوسمانیی و عێراقی عوسمانییەوە کە ئەمەش ئەنجامی کارتێکردنی سیاسەت و ڕۆشنبیریی ئەورووپایە لە جەستەو گیانی ئەو دەوڵەتەو هەروەها ئەنجامی حوکمڕانیی ئەم دەوڵەتەشە لە وڵاتەکەماندا!

وێنەی ئەو گۆڕینە دیارو گرنگانەش ئەوەیە، لەساڵی١٨٦٥ز.دا (نیزامی تەشکیلاتی ویلایات-هەرێمەکان)دەرچوو. هەروەها لەساڵی١٨٧٠ز.دا (نیزامی مەعاریف/زانستیی عوسمانیی) هەڵکەوت کە دوواتر سوڵتان عەبدولعەزیز پووچی کردەوە. هەروەها لەساڵی ١٨٨٢ز.دا لەهەرێمەکانی: مووسڵ، بەغداد، بەسرەدا:(مەجلیسەکانی مەعاریف)دامەزران بۆ چاودێریی کاروباری قوتابخانەکان. {٥/ل٢٢٧و٢٧٥} سەرئەنجام لەسەردەمی (کەنعان پاشا)و لە"مووسڵ"دا، بەکۆششی حاجیی نەعمان ئەفەندیی کوڕی مستەفا ئەلعومەریی، (یێکەم قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان – مووسڵ) داندرا. {٥/ل١٧٧} . لەلاییێکی دیەوە- وەك وێ دەچێ- ماوەییێکی کەم لەدووای ئاشکرابوونی تەشکیلاتی هەرێمەکانەوە، (سلێمانیی)ش بۆی لووابێ (یێکەم قوتابخانەی ڕوشدییە – سەرەتایی کوڕان –)ی بەخۆوە دیتبێ کە پیاوە گەورەکانی کورد وەك ئەحمەد پاشای بابان و سلێمان غەوواس، کۆششیان بۆ کردووەو ساڵی١٨٦٨ز. دامەزراوە. {١٦/ل٧٨} . لەبازێڕی بەغدادیشدا، ساڵی ١٨٨٩ز، چوار (قوتابخانەی سەرەتایی: حەمیدییە، جەدید حەسەن پاشا، عوسمانیی، کەرخ) ی کوڕان کراونەتەوە، {٥/ل١٥٣} بەڵام بەر لە ئەمانەو لەسەردەمی حوکمڕانیی والیی مەدحەت

پاشادا: ١٨٦٩ – ١٨٩٢، دوو (قوتابخانەی نێوەندیی–ڕوشدییەی‌سەربازیی–ڕوشدییەی مولکیی) دامەزراون. {٥/ل١٥٥}.

لێکۆڵی کۆچ کردوو عەبدوڕڕەزاق ئەلهیلالیی، لەمەڕ قوتابخانە ڕەسمییەکانی (کیژان) یش ئەوها باس دەگێڕێتەوە: (یێکەم قوتابخانەی کیژان لە عێراق)دا، ئەوەیە: حوکمڕانیی عوسمانییەکان لەساڵی١٣١٧ك/١٩٠١ز.دا، لە بازێڕی (بەسرە) دایانمەزراندو سەبیلە خانم یێکەم مامۆستا–ڕێبەری بوو. {٥/ل٨٥، ١٥٨،١٨٥}. هەروەها لەسەردەمی والیی نامیق پاشادا: ١٨٩٩–١٩٠٢ز، لە بەغدادا (قوتابخانەی اناث روشدیە مکتبی–ڕوشدییەی کیژان) دامەزرا. دیسان دووای مەشرووتە–ژینی دەستووریی١٩٠٨ز، دوو قوتابخانەی یێکەمین (ڕوشدییەی کیژان،سەرەتاییکیژان) لەگەڕەکی سەرڕاجخانەی مووسڵدا دامەزران. {٥/ل١٨١}. بەلام ئەلهیلالیی دەڵێت: هەردوو بازێڕی (کەرکووك، سلێمانیی) وەك بازێڕەکانی دی هەرێمی مووسڵ (هیچ قوتابخانەیێکی کیژانیان تێدا هەڵنەکەوتووە ! !). {٥/ل١٨١}.

لەئێرەداو لەمەڕ قوتابخانەکانی سلێمانیی،پێویستی دەزانم یادێکی گفتارەکانی مێژوونووس ئەمین زەکیی خۆمان بکەمەوە..ئەو دەبێژێت:(قوتابخانەی ڕوشدییەی سەربازی سلێمانیی) لەساڵی١٣٠٩ر/١٨٩٣ز.دا بەکۆششی گەورە پیاوی عوسمانیی – کورد – سەعید پاشای خەندان دامەزرا. {٧/ل٢٥٧}. هەروەها (قوتابخانەی سەرەتایی – کوڕان) لەساڵی ١٣١٦ر/١٩٠٠ز دامەزراوە ! {٧/ل٢٠٥}.

لە ئەم ئاستەدا عەبدوڕڕەزاق ئەلهیلالیی دەڵێت: (قوتابخانەی ئامادەیی– ئیعدادیی مولکیی) لەماوەیێکی کەمی دوای ساڵی ١٩٠٨ ز دامەزراوە. {٥/ل١٨١}. بەئەم پێیە لەمەودای ساڵانی ١٨٦٨–١٩٠٨ ز.دا، چوار قوتابخانەی ڕەسمییانەی عوسمانییەکان لە نێو بازێڕی (سلێمانیی)دا دامەزراوەو هیچ دەنگو ڕەنگێکی (قوتابخانەی کیژان)یش نییە"١". جێگەی باسە، محەممەد ئەمین زەکیی تەمەنی ئەو قوتابخانەیە درێژ

دەکاتەوە بۆ کۆتایی سەردەمی حوکمڕانیی عوسمانیی ١٩١٤-١٩١٨ز! بۆ روونتر بوونەوەی ئەم هەواڵەش، ڕاستیی ئەوەیە: (ڕوشدییەی سەربازیی) لە ساڵی ١٩١٤ز.دا هەڵوەشاوەتەوە... مامۆستای پێشڕەو - یێکەم جاریشە ئەم هەواڵە ئاشکرا بکەم - کۆچ کردوو سەعید سدقی کابان لەدەفتەری کـــارنامەی خۆیداو بەقەڵەمی خۆی نووسیوییێتی: (لە١٠ی ئاغستۆسی١٩١٤دا، جێگری قوتابخانەی نێوبراو بووم). پتریش دەڵێت: (ڕوشدییەی سەربازیی هەڵوەشاوەتەوەو خراوەتە سەر مەعاریفی گشتیی لە٢٦ی تەشرینی دووەمی ١٩١٤ دا)."٢"

بەڵگەنامەیێکی‌دی-یێکەم جاریشە ئاشکرای دەکەم -دەستنووسی مامۆستاییێکی پێشڕەوی دیە کە شێخ عەبدوڕڕەحمان نسیبەو لایێنگری مامۆستاکەی پێشووە بۆ هەڵوەشاندنەوەی قوتابخانەی نێوبراو.. ئەم باسەکە روونتر دەکاتەوەو دەبێژێت: (تێکەڵی قوتابخانەی نموونەی سەرەتایی کراوەو نێونرا: تەشویقییە!)."٣" هەردوو مامۆستاش دەگێڕنەوە کە هەتا سەردەمی - بەقسەی خۆیان داگیرکردن - هاتنی ئینگلیز بۆ سلێمانیی، هەر مامۆستای بوون!

بە ئەو ڕۆشناییە، ڕاستیی ئەوەیە، سێ قوتابخانەی کوڕان (ئامادەیی مولکیی، نموونەی سەرەتایی، قوتابخانەی تەشویقییە) لە سەردەمی حوکمڕانی عوسمانییدا بەجێ‌ماون!

نێوهاتنی داگیربوونی سلێمانییش"!!" مانای ئەوەیە، دەوڵەتی عوسمانیی، دووای دۆڕاندنی یێکەم جەنگی گێتیی، هەموو دەزگە ڕەسمییەکانی لەدەست چووەو هەڵوەشاوەتەوە. لە ئەم بارەدا و دووای ڕێککەوتنی ئاشتییانەی سەرداری کورد حەفید زادە مەحموود و ئینگلیز، ئیدارەکردنی بـاژێڕی سلێمانیی خرایە ئەستۆی (یێکەم حوکومەتی کوردستان - ١٩١٨/١١/١٧) بەڵام دووای حەوت مانگێ هەر بەپیلانی ئینگلیز خۆی، حوکمدارییەکە تێك چووە و باژێڕەکەش لە١٩١٩/٦/١٦ دا ڕاستە و ڕاست

لەلایێن ئینگلیزەوە داگیر و ئیدارەکرا کە حاکمی سیاسیی مێجەر (سۆن.Soane E.B)ی بەسەرەوە دانا و ئەمیش لە نێوان یێکەم مانگی ١٩١٩ تا٥/٣/١٩٢١ لە سلێمانییدا حوکمڕانی یێکەم بووە.{١٢/ل٣}. لە ئەو ماوەیەشدا چۆن ڕۆژنامەی (پێشکەوتن-سلێمانیی) زمان حاڵی شایێتە، هەروەها هێندێ بەڵگەنامەی مامۆستا پێشڕەوەکان پشتیوانن، ئەوە باژێڕی سلێمانیی، بارێکی نوێی بەخۆوە دیتووە !

شێوەی گشتیی ئەم بارە-وەك وردبوومەتەوە-ئەوە دەنووێنێ کە بەرنامەی خوێندنی عوسمانیی، گۆڕینی بەسەردا هاتووە. "٤".

بۆ یێکەم جار لە قوتابخانەکانی ئەم باژێڕەدا، خوێندن و نووسینی کوردیی - بەشێوەیێکی ڕەسمییانە-هەڵکەوتووە و (سۆن) ی کوردیی زان خۆی سەرپەرشتی ئەم بزاڤەی کردووە. {١٤ /ل٣٨٥-٣٨٨}، تەنانەت مامۆستا محەممەد زەکیی داوە بۆ دانانی کتێبی خوێندنی قوتابخانەی ناسراو بە: (ئەووەلین کیتابی قیرائەتی کوردیی-بەغداد١٩٢٠: Kitabbi Awalamin Qiraati Kurdy, Baghdad-1920) {١/ل١٥٢.پ١٠}.

لەلایێکی دییەوە نێوی قوتابخانەی "تەشویقییە" گۆڕدراوە بۆ (نموونەی سەعادەت:١١/١/١٩١٩)"٥".کارنامەیمامۆستا عەبداللە نورلموهتەدیی-بەردەستم - ڕادەگەیێنێ کە لە ١/٥/١٩١٩ دا ڕێبەری بووە."٦". دواییش مامۆستا محەممەد ڕەشید زەکی کابان، هەروەها دوو قوتابخانەی دی کوڕان کراونەتەوە: قوتابخانەیێکی چوار پۆلیی:(نموونەی عیرفان- نێوەندی ئابی ١٩٢٠). {١١/ل٤}.

کارنامەی مامۆستا سەعید زەکیی فەتاحی -بەردەستم- ڕادەگەیێنێ کە لە ١٥/٨/١٩٢٠ دا ڕێبەری بووە. لەلایێکی دیەوە " ئەنجوومەنی باژێڕی سلێمانیی - مەجلیسی ئیداریی سلێمانیی "لە کرد و کۆششدا بووە و گوتاری بڵاوکردووەتەوە لە پێناوی کردنەوەی "قوتابخانەیێکی پیشەسازیی کوڕان"). {٨/ل٣-٤}، بەلام

سەرنەکەوتوون دایبمەزرێنن! هەروەها گوتاری ڕۆژنامەنووسییش بڵاوە بۆ هان دان و کردنەوەی "قوتابخانەی کیژان". {١١/ل١-٢} کە دیارە پشتیوانیی نەبووە و دانەمەزراوە.

بەئەم پێیە، تا ئەم هەلو هەڵکەوتە، هیچ هەواڵێ بۆ هەڵکەوتنی قوتابخانەیێکی (کیژان)نییە!! بۆیێکا ڕەوایە پرسیار بکرێ داخۆ ڕاستە تا ساڵی ١٩٢٦ ز (قوتابخانەی کیژان) لە سلێمانییدا نەبووە؟

## یێکەم قوتابخانەی کیژان

پەرۆشییو لێپرسینەوەی ورد لەڕاستیی، بەریگرت و بە (بەڵگەنامەی ڕەسمییانەوە) بۆم ساخ بووەوە کە بەڵێ لە (سەردەمی حوکمڕانیی عوسمانیی) دا، تەنانەت لەگەرمەی جەنگدا، (یێکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانیی) دامەزراوە و یێکەم ئافرەتی کوردیسلێمانیی (مەلیحە نەزهەت) خان ڕێبەری بووە کەخۆیشی نەوەی خانەدانێکی بەنێوبانگ و زانست پەروەرە!

ئەم قوتابخانە یێکەمەی کیژان (١٧ /١٢ /١٩١٥) کە لەهیچ سەرچاوەیێکی مێژوویی و بەڵگەنامەیێکی وەك (ساڵنامەی عوسمانیی) دا باس نەکراوە — دەشێ مەلامەت گیروگرفتەکانی جەنگ بووبێ!! —و وێڕاش بەڵگەنامە دەیسەلمێنن کە "ڕەسمیی" بووە، بە تایبەتی کە نێوی ئەو خانمە میهرەبانە لە تۆمارە عوسمانییەکانی (مودیرییەتی مەعاریفی مەنتیقەی مووسڵ — ڕێبەرایێتی زانستیی نێوچەی موسڵ) دا، دیار و نووسراوە!

وردکردنەوەی باری هەڵکەوتنی قوتابخانەکەو سەرچاوەی دەسەلاتی سەردەمەکەش، کارمان تێدەکەن بڵێم، زۆر وێ دەچێ کە قوتابخانەکە بەری کردو کۆشی هەندێ کوردی ڕۆشنبیری سەر بە (کۆمەڵەی یێکگرتن و پێشکەوتنی عوسمانیی — لقی سلێمانیی) بوو بێ! بۆ بڕواکردنیش دەڵێم، نیشان بە ئەو نیشانەی

لەلاییێکەوە هاوسەری مەلیحەخان، عەبداللە نوورولموهتەدیی، بەر لە ڕاگواستنەوەی لەمووسڵەوە بۆ سلێمانیی لە١ /١١/١٩١٤ـەوە، لە قوتابخانەکانی مووسڵی سەر بە ئەو(کۆمەڵەیە)دا مامۆستا بووە! "٧". لەلاییێکی دیەوە نیشان بە ئەو نیشانەی هاوتای ئەو قوتابخانەیە، وەك قوتابخانەکانی (کیژانی بەغداد) کە لقی بەغدادی کۆمەڵەی نێوبراو ڕۆژی ٢٥ /١/١٩١٤ لە بەغداد دا کردبوونیەوە، لەگەڵ سێ قوتابخانەی کیژانی (کەرخ، باروودییە، بابولشەیخ)، ئەمانە لەسەردەمی ئینگلیزی داگیرکەر لەساڵی ١٩١٧ ز.دا پەك خران و هەڵگیران! {٥/ل١٦١}.

جێگەی خۆشیەتی بڵێم، بەهاتنی ئینگلیز، یان ڕاستتر–وەك بەڵگەنامە دەگێڕێتەوە– دووای داگیربوونی مووسڵی مەڵبەندی هەرێمەکە کە لە ٨–٩ /١١/١٩١٨دا و پێوەندیی دابڕینی لەگەڵ سلێمانیی، ئیدی قوتابخانەکەی سلێمانیی پەکی کەوتووەو لەئەوە دوواترەوە، لەسەردەمی حوکمداریی حەفیدزادە مەحموود و لەسەردەمی ئینگلیز خۆیدا، جارێکی دی هەڵنەکەوتووەتەوە!

وردبوونەوە و لێپرسینەوەی زۆریشم ئەگەر شاگردەکان و مامۆستاکانی پێ نەناسرابێتەوە، ئەوە دڵنیام کە شاگردە کیژەکانی ئەم قوتابخانەیە هەر منداڵانی ڕۆشنبیرەکان و دەوڵەمەندەکانی بازێڕەکە بووبن و هەتا دەمە و هەڵگرتنیشی–بە بەراووردی چوار ساڵ تەمەنی قوتابخانەکە–بەلاییێنی کەمەوە سێ پۆل و پتر لەسیی شاگردی هەبوویێ!

پێویستی گوتنیشە: مەلیحەخانی میهرەبان هەشت ساڵ دووای هەڵگرتنی قوتابخانەکە، ئەوجا چووەتەوە سەر پیشەی جارانی کە لە بازێڕی (باقووبە) دا دامەزراوەتەوەو دوواتریش ڕاگواستراوەتەوە بۆ سلێمانییو لە(قوتابخانەی سەرەتایی کیژان–یێکەم لەسەردەمی حوکمڕانیی عێراق) دامەزراوە.. واتە دووای تێپەڕبوونی نزیکەی ساڵێك و حەوت مانگێ بەسەر ئاوەدان کردنەوەی لە١٠/١٠/١٩٢٧داو سەردەمی

'گوزیدەخان"ی ڕێبەرەکەو مامۆستا فاتیمە محیەددین پەریی یاوەری کەموخابن ئەم
ەڕێزە–لای در.کەمال مەزهەر–نێوی مەلیحەخانی نەهێناوە!
بەڵگەنامە ڕەسمییەکان ئەوەش نیشان دەدەن مامۆستای پێشڕەو: مەلیحەخان،
قوتابخانەیسەرەتاییکیژان–زەهرا!)و(قوتابخانەیسدیقەی کیژان)و (قوتابخانەی
ئۆیژەی کیژان)ی سلێمانیی دیتووە کەئەمەی دوواییی، دووا وێستگەی بووە و ئیدی بە
ـارەزووی خۆی و قاییل بوونی وەزیری مەعاریفی عێراق لە١٢/١١/ ١٩٤١ دا، خۆی
ئارکەنار و خانەنشین کردووە!
بۆدڵنیابوونی پترو سوودبەخشیش، (کۆمەڵە بەڵگەنامەیێکی ڕەسمیی– مەلیحە
ەزهەت) دەخەمە ڕوو کە بێگومان کردەوەی خۆیو هەبوونی قوتابخانەکەیش، وێنەی
ەڵپەیێکی گیانی مرۆڤی کوردە لە بۆ پەڕینەوە لەڕابوردووی تاریکو نەهایتیو
ەئامێزگرتنی ڕووناکیی زانست و زانین و دووا ڕۆژی پێشکەوتوو!

# بەشی دووەم

## بەڵگەنامەکان "٨"

١. بەڵگە-کارنامەیێکی ڕەسمییانەی عەرەبییەو لە (٤ ی شەووالی ١٣٤٤ ک/٢٦ی یسان ١٩٢٦ و ١٢ ی زیلحیججەی ١٣٤٩ ک /٥ ی ماییسی ١٩٣١ دا دووبارە و بەقەڵەمی خۆی کۆمەڵێ پرسیاری وەڵام داوەتەوەو -بەڕێکخستنیانەوە- خۆیان بە ئەم جۆرە دەنوێنم:

-نێوی تەواوی خانەدانی: مەلیحە نەزهەت کیژی سەیید عەبدولقادر ئەفەندیی کوڕی شێخ عەبدوسسەلام ئەفەندیی قازیی"٩" (دایکی: خەدیجەیە، خەدیجەی کیژی شێخ ئەحمەددی شێخ ڕەسووڵی پڵاوخۆر/کەمال).

-ساڵ لەدایك بوون: ١٣١٢ ک/١٨٩٤ ز "١٠"، موسڵمان، شافیعیی، عێراقیی.

-شوێنی لەدایك بوون: مونتەفیك " ناسرییە /کەمال".

-مەڵبەندی خۆی و خانەدانی: سلێمانیی.

-شوێنی نیشتەنیی ئێستەی: سلێمانیی-گەڕەکی گۆیژە !

-هاوسەر/مێردی:عەبداللە ئەفەندیی نووری لەقەبدار بەموهتەدی، لە خانەدانی یووسف ئەلحەسەنی مووسڵییە"١١". کیژێکی تاقانەیان هەیە و تەمەنی نزیکەی سێ ساڵە ! "١٢".

-سەرچاوەی خوێندنی؟ (دەڵێت: کە منداڵ بووم، یێکەم جار "قرآن"م لەلای مەلا ئەحمەد لەسلێمانییدا خوێندووە. دوواتر لەلای سەیید عومەرعیرفان ئەفەندیی خاڵم"١٣" دەرسی تایبەتیم لە زمانی فارسییدا وەرگرتووە. دووای ئەوە خوێندنی فارسیی و زمانی تورکیم لەلای بابی خواڵێخۆش بووم عەبدولقادر ئەفەندیی قازیی پێشووی بازێڕی "دیوانییە" تەواوکرد. ئەوجا چوومە پۆلی دووەمی " قوتابخانەی سەرەتایی کەربەلا"و ماوەی ساڵێکم ڕابوارد. دوایی بەهۆی جێگە گۆڕکێی فەرمانی

بابمەوە بۆ بازێڕی "دیوانییە" چوومە پۆلی سێیەمی دەورەی نێوەندیی — دەورەی موتەوەسیتە — و کە دایك و براکانیشم چوون بۆ " سلێمانیی " لەگەڵیان ڕۆیشتم و دەستم لە قوتابخانە بەردا: ١٣٢٠ك/١٩١١ ز.

ئەو زانستانەی لەئەوێدا—دیوانییە/کەمال—دەمخوێند، ئەمە بوون: موساحەبات ئەخلاقییە، زمانی عوسمانیی، مێژوو، ماتماتیك و ئەندازە، نیگار و هتد !).

—کردەوەکانی—فەرمانەکانی کەدیتوونی؟:(لە١٧ ی کانوونی یێکەمی ١٩١٥ز. دا بە مامۆستای یێکەمی — ڕێبەر /کەمال—قوتابخانەی کیژانی سلێمانیی دامەزرام و بە مووچەی چوار سەد قرش. دوایی مووچەکەم گەییشتە ٦٠٠ قرش. ماوەی ڕاپەڕاندنی فەرمانەکەشم نزیکەی چوار ساڵ بوو. واتە هەتا ڕۆژی داگیرکردن: ٩ی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ز. دوای داگیرکاریش نەهاتمە پێشەوە بۆ فەرمانی دیتن هەتا ئەو کاتەی بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی بەغداد دایمەزراندم بەڕێبەری "قوتابخانەی کیژانی باقووبە" لە١ ی مایسی ١٩٢٦ دا و بە مووچەی سەد ڕوپییە، بەڵام لەبەر نەخۆش کەوتنی منداڵەکانم دەست بەرداربوونی خۆم و داخوازیم پێشکەشی بەڕێوەبەرایێتیەکە کرد کە لە٨/تەمووز /١٩٢٦ دا پەسەند کرا! دوواتر سەر لەنوێ مەعاریف لە١/تەشرینی یێکەم/١٩٢٧داو بەمووچەکەی جارانمەوە، دایمەزراندمەوە بە مامۆستای "قوتابخانەی کیژانی سلێمانیی"و تا نهوو لەسەر فەرمانم).

—ئەو زانستانەی شارەزایی هەیە؟: مێژوو، جوگرافیا، دورووەمانیی !

—ئەو زمانانەی دەیزانیێ؟: عەرەبیی، فارسیی، تورکیی، کوردیی بەقسە و نووسینەوە. پتریش دەستم لە تورکییدا هەیە !

—داندراوەکانی؟ (نییە !)

٢. بەڵگەنامەیێکی ڕەسمییانە — تورکیی زمان "١٤" — لاییەنگیری مودیرییەتی مەعاریفی مووسڵ، ژمارە:١٤٠٧/٢٤ی ڕێکەوتی٥/٤/١٩٤١کە "مەتنی بەڵگەنامەیێکی

تورکیی لەگەڵە " لەمەڕ (خزمەتگوزاریی مامۆستا مەلیحە خانم کە دەقا و دەقە لەگەڵ تۆماری عوسمانیی – سیجلی عوسمانیی) پارێزراو لەلای خۆی.

**کورتییەکەی ئەمەیە:**

(مەکتەب ئیناث–مێینە: مێژووی چوونەسەرکاری جێگری مامۆستا– وەکیلەی موعەللیمە–مەلیحەخان لە١٧/کانوونی دووەم/١٣٣١ ڕۆمیی/١٩١٥ ز " کەمال " کە لەسەر داخوازیی نازرییەت – وەزارەتی مەعاریفی میهرەبانە.

نێوبراو لەسەرەتای ساڵی١٣٣٤ی دارایی–ڕۆمیی/١٩١٨ز "کەمال" بەنێونیشانی موعەللیمەوە موچەی تەواوی وەردەگرێ. بۆ پێویستی بەکارهێنان، موتەسەڕڕیفییەتو پشکنەری مەعاریف ئاگادار کران!

١٣ مارت ١٣٣٤ /١٩١٨ ز "/تەواو

٣. بەڵگەنامەیێکی ڕەسمییانە– تورکیی زمان "١٥"– لەڕێبەری قوتابخانەی کیژانی سلێمانییەوە... ژمارە:٣٤ ی ڕێکەوتی ٢ ی تەشرینی دووەمی ١٩٢٧ بەرەو ڕووی ڕێبەری مەعاریفی نێوچەی بەغداد کراوەو دەستنووسی گوزیدەخانمی ڕێبەرە.. کورتییەکەی ئەمەیە:(فەرمانی دامەزراندنی مەلیحە نەزهەت خانم نەگەییشتووەتە قوتابخانەکەمان. وێڕای ئەوەی لە ساڵی خوێندنی ١٩٢٧–١٩٢٨ دا بە مووچەی ١٠٠ ڕوپییە کارگوزارە. تکایە مێژووی دامەزراندنیمان بۆ ئاشکرا بکەن تا بیخەینە ڕاپۆرتی مانگانەوە/تەواو).

(تێبینی: چەند پەراوێزێ لەنێو بەڵگەنامەکەدا هەیە، وەك پەراوێزی ژمێریار ئەحمەد بەگ کە دەڵێت: فەرمانێکی تایبەتی بۆ دامەزراندنی دەرنەچووە. بەڵکو خراوەتە نێو کارگوزاریی – میلاك – ەوە، هەروەها هاوتاکانیشی /تەواو " کەمال ").

لەلاییکی دییەوە، بەڕۆشنایی گفتاری مەلیحەخان کە گوتبووی لە ١ /١٠/ ١٩٢٧ داد دامەزراوە–کە ئەمەی نارێکە لەگەڵ فەرمانی دامەزراندنی بە بەراووردی لەگەڵ

نامەی باس کراو-ئەوە بەڵگەنامەیێکی دی کە لەلایێن ژمێریاری لیوای سلێمانییەوە دەرچووە و ژمارە: ٥ /٦١٢٣ ی ڕۆژی ٢ /١٠ /١٩٢٨ ی بەسەرەوە هەیە و بەرەو ڕووی بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی بەغداد کراوە دەڵێت: (وەڵام بۆ نامەی ژمارە ٣٢٣ ی ١٩٢٨/١/٢٥ تان، ئەوە مەلیحە نەزهەت خان، مامۆستای قوتابخانەی کیژانی سلێمانیی لە ٢١ ی ئەیلوولی ١٩٢٧ دا " ١٦ " هاتووەتە سەر کار /ئیمزای ژمێریاری /محاسب)، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ماوەیێ بەر لە دەرچوونی فەرمانی ڕەسمیی بۆ دامەزراندنی، چووەتە سەرکار!

٤. ئەرزوحاڵ-ڕازنامەیێکی داخوازیی بۆ دەست بەرداریی مامۆستا مەلیحە نەزهەت کە بەهۆی پشکنەری مەعاریفی کەرکووک-سلێمانییەوە بە مێژووی ٢٩ /٤ /١٩٣٠ پێشکەشی بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی نێوچەی بەغداد کراوە! لەبەر گرنگیی هێندەی لێ وەردەگرم: (.. لەسەردەمی پێشوودا-عوسمانیی /کەمال — من ئەم قوتابخانەیەم دامەزراندووە و ماوەی چوار ساڵێ بە ڕێگەوەم بردووە تا سەردەمی داگیرکردن.. دوایی لە ساڵانی ١٩٢٥ — ١٩٢٦ دا بۆ ماوەیێکی کورت ڕێبەری قوتابخانەی " باقووبە " بووم. دوواتر سەرلەنوێ بوومەوە بە مامۆستاییێکی ئەم قوتابخانەیەی ئێستەم و لەپاڵ ڕێبەری پێشوو " گوزیدەخان " کە شایانی سوپاس و ڕێز لێگرتنی بووم و دووچاری هیچ جۆرە گلەییێ نەبووم! !).

(تێبینی: ئەرز و حاڵنامەکە لەدووای چەند نامەیێکی ڕەسمییانەی ڕێبەری نوێ " زەهرا /کیژی مستەفا پاشای یامەلکێ " وە هاتووە کە ڕۆژانی ٢٩ /١ /١٩٣٠ و ٨ /٢/ /١٩٣٠ بەبیانووی ناڕێکیی کارکردنی لێی نووسیوە بۆ بەڕێوەبەرایێتی نێوچەی بەغداد. لەگەڵ ئەوەی نێوەخنی ئەرز و حاڵنامەکەی مەلیحە نەزهەت خان هۆی دی ئاشکرا دەکا-هێندێکی تایبەتە بە ڕەفتار و ڕەوشتی ڕێبەرەکە و من نامەوێ باسیان زیندوو بکەمەوە-دیارە کە دەست بەردارییەکە پەسەند نەکراوە. بەڵگەش نامەی ڕەسمییانەی

پشکنەری مەعاریفی کەرکووک – سلێمانییە بۆ بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی بەغداد: ژمارە – ٢٦٦ ی ١٤ /٥ /١٩٣٠ کە دەڵێت: " ئەرزوحاڵنامەی مامۆستا مەلیحە نەزهەت پێشکەش دەکەم و باوەڕم ئەوەیە کە چاکترە دەست بەرداربوونی پەسەند نەکرێ. چونکە لەدووای ڕێبەرەکەوە چاکترین مامۆستای قوتابخانەکەیە. هەروەها لەبەرئەوەش کە بەهانەی ڕەوایشی هەیە–بەهانەی ژانی مانگانەی ژنانە وەك خۆی لە ئەرزوحاڵنامەکەدا ڕوونی کردووەتەوە/کەمال – بۆیێکا دەتوانرێ ببەخشرێ و ئیدی فەرمان فەرمانی بەڕێزتانە! /تەواو "

٥. بەڵگەنامەی ڕەسمییانەی ژمارە: م /٩٥ /١٧ ی ڕۆژی ١٨ /مایس /١٩٣٠ ی بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی بەغداد کە وەڵامی مەلیحە خان بە (پەسەندنەکردنی داخوازیی دەست بەرداربوون) ی دەداتە دوواوە. داوایشی کردووە کە (هەموو ناڕێکیی نێوان خۆی و ڕێبەرەکەی چاك بکرێ!) و باوەڕیشی هێناوە بە (توانا و چالاکیی!)

٦. بەڵگەنامەیێکی ڕەسمییانەی سەرئاسا –فەوقولعادە و عەرەبیی زمان – ژمارە: ٣ ڕێکەوتی ٢٩ /٣ /١٩٣١ بە ئیمزای " ف. علیە /فاتمە عەلییە – یان فاتمە محیەددین پەریی /کەمال " لەبریی ڕێبەری قوتابخانەی کیژانی سلێمانیی لەمەڕ " جوێ بوونەوە و هاتنەوە سەرکاری مەلیحە نەزهەت" کە وێ دەچێ لە پشوودانێ گەڕابێتەوە و ماوەی نێوان ٤ /٣ و ٢٥ /٣ /١٩٣١ ی بەسەربردبێ!

٧. بەڵگە، سەرفەرمانێکی ڕەسمییانە–عەرەبیی زمان – بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی سلێمانیی: ژمارە: ١٣٥٧ ی ڕێکەوتی ١٧ /١٠ /١٩٣٤ کە بڕیاری داوە لە ١ /١ /١٩٣٤ بەدوواوە مەلیحە نەزهەتی مامۆستای " سدیقەی کیژان " بەرۆشنایی مووچەی مانگانەی " ٧,٥٠٠ " فلسەوە کرێی کاری دوو ساعاتی زیادەی پێ بدرێ!

٨. بەڵگە، سەرفەرمانێکی ڕەسمییانە–عەرەبیی زمان–بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی سلێمانیی ژمارە: ١٥٤٥ ی ڕێکەوتی ١ /١٢ /١٩٣٤ کە ئاشکرای دەکا: بەپێی فەرمانی

بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی گشتیی، مووچەی مامۆستایان (مەلیحە نەزهەتی مامۆستای سدیقە لە ۷,٥۰۰ فلسەوە زیاد بکرێ بۆ ۸ دینار! ڕێبەری قوتابخانەی زەهراش فاتیمە عەلییە لە ٥,٦۲٥ فلسەوە زیاد بکرێ بۆ ٦ دینار!!) "۱۷"

۹. بەڵگە، سەرفەرمانێکی بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی سلێمانیی ژمارە: ۹۲۲ ی ڕێکەوتی ۲۰ /۱۱ /۱۹۳۷ ئاشکرای دەکا: مامۆستا مەلیحە نەزهەت لە مامۆستایێتی سدیقەوە بکرێ بە یێکەم مامۆستا – ڕێبەر–ی قوتابخانەی گۆیژەی کیژان! "۱۸"

۱۰. بەڵگەنامەیێکی ڕەسمییانە–عەرەبیی زمان–ی مەعاریفی سلێمانیی ژمارە: ۱۱ /۳ /۱۳۹۰ ی ڕێکەوتی ۸ /٤ /۱۹٤۱ بەرەوڕووی بەڕێوەبەرایێتی دارایی گشتیی–بەشی خانەنشینەکان کراوە و بەڵگەنامەی ڕەسمیی " گەڵاڵە کراوی بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی مووسڵ–بەشی تۆماری عوسمانیی و پارێزراوی پێشکەش دەکا لەمەڕ سەلماندن و ژماردنی خزمەتگوزاریی ڕابوردووی مامۆستا " مەلیحە نەزهەت عەبدولقادری ڕێبەری قوتابخانەی گۆیژەی کیژان!".

۱۱. بەڵگەنامەیێکی ڕەسمییانە–عەرەبیی زمان–ی وەزارەتی مەعاریف، بەشی کارگوزاریی، ژمارە: ۲۰۲٦۳ ی ڕێکەوتی ۱۲ /۱۱ /۱۹٤۱ لەمەڕ ڕەزامەندیی وەزیری پایەبەرز بۆ خانەنشین بوونی مەلیحە نەزهەتی ڕێبەری قوتابخانەی گۆیژە و دانانی زەکییە زوهدی بابان، دەرچووی خانەی مامۆستایانی یێکەمین–دارولموعەللیماتی ئوولا–لەجێگەی ئەو بە مووچەی ٦ شەش دینار!

**دووا وشە**

هێندێ وردە خاڵی دی و هەڵسەنگاندنی پێویست دەبینم:

مامۆستا فاتیمە محیەددین پەریی–لای در. کەمال مەزهەر ئەحمەد نێوی مورەککەبی خۆی: فاتمە عەلییەی نەگێڕاوەتەوە–گوتوویێتی گۆیا لە قوتابخانەی "

ئیتتیحاد و تەرەققیی بەغداد " دا خوێندوویێتی. ئەو قوتابخانەیەی کە باس کرا لە ٢٥ /١ /١٩١٤ دا دامەزراوە و لە ١٩١٧ز.دا هەڵگیرا!

ئەمە مانای ئەوەیە: کاتێ یێکەم قوتابخانەی کیژان لە ١٩١٥ز.دا دامەزراوە، فاتمەخان شاگرد بووە!

ئەو مامۆستا بەڕێزە کە هەرگیز کاروانی خوێندنی خۆی ڕۆشنا نەکردووەتەوە هەروەها نەیگوتووە داخۆ شەهادەی خوێندنی لە خانەی مامۆستایانی عوسمانییەوە وەرگرتووە، باوەڕم دەداتێ کە وەك مەلیحەخان بەنێوی " جێگری مامۆستا-باش موعەللیم" ەوە دامەزرابێ. ئەم تاریفە عوسمانیی-عێراقییە بەسەر ئەو کەسانەدا دابڕاوە-پیاو چ ژن-کە خوێندنی خانەی مامۆستایانیان نەبڕیی بێ!

بەڵگەیێکی دی یێکەمیی مەلیحە نەزهەت خان و پێشکەوتنی خزمەتگوزاریی بەرامبەر فاتمەخان بە ئەوەشدا ساخ دەبێتەوە کە ساڵی ١٩٣٤ مووچەی مەلیحەخان لە مووچەی فاتمەخان پترە!

جێگەی باسە، فاتمەخان لای در. کەمال مەزهەر ئەحمەد ڕایگەیاندووە کە قوتابخانە دووەمەکەی سلێمانیی ١٩٢٦ز (بۆ ڕێز لێگرتنی ناسنێوی " زەهرا " ی بەسەردا براوە). ڕاستییەکەی ژمارەکانی ڕۆژنامەی (ژیان-١٩٢٦) و دوواتریش. هەروەها بەڵگەنامە بلاوکراوەکانی ئێرەش-بەدەستنووسەکەی فاتمە عەلییەشەوە-دەیسەلمێنن کە درەنگێ بە ئەو ناسنێوەوە دەرکەوتووە. بۆ وێنە لەدووای تێپەڕبوونی هەشت ساڵەوە، واتە لە ١٩٣٤ دا - کە فاتمەخان ڕێبەر بووە-بە ئەو نێوناسەوە دەرکەوتووە. باوەڕیشم هەیە کە ئەم ناسنێوە لەسەردەمی ڕێبەری دووەم " زەهراخان " وە هەڵکەوتووە "١٩" نەك لەسەردەمی فاتمە خاندا!

دوواجار دەوری پێشڕەویی مەلیحەخان هەر ئەوە نییە کە دامەزرێنەر و یێکەم مامۆستای یێکەم قوتابخانەی سلێمانییە، بەڵکو گرنگتر ئەوەیە کە خانەدانەکەی لە

کۆمەڵێکی دوواکەوتووی گۆشەگیری ئەو ڕۆژگارانەدا، هانی خوێندن و پێگەییشتن و هەڵگرتنی ئەو ئەرکەی داوە و لە گەرمەی یێکەم جەنگی گێتییدا سەربەرزانە ئەرکەکەی ڕاپەڕاندووە و کلاوڕۆژنەییێکی ڕووناکی کردووەتەوە و تا ساڵی ١٩٤١ خزمەتگوزار بووە! "٢٠"

ئەم پێشڕەوە و هاوەڵەکانی: گوزیدەخان، فاتمەخان، زەهراخان"٢١"، سەبیحە محەممەد ئەمینی مامۆستای قوتابخانەی تەوێڵە-١٩٢٤، نەسیمە یەعقووب مامۆستای قوتابخانەی هەڵەبجە - ١٩٣٧، ناجیە بەشیر مامۆستای قوتابخانەی سدیقە-١٩٣٤ و گەلێکی دی-وەك بەهیە مەعرووف-بەڕاستیی لە (مێژووی سلێمانیی)دا دەروازەی ڕووناکیی و خێریان لە خەڵکیی کردووەتەوە، بۆیێکا دەبێت لەخانەی نەمرەکانی کورد دا بناسرێنەوە!

داخۆ بۆ پیرۆزیی نێوی مەلیحە نەزهەت خان کەسێ گوێ دەگرێ و نێوی (مەلیحە نەزهەت) بەسەر قوتابخانەیێکی کیژانی سلێمانییدا دادەبرێ؟

ڕاستییەکەی من خۆم لەنێوان ساڵانی ١٩٨٦-١٩٩٧ دا چەندجار چوومەتە سەر ڕێبەرە گشتییەکانی پەروەردەی سلێمانیی و بەرەو ڕوو پێشنیازم بۆ کردن کەچیی کەسیان گفت و قسەی نەبردە سەر و درۆزن بوون!

## پەراوێز

"١". وەك ڕوونە، من لەمەڕ قوتابخانە ڕەسمییەکانی کوڕان - کیژانی نێو باژێڕی سلێمانیی ئاخاوتووم نەك لەمەڕ هەموو قوتابخانەکانی لیواکە و خوێندنی نێو فێرگە و حوجرەکان!

"٢". دەستنووسی کارنامەی ئەو مامۆستایە، بەڕێز بەهجەت سەعید کابانی کوڕی پێشکەشی کردم. سوپاس!

"٣". لە دەستنووسێکی کارنامەیەوە - وەرگیراوم لە بەڕێوەبەراییێتی گشتیی پەروەردەی سلێمانیی - س ١٩٨٤.

"٤". بە داگیربوونی عێراق لەلایێن ئینگلیزەوە لە نێوان ١٩١٧ – ١٩١٨ ز. دا، بەرنامەی خوێندنی عوسمانیی هەڵوەشایەوە، تەنانەت وەك ساتیعولحوسەریی دەگێڕێتەوە، نیزامی خوێندنی بەریتانیی لە عێراقی داگیرکراودا لە ساڵی ١٩١٩ بەدواووە پەیڕەوکراو بەرنامەی خوێندن لە هەرێمی مووسڵ – ١٩١٩ دا چاپ و بڵاوکرایەوە (٣ /ل١٠٥)، هەڵبەت کاپیتان جیرۆم فارێل G. Farell ی چاودێری گشتیی مەعاریفی هەرێمی مووسڵ – لە ڕۆژنامەی پێشکەوتنی سلێمانییدا نێوی هەیە – هەمان بەرنامەی لە سلێمانییشدا پەیڕەو کردووە (٦ /ل١١٧) بەلام وەك لێی ورد بوومەتەوە، میجەر (سۆن Soane) پتر پەرۆش بووە و هەر ئەویش هانی مامۆستا سەعید سدقی کابانی دابوو کە لەو هەلەدا (سەرف و نەحو – صرف و نحوی کوردی) ی دابنێ ... رەنگبێ– وەك مس بێڵ Miss Billباوەڕی هەیە – فارێل کتێبی (ئەووەلەمین قیرائەتی کوردیی) دانا بێ!

"٥". وێڕای دەستنووسی کارنامەی چەند مامۆستاییێکی پێشڕەو، (پێشکەوتن – سلێمانی: ژ ١) ڕاپگەیاندووە کە لە ٢٨ /٦ /١٩٢٠ دا ساڵی خوێندنی ١٩١٩ – ١٩٢٠ تەواو بووە!

"٦". کارنامەی دەستنووسی مامۆستاکەم لە (خێرات) ی کیژیەوە وەرگرتووە، بەغداد – ١٩٨٦.

"٧". هەمان سەرچاوە.

"٨". ئەم کۆمەڵە بەڵگەنامانە – بە ئیزنی بەڕێوەبەرایێتی گشتیی پەروەردەی سلێمانیی – بە هاریکاریی بەڕێزان مەحموود تۆفیق خەزنەدار، فەخرییە نامدار، عەلی قرگەیی لە پاییزی ١٩٨٣ ز. دا دەستگیر و فۆتۆکۆپیم کرد. سوپاسیان پێویست دەبینم!

"٩". خانەدانی شێخ سەلامی قازیی، خانەدانێکی زانست پەروەر و ناسراوی سلێمانییە! ئێستەش (مزگەوتی شێخ سەلام) ئاوەدانە، بەلام بێ نازەو فێرگەکەی کوێربووەتەوە، کاتی خۆی شێخ سەلام خۆی مامۆستای بووە و دووایش بەرەو ڕووی مەلا عەبدوڕڕەحیمی چرووستانیی کردووە. (٤ /ت٤١).

"١٠". لە کارنامەییێکی دیدا – بەڕۆشنایی شوناسنامەی – ساڵەکە بە ١٨٩٣ ز نیشانەکراوە.

"١١". لەنێوان ١٨٦٦ – ١٩٥٢ ز. دا ژیاوە و قوتابخانەکانی سەرەتایی و نێوەندیی سلێمانیی، باقووبە، مووسڵ، هەولێری کردووە.

"١٢". پاییزی ١٩٨٦ چوومە بەغداد و بەهۆی نێوی هاوسەریەوە محەممەد حیکمەت زەهاویی – لە دەلیلی تەلەفووناتدا – ماڵی (خێرات) ی کیژی عەبداللە نوورولموهتەدی و مەلیحە ئەزمەتم دۆزییەوە کە میوانداریان کردم و وێنەی فۆتۆگرافیی و کارنامە و هێندێ دەستنووسی باب و دایکی پێشکەش کردم. سوپاس!

"١٣". عومەر عیرفان ئەفەندیی " ١٨٨٢ – ١٩٣٢ ز " کوڕی شێخ ئەحمەدی شێخ ڕەسووڵی پڵاوخۆرە. خوێندنی قانوونی لە ئەستەنبووڵدا تەواو کردووە و ساڵی ١٩٢٣ گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانیی.. شاعیر و نووسەر بووە و گۆیا ڕۆمانی (فەتحی ئەستەنبووڵ)ی لە فرانسییەوە کردووە بە کوردیی! من ئاگاداری ڕۆمانی ئەوتۆ نیم! ! (٢٢ /ل٤).

"١٤". مامۆستای کۆچ کردوو ئەحمەد خواجەی مێژوونووس لە ساڵی ١٩٨٤ ز. دا بەڵگەنامە تورکییەکانی بۆ گۆڕیم. جێگەی بەهەشت بێ!

"١٥". هەروەها.

"١٦". لە دەفتەری کارنامەیدا مێژووەکە ١ /٢ /١٩٢٧ نووسراوە.

"١٧". بۆ کەڵکی ئەدەب دۆستان دەیگێڕمەوە: لە ئەو فەرمانەدا (عەبداللە گۆران) ی شاعیر نێوی هاتووە کە مامۆستای گوندی " سێوسێنان " بووە و مووچەکەی لە ٧,٥٠٠ فلسەوە بووە بە ٨ دینار.

"١٨". لە ئەم بەڵگەنامەیەدا فەرمانێکی بەڕێوەبەرایێتی گشتیی مەعاریف، ژمارە: ١٣٦٧٧ – ٣ /١٠ /١٩٣٧ هەیە کە باس لە ڕاگواستنی (قوتابخانەی تەوێڵە) دەکات بۆ (سلێمانیی) و مامۆستا سەبیحە محەممەد ئەمینی لە تەوێڵەوە ڕاگواستووەتەوە بۆ قوتابخانەی کیژانی هەڵەبجە و نەسیمە یەعقووبی مامۆستای ئەوێی ڕاگواستووە بۆ قوتابخانەی سدیقەی سلێمانیی و (مەلیحە نەزمەت) یشی بۆ قوتابخانەی گۆیژە گۆڕیوە و مووچەکەیشی گەیشتووەتە دە دینار.

"١٩". نێوی (زەهرا زەرین تاج، فاتمە زەهرا محیەددین ئەفەندیی) لە ڕۆژنامەی سلێمانییدا ئەوها دەرکەوتووە! (٢٠ /ل٣).

"٢٠". بە قسەی خێرات خانی کیژی خۆی، مەلیحە نەزمەت لە ڕۆژی ٢ /٤ /١٩٦٧ دا لە بەغداد دا کۆچی ماڵئاوایی کردووە و لە ئەوێشدا ئەسپاردەی خاک بووە!

"٢١". کردەوەییێکی مێژوویی مامۆستایان مەلیحە نەزهەت و زەهرا یامەلکێ، فاتمە محیەددین پەریی ئەوەیە کە بەر لە دامەزراندنی (کۆمەڵی زانستیی ژنان – سلێمانیی: ٢٨ /٧ /١٩٣٠) پێکەوە پۆلێکی یێکەمینیان بۆ (پاکۆدانی نەخوێندەواری نێو ژنان) کردووەتەوە و ڕۆژی سێ سەعات دەرسیان گوتووەتەوە. (١٨ /ل٢).

تێ بینی: وێنەکانی مەلیحە خان، یێکێکی لە مامۆستای بەرێز کۆچ کردوو بەهیە شێخ مەعرووفەوە، سیانی دی لە خێزانی مەلیحە نەزهەت – عەبداللە نوورولموهتەدیەوە. سوپاسیان دەکەم.

** ر= ڕۆمیی، سڵی دارایی عوسمانیی

ك =ساڵی کۆچیی

ز= ساڵی زایینی عیسا

**تەماشاکراوەکان**


(١) . ئەحمەد: کەمال مەزهەر " در ": (تێ گەییشتنی ڕاستیی – بەغداد ١٩٧٨).

(٢) . ئەحمەد: کەمال مەزهەر ئەحمەد: (چەند لاپەڕەیێ لە مێژووی گەلی کورد – بەغداد ١٩٨٥).

(٣) . الحِصری: ساطع: (مذكراتي في العراق. ط ١. بيروت ١٩٦٧).

(٤) . القزلجي: محمد : (التعريف بمساجد السليمانية ومدارسها الدينية. بغداد ١٩٣٨).

(٥) . الهلالي: عبدالرزاق: (تاريخ التعليم في العراق في العهد العثماني – بغداد ١٩٥٩).

(٦) . الهلالي: عبدالرزاق: (تاريخ التعليم في عهد الاحتلال البريطاني – بغداد ١٩٧٥).

(٧) . زكي: محمد امين: (تاريخ السليمانية وانحاءها " ترجمة جميل الروژبياني – بغداد ١٩٥١).

ڕۆژنامە و گۆڤار:

(٨) . پێشکەوتن – سلێمانیی: س ١، ژ ٣، ١٢ /٥ /١٩٢٠

(٩) . پێشکەوتن – سلێمانیی: س ١، ژ ٨، ١٧ /٧ /١٩٢٠

(١٠) . پێشکەوتن – سلێمانیی: س ١، ژ ١٠، ١ /٨ /١٩٢٠

(١١). پێشکەوتن – سلێمانیی: س ١، ژ ١٨، ٢٦ /٨ /١٩٢٠

(١٢). پێشکەوتن – سلێمانیی: س ١، ژ ٤٦، ١٠ /٢ /١٩٢١

(١٣). پێشکەوتن – سلێمانیی: س ٢، ژ ٧٠، ٢٥ /٨ /١٩٢١

(١٤). گۆڤاری: دەنگی گێتی ی تازە – ب ٤، ژ ٥، ئاغۆستوس ١٩٤٥.

(١٥). ڕۆشنبیری نوێ – ژ ٣٣، ئادار ١٩٧٩

(١٦). ڕۆشنبیری نوێ – ژ ٩٠، ١٩٨٢

(١٧). ڕۆژنامەی: ژیان – س ١، ژ ١٣، ٢٢ /٤ /١٩٢٦

(١٨). ڕۆژنامەی: ژیان – س ١، ژ ٢٤١، ٢١ /٥ /١٩٣٠

(١٩). ڕۆژنامەی: ژین – س ٢١، ژ ٨٦٦، ٣ /٤ /١٩٤٧

(٢٠). ڕۆژنامەی: ژین – س ٢١، ژ٨٧٩، ١٧ /٧ /١٩٤٧

(٢١). ڕۆژنامەی: ژین – س ٢١، ژ ٨٨٠، ٢٤ /٧ /١٩٤٧

(٢٢). ڕۆژنامەی: ژین – س ٣١، ژ ١٣١٥، ٤ /١٠ /١٩٥٦

(٢٣). کوردستانی نوێ – س ٥، ژ ١٤٣٤، ١٩ /٣ /١٩٩٧

(٢٤). هاوکاری – ژ ٦٩٢، ٢٣ /٦ /١٩٨٣.

———— ٠ ————

# ٥

# یێکەم حوکوومەتی کوردستان

## ١٧ /١١/ ١٩١٨ نەك ١/١١/ ١٩١٨ دامەزراوە

### پێشەکیی

هەڵەکە هەشتا ساڵانە، گەورەیە، باوە.. لەزووەکەوە نووسەرەکان–بەئاگادارەکانیشەوە– بەجودا ژمارەیێکیان داتاشیوە بۆ ڕۆژێکی مێژوویی گەلی کورد، ڕۆژی دامەزراندنی یێکەم حوکوومەتی کوردستان!

ئەز بەڕۆشنایی (بەڵگەنامە)یێکی ئەفسەرێکی ڕۆژگارەکە مێژوویێکی (نوێ)م لە (کوردستانی نوێ –١٥/١٢/١٩٥٥. سلێمانیی)دا بڵاوکردەوە..زۆری نەبرد بەڵگەنامەیێکی دی،قسەو باسی ڕەسمییانەیئینگلیزخۆی، سەرنجی ڕاکێشام کەمێژووەکەی (ئەفسەرە) باس کراوەکەی (دوو ڕۆژ بردووەتە دوواترەوە!). ئیدی پێویستم زانیی جارێکی دی لە (کوردستانی نوێ:١٠/٧/١٩٩٧. سلێمانیی) دا (مێژووە نوێ) یێکە بڵاوبکەمەوە.

سەیرم پێ دێ لە یادی هەشتا ساڵەی ئەو حوکوومەتەدا، دیسان هەڵە باوەکە کە (١/١١/ ١٩١٨) لە(کوردستانی نوێ – ٤ /١٢/ ١٩٩٨، لەندن) دا بەکارببرێتەوە!!

ئەوە هەموو ڕاستییێ لەگەڵ (مێژووە ڕاستەکە) دەخەمە ڕوو بەشکو ئیدی لە ئەو هەڵەیە بپەڕینەوە و ڕاستیی بچەسپێت!

### ١- خوێندنەوەی سەرچاوە گرنگەکان!

١/١: دوو سەرچاوەی ئینگلیزیی هەرە باوەڕ پێکراو، جێگری حوکمداری گشتیی مەملەکەتی بەریتانیا لە عێراقدا، کۆڵۆنیل ئا. تیێ. وێڵسن A.. T. Willson (١ /ل١٧٥ – ١٧٧). هەروەها سکرتێری گشتیی مس: گ. بێل Miss. G. Bill (٤ /ل١٨٩) لە دانراوەکانی خۆیاندا – بێ نیشانەکردنی ڕۆژەکە کە یێك مێژوویان تۆمار کردووە –

دەگێڕنەوە: (مێجەر. نۆییل Noel. ڕاسپێردراوە کە بچێتە سلێمانیی و لە " نێوەندی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ دا " گەییشتە جێ و گەرم و گوڕ پێشوازی لێ کراو ... دەست بەجێ حوکوومەتێکی ڕێبەراییێتی – دەمەکیی کوردیی پێك هێنا و شێخ مەحموودی کرد بە حاکم – حوکمدار –ی نێوچەکە!).

٢/١: حەفید زادە مەحموود – یادی بەخێر – لەگفتو گۆیێکی ڕۆژنامەنووسیی سالّی ١٩٣٦ دا – بێ نیشانەکردنی مێژووی دامەزراندنی – بۆ حەبەزبووزی ڕۆژنامەوانی گێڕاوەتەوە: (دووای ئاگربەستی س ١٩١٨، حوکوومەتی کوردی پێکهات و ماوەی حەوت مانگی خایاند). (٧ /ل١٢٠).

٣/١: مێژوونووسی عێراق عەبدورڕەزاق ئەلحەسەنیی دەلێت: (مێجەر نۆییل ڕاسپێردرا لە نێوەندی مانگی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ دا بچێتە سلێمانیی ... هتد!). (٥ /ل٢٦٢).

٤/١: ئەحمەد خواجە – لاوی ئاگاداری ڕووداوەکان – لە دانراوی مێژوویی خۆیدا دەلێت: (نوماینده و نوێنەری ئینگلیز، مێجەر نۆییل لە ڕۆژی " ١٨ ی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ دا " پاش نیوەڕۆ گەیشتە سلێمانیی و ڕۆژی دوایی لە بەردەرکی سەرای حوکوومەتدا، لەپێش چاوی هەزاران دانیشتووانی شار و عەشائیرەکان چووە سەر کورسیی، بە زمانی فارسیی گوتی: " بەنێوی حوکوومەتی بەریتانیا و حاکمی عامی عێراقەوە قسەتان لەگەلّ دەکەم! لەسەر فەرماییشتی حاکمی عام لە بەغداد: شێخ مەحموود حوکمداری کوردستانە!). (٢ /ل٢٠–٢١).

٥/١: ڕەفیق حیلمی – مامۆستای قوتابخانە و ئاگاداری ڕووداو و بەیعەت بە حوکمدار – لەیاداشتی ناسراوی خۆیدا دەلێت: (نۆییل لەگەلّ هەیئەتێکی پچووك – دەلێن مێجەر دانێلس A.M.Daniels ی لەگەلّ بووە –بەڕێگەی چیاکانی کفری و چەمچەمالّدا هاتە "داریکەلی " ئەمجا سلێمانیی... مێجەر نۆییل ڕۆژی " یێکەمی تەشرینی دووەمی

١٩١٨ " لە بەردەرکی سەرا کۆبوونەوەیێکی گەورەی ڕێکخست و گوتارێکی درێژی خوێندەوە و بڵاوی کردەوە، "شێخ مەحموود لەلایێن حاکمی عامی عێراقەوە بە حوکمداری کوردستان ناسرا!). (٤/ل٥٨-٦١).

٦/١: در. جەمال نەبەز - نازانرێت لەکوێوە باسی وەرگرتووە - دەڵێت: (ڕۆژی ٢ی تەشرینی دووەمی ١٩١٨ لە هەڵبژاردنێکی ئازاددا شێخ مەحموود بە مەلیکی کوردستان "!!" هەڵبژێردرا!) (٦ /ل٤١٠).

**٢: وردبوونەوە**

١/٢: ئاشکراکردنی نێوەندی تەشرینی دووەمی١٩١٨/ت٢: سیی ڕۆژە و نێوەندەکەی ١٤-١٦ی مانگەکە دەگرێتەوە، بێگومان ئا.تیێ.وێڵسن هەرگیز هەڕەمەکیانە نە ئاخاوتووە، چونکە- دووای پەرسی کۆکسی حاکمی گشتیی مەملەکەتی بەریتانیا لە عێراقدا کە لە١٥/ئەیلوول/١٩١٨ ڕووی کردە ئێران بۆ کاروباری فەرمانی نوێی-هەر خۆی نەخشە کێش و بڕیارنووسی سیاسەتی ڕاسپاردنی مێجەر نۆیێل بوو! ئەوەتە هەرخۆی بە ئەم دەسەڵاتەوە نێوبراوی ناردووە: (.. تۆ لە١ی تەشرینی دووەمەوە١٩١٨ز /کەمال - دانرایت بە حاکمی سیاسیی کەرکووك ... تۆ بەکەڵکی بزانیت دەسەڵاتت هەیە " شێخ مەحموود " لە سلێمانییدا بە نوێنەری ئێمە دابمەزرێنیت!). (١ /ل١٧٥-١٧٦).

کەواتە (نێوەندی: ت٢) جێگەی ئەوپەڕی متمانەیە، بەتایبەتی کە نێوبراو لە (١/ت٢)ەوە دانراوە بە حاکمی سیاسیی نێوچەی کەرکووك (نەك سلێمانیی ... نێوبراو کە هاتە سلێمانیی و شێخ مەحموودی بە حوکمدار ناساند، خۆی بوو بە ڕاوێژکاری!).

٢/٢: شێخ مەحموود لە گفتو گۆیدا بۆ "حەبەزبووز"ی ڕۆژنامەوان، کە ماوەی حوکمدارییەکەی بە حەوت مانگ ئاشنا کردووە، دیارە ماوەکەی خستووەتە سنووری (ڕۆژی دامەزراندنی و "!!" دیل بوونی لەدوای شەڕەکەی دەربەندی بازیانەوە: ١٩١٩/٦/١٨).

ئەگەر مێژووەکەی ڕەفیق حیلمیی (١١/١:ت٢) لە بەرامبەر حەوت مانگەکە ڕابگیردرێت، دیارە ماوەی حوکمدارییەکە لە (حەوت مانگ و نیو پترە!) کە ئەمەش ناڕێکە، چونکە (نیو مانگێ نرخی پترە— گریمان چەند ڕۆژەکەش لە نێو گفتوگۆییێکی ڕۆژنامەنووسییدا بێ بەرەکەت بێ — دیارە ڕەواو پێ ویست بوو کە شێخ مەحموود بڵێت (حەوتو مانگو نیو!)، کە ئەمەیشی نەگوتووە دیارە (نیو مانگەکە) بەر ماوەکە نەکەوتووە کە بەریش نەکەوتبێ، دیارە مێژووەکەی ڕەفیق حیلمیی (١١/١) هەڵەیە. بەڵام ئەگەر مێژووەکەی ئا. تێ. وێڵسن (نێوەند:١٤تا١١/١٦:ت٢) لە بەرامبەر (حەوت مانگەکە) ڕابگرین، تەواو دیارە کە (ماوەکە) ڕاستو دروست (حەوت و مانگ و چەند ڕۆژێ!!) دەگرێتەوە!

بە ئەم پێیە دیسان دیارە کە سنووری مێژووی (نێوەند:١٤—١١/١٦: ت٢ /١٩١٨) بۆ دامەزراندنی و (١٩١٩/٦/١٨) بۆ کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی حوکمدارییەکەی یێک دەگرنەوەو مێژووەکەی ڕفیق حیلمیی (ناپەسەندە!).

٣/٢: مێژووەکەی عەبدوڕڕزاق ئەلحەسەنیی دیارە مایەی دڵنیایی و متمانەی زانستییە بەرامبەر مێژووەکەی ئا. تێ. وێڵسن و متمانە نەکردنیشە بە ڕەفیق حیلمیی!

٤/٢: مێژووە نووسراوەکەی ئەحمەد خواجە (١٩١٨/١١/١٨) کە نزیکترین مێژووە لە ئا. تێ. وێڵسنەوە، بەڵگەنامەییێکی ڕۆژگارەکەی لەگەڵ نەنوواندوە تا دڵنیا ببین: ڕۆژی دوواتر: ١٩١٨/١١/١٩ جاڕی حوکوومەتی دامەزراندن درابێ!! (ڕۆژی ٣٠ /١١ /١٩٩٥) کە باسی بەڵگەنامەی ئەفسەرەکەم لاکردەوە، فەرمووی ئەوە بەڕاستتر وەردەگیردرێ، چونکە کەسەکە — ئەدهەم ئەحمەد — خۆرڕاستان تێکەڵ و بەشداری ڕووداوەکان بووە و خۆیشی لەدووای شەڕی تاسلووجەی قەوماوی ٢٥ /مایس /١٩١٩ ەوە بۆ یێکەمین جار تێکەڵ و پێوەندیی لەگەڵ شێخ مەحموود هەبووە، بەڵام وەك ئەنجامی ئەم باسە دەریدەخات، ئەحمەد خواجە مێژووەکەی — لە هەمووان — نزیکتر ڕاگرتووە!

**٥/٢:** مێژووەکەی ڕەفیق حیلمیی، (١/١١/١٩١٨) کە بووەتە هەڵەییێکی گەورە و باو – خۆمیش لە ١٩٨٤ دا بەر تەڵەی کەوتم – وەك چ بەڵگەنامەییێکی لەگەڵ نییە و پشتی کردووەتە مێژووەکانی (وێڵسن و مس بێل) شایانی کێشانێکی وردە، ئەگەرچی مێژووەکانی، (١ /١١ /١٩١٨ – دەسەڵات دان بە نۆییل " کردنی بە حاکمی نێوچەی کەرکوك " یان (١ /١٢ /١٩١٨ – هاتنی وێڵسن بۆ سلێمانیی و کۆبوونەوەی لەگەڵ شێخ مەحموود) ڕەنگبێ سەریان لیَ تێك دابیَ ! !

بۆ کێشانی ئەو مێژووە لە تەرازوودا، جاریَ – هەر بۆ وێنە – نووسینی خۆی بەرەو ڕووی مێژووی (١ /١١: ت٢ /١٩١٨) ی دانراوی خۆی دەکەینەوە !

خۆی ڕەفیق حیلمیی بەئاشکرا باسەکانی ئەوها دەگێڕێتەوە: (.. بەلاَم وەك گوتمان لەناکاو لە ٣١ ی تەشرینی یێکەمی ١٩١٨ دا موتارەکە – هودنە – بلاَوکرایەوە /ئەو مێژووە هەڵەیە و ڕاستییەکەی ٣١ ی تەشرینی یێکەمی ١٣٣٤ " ڕۆمیی بەرامبەر ٣٠ تەشرینی یێکەمی ١٩١٨ ی زایینە /کەمال – ئیدی عەلی ئیحسان پاشا چارەی نەما و بە تەلەگراف ئەمری دا بە موتەسەڕڕیفی سلێمانیی کە ئیدارەی لیواکە بداتە دەست شێخ مەحموود و خۆی بگەیێنێتە مووسڵ ! ! . شێخ مەحموود بە ئەم جۆرە بوو بە موتەسەڕڕیفی سلێمانیی و جاریَ بەنێوی حوکوومەتی عوسمانییەوە ئیدارەی گرتە دەست ! ! .

موتەسەڕڕیفی تورکەکان لە ئەو ڕۆژگارەدا لە سلێمانیی عەلی ڕەزا بەگ نێوێکی خەڵکی " قۆنییە " بوو، لەگەڵ ئەو پیاوانەی میریی کەرکووك و یا غەیرە تورك بوون، سلێمانییان بەجیَ هێشت و چوونە مووسڵ و فەوجە عەسکەرەکەی تورك لەژێر سەرەکیی ساڵح بەگی تابوور ئاغاسییدا، هێندیَ جەندرمەش هێشتا لە سلێمانییدا بوون ! !، بەلاَم کە حاڵ گەییشتە ئەم ڕادەیە: شێخ مەحموود جارێکی دی دەستی لە تورکەکان شت و هیوای گەڕانەوەی پێیان نەما. لەبەرئەمە دەستی لە ڕێکخستنی ئەو

هێزە -هێزی میلیس-هەڵگرت، کەوتە سەر سەوداکەی پێشووی! ئەم جارەش بیری لە ئەوە کردەوە کە بەرامبەر بە هێندێ قەول و بڕ و ئیمتیازات، سلێمانیی تەسلیم بە ئینگلیزەکان بکات! بەڵام نامەی ئەم جارەی بە عیززەت تۆپچی /عیززەتی فاتە و ئەحمەد فائیق /فایەقی تاپۆ دا ڕاستە و ڕاست ناردە کفری و بەرامبەر بە ئەو ئیمتیازانە کە بۆخۆی و بۆ کورد بەشەرتی دانا بوو، ئینگلیزەکانی داوا کردە سلێمانیی!!.

ئینگلیزەکان کە لەتەرتیباتی عەلی ئیحسان پاشا لەگەڵ شێخ مەحموود ئاگادار بوون، ئەمەیان لێ ڕانەدەپەرموو و بەتەمانەبوون کەتاکاتی خۆی نەیەت، بێنە سلێمانییەوە!!. لەبەرئەوە ئەم نامەیەی شێخ مەحموودیان پێ خۆش بوو. ناردیان بۆ وێلسن. خۆیشیان وەڵامی ((بەڵێن)) یان بۆ ناردەوە و داوایان لێ کرد کەچاوەنۆڕی ئەمری ((وێلسن))ی حاکمی عام بکا. نامەی ئەم جارەی شێخ مەحموود لەلایێن ئینگلیزەکانی ((کفری))یەوە نێردرا بۆ (وێلسن) ی حاکمی عامی عێراق. لەبەرئەمە ناردی بە شوێن (مێجەر نۆییل) دا کە یێکێ بوو لە زابتە ئینگلیزەکانی شارەزا بە هەرێمی کوردستان. بەڕاسپێری تایبەتی و بەنێوی خۆیەوە ناردی بۆ سلێمانیی. نۆییل لەگەڵ هەیئەتێکی بچووک ... هتد) (٤ /ل٥٧-٥٨).

لەبەرامبەر ئەو هەموو باسە گرنگانەدا کە دەیان پرسیار و وەڵام هەڵدەگرن و ڕەفیق حیلمیی ڕێزی مێژوویی ڕووداوەکانیشی نەگرتووە -بێ درێژدادڕیی- من بەدەم ئەم مێژووانەی خوارەوە (تاکە پرسیارێك) دەکەم:

١- ١٩١٨/١٠/٢٥ داگیرکردنی بازێڕی کەرکووك لەلایێن ئینگلیزەوە!

٢- ١٩١٨/١١/١٨ داگیرکردنی بازێڕی مووسڵ - مەڵبەندی ویلایێتی مووسڵ - لەلایێن ئینگلیزەوە!

٣- ١٩١٨/١١/١٠ ناچاربوونی سەرفەرماندەی گشتیی سوپای عوسمانیی، عەلی ئیحسان پاشا بە چۆڵ کردنی مووسڵ و ڕووکردنە باژێڕ و نێوچەی (نیسیبین و هەکاریی!).

پرسیاریش ئەمەیە: کە ئاگربەست لە دوورگەی مۆدرۆس Modrus داو لەسەر پاپۆڕی (ئاغا مەمنوون) و لە نێوە ڕۆژی ١٣٣٤/١٠/٣١ر = ١٩١٨/١١/٣٠ز. دا مۆرکرا: (بەپێی کام بەند و ماددەی بڕیار بووە: دوو سبەیی:١٩١٨/١١/١) مێجەر نۆییڵ بە پەلە بگاتە سلێمانیی و ...؟؟؟

٦/٢: مێژووەکەی در. جەمال نەبەزیش – ١٩١٨/١١/٢– بەدەم بەڵگەوە یان لە سەرچاوەیێکی دیار و باوەڕ پێ کراوەوە نەهاتووە و لە داتاشراو دەچێ کە تەنانەت لە سەرچاوە گرنگەکانیشەوە نزیك نییە بۆییێکا هیچ دڵنیایی زانستیی و باوەڕ پێ کردن نابەخشێ!

### ٣: بەڵگەنامەی ڕاستیی

وێڕای ئەو وردبوونەوانەی ڕابوردن، پێ ویستی دەزانم لە دوو کەسی فەرمانبەری سەردەمەکە و تێکەڵی کار و فەرمانی ڕەسمیی دوو بەڵگەنامەی کەسیی خۆیان بۆ یێکەم جار بخەمەڕوو:

١/٣: بەڵگەنامەی یێکەم مامۆستای یێکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانیی: مەلیحە نەزهەت خانم.

حاڵنامەی ڕەسمییانەی و دەستنووسی خۆی و ئیمزاکراوی دوو جارەی لە ١٤ی شەووالی ١٣٣٤/٢٦ی نیسانی١٩٢٦و زیلحیجەی١٣٤٩/٥ی مایسی ١٩٢٦ دا دەڵێت: (لە ١٧ی کانوونی یێکەمی ١٩١٥ دا دامەزرام بە جێگری یێکەم مامۆستا – ڕێبەر – لە قوتابخانەی کیژانی سلێمانییدا و بە مووچەی ٤٠٠ غرش. ماوەی کاریشم نزیکەی چوار ساڵی خایاند، واتە تا ڕۆژی داگیربوون:٩ی تەشرینی دووەمی١٩١٨"!!.. هتد). " ١ ".

بەلگەنامەکە دیارە مەبەستی لەڕۆژانی داگیربوون– ٩/ت٢/١٩١٨ رۆمیـی=١٩١٨/٢/٨ زاییـنیی – داگیربوونی بازێڕی مووسڵە نەك سلێمانیی، چونکە وەك ئاشـکرایە سـلێمانیی بە سیاسەت و ئاشتیانە ئینگلیزی هاتووەتە نێو و بۆمان دەسەلمێت کە تا ئەو مێژووەی ژوورەوو، قوتابخانەی کیژانی سلێمانیی وەك دەزگەیێکی ژێربـاری دەسـەلاتی عوسمـانیی بووە. (بە ڕۆشنایی ئەم بەلگەنامەیـە، لـە١١/١: ت٢/١٩١٨دا، مێجـەر نۆییـل هـەرگیز لـە سلێمانییدا نەبووە و حوکوومەت و حوکمداریی کوردستان دانەمەزراون!).

٢/٣: بەلگەنامەی دووەم – ژ: ١ – ئەرزوحاڵنامەیێکی کۆنـە ئەفسـەری عوسمـانیی، یوزباشیی – ڕەییسـی یێکـەم – فەرمانـدەی ژانـدارمی پێشـووی چەمچـەماڵ (ئەدهـەم ئەحمەد ئیبراهیم زادە) کە بـۆ کـارێکی خـۆی لـە٧ی کـانوونی دووەمـی ١٩٣٤ دا بـەرەو ڕووی موتەسـەڕیفی سـلێمانیی کردووەتـەوە، بەئاشـکرا دەڵێـت: (لـە تـەئریخی ١٥ی تەشـرینی سـانیی ١٩١٨ دا، کـە حوکوومـەتی فەخیمـەی ئینگلیـز، لـە سـلێمانییدا، حوکوومەتی تەئسیس کرد – لەبـەر ترسـی قەدەغـە بـوون نێـوی کوردسـتانی نـەهێناوە /کەمال– بەندە لە تەشکیلاتی ژاندارم و، لە ئـەمر و ئیدارەی جـەنابی مێجـەر دانیـێلس موسـتەخدەم بـووم و هـەتا تـەئریخی وقووعـاتی دەربەنـد – بازیـان – لەچەمچـەماڵ قوماندان ژاندارم بووم ... هتد).

**٤: بەلگەنامەی هەرەڕاست!**

بەلگەنامەکەی یوزباشیی ئەدهەم ئەحمـەد بەلگـەیێکی ئەوتۆیـە کـە هـی ئەوەیـە بـە یێکجـاریی متمانـەی پـێ بکـرێ، بـەلام لەلاییێکـەوە ئـەوە هەیـە بەلگەنامەکـە خۆییـە و ڕەسمییانە نییە، لەلاییێکی دیەوە چونکە بەلگەنامەی – ئینگلیزیی– ڕەسمییانە و باوەڕ پێ کراوترە، ئەوە هێندێ نرخی کەمترە لە ئەمەی دووایی!

من لەبەرامبەر مێژووەکەی (وێلسن، مس بێل) دا نێوەندی مـانگی تەشـرینی دووەمـم لەنێوان ١٤–١٦ی تەشرینی دووەمدا ڕاگرت بوو، خۆشبەختانە بەلگەنامەیێکی ئینگلیزیی

– ژ: ٢– بەدەستەوە هەیە کە (هاتنی مێجەر نۆییێلی بۆ سلێمانیی، خستووەتە ١٦/ت ٢).

کەواتە هەرە چاکتر ئەوەیە (مەتنی بەڵگەنامە) ی نێوبراو کە در. ئەحمەد ئەبووبەکر عوسمان لەگۆڤاری"الثقافة–ئەلسەقافە/ڕۆشنبیریی"بەغدادابڵاویکردووەتەوە. " ٢ "!

بەڵگەنامەکە تێیدا هاتووە: (برووسکەیێکی دایێرەی سیاسیی بەغداد – دایێرەی حاکمی سیاسیی ئینگلیز/کەمال–ژمارە:٩٩٢٧ دەڵێت " مێجەر نۆییێل لە ١٦ ی تەشرینی دووەم لە سلێمانییەوە ئەم برووسکەیەی ناردووە: ئەمڕۆ گەییشتینە سلێمانیی! پاشایانە پێشوازیم لیٚ کرا. کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر لەسەر ڕێگەی هاتنمدا ڕاوەستا بوون و ڕەنگ و ڕووی خۆشیی و شادییان دەنواند! ").

مێجەر نۆییێل پتر دەبێژێت: (من لەسەر ڕێگەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی چاودێری کراومان و ڕاگیراوی ئەفسەرە سیاسییەکانمان زۆر سەختیی نابینم بەمەرجیٚ هەر ئێستە کاروباری دەست بدرێتیٚ، چونکە بزاڤەکە مەزنە، هەرهیچ نەبیٚ لە سلێمانییدا. /تەواو).

بە ئەو پێیەی–ئەحمەد خواجە گوتەنیی– ڕۆژی دوایی لەبەردەرکی سەرای حوکوومەتدا " نۆییێل " چووەتە سەر کورسیی و بە زمانی فارسیی جاڕی دامەزراندنی حوکوومەتی کوردستان و شێخ مەحموودی دا، دیارە (ئەو ڕۆژە ڕێکەوتی١٧/١١/١٩١٨) یە نەك (١/١١/١٩١٨) ی نیشانەکراوی ڕەفیق حیلمیی، یان (٢/١١/١٩١٨) ی دروست کراوی در. جەمال نەبەز، یان (١٥/١١/١٩١٨)ی بەڵگەنامە خۆییەکەی یوزباشیی ئەدهەم ئەحمەد یان (١٨/١١/١٩١٨) ی ئەحمەد خواجە کە ئەمیان لە هەموویان ئاگادارتر و لە مێژووە ڕاستەکەوە نزیکترە!

**ئەنجام**

١. ڕاستیی مێژووەکەی وێلسن و مس بێل –با ڕۆژەکەش نیشانە نەکرابێ– هەروەها ماوە نیشان کراوەکەی حەفید زادە مەحموود خۆیشی.

٢. پووچ بوونی هەر مێژوویێکی بە مەزندە دانراو یان داتاشراو، تەنانەت مێژووی بەڵگەنامە خۆییەکەی یوزباشیی ئەدهەم ئەحمەد!

٣. جاڕدانی دامەزراندنی یێکەم حوکوومەتی کوردستان و حوکمداری کوردستان حەفید زادە مەحموود لە ڕۆژی: دووشەممە ١٧/تەشرینی دووەم/١٩١٨ز بەرامبەر ٢٩/موحەڕڕەم/١٣٣٧ ك.

**پەراوێز**

١. بۆ ناسینی شێوەی بەڵگەنامەکە و دەستنووسی خاتو مەلیحە نەزھەت بنۆڕە ئێرە و بابەتی (یێکەم قوتابخانەی کیژانی سلێمانیی).

٢. ڕستە گوتاری (مەسەلەی کورد دوای جەنگی گیچتیی یێکەم) ی نووسراوی در. ئەحمەد ئەبووبەکر عوسمانە کە لە چەند ژمارەیێکی گۆڤاری عەرەبیی (الثقافة /ئەلسەقافە – ڕۆشنبیریی) بەغدادا بڵاوی کردووەتەوە و – مخابن – بەشە فۆتۆکۆپییەکەی ئەم باسەی چەند دێڕێکی لێ پەڕیوە و بەر چاپ نەکەوتووە وەك (ژمارەی گۆڤارەکە و بەشی بڵاوکردنەوە) و هەر بەتەنێ ژمارەی لاپەڕەی باسەکە: (٧٣) فۆتۆکۆپی بووە ... هیوام هەیە (وێنەی مەتنە عەرەبییەکەی بڵاوکراوەی در. ئەحمەد/الثقافة) کە لەئێرەدا بەڵگەنامەی (ژ:٢)ە، هیچ گومانێ نەهێڵێتەوە و ئەو لێ پەڕینەی ژمارەی گۆڤارەکە بە کەم و کورتیی نەژمێردرێ! (فۆتۆکۆپیی لێ کۆڵینەوەکەم لە کوردستانەوە هاتووە بۆ مەنفا – هەندەران).

**تەماشاکراوەکان**

١. ارنولد ویلسن – (الثورة العراقیة: ترجمة جعفر الخیاط. بیروت ١٩٧١ /چەند بەشێکی دوو بەرگە ناسراوەکەی کتێبی

Mesopotamia Aciash و ١٩٢٤ چاپی Mesopotamia 1917 .Loyaliteas 1920
of loyliteas چاپی 1920-1917 چاپی ١٩٣١.

٢. احمد خواجە: (چیم دی. ب١، چاپخانەی شەفیق. بەغداد ١٩٦٨).

٣. مس بيل: (فصول من تاريخ العراق القريب – ترجمة و حواشي جعفر الخياط،ط، بغداد ١٩٧١.

٤. حلمی: رفیق (یاداشت – ج ٢. بەغدا ١٩٥٦).

٥. الحسني: عبدالرزاق: (تاريخ العراق السياسي، ج ٢، بغداد ١٩٧٥).

٦. هاوار: م. ر. (شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ج ١. لەندن ١٩٩١).

٧. محمد: کمال رؤوف: (کاروان – س ١٩٨٥ /مقابلة فريدة نادرة مع الشيخ محمود الحفيد).

# ٦

# بنچینەی مۆسیقەی هاوچەرخی سلێمانیی

## پێشەکیی

ئەمڕۆ لە کوردستانی باشووردا –لکێندراو بە عێراقی عەرەبەوە – بەشێوەییێکی ڕەسمیانە و ئاشکرا، چەندین تیمی مۆسیقەی هاوچەرخ، هەروەها تیمی میللیی، هێندێ فێرگە و دەزگەی خوێندنی هونەرە جوانەکان هەن و خوێندنی ئەو هونەرانەش – بەمۆسیقەوە – لەلای دەوڵەت هەتا لەلای کۆمەلانی خەڵك، لە باخچەی ساوایانەوە تا دەگاتە ئەو جۆرە فێرگانە، ڕەوا و پەسەندە ... تەنانەت دەوڵەت یارمەتیی ئەو تیمانە دەدات و ڕێزی مۆسیقەژنەکان و گۆرانیبێژەکانی گرتووە و خەلاتی کردوون.

لەلاییێکی دیەوە، مۆسیقەژەن، گۆرانیبێژ لەهەر شوێنێکدا بن، بە دەیانن! دەزگەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیش بەرهەمی تۆمار و بلاوکردوونەتەوە و بەچەند و جۆریش، لەچاو هەر سەردەمێکدا شوێنی دیار و بەهێزیان گرتووە و بەتایبەتیش مۆسیقەژنەکان، زۆریان، زۆربەی سازەکان بەکار دەبەن.

ئا ئەم بارە – وێڕای هەر کەم و کورتییێ لە جۆری بەرهەمدا – بەگشتیی وێنەییێکی ئاشکرای شارستێنیی و پێشکەوتنی ژینی ڕۆشنبیریی و کۆمەڵییە.

داخۆ ئەم بارە – کە ڕیشەی مێژوویی خۆی هەیە وەك هەر بارێکی دی شارستێنیی – بۆ وێنە لە بازێڕێکی ناسراوی وەك سلێمانییدا زەمینەی چۆن بووە و تۆوی چۆن چاندراوە؟ هەروەها یێکەم تیمی مۆسیقەی هاوچەرخی چۆن تێدا دامەزراوە و چ مامۆستاییێکی مۆسیقەزان پێشڕەوی بووە؟

### ١. شەوە زەنگ

لەئێرەوە دەست پێ دەکەم و دەڵێم، ئەگەر پەروەردە و خوێندنی نوێ ڕەنگ و ڕوویێکی شارستێنیی هاوچەرخ بێت، ئەوە ئەم شێوەیە هەتا ساڵی ١٨٧٠ ز نەگەیشتە سێ هەرێمەکە — مووسڵ، بەغداد، بەسرە — ی وڵاتی نێوبراو بە عێراقی عوسمانیی. لەئەوە دوواترەوە، لەئەم بازێڕ و ئەوی دیدا — بە بازێڕەکانی کوردستانەوە — هێندێ فێرگەی ساوایان و قوتابخانەی سەرەتایی و فێرگەی ئامادەیی سەربازیی کرانەوە، بەڵام لە هەموویاندا خوێندن و فێربوون بە زمانی زگماك نەبووە، بەڵکو بە تورکیی بووە کە تەنانەت لە فێرگەی ئامادەیی سەربازیی بەغداددا ستەم گەییشت بووە ئەو ڕادەیە کە بەئاشکرا ئاگاداریی تێدا هەڵواسراوە و ڕایگەیاندووە: " گفتوگۆی ئاسایی بە عەرەبیی و کوردیی قەدەغەیە ! ". لە ئەمەش پتر تا شکانی هەموو دەسەڵاتێکی دەوڵەتی عوسمانیی دۆڕاوی یێکەم جەنگی گێتیی — س ١٩١٨، هیچ قوتابخانەیێکی سەرەتایی لە بەرنامەی وانەکانی حەوتۆدا، (وانەی سروود) ی تێدا نەبووە، بەڵکو بەتەنێ وانەی (سروود بێژین /انشاد) لە قوتابخانەکانی ئامادەییدا بە زمانی تورکیی بۆ ستاییش کردنی سوڵتان و دەسەڵات و دام و دەزگەی هەبووە ! !

دووای ئەو سەردەمە شەوە زەنگە و داگیربوونی وڵاتی نێوبراو بە عێراق — بە کوردستانیشەوە — لەلایێن ئینگلیزەوە، دیسان شەوە زەنگ بڕی کردووە و بەرنامەکانی خوێندن لە قوتابخانەی یێکەمی و سەرەتاییدا، کە (دانراوی مەعاریفی گشتیی — س ١٩١٩)ی ئەو داگیرکەرە نوێیە خۆی شایێتە، لەنێو وانەکاندا (وانەی، سروود و مۆسیقە) نەبووە ! !

بەئەم پێیە، لایێنێکی پەروەردەیی چ خوێندەواریی گرنگ لە ساوایان و قوتابیان دابڕاوەو هەستی ناسکیان بە ئاوازەی بیر و زمانانیان نەهەژاوە !

### ٢. ئاسۆییکی ڕووناك

دامەزراندنی مەملەکەتی سەربەخۆی عێراق – س ١٩٢١، کلاوڕۆژنەی ڕووناکیی بۆ باری خوێندن کردەوە. وەزارەتی مەعاریف، بەتایبەتی لەگەڵ دەست پێ کردنی ساڵی خوێندنی ١٩٢٢–١٩٢٣ز. دا بۆ یێکەمین جار لە بەرنامەی خوێندنی یێکەمی و سەرەتاییدا وانەی (سروود) ی دانا چەشنی وانەکانی دی ... بەلام ئەم بەرنامەیە بۆ بووژانەوەی گیانی عەرەبایەتیی بوو کە بەسەر قوتابیە کوردەکانیشدا دەسەپا چۆن بەسەر هەموو قوتابخانەکانی عێراقدا سەپێندرا.. هێندە هەیە لەبەرئەوەی – کوردستانی باشوور تا ساڵی ١٩٢٤ خاوەندی حوکومەتی خۆی بوو – ئەو بەرنامەیەی عێراق تا ١ ی مارتی ١٩٢٥ لە سلێمانییدا پەیڕەو نەکرا.. لە ئەو مێژووەشدا یێکەم قوتابخانەی سەرەتایی عێراقیی–کوڕان– دەزگەی پێنج پۆلی کردەوە. چواری یێکەمیی و پۆلێکی سەرەتایی کە ١٤٠ قوتابیان گرتەخۆ و ٦ مامۆستا و یێك خزمەتگوزاریان بۆ دانرا و بەپەلە پێویستیی و کەرەستەی بۆ ئامادەکرا. جێگەی باسە لە ئەو هەلەوە تا ساڵی ١٩٣٦، کاروباری ئەو قوتابخانەیە و هاوتای لەلایێن موتەسەڕیفییەتی سلێمانیی و ئەنجوومەنی مەعاریفی بازێڕەکە و پشکنەری مەعاریفی کەرکووکەوە چاودێری دەکرا!

### ٣. بەردی بنچینە!

ئەم قوتابخانەیەی سلێمانیی دەبوو پەیڕەوی بەرنامەکانی بەڕێوەبەراییێتی مەعاریفی گشتیی عێراق بکات و لەنێویدا بایەخ بدات بە (دیدەوانیی/کەشافە) و وانەی (سروود)!! هەڵبەت لەڕووی سروود بێژینیشەوە –وەك بەلگە دەدرەوشێنەوە هۆنراوی چەشنی هۆنراوەی سرووده عەرەبییەکان فێری منداڵانی کورد بکرێت، وەك سروودەکانی، مارشی خدێوی میسر (بیلادی ئینتبـاهی، هاکەزا دائیما نەمشی، هەییا بینا نەحوەلئەمام، سەمیعتو شیعرەن، یا عەلەمولئوممە، ئەشرەقت شەمسولنەجاح).

ڕاستییەکەیشی ئەم قوتابخانەیە، بە مامۆستا و ڕۆشنبیرە کوردەکانی لایێنگیریەوە، کردەوەییێکی چاك و بەنرخیان نواندووە کە ئەو سروودانەیان نەداوە بەگوێی منداڵانی کورد دا و بەتەنێ ئاوازەکانیان وەرگرتوون‌و (شیعری کوردیی) نیشتیمانیی‌و نەتەوەییان بەکاربردووە. بێگومان شاعیرەکان لە ئەم کارە پیرۆزەدا دەستیان باڵایە، وەك، (عەبداللە زێوەر)ی مامۆستای هەمان قوتابخانەو شاعیرانی دی وەك (عەبدولخالیق ئەسیریی، ڕەفیق حیلمیی، نووریی شێخ ساڵح، مەحموود جەودەتی ئەفسەر، محەممەد تۆفیق، فایەق عەبداللە —بێکەس، بێخود). وێڕاش هەربۆ ڕەواج پێ دانی (سروود)و گۆرانیی کوردیی، چەند نامیلکەیێ چاپ‌و بڵاوکراونەتەوە وەك، (گۆرانیی/چاپخانەی سلێمانیی، س ١٩٢٥) و (گۆرانیی — کەریم سەعید زانستیی/چاپخانەی فورات، بەغداد ١٩٢٨).

بەئەم پێیە، بەهۆی ئەم قوتابخانەیەو دۆستانی پێشکەوتنی گەل‌و خوێندەوارییەوە، زەمینەی سروود و گۆرانیی قوتابخانە لە ئەم بازێڕە دانرا... بەڵام ئەم زەمینەیە بەبێ مۆسیقە و بەکاربردنی سازی مۆسیقە و فێرکردنی قوتابیان ناتەواوە و دەبوو بەردی بنچینەیی لێ هەڵبکەوێت!

لەبەختی بازێڕەکە و قوتابیان و بەتایبەتی هونەری مۆسیقە و سروود و گۆرانیی فێربووندا، کوڕە کوردێکی نێو ڕیزی چوارەمی لەشکری عێراق لە سلێمانییدا کە مۆسیقاناس و شارەزا و پەرۆش بووە، لە ئەو قۆناخە ناسکەدا هاتووەتە پێشەوە و بەخۆڕایی و دووای نیوەڕوان هونەری " مۆسیقە " ی فێری قوتابیان کردووە و وانەی پێ گوتوونەتەوە. لەئەوەش پتر پێشنیاری کڕینی (باندۆییێکی مۆسیقە)ی کردووە تا باری فێربوونی سازەکان و تێ گەییشتنی قوتابیان ئاسان و خۆشتر بێت!

بۆ ئەم کارە چاکە بە کردەوەی هونەرانەی نوێوە کە بە یێکەم درامای قوتابخانە وە لەسەر شانۆ بەنێوی (نەتیجەی سەفاهەت و سەعی)ەوە، شەوی سێشەمەی ٢٧ی

تەمووزی ١٩٢٦– لەخانووی قوتابخانەکەدا– خەڵکەکە "٦٥٠" ڕوپیەیان بۆ کڕینی ئەو باندوویەی مۆسیقە کۆکردووەتەوە دەست بەجێ – بەهۆی مستەفا مەزهەری پشکنەری مەعاریفی کەرکووکەوە – ئەو باندۆیە کڕدراوە کە بووە بە (یێکەم باندۆی مۆسیقە بۆ یێکەم تیمی مۆسیقەی سلێمانیی).

لەمەڕ چاکەی مۆسیقەناس عەبدولواحیدی ئاغا مستەفا و پێ گەیاندنی مۆسیقەژەنان، بەڵگەیێکی ڕۆژنامەنووسی و شایێتی یێکێ لە قوتابیەکانی ئەندامی ئەو یێکەم تیمە، یاد دەکەمەوە:

١). ژیان–س ١، ژ ٣٢، پێنجشەمە٩ی ئەیلوولی ١٩٢٦ بەنێونیشانی (بۆ ئەهالیی موحتەرەم!)ەوە نووسیویێتی: (.... نائیب زابتی فەوجی چوارەم، جەنابی واحید ئەفەندیی کوڕی ئاغا مستەفا، خەڵقی کۆیسنجق کە لە باندۆی مەلیکییدا – تیمی مۆسیقەی پاشای عێراق /کەمال – موعەللیمی مۆزیقە بووە، ئەمە ساڵێکە – واتە لە ١٩٢٥ بەدوواوە/کەمال– مەجانەن بە تەلەبەی مەکتەب دەرسی فەننی مۆزیقە تەدریس ئەکا. تەشویق و تەئمیناتی ئەم زاتە بوو بەباعیسی جەسارەتی هێنانی ئەم باندۆ مۆزیقەیە، بە غیرەتێکی بێ میسالەوە تەعەهودی فەرمووە کە هەتا لێرە بێ هەروا بە مەجانیی تەعلیمی مۆزیقە بە تەلەبە بکا. هەیئەتی موعەللیمین و تەلەبە بە کەماڵی حورمەت، ئەم زاتە حەمییەتمەندە و سنعەتکارە تەقدیم ئەهالیی موحتەرەم ئەکات. /مودیری مەکتەب).

٢). قوتابییەکی قوتابخانەکە، پزیشك ئەوڕحمان میرزا عەبدالله بەنێونیشانی (یێکەم تیمی گۆرانیی و یێکەم تیمی مۆزیقە لە سلێمانییدا/هاوکاریی – ژ٨١٠ی١٩٨٥/١٠/١٧) بیرەوەریی خۆی بەوردیی گێڕاوەتەوە ... بۆ وێنە دەڵێت: (.. کاك عەبدولواحید – نائیب زابتێکی کوردی کۆیێ – مەردانە و بە دڵ و بە گیان کەوتە ئیش کردن، خۆی و مامۆستاکان چەند قوتابییەکیان هەڵبژارد فێری مۆزیقەیان بکەن و " تیمی مۆزیقە " ی

لیَ پیَك بهیَنن. لەمانەی ئەویی بە بیرمدا بیَن: جەلال مەجید سەلیم ئاغا، جەمال مەجید سەلیم ئاغا، رەحمان کەریم، رەحیم کەریم، سالَح عەلی، ئەورەحمان میرزا عەبدالله، خۆم، ئەحمەد میرزا مارف.. هتد).

پزیشك ئەورەحمانی میرزا عەبدالله نیَوی سازەکانی باندۆکە و چۆن فیَربوونیان و پاشەرۆژی روون کردووەتەوە و دەلَیَت: (وەك بیرم بیَت، دەهۆلَیَکی گەورە، چوار تەپلَ، ترامپیَت، چوار بۆکیی، چوار کەرەناتە، چوار فیفرە، شمشالَ.. وە چەند پارچەییَکی گەورەی زەرد – دەبیَت ترامپیَت بووبن /کەمال – کە ناویانم لەبیرچووەتەوە.

من لەپیَشدا "بۆکی" یان دامیَ فیَری بم، لەپاشدا وتیان "فیفرە" بۆ تۆ باشترە چونکە لاوازیت!

خوالیَ خۆشبوو کاك عەبدولواحید هەموو پاش نیوەرۆییَ ئەهات و فیَری نۆتەی ئەکردین و چۆن سازەکان بەکار بهیَنین، چۆن هەر کەسە لەسەر ئامیَری خۆی ئەو نۆتەیە بەکار بهیَنیَ، کابرا بە راستیی زۆر لەگەلَمان ماندوو ئەبوو! پاش ئەوەی فیَری بەکار هیَنانی نۆتەی مۆزیقە بووین و توانیمان مۆزیقە بە نۆتە لیَ بدەین، عەبدولواحیدیان گواستەوە بۆ شاریَکی تر! ئیتر کەس نەما مۆزیقە بزانیَ و جیَی ئەو بگریَتەوە بۆ مەشق کردن لەسەر ئەوەی فیَرکرابووین. عەلی ئاغا – پیَم وەیە مامۆستای قوتابخانە عەلی ئاگایە/کەمال–سەرپەرشتیی ئەکردین، بەلاَم لەوەی عەبدولواحید فیَری کردبووین، پتر فیَر نەبووین!).

پزیشك ئەورەحمان یادی ئەو رۆژگارانەی کردووەتەوە و دەلَیَت، (چەند خۆش بوو، پاش نیوەروان، هەفتەی جاریَك، جلی کەشافەمان لەبەر ئەکرد و چوار ریزمان ئەگرت.. لە پیَشمانەوە باندی مۆزیقە و تیمی گۆرانیی بە شەقامەکانی ناو شاردا ئەیانگیَراین وە یا ئەیانناردینە دەشتیَ و هەزاران مندالَ و گەورە شویَنمان ئەکەوتن! هتد ...).

## ٤. وێنەی کردەوەی هونەرانەی نوێ!

وێڕا کە دەفتەرێ یان گەنجینەیێکی پارێزەری یادگارەکانی هونەری ئەو قۆناخە بەدەستەوە نییە، بەلام بەڕۆشنایی نامێلکەی سروود و گۆرانییە چاپ کراوەکان، هەروەها بەڕۆشنایی گفتوگۆی کوڕی مامۆستا عەبدولواحید -لەبابیەوە هەواڵەکانی بیستووە- ئەوە بۆ وێنەی فێرکردن و دابەش کردنی ئاوازەکانی ئەو سروودانە، چەند بەلگەییێکیان - بەتەنێ سەرەتایان - دەخەمە ڕوو:

١). **کابرا مەڕوانە ماڵ خانەی وێرانی من**
**تێ بگە تەحسیلێ و کەسب و کردەوەی عیرفانی من**
" ئەسیریی "

٢). **لەم زەمانی ئینتیباهی میللەتی ڕووی سەرزەمین**
**بێچووە شێری کوردەواریی حەیفە نوستوویی لانەبین!**
" زێوەر "

٣). **ئەی وەتەن چەند خۆشەویستی ڕۆحی شیرینی منی**
**مەزرەعەی توخم و نەشات و باعیسی ژینی منی**
" زێوەر "

٤). **هێندە شیرینە لام دار و بەردی وەتەنم**
**بەفیدای دەکەم سەر و گیان و بەدەنم**
" زێوەر "

٥). **وەتەن بەجەننەت ناگۆڕینەوە**
**ڕەحمەت بە زیللەت ناگۆڕینەوە**
" ڕەفیق حیلمیی "

٦). **تا دەس لەمل مەقسەد نەکەم**

**شەرتە نەنیشم قەت بەتاڵ**

" زێوەر "

٧). **کوردینە بکەین داییم ئیفتیخار**

**باپیری ئێمە شێری نامدار**

**ئەهلی سەلیبی مەحوو کرد سەد جار**

**تەئریخی عالەم شاهیدە بۆمان**

" مەحموود جەودەت "

٨). **ئێمە کە کوردین لەلامان وایە**

**کوردیی زمانێکی زۆر بێ هاوتایە**

" محەممەد تۆفیق "

٩). **ئێمە کەشافەی کوردین**

**هەموو بە دەس و بردین**

" فائیق عەبداللە /بێ کەس "

وێڕای ئەو سروودانە، هەر بەڕۆشنایی سەرچاوەکانی ڕابردوو، هەر لە ئەو هەلەدا بۆ یێکەم جار هونەرێکی پڕ نمایش و ئاواز و سروود هەڵ کەوتووە کە لەسەر ئاوازی (ئینتیباه /انتباه) ی عەرەبیی، ئۆپەریتیی (دلاوەران) نمایش کراوە و بێژراوە لەلایێن شێخ نوری شێخ سالحەوە ڕێکخراوە!

ئەو یێکەم ئۆپەرێتە وێرا کە بیرەکەی لە پەخشانێکی فرەنسییەوە مەحموود جەودەت وەریگێڕاوە و شێخ نووریی شێخ سالح بە هۆنراو ڕازاندوویەتیەوە، بۆخۆی نرخێکی هونەرانەی تایبەتی هەیە، بە ئەوە لەلاییکەوە بابەتێکی یێکگرتوو، ئاوازێکی یێکگرتوو لەلایێن (باب، دایك، کوڕ، کیژ، ئافرەت، منداڵ، چەك بەدەستان) ەوە بێژراوە.

هەرچەندە هێندێ سەرچاوە، وەك (دیوانی شێخ نووریی شێخ سالّح – نووسراوی
زاد عەبدولواحید) دەگێڕنەوە گۆیا ئەم شاعیرە دەنگ خۆشە، خۆی خەریکی پراوە پێ
ردنی قوتابیەکانی سالّی ۱۹۲۷ بووە، بەلاّم – هەروەك کوڕی مامۆستا عەبدولواحید لە
بیەوە هێندێ بەندی بۆ گێڕامەوە – باوەڕم هەیە کە هەر ئەو مامۆستا مۆسیقەناسە
ۆی دابەشکەری ئاوازەکان و مەشق پێ کەری قوتابیەکان بووبێت!

ئەو باسانە لەلایێك و لەلایێکی دیەوە پێویستە پتر بکۆلّینەوە و لە کاریگەریی
ەلّکەوتنی ئەم بارە نوێیەی (مۆسیقە و سروود و گۆرانیی) لە سلێمانییدا پتر
ردببینەوە!

لە ئەم بارەیەوە بیرەوەریی ئاگاداران دەنوێنم:

کۆچ کردوو عومەر قەززازی وەکیلی گۆرانییە تۆمارەکراوەکانی کۆمپانییەکانی قەوان
ە سلێمانییدا –دەنگی لەلام تۆمارکراوە – لەسالّی ۱۹۷۸ دا بۆ منی گێڕایەوە کە
حەمدی ئەفەندیی ئەمین ئاغای گۆرانییبێژی سەر قەوان، لە ئەو سەردەمەدا قەوانێکی
ەرکرد و دیوێکی سروودی "پیرەمەگروون موقەددەسی"ی شیعری زێوەری شاعیر
ووە!)

ڕۆشنبیری کۆچ کردوو فوئاد ڕەسوول ناجیی لە ۱۹۷۹/۲/۲٦ دا – گوێگری بەرنامەی
ۆژێ لە ڕۆژانم بوو – بە نامە ئاگاداری کردم و نووسیوییێتی، (گۆرانییەکی دی ئەو
ەردەمە کە زۆر باو بوو، بەڕادەیێ کە دانەیێکی قەوانەکە بە یێك لیرەی زەردی ئەو
ەمانە دەفرۆشرا، گۆرانییێ بوو بە دەنگی پیاوێ و "پیرەمەگروون موقەدەسی"ی
ەگێڕایەوە. ڕوویێکی دی قەوانەکە گۆرانیی "چێژتم ئەمڕۆ زەهری مار" بوو. مۆسیقەی
ەم گۆرانییانە پیانۆ بوو لەسەر شێوەی هارمۆنیی مۆسیقەی ڕۆژئاوا و بە دەنگی
"تەنیۆر/چریکە"وە دەبێژرا! تەواو).

هەڵبەت ئەم گۆرانییەی (حەمدی ئەفەندی) ی بەدەم پیانۆوە بەڵگەیە کە ئەوێکی خەڵکی سلێمانیی، دەبێت "نۆتەکانی سروودەکە"ی بۆ نووسرابێتەوە و لەگەڵ خۆیَ بردبێتی بۆ بەغداد و لەکاتی دەرکردنی قەوانەکەدا (تیمی مۆسیقەی سەر بە کۆمپانیای قەوانەکە) لێیان دابێت!

هەر لە ئەم ئاستەدا – وەك وردبوومەتەوە و تۆمار کراوی قەوانەکەم لەلا هەیە – کاری بڵاوبوونەوەی سروود و گۆرانیی گەیشتووەتە ڕادەییَ (دەنگی ژنانە) بیانگێڕتەوە. بۆ وێنە سروودی (ئێمە کە منداڵ و نەوجەوانین) چەند دەنگێکی ژنانە – لەسەر تەختی خۆرهەڵاتیی – بە قەوانی کۆمپانیای (ئۆدیۆن ODION گێڕاویانەتەوە. هێندەی وردیش بوومەتەوە دەنگەکان یێکێکی گۆرانیبێژ ((دایکی جەمال)) ەو ویَ دەچیَ گۆرانیبێژەکانی عەرەبیی (بەدرییە ئەنوەر و مونیرە ئەلهوەزوەن) یش هاودەنگی بووبن!

لەئەمەش پتر، لەماوەی فەرمانی مامۆستا عەبدولواحید لە نێوان ١٩٢٥–١٩٢٨ دا لە سلێمانییدا، چەند گۆرانیی دی بە دەنگی (دایکی جەمال) لەسەر قەوان بڵاوبووەتەوە، وەك (هەی گوڵ هەی گوڵ، ئاغام شێخ مەحموود شێخ سەعید کوانیَ؟)و شیعرێکی نیشتیمانیی عەبدولخالیق ئەسیریی نەتەوەپەروەر کە دەڵێت: (وەسیەت بیَ ئەگەر مردم وەرە سەر قەبرەکەم قالە –بڵیَ ئاواتەکەت پێك هات هەڵسە لەخەو خاڵە!). گومانیشم هێندی گۆرانیی سەر قەوانەکانی ئەو ڕۆژگارە کە هەڵبەستی تازە بابەتیان تێدا هەیە، مایەی کاری ئەم قۆناخەیە!

## ٥. مامۆستا عەبدولواحید کێیە؟

عەبدولواحید کوڕی حاجی ئاغا مستەفا کوڕی محەممەدە. دایکی زێنەبی مەلا حەکیمە. لە ساڵی ١٨٩٩ ز. دا لە بازێڕۆکی کۆییَ لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٧٥ دا – بەهۆی نەخۆشیی شەکرەوە –لەسلێمانییدا کۆچی کردووە و لە ((کۆییَ))دا ئەسپاردەی

خاك کراوە. عەبدولواحید لەسەردەمی حوکمڕانیی عوسمانییدا لە قوتابخانەی سەرەتایی ((کۆییێ))دا خوێندوویێتی.. مێژوونووسی کۆییێ تاهیر ئەحمەدی حەوێزیی دەگێڕێتەوە (کویسنجق ابتدائیسی –قوتابخانەی سەرەتایی کۆییێ–ساڵی١٩٠٠ دووبارە کراوەتەوە کە لەپێش سەفەر بەلگ /یێکەم جەنگی گێتیی، ماوەیێ داخرا، عەبدولواحید دەچووە ماڵی قەشە سوورەی عەنکاوەیی دەرسی یۆنانیی دەخوێند.)

سەرداری کوڕی بۆ منی گێڕایەوە، دووای ئەو خوێندنە چووەتە ڕیزی (قوتابخانەی ئامادەیی)ەوە کەپێم وەیە دەبێت قوتابخانەکە (ئامادەیی سەربازیی مووسڵ) بوویێ و دیارە بەهۆی قەومانی یێکەم جەنگی گێتییەوە، خوێندنەکەی تەواو نەکردووە و – ئەو و هاوتای – بە پلەی جێگری ئەفسەرەوە تێکەڵی لەشکری عوسمانیی و جەنگەکە بوون. وەك کوڕەکەیشی گێڕایەوە، بە ئەو پلەیەوە لە (شەڕی چەنان قەلعە) دا بریندار بووە و لە خەستەخانەدا زۆر ماوەتەوە و ئەویش ئەو ماوەیەی بەهەل زانیوە کە فێری ساز لێ دان و مۆسیقە ببێت!

دووای دامرکاندنەوەی جەنگ گەڕاوەتەوە بۆ نیشتیمانی و–بە قسەی کوڕەکەی لەگەڵ دامەزراندنی لەشکری عێراق –چووەتە یێکەم پەلییەوە کە ناسراوە بە (فەوجی مووسالکازم/موسی الکاظم) و دووایی چووەتە پەلی چوارەمەوە کە ساڵی ١٩٢٥ لە سلێمانییدا بووە. بەڕۆشنایی (ژیان–س٣، ژ١٠٩–١٢ی نیسانی ١٩٢٨) هەتا ئەم کاتە لە سلێمانییدا بووە و دوواتر لەگەڵ ڕاگۆستنەوەی ئەو پەلە، ئەویش ڕاگۆستراوەتەوە بۆ بەغداد.

عەبدولواحید لە سوپای عێراقدا پلەی بەرزبووەتەوە تا گەییشتووەتە پلەی سەرۆکی یێکەم –رائید–و لەساڵانی١٩٤١تا١٩٧٠ دا هەر بە ئەو وەزیفەیەوە لە بازێڕی دیوانییەدا بووە و دوواتر خانەنشین کراوە و گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانیی و لە پاڵ کوڕەکانی ژیاوە تا کۆچی ماڵئاوایی.

لەڕووی ڕۆشنبیرییەوە، زمانەکانی عەرەبیی، تورکیی، فارسیی، ئینگلیزیی، کەمیٚ ڕووسی و یۆنانیشی زانیوە.. خولیای خوێندنەوەو خوێندەواریی بووە. شیعری شاعیرانی کوردو عەرەبو تورکی لەبەربووە، تەنانەت -بەقسەی کوڕەکەی- چوارینەکانی (عومەر خەییام)ی لا شیرینو هێندێکی لەبەر بووە.

هەروەها -بەقسەی کوڕەکەی-شارەزایی لەشوێنەوارە کۆن و ئەنتیکەکاندا هەبووە. هەروەها هێلی بزماریشی خوێندووەتەوە، تەنانەت دانراوێکی لەمەڕ شوێنەوار و ئەنتیکە کۆنەکانی عێراق هەیە و لەلای کوڕەکانییێتی. کوڕەکەی -چەند هۆنراوێکی ئاوازە دانراوەکانی بابی بۆ دەگێڕامەوە-پتر باسی مۆسیقە پەروەری بابی گێڕایەوە و گوتی، (وەك بابم بۆ منی گێڕایەوە، کاتی خۆی لە سلێمانییدا، دووای نیوەڕوان قوتابیانی سلێمانیی فێریی سروودو گۆرانییو ساز لیٚ دان کردووە! هەروەها کاتی خۆی لە ماڵەوەدا پیانۆییێکی هەمانەیی هەبووە کە بە لاق کاری کردووە!

بابم کتێبێکی تورکیی مۆسیقە و نۆتی مۆسیقەی هەبوو - دێتەوە بەرچاو و یادم- نێوی سۆلفێج بوو، دانراوی مستەفا سەفوەت نێویٚ بوو کە لە١٣٠٨ی کۆچیدا دایناوە و پارچەییێکی ئەو کتێبە لێی نووسرا بوو، "لە ئەم نووسراوەدا زاراوەی مۆسیقەی فڕانسیمان بەکارهێناوە. ئەمە جێگەی ڕەخنە لیٚ گرتن نییە، چونکە بەرلە ئێستە بەدڵێکی فراوانەوە هێندیٚ زاراوەی مۆسیقەی ئیتالیمان وەرگرتووە!").

کوڕەکە بەناخۆشییەوە کۆتایی بە قسەکانی هێنا و گوتی: (بابم گێڕایەوە لە سلێمانیی ئەو ڕۆژگارەی جاراندا هێندیٚ کەس شکاتیان لیٚ کردبوو لەلای موفەتتیشی ئیداریی سلێمانیی کە ئینگلیز بوو، گۆیا منداڵەکانیان فێری سروود و گۆرانیی دەکات.. ئەمەش کاری تیٚ کردبوو کە پیانۆ خۆشەویستەکەی بشکێنێت و دەفتەرەکانی بسووتێنێت و نەشهێڵێت منداڵێکی توخونی هونەر بکەوێت!!).

عەبدولواحید نووریی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە سێ ژنی هێناوە کە (ئایشێی ڕەسوول، فاتیمەی ساڵح، فەهیمە) و بەری یێکەم و دووەم نۆ کوڕ و کیژ بووە، کە ئەمێستە هێندێکیان سلێمانیی نشینن!

**ئەنجام**

لە ڕۆژگارێکی دوواکەوتوودا لەڕووی ئاوەدانیی و خوێندەواریی و کۆمەڵایەتییەوە کە بۆ وێنە دەزگەکانی ئاو و کارەبا، قوتابخانەی زۆر نەخوازەلا فێرگەی مامۆستایان یان هونەرە جوانەکان لەکوردستانی باشووردا و بەتایبەتی لە سلێمانییدا نەبووە، ئەم یێکەم قوتابخانەیەی سەردەمی مەملەکەتی عێراق بوو بەلانە و بنچینەی هونەری مۆسیقەی جوانی سەردەم.. یێکەم باندۆی مۆسیقا، یێکەم تیمی مۆسیقا، یێکەم چەپکە بەرهەمی سروود و گۆرانیی تازە بابەت هەڵکەوتوون کە تەنانەت تیشکی ئەم بارە داوێتی لە هەستی گۆرانییبێژەکان و بزاڤی (گۆرانیی سەر قەوان).

ڕاستە لە ڕیزی شاگردەکانی ئەو قوتابخانەیەدا، دووا ڕۆژ مۆسیقە زان و مۆسیقە ناس هەڵنەکەوتووە کە –ئەوەش بەهۆی دوواکەوتنی سەردەمەکە و سەراپای ژینی کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیرییە– بەڵام کاریگەرییێکەی لە گیاندایەو ڕۆژنامەی (ژیان)و بیرەوەری خەڵك لە مێژوودا بارەکەیان چەسپاندووە. لە ئەوەش گرنگتر تا ئەم ساتە ئەو (یادگارانە) ی ئەو سەردەمە، وان لەسەر زاری قوتابیانی ئەم سەردەمەش و هێشتا ئاوازەکان دەگەنە بەرزایی ئاسمان!

دوواجار وەك مامۆستا عەبدولواحیدی حاجی ئاغا مستەفا – وێڕای فەرمانی – یێکەم مامۆستای مۆسیقە ناسو دامەزرێنەری یێکەم تیمی مۆسیقەی سلێمانییە، داخۆ فێرگەکان، مۆسیقە پەروەران چۆن چۆنی ڕێزی دەگرن و چۆن نێوی نەمری هەڵدەگرن؟

## تەماشاكراو و پەراوێز

١- ساطع الحصری - مذكراتي في العراق، ج ١. دار الطليعة، بيروت ١٩٦٧

٢- طاهر احمد حويزی - مێژووی كۆیە، ب ٢. بەش ٢، چاپخانەی نەمیر، بەغداد ١٩٨٤.

٣- لەتیف مەحموود هەڵمەت "لە یادی هونەرمەندێكی دێریندا " هاوكاری -١٩٨٤/٦/١٤

٤- گفتوگۆی تۆمار كراوم لەگەڵ كاك سەردار - كوڕی - عەبدولواحید حاجی ئاغا مستەفا، سلێمانیی ٣ /٧ /١٩٨٤ (وێنەی فۆتۆگرافی بابیشی پێشكەش كردم!). *

٥- ڕۆژنامەكانی: ژیانەوە، ژیان

٦- هێندیێ بەڵگەنامەی كۆن و ڕۆژنامەی عەرەبیی عێراق،

*پێویستی دەبینم ئاماژەی قسەیێكی كوڕەكەی بكەم كە گوتی:

(بابم لە خەستەخانەدا زۆر ماوەتەوە و ئەو ماوەیەی بە هەل زانی فێری ساز لیێ دان و مۆسیقە ببێت!). ڕاستییێكەی ئەز هێندیێ گومانم دەكەم و دڵم داخورپاوە بۆ ئەوە كە عەبدولواحید بەر لە (خەستەخانە) مۆسیقەی خوێندبێت و شارەزایی تەواوی پەیدا كردبێت. بەڵگەشم ئەوەیە، ئەگەر یێكی توانا و شارەزا نەبووبێت چۆن - وەك ڕۆژنامەی ژیان شایێتە - لە (تیمی مۆسیقەی پاشای عێراق) دا دادەمەزرێت؟

# ٧

# جەمعییەتی پێشکەوتنی کوردان
# سلێمانیی - س ١٩٢٦

## ڕێڕەوی باس

مێژووی بزاڤی کۆمەڵە -پارتە سیاسییەکانی کوردستان بە نهێنیی و ئاشکرایانەوە لە سەدەی بیستەمدا باسێکی چڕوپڕ ونە. چۆنییێتی هەڵکەوتنیان و مێژوو و شوێنیان، دامەزرێن و ئەندامانیان، بەرنامە و ئامانجیان، جۆری ڕەفتار و چالاکیی نهێنیی و ئاشکرایان، پێوەندییەکانی نێوخۆ و دەرەوەیان، سنوور و بارستایی باوەڕی جەماوەر پێیان، هۆکانی بەرزیی و نزمیی و شکستیی و لەنێوچوونیان. کێشی کاریگەرییان لە بۆ گۆڕین و پێشخستنی مەسەلەی ئازادیی و سەربەخۆیی گەل و نیشتیمان، هتد.. وردبوونەوە و لێ کۆڵینەوە و ساخ کردنەوە و ئاشنا بوونیان پێویستە!

بێ گومان سەختیی باری گەل لەدووای دابەش بوونی کوردستانەوە، زۆر و ستەم و پیلانی هێزە نێودەوڵەتیەکان و داگیرکەران. هەروەها نەبوونی دەزگەیێکی گەنجینەدار و ئەرشیفناسی کوردیی، وەلام دانەوەی ئەو پرسیارانەی سەرەوە و گرفتی کون و کەلەبەرەکانیانی گران کردووە، بەتایبەتیی کە گەلێ نهێنیی ئەو کۆمەڵە و پارتانە، بەهۆی مردنی بەشدار بووەکانەوە گڵە کوێر بوون!

یێکێ لە ئەو کۆمەڵە -پارتە (نهێنی) یانەی کە هەواڵەکانی ونە، (جەمعییەتی پێشکەوتنی کوردانی سلێمانیی- س١٩٢٦)ە کە تا نهوو هەر بەتەنێ سەرچاوەیێکی بێگانە نێوی هێناوە و " چەند دێڕێك " ی کەمی لێ نووسیوە!!

من لە ئێرەدا خۆشحاڵم دەستنووسی (بەرنامەی سیاسیی جەمعییەتی پێشکەوتنی کوردان -سلێمانیی، س١٩٢٦) بۆ یێکەم جار ئاشنا بکەم و دووی ناسینەوەیشی بکەوم.

هیوام زۆره سیاسه‌تبازەکان بەتایبەتی بە تەمەنەکان پتر خۆیان بە باس و نهێنییەکانی ئەم کۆمەڵەیە - پارتەوە خەریك و پتر خزمەتی ڕاستیی بکەن!

## سەرەتاییکی مێژوویی

بەر لەئاشنا کردن و لێوردبوونەوەی ئەم کۆمەڵەیە، پێویستی دەبینم باسێکی سەرەتاییکی مێژووی کۆمەڵە -پارتە سیاسیەکانی بەرودووای یێکەم جەنگی گێتیی بکەم!

ئەو بەڵگەو سەرچاوانەی لەبەردەستی مندا هەن، دڵنیایی دەبەخشن کەدووای هەڵکەوتنی -مەشرووتەی عوسمانیی- ژینی دەستووریی لە٢٣/٧/١٩٠٨ دا، -وەك لە باسێکی تایبەتدا دەردەکەوێت-هەواڵ ڕاستە کە(جەمعییەتی ئیتتیحادو تەرەققیی عوسمانیی-لقی سلێمانیی) هەبووە. بەڵام سەرچاوەی ئەوتۆمان لەبەردەست نییە تا (لقەکانی دی) کوردستانی باشوور بناسینەوە..

وێڕاش ئەوەم پێ سەیرە کەسەرچاوەیێ هەواڵ نابەخشێ لەمەڕ هەبوون و چالاکیی (جەمعییەتی هاریکاریی و پێشکەوتنی کورد-کورد تعاون و ترقی جمعیتی: ئەستەنبوڵ ١٩/٩/١٩٠٨) لە کوردستانی باشووردا و بەتایبەتی لە سلێمانییدا!!

دووای پاکۆبوونی دەسەڵاتی عوسمانیی،لەسەردەمی یێکەم حوکوومەتی کوردستانی باشوور ١٧/١١/١٩١٨دا -سەردەمی حوکمدار حەفید زادە مەحموود-چ هەواڵی بەدەستەوە نییە کە ئایا کۆمەڵەیێکی سیاسیی هەبووە یان نا؟ من خۆم باوەڕ دەکەم کرد و کۆشی هەبووە و چ کۆمەڵەیێ نەبووە!

لەسەردەمی سلێمانیی داگیرکراوی ئینگلیزداو لەنێوان ١٨/٦/١٩١٨-٥/٨/١٩٢٢ دا هەواڵی کەم‌و کورت لەمەڕ هەبوونی چەند کۆمەڵەیێکی سیاسیی‌و نهێنیی نەیاری ئینگلیز بەدەستەوە هەیە.

مێژوونووسی سەردەمەکە: ئەحمەد خواجە - بێ نیشان دانی مێژووی دامەزراندن، بەرنامە و شێوەی کارکردن، نێوی ئەندامان، باری چالاکیی و سنووری - دەگێڕێتەوە کە ئەم کۆمەڵانە-پارتانە: (بەرزیی وڵات، کوردستان، گزنگ، فیدایانی کورد، وەتەن پەروەران بەسەرۆکاییێتی کۆنە ئەفسەری عوسمانیی جەمال عیرفان دامەزراوەوهەبوون!) (٢/ل٦١).

یاداشتنووس ڕەفیق حیلمیی دەگێڕێتەوە کە بەنهێنییو بەسەرۆکاییێتی خۆی (کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد -س١٩٢٠) لەسلێمانییدا دامەزراوەو -خۆی گوتەنیی- بێ بەرنامەو تەمەن کورتیش بووە، بەڵام هەر خۆیشی چەند جاریٚ نێوی هێندیٚ ئەندامی دەستەی ڕێبەریی کۆمەڵەکەی هێناوە وەك: (ڕەفیق حیلمیی، ماجید مستەفا، مەحموود جەودەت. سەیید عەبداللەی سەیید حەسەن، عەزمی بەگ بابان). (١/ب١،ج٤...)

لەلاییێکی دیەوە هەر لەهەمان سەردەمدا، بە ئیزنیی کاربەدەستەکانی ئینگلیزی داگیرکەری سلێمانیی، یێکەم کۆمەڵەی ئاشکرای نیمچە سیاسییو ڕۆشنبیریی، (جەمعییەت کوردستان-١٩٢٢/٧/٢١، سلێمانیی) دامەزراو بەهەڵبژاردنی ئاشکرا سیانزە کەسی ناسراوی سلێمانیی کەبازرگانوفەرمانبەرو ڕۆشنبیرو کۆنە ئەفسەری عوسمانیی بوون. سەرۆكو ئەندامی دەستەی ڕێبەریی ئەم کۆمەڵەیەش ئەم زاتانە بوون: (مستەفا پاشا یامەلکیٚ -سەرۆك)، ئەندامان (ڕەفیق حیلمیی، ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ، سالح ئەفەندی قەپتانچی، فایەق بەگ مەعرووف بەگ، حاجی ئاغا فەتح اللە، عیززەت بەگ عوسمان پاشا، بەهجەت ئەفەندیی یوزباشیی، شێخ محەممەد ئەفەندیی گولانیی، شێخ عەلی ئەفەندیی سەرکار، عەلی ئەفەندیی باپیر، عەبداللە ئەفەندیی محەممەد ئەفەندیی، شوکری ئەفەندیی عەلەکە!) (٦/ل٢).

ئەم کۆمەڵەیە-خۆی گوتەنیی- کە بۆ، (خزمەتی وڵات و بەرزکردنەوەی مەعاریف) هەڵکەوتووە، دیسان بێ بەرنامە بوو! بەهاتنەوەی حەفیدزادە-شێخ- مەحموودیش لە

ئەسارەتی هیندوستان‌و بوونی بەحوکمدار – مەلیکی کوردستان، ئەوپەڕی چالاکیی کۆمەڵەکە (بەهێزکردنی پێوەندیی کورد و حوکمداری کوردستان لەگەڵ ئینگلیز بووە).
هەروەها لەسەرەتاوە دەرکردنی ڕۆژنامەیێکی حەوتۆیی زانستیی، کۆمەڵیی، ئەدەبیی، سەربەست‌و میللیی، (بانگ کردستان –٢٢/٨/١٩٢٢–٨/٦/١٩٢٣. سلێمانیی) لەدەست هاتووە!

بەگشتیش –ڕەفیق حیلمیی گوتەنیی–دووای هەڵکەوتنی دووەم حوکوومەتی کوردستان لە١٠/١١/١٩٢٢دا، (کۆمەڵە)ی نێوبراو بەرەبەرە پەك کەوتەو بێ ئەنجام بوو!

لەسەردەمی حوکمڕانیی پچڕ پچڕی حەفید زادە–شێخ–مەحموودی مەلیکی کوردستان: ١٩٢٢–١٩٢٤دا، هیچ کۆمەڵەیێکی سیاسیی دەنگ‌و ڕەنگی نییەو وێ دەچێ زۆریش پێ ویست بووبێ بۆیێکا یێکێکی وەك ڕەفیق حیلمیی سەرنووسەری ڕۆژنامەی زمان حاڵی (حوکوومەتی کوردستانی جونووبیی!) لە ڕۆژنامەکەدا: (امید استقلال – س١٩٢٣)دا بانگی بۆ دامەزراندی کۆمەڵەیێکی سیاسیی داوەو دەڵێت: (حەتتا لە تەحتی ریاسەتی جەنابی مەلیکدا بە پرۆغرامێکی قەتعیی و فائیدە بەخش "جەمعییەتێکی ئەحرار" تەشەککول بکا!!) (٥/ل٢).. بەڵام وێ دەچێ کەس بە پیریەوە نەچووبێ و بانگەوازەکەی بێ هوودە بووبێ!!.

## کۆمەڵەکانی سەردەمی مەملەکەتی عێراق

دووای داگیرکردنی سلێمانیی –پێتەختی مەملەکەتی کوردستان–لەلایێن نێرووەکانی ئینگلیز–عەرەبی عێراقەوە لە١٩/٧/١٩٢٤داو لکاندنی بازێڕەکە بەدەسەڵاتی مەملەکەتی عێراقی عەرەبەوە، بارێکی نوێ خوڵقا. لە ئەو هەلانەشدا (کۆمەڵەی گەلان) سەرقاڵی کێشەی –بەنێو هەرێمی مووسڵ– کوردستانی باشوور بوو!

لە ئەم ڕۆژگارەدا کۆمەڵێ ڕۆشنبیر و بازرگان و کەسانی ناسراوی خاوەند زەوی و زار لە سلێمانییدا –بۆ بەرهەڵستی داخوازیی تورکیای نوێ بەرامبەر ئەو کێشەیە– یێکەم

کۆمەڵەی سیاسیی بەرنامەداری ئاشکرای بەنێوی (جەمعییەتی مودافەعەی وەتەن-سلێمانیی) دامەزراندو هەڵبژاردنێکی ئاشکرا حەڤدە ئەندامی دەستەی ١٩٢٥/٢/٢٤. ڕێبەریی‌و سەرۆکەکەی ئەحمەدبەگی‌تۆفیق بەگی-یێکەم موتەسەرڕیفی‌کوردی سلێمانیی-پەسەند کرد.

ئەمە نێوی سەرۆك‌و ئەندامەکانە: (ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ. ڕەشید مەستی. تۆفیق بەگ مەحموود ئاغا/پیرەمێرد. محەممەد ئاغای عەبدوڕڕحمان ئاغا. شێخ محەممەد ئەفەندیی گوڵانیی. عیززەت بەگ عوسمان پاشا. عەلی عیرفان ئەفەندیی. حاجی سەعید ئاغا. ئەحمەد بەگ فەتاح بەگ/حەمدیی شاعیر. محەممەد بەگ قادر پاشا. حاجی ئیبراهیم ئاغا. میرزا تۆفیق قەززاز. محەممەد بەگ حاجی ڕەسووڵ بەگ. مەحموود ئەفەندیی ڕەئیسی بەلەدییە. فەتاح ئەفەندیی ئەوقات. فایەق بەگ مەعرووف بەگ. شەوکەت بەگ عەزمی بەگ). (٩/ل٢).

جێگەی باسە هەر بەهەمان نێو و مەبەستەوە لە١٩٢٥/١/١٦ دا و لە بازێڕی مووسڵدا کۆمەڵەییێکی ئەوتۆ دامەزراوە! وردبوونەوەش لەباری هەڵکەوتن‌و شێوەی دامەزراندن‌و ئامانج و نێوی ئەندامەکانی کۆمەڵەکەی مووسڵ و سلێمانیی و لە کارکەوتنی خێرایان، بەبڕاندنەوەی کێشەی مووسڵ گەڕاندنەوەی نوێنەرەکانی (کۆمەڵەی گەلان) کە لە ئەو ماوەیەدا هات بوون بۆ دیدەنیی‌و لێپرسینەوە، ئەوە تێ دەگەین کە هەردوو کۆمەڵەکە بە ئامۆژگاریی ئینگلیز و عێراق دامەزرابوون!

کۆمەڵەکەی سلێمانیی-خاوەند بەرنامەی بڵاوکراوە لەڕۆژنامەی ژیانەوە دا- جوانتر لە ئەم دوو بەندە گرنگەدا دەناسرێتەوە:

ب١: غایەی ئەم جەمعییەتە، مودافەعەی وەتەن‌و حودوودی حازیرەی ویلایەتی مووسڵە "!!" کە لە موتەممیاتی عێراق مەعدوودە!

ب٢: وەتەن‌و مەملەکەتەکەیان"!!" لەگەڵ ویلایەتی مووسڵ بەجۆرێکی لایەنفەککی عێراق عەدد ئەکات! (٩/ل٣).

چەندیش لەتەواوی بەرنامەو ئامانجەکانی ئەم کۆمەڵەیەش وردببیتەوە، دڵنیا دەبیت کە ڕەنگ‌و ڕوویێکی دڵڕفێنی نییە بەرامبەر خەباتی خوێناوی و ماف چارەنووسی گەلی کورد، بۆییێکا زۆر چاوەنۆڕ دەکرێ هەر (کۆمەڵەییێکی سیاسیی نهێنیی) هەڵبکەوێ کە ئەمەش ڕووی داوە.

## جەمعییەتی پێشکەوتنی کوردان

دووا بەدووای هەڵکەوتنی ئەو پێوەندییە نوێیە کوردستانی باشوور بە مەملەکەتی عێراقی عەرەبەوەو قاییل بوونی (کۆمەڵەی گەلان) بە لکاندنی هەرێمی مووسڵ "!!" بە ئەم مەملەکەتە تازە دروست کراوەوە، هەروەها کلپەسەندنی سێیەم شۆڕشی حەفید زادە -شێخ-مەحموود لەچیادا، ڕوونە کەدووای ئاوابوونی خێرای (جەمعییەتی موودافەعەی وەتەن!!) کۆمەڵەییێکی سیاسیی نهێنیی بەنێوی (جەمعییەتی پێشکەوتنی کوردان)ەوە هەڵکەوتووە.

نووسراوێکی تاقانە کە تا نهوو هەر خۆی نێوی هێناوە و لە ئەویشەوە بە چەند دێڕی باسی بڵاوە، هەر ئەو نووسراوەی لێ کۆڵی فڕانسیی (کریس کوتشیرا) لە دانراوی خۆیدا (بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد-س١٩٧٨.پاریس) لێی گوتووە: (لە ساڵی١٩٢٦دا ئینگلیز لە سلێمانییدا " کۆمەڵەی پێشکەوتن"ی نهێنیی هەڵوەشاندەوەو بەری گرت کە ئامانجی ڕێکخستن و ڕووناکبیریی ئەندامەکانی بوو، بەڵام دووای ئەو خێرا کۆمەڵەیێکی دی پێك هات‌و جێگەی گرتەوە!). (٣/ل٩١).

### •• بەڵگەنامەی بەرنامەی کۆمەڵەکە!

وەك سەرچاوەی نێوبراو لە ئەو چەند وتەیە چی دی پێ نەبووە، خۆشبەختییە کە (بەرنامە کوردییەکەی و مەتنە وەرگێڕدراوەکەی بۆ زمانی ئینگلیزیی) لە گەنجینەی

نەتەوەپەروەری نەمر مستەفا سایێبدا هەلگیراوە و ئەوەتە بۆ یێکەمین جار خۆر دەبینێت:

پڕۆغرامی جەمعییەتی پێشکەوتنی کوردان.

١. ئەم جەمعییەتە کۆبووەتەوە بەپێی ئەو ماددانە کە لە خوارەوە نووسراوە. بە ئیتتیفاقی هەموو لایێك بۆ مەنافیعی میللەتی کورد سەعیی ئەکات!

٢. غایە و مەقسەدی جەمعییەت یێکیێتی، نەشری مەعاریف، تەنویری ئەفکار، موحافەزەی حوقووقی مەشرووعەی میللەتی کوردە!

٣. جەمعییەت بۆ گەیشتن بەم مەقسەدە لە هیچ نەوعە تەشەببوسێکدا قوسوور ناکات و خۆیشی بۆ یارمەتیی دانی ئەو کەسانەی کە خزمەتی ئەم غایەتە ئەکەن موکەللەف ئەزانێ!

٤. جەمعییەت بۆ پێشکەوتنی میللەتی کورد ڕەهبەری خۆی ئەمڕۆ حوکوومەتی بەریتانیا ئەناسێ!

٥. واریدات و مەساریفات و تەئمینی موخابەرەی جەمعییەت بەپێی ئیقتیدار و حەمییەتی خۆیان دوخوولییە ئەدەن بە سوندووقی جەمعییەت.

بێجگە لە لەو دوخوولییە، ئەوانەی کە ئەسحابی مەعاشن بەپێی مانگانەیان لائەقەل بە نیسبەتی سەدیی دوو نیو ئەبێ یارمەتیی جەمعییەت بدەن، لەوە زیاتر یارمەتیی دان بۆ ئەسحابی جەمعییەت مەربووتی ویجدانیانە!

" تەواو "

■ **لێکۆڵینەوە**

ئەو بەرنامە سیاسییە –لەسەر پەڕەیێکی زەردباوی ٣٠×٢٠سمدا نووسراوە –دیارە بەدزییەوە وێنەی بە دەست نووسراوەتەوە و گەیاندراوە بە (موتەسەڕڕیفی سلێمانیی) کە ئەویش بەقەڵەمی–سووری– خۆی لەپەراوێزی قاقەزەکەدا نووسیوییێتی: (سیڕڕی:

تەحریرات، بە ئینگلیسیی تەرجەمە بکریۆ دوو سورەتی بۆ ئێمە بنێرێت!(١/٧)."١"
وەك وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەیشی لەبەرچاوە، دیارە کەهەڵکەوتنی ئەم کۆمەڵەیە ترسێکی گەورەی هەبووە!! بەلاّم بۆچیی؟

جارێ پێویست دەکات (بەرنامەی کۆمەڵەکە) لەبەرامبەر نووسینەکەی (کریس کوتشیرا) ڕابگرین و بەراووردی بکەین و جودابیەکان ڕوون بکەینەوە:

١. بەپێچەوانەی قسەی کوتشیراوە، (کۆمەڵەی پێشکەوتن)نێوی تەواوی کۆمەڵەکە نییە و (کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان) ڕاست و ڕەوانە!

٢. پێچەوانەی قسەی کوتشیراوە کەدەلێت: (مەبەستی کۆمەڵەکە ڕۆشنبیریی بووە!) ئەوە مەبەستی گەورەی کۆمەڵەکە، (موحافەزەی حوقووقی مەشرووعەی کورد)ە!

٣. وەك دەستنووسی موتەسەڕڕیفی ئەوساتەی سلێمانیی-بێگومان ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگە-بەسەر قاقەزی بەرنامەکەوەیەو لەبەرچاوە، زۆر وێ دەچێ پێچەوانەی قسەی کریس کوتشیرا کە دەلێت، (ئینگلیز لەسلێمانییدا کۆمەڵەی پێشکەوتنی هەلوەشاندەوەو بەریگرت!) ئەوە نەك بەتەنێ ئینگلیز، بەلکو بە هاریکاریی دەسەلاّتدارانی ئینگلیز - عێراق، کۆمەڵەکە ناسرابێتەوە و قەدەغە کرابێ!

٤. وەك موتەسەڕڕیف مێژووی(١/٧)ی لێ داوە کەبێگومان دەکاتە (١٩٢٦/١/٧)، دیارە کۆمەڵەکە لەئەم مێژووەدا-بەڕەسمیی- ناسراوەتەوە. بەپێی ئەم دەستنووسە و بەپێی ڕاگەیاندنەکەی کوتشیرا کەدەلێت، (ساڵی١٩٢٦ دامەزرا!) ئەوە ناچارین لایێنی ساڵی ١٩٢٦ بگرینو باسەکە ئەوها وەربگرین کە لە(یێکەم هەفتەی دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەسیاسییەنهێنییە)دا،نهێنبرەکانی دەولەت، زەفەریان پێبردووەو ناسیویانەتەوە!

٥. پێچەوانەی بێ دەنگیی کریس کوتشیرا، ئاشکرا دیارە کە کۆمەڵەکە: (ئەمرۆ بۆ پێشکەوتنی میللەتی کورد، بەریتانیا بە ڕەهبەری خۆی دەناسێت!).

سێ پرسیاری گرنگیش چاوەنۆڕی لێ پرسینەوە و وەڵامن:

پ١: ئەم کۆمەڵەیە –ئینگلیزی بەرەهبەری خۆی ناسیی بێ–بۆچیی بەئاشکرا کارناکات؟ بۆچیی بەری لێ گیراوە و قەدەغەکراوە؟

پ٢: دامەزرێنەرەکانی کۆمەڵەکە کێن؟

پ٣: ئەو کۆمەڵەیەی –کوتشیرا گوتەنیی–هەر زوو دووای ئەم کۆمەڵەی پێشکەوتنە دامەزرا، کام کۆمەڵەیە؟

بەپێی توانا، وەڵام دانەوەی کورتم ئەمەیە:

١/١: لەلای ئینگلیزی چاودێری دەوڵەتی عێراق و حوکوومەتی مەملەکەتی عێراقیش، هەر کۆمەڵەییێکی کورد مایەی گومان و ترسە کە بێ ئاگاداریی خۆیان و بێ ئافەرینی قانوونیی، بە نهێنیی دابمەزرێ!

٢/١:ڕستەی (حوقووقی مەشرووعە!) لەوەتیی ئاگربەستی یێکەم جەنگی گێتییەوە، کەوتووەتە سەرزاری چینە شۆڕشگێڕ و ڕۆشنبیرە نەتەوەپەروەرەکانی گەلی کورد.. لەلای ئەو دوو لایێنەشەوە (ئینگلیز–عێراق) مایەی گومان و ترسە، بەتایبەتی لە ئەو ڕۆژگارانەدا –ڕۆژگاری دامەزراندنی کۆمەڵەکە– حەفید زادە مەحموود لەدژی هەردوولا شۆڕشی دەگێڕا!

بۆ ڕاستیی و سەلماندنی باوی ئەم ڕستە گرنگە، تەنانەت بە کابراوی حەفید زادەش، ئەوە بەڵگەییێکی زیندوو بەیاننامەییێکی سیاسیی ١٩٢٢/١٢/٢ی حەفید زادە خۆییێتی کە بڵاوەو تێیدا گوتوویێتی: (لەتەڵەبی حەققی مەشرووعمان ڕوو وەرناگێڕم. حەققی ئەم میللەتە مەغدوورەم دەوێ و لازمە تا نیهایەت بۆ ئیستیحساڵی دەوام و ئیسرار بکەم!) (٤/ل١١٧).

ڕاستییەکەیشی–وێڕای ئەوەی لە ئەم ڕۆژگارانەدا کێشەی هەرێمی مووسڵ و عێراق و کێشەی کورد کەوت بووە بەردەم کۆمەڵەی گەلان– لەلای حەفید زادە و لەلای زۆربەی

ڕۆشنبیرەکان، ماف (ڕەوای کورد–حوقووقی مەشرووعە!) بریتیی بوو لە (سەربەخۆیی کوردستان) کە ئەمە هەرگیز لە بەرنامە سیاسییە دووربینەکانی ئینگلیز–عێراقدا نەبووەو قەدەغە بووە! کەواتە بەر لیٚ گرتن و قەدەغە کردنی پیٚ ویست بووە و وێش ناچیٚ ئینگلیز خۆی، هەرگیز ئافەرینی لە دامەزراندنی کردبیٚ!

۱/۲:چبەڵگەنامەیێکیڕاستو ڕەوان بەدەستەوە نییە وەڵام بداتەوەو دامەزرێنەرەکان ئاشنا بکات، کڵاو ڕۆژنەیێکی ڕووناکیی هەیە و توانایێکمان دەداتیٚ بڵێین: باوەڕ ناکرێت لایێنگیرانی نزیکی حەفید زادەی شۆڕشگێڕ ئەم کۆمەڵەیەیان دامەزراندبیٚ و باوەڕ بەهێزترە کە ڕۆشنبیرانێکی لایێنگری (مافە ڕەواکانی میللەتی کورد و ئارەزوومەندی دۆستایەتیی کورد –ئینگلیز) ئەم کارەیان لە دەست هاتبیٚ! دیارترین ڕۆشنبیریش کە لە نێو ڕووداوەکانی ۱۹۲۲–۱۹۲۳دا بۆ ئەو ئامانجە چستو چالاك بووبیٚ، (مستەفا پاشا یامەلکیٚ) بووە کە لەڕۆییشتنە عوموومییەکەی ۱۹۲۳/٦/۱۷بەدوواوە چوو بووە بەغدادو لەڕۆژگاری (هەڵکەوتنی ئەم کۆمەڵەیە)دا، هەرخۆی لە۱۹۲٦/۱/۲۸دا –یانزدە ڕۆژ دووای دەرکەوتنی بەرنامەی ئەم کۆمەڵەیە بۆ موتەسەڕڕیفی سلێمانیی –سەرلەنویٚ ڕۆژنامەی (بانگ کوردستان: ژ ۱٤–۱)ی لە بەغداد دا دەرکردووە و لە (بانگ کوردستان–ژ۱٤– ۲: ۱۹۲٦/۲/۱۵)دا سەرگوتارێکی دەڵێت: (نەوەك لە کوردستانی وەسەتا–کوردستانی عێراق/کەمال–هەموو وڵاتی کوردانی ترحەز دەکەن بەبوونی ئینگلیزان کەهەمیشە چاویاریان –چاودێریان/کەمال–بکەنو ئارەزووی ئەوان لەسەر هەرچیی بێت کوردان بۆ مەسڵەحەتی خۆیان پێیان خۆشەو دەزانن کەئینگلیزان ئێسکانی کوردان ناشکێنن!!)

تەنانەت لەهەمان ژمارەدا مستەفا پاشا شیعرۆکەیێکی خۆی بڵاوە کە تێیدا دەڵێت:

**ئێمە کوردین دۆستی ئینگلیزین ئەگەر گیو لە ئێمەی نەکا**
**ئیددیعای ئێمە (!!!) تەسلیم گورگانمان نەکا!**

بەڵام هەر دووای (بانگ کوردستان: ژ١٤-٣: ١٩٢٦/٤/١) دەنگی مستەفا پاشا کپ‌و وێنەی ڕۆژنامەکەیشی بۆ بەرەو دووا لە چاوان ون بوو! ! "٢".

٢/٢: لە هەلی دەرکردنی ڕۆژنامەی نێوبراودا و هەڵکەوتن و ئاشکرا بوونی (کۆمەڵـەی پێشکەوتنی کوردان)بۆ کاربەدەستەکان، لەلاییکەوە جموجووڵ بۆ پێکهێنانی پەرلەمانی عێراقیی و هەڵبژاردن لە ئارادا بوو، مستەفا پاشاش یێکێ بـوو لـەنێو ڕیـزی کەسـەکانی کورددا کە بە هیوای هەڵبژاردن‌و سەرکەوتنی خۆی بوو ... بنۆڕە: (لە ئەشراف و تیجـار و مونەوویرانی سلێمانیی، فەتاح بەگ زادە ئەحمەد، عەبـدوڕڕحمان ئاغـا زادە محەممـەد ناجیی، حاجی ئیبراهیم خەففاف، حەسەن ئاغا زادە حاجیی، مەحامیی ڕەفیـق تۆفیـق، تۆفیق قەززاز، ڕەشید مەستی، مەعرووف بەگ زادە فایەق، حاجی شەریف زادە فـەتاح. حاجی فەتاح زادە ڕەمزی).

لەبریی سەد کەسی ناسراوی سلێمانیی، ئاگاداری نامـەیێکیان بـۆ ڕێبـەری ڕۆژنامـەی (ژیان)ی سلێمانیی ناردووە کە تێیدا گوتوویانە: (لەبەرئەوەی حـاجی مسـتەفا پاشـا بـە زاتێکی موقتەدیر و بە لیاقەت ئەزانین، بۆئەوەی کە سـلێمانیی لـە مەجلیسـی نووابـدا – پەرلەمان/کەمال– تەمسیل بکات، نامەزدیی موشار و ئیلێە ئیعلان دەکەین!). (٧/ل٣).

بە تیشکی ئەم ڕووناکییە ئاشکرایە کە(مسـتەفا پاشـا) لایێنگیرانێکـی لـەڕیزی هـەرە ناسراوەکانی سلێمانییدا هەیە و متمانەی پێ دەکەن و پشتیوانین!

کەواتە زۆر چاوەنۆڕ دەکـرێ لـەنێو ئـەو کۆمەڵـە کەسـانەوە (کۆمەڵـەی پێشـکەوتنی کوردان) سەری هەڵ دابێ و دامەزرابێ، بەتایبەتیش کە –لای لێ کۆڵەکان–زۆربـەی ئـەو نێوانە، بەوردبوونەوە لەتێکەڵییان، بە دۆستی پێوەندیی کورد – ئینگلیز دێنە بەرچاو!

١/٣: وێڕای ئـەوەی کوتشـیرا نێـوی (کۆمەڵەکـەی بریـی کۆمەڵـەی پێشـکەوتن! !)ی نەبردووە، ئەوە کۆمەڵەیێ کە زۆر زوو دووای١٩٢٦/١/٧دامەزرابێ و جم و جووڵی خێرای بە دوودا هاتبێ، ئەوەیە کە لە١٩٢٦/١/٢٧دا –بیسـت ڕۆژ دووای ناسینەوەی بەرنامـەی

کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان -سێ کەسی بەنێوبانگی سلێمانیی: (پارێزەر ڕەفیق تۆفیق، ڕەمزیی حاجی فەتاح، فایەق مەعرووف بەگ) کە لە ڕیزی پشتیوانەکانی مستەفا پاشاشدان، داخوازییان داوە بە وەزارەتی نێوخۆی عێراق بۆ دامەزراندنی (جەمعییەتی زانستیی کوردان-سلێمانیی)و دەزگەی نێوبراویش بەنامەی (ژ٥٧١-٢٤/٢/١٩٢٦) ڕەزامەندیی نواندووەو شەوی٢-٣/٤/١٩٢٦ یش ئاهەنگی کردنەوەی کۆمەڵەکە کراوەو ئەو سێ کەسە دامەزرێنەش بوونەتە ئەندامی ڕێبەریی کۆمەڵەکەو-موتەسەڕڕیف-ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ بووە بە سەرۆکی کۆمەڵەکە! (٨/ل٢).

کەواتە هەر ئەم دووەم کۆمەڵە ئاشکرا و ڕۆشنبیرییە دووای کۆمەڵە نهێنییەکە (پێشکەوتنی کوردان) دامەزراوەو ئەم جێگەی گرتووەتەوە نەوەکا کۆمەڵەیێکی دی وەك (کۆمەڵەی زەردەشت)ی نهێنیی‌و دامەزراوی مستەفا سایب کە دووای دامەزراندنی بە ئەندازەوان لە دەزگەی ئەشغالی سلێمانیی لە پاییزی ١٩٢٦ دا، ئەم کارەی لە دەست هاتووە.

**ئەنجام**

وێڕای بەڵگەنامەکە کەهەموو نهێنییێ ساخ دەکاتەوە، دەتوانم بڵێم ئەم ئەنجامانەمان لەبەرچاوە:

١. کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان کە وێ دەچێ لە یێکەم هەفتەی ساڵی ١٩٢٦دا دامەزرابێ، یێکەم کۆمەڵەی سیاسیی نهێنیی بووە لە سەردەمی مەملەکەتی عێراقدا و -خۆی گوتەنیی-مەبەستی پێشکەوتنی میللەتی کوردو یێکیێتیی‌و بڵاوبوونەوەی خوێندەواریی‌و لەسەروو ئەوانەشەوە (پاراستنی مافە ڕەواکانی میللەتی کورد) بووە.

٢. قەدەغەبوونی بەتەنێ ئەنجامی بارە نهێنییەکەی نییە، بەڵکو ترسی دەسەڵاتدارانی ئینگلیز-عێراق بووە لە ئامانج‌و مەبەستەکانی بەتایبەتی لەمافە ڕەواکانی میللەتی کورد!).

٣. دامەزرێنە (ون)ەکانی، کەسانێکی دۆستی پێوەندییو هاریکاریی کورد-ئینگلیزن. هەر بۆییێکا بیَ سلّ کردنەوە(حوکوومەتی بەریتانیا بەرەهبەری- ئەو رۆژەی -دەناسێت!). هەرگیز باوەڕیش ناکرێت کە سەر بە حەفید زادە مەحموود و بەرنامە سیاسیەکانی ئەو بووبیَ!

زۆرتر ویَ دەچیَ کەسانێکی دۆستو لایێنگری مستەفا پاشا یامەلکیَ بووبن کە وێش دەچیَ -دووای ئاشکرا بوونیان- بەشداری دامەزراندنی (کۆمەڵەی زانستیی کوردان) ی رۆشنبیرییان کردووە.

٤. کۆمەڵەی باس کراوی کریس کوتشیرا -دووای کۆمەڵەی پێشکەوتن- کەزۆر زوو هەڵکەوتبیَ، هەر (کۆمەڵەی زانستیی کوردان - سلێمانیی) یە. باوەڕیش بەهێزە کە بنچینەی ئەم کۆمەڵەیەش مەلامەتێکی سیاسییە نەك رۆشنبیریی روون!! " ٣ ".

## پەراوێز

" ١ ". بەراوردکردنی دەستنووسەکە مەتنی (بەرنامەی کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان) لەگەلّ نامەییَکی رەسمییانەی ٩/١٦ /١٩٢٤ ی موتەسەرریفی سلێمانیی - چاپمان - ی ئینگلیز بۆ مەرحووم شێخ ئەمینی خالّ، دلّنیام دەکا کە دەستنووسە کوردییەکە بە قەڵەمی کۆپیی نووسەری تەحریراتی ئەو ساتەی موتەسەرریفیەتی سلێمانیی، (جەلال سایب) ە و هەر ئەویش وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەیشی - بە مەرەکەبی رەش - لە دەست هاتووە.

جێگەی باسە، جەلال سایب یێکەم جەنگی گێتییدا دیل کراوە و لە (بۆرما) دا زیندانی کراوە و لە ئەسارەتدا فێری ئینگلیزییەکی چاك بووە کە خۆی جێگری ئەفسەری عوسمانیی بووە!

پێویستە روونیش بێت کە باوەڕم بەهێزە، مستەفا سایب بەهۆی ئەم برا گەورەیەوەی رەنگبیَ ئەم بەڵگەنامەیەی دەستگیر بووبیَ بەتایبەتی دوای سالّی ١٩٢٧ کە ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ لە موتەسەرریفیەتیی سلێمانیی لابرا.

لەلایێکی دیەوە، هەر لەبارەی بەڵگەنامەکەوە، پێ ویستی دەزانم بڵێم: لەسەر مەتنە ئینگلیزییەکە نووسینێ بە قەڵەمی کۆپیەی کاڵ نووسراوە و ژمارەی (دوسێ ۱۱ /۱) ی لەسەر دانراوە کە ئەمەش بەڵگەیە بۆئەوەی لە ئەو (مێژووە) دا دۆسێە بۆ ئەو کۆمەڵەیە کراوەتەوە.

پرسیارێکی ڕەوای خوێندەواریش کە وێ دەچێ ئەوە بێ بڵێت: (جەلال سابیب چۆن ئەو برنامە کوردییەی نووسیوەتەوە و لەکوێی بوو؟) و (ئایا دەشێ خۆی ئەندامێکی کۆمەڵەکە بووبی؟) ئەمەش شایانی وەڵامە!!

ڕاستییەکەی وەك سەرنجم داوە (جەلال سابیب) نێوی لە هیچ کۆمەڵەییێکی سیاسیی کورددا نەبووە و دەرنەکەوتووە. بەڵام لەبەر ئینگلیزیی زانینیی و توانای لە کاروباری نووسین و ئیدارەدا، لە ئینگلیزەکانەوە تا موتەسەرڕیفەکانەوە نزیك بووە! (ساڵی ۱۹۲۱ دا لەگەڵ ئەدمۆندز **S.J.Edmons** بووە لە ڕانیەدا!) {چەند قسەییێکم لەمەڕ جەلال سابیب – لە کوردستانی نوێ دا – بە هەڵە نووسیی بوو!}.

بۆ چۆنییێتی دەستگیرکردنی (بەرنامەی کۆمەڵە) ی باس کراویش، پێم وەیە کە نهێنبرێ مەتنە ئەسڵییەکەی هێنا بێت بۆ موتەسەرڕیف ئەحمەد بەگ و ئەویش داوای لە جەلال سابیب کردبێت کوردییەکەی لەبەر بنووسێتەوە و وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەشی جێ بە جێ بکات! (خودا هەرە ئاگادارترە!).

" ۲ ". مستەفا پاشا یامەلکێ – لەدژی ڕژێمی تورکیای کەمالیی – هەمیشە نەیارانە خۆی دەنواند و بە گیانی کوردایەتیی خۆیەوە هیوای بە ئینگلیز بوو کە دۆستی کورد بێ و کورد و کوردستان ئازاد بن و نەکەونە ژێر باری دەوڵەتی نوێی تورك و عەرەبەوە، بۆییێکا لە سەردەمی حوکمڕانیی حەفید زادە مەحمووددا هەمان باوەڕی دەنواند، بەڕادەیێ حەفید زادە گومانی لە پێوەندیی بە ئینگلیزەوە هەبوو، تەنانەت ویستی بەندی بکات!

مستەفا پاشا و خەڵکانێکی هاو خەیاڵ و ئەتواری بەرە بەرە خۆری هیوایان –بە ئینگلیز– پووکایەوە و خۆی مستەفا پاشا/بە فیتی ئینگلیز–چیی بۆ نەهاتە دی وەك بابەتی چوونە پەرلەمانی عێراقەوە کە هەرگیز کرد و کۆشی – دووجاری – نەگرت!

دووای ئەم قەوماوانە، داخستنی ڕۆژنامەکەی بەغدادی، سەرنەگرتنی چوونە پەرلەمانی، نەبوونی کورد بەهیچ بە سایەی ئینگلیزەوە.. هتد، دیارە هەموو خەونەکانی مستەفا پاشا بلّقی سەر ئاو دەرچوون بۆییکا کوڕەکەی لە (بیرەوەرییەکانی عەبدولعەزیز یامەلکێ /بلاوکراوەی گۆڤاری دەنگی مامۆستای کورد: ژ ٢٧ و ٢٨ " ژ ٢٨ - ل١٩ " دووا نیگای هەستی بابی خۆی نواندووە و دەبێژێت: (بەهۆی سیاسەتی ئینگلیزەکانەوە زۆر مەقهوور بووە ! !).

" ٣ ". لێ کۆڵینەوەییکی چرم ئامادە کردووە لەسەر (کۆمەڵەی زانستیی کوردان - سلێمانیی) بەلام پاکنووس نەکراوە و لە هەندەراندا لەبەردەستم نییە کە (ئەو ڕاستییەم تێدا سەلماندووە !).

### تێبینیی

وشەی (جمعية) ی عەرەبیی لەسەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکاندا تا دووای دروست بوونی مەملەکەتی عێراقی عەرەبیش لەبریی (حزب، پارت) ی سیاسیی، تەنانەت ڕۆشنبیریی بەکار دەبرا، بۆییکا (جەمعییەتی پێشکەوتنی کوردان) وەك پارتێ دەناسرێت. وەك وێنەی مەتنە ئینگلیزییەکەش لەبەرچاوە، وشەی (جەمعییەت) بەشێوەی (کۆمەڵە، یێکیێتی Association) وەرگێڕدراوە.

## تەماشاکراوەکان

(١) .حلمي: رفيق.(یاداشت،ب ١/ل ١٠٠ - ١٠٤، ج ٤/ل١٠٩-١٢٨،بەغدا ١٩٥٦).

(٢) . خواجە: احمد. (چیم دی، ب ١، بەغدا ١٩٦٨).

(٣) . شريف: عبدالستار طـاهر "در"(الجمعيـات والمنظمـات والاحـزاب الكرديـة في نصـف قرن، بغداد ١٩٨٥).

(٤) . هاوار: م. رسول (شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خـوارووی کوردسـتان، ج ٢، لەندەن ١٩٩١).

(٥) . اميد استقلال-س ١، ذ٨،٨ تشرين ثانى ٣٣٩ /٧-١١-١٩٢٣.

(٦) . بانگ كردستان -س١، ژ ١، ١٩٢٢/٨/٢.

(٧) . ژيان-ژ ١٩٢٦/٢/٥،١٨.

(٨) . ژيان - ژ ١٩٢٦/٤/٢٥،١٣.

(٩) . ژيانەوه-ژ١٩٢٥/٢/١٦،٩.

# ٨

# کێشەییکی سیاسیی
# بەنێوی نووسین و خوێندەواریی کوردییەوە
## بەشی ییکەم

### پێشەکیی

سەروەزیرانی مەملەکەتی عێراق لەبەردەم ئەنجوومەنی نوێنەران –پەرلەمان– ڕۆژی ١٩٢٦/١/٢١ گوتارێکی داو گوتی: (.... ئەم وڵاتە نازیێ تا هەموو ڕەگەزێکی، هەموو مافێکی خۆی پێ نەدرێ! ... پێویستە مافەکانی گەلی کورد بدرێ! پێویستە کارگێڕەکان هەڵبژاردەی نێوخۆی بێ! پێویستە زمانیان بە ڕەسمیی بناسرێت! پێویستە منداڵانیان لە قوتابخانەکاندا بە زمانی خۆیان بخوێنن! (٣ /ص١٣١).

بەندی سێی یاداشتنامەی نهێنیی ١٩٢٦/٣/٢ ی لیژنەی ڕاسپێردراوی کۆمەڵەی گەلان"٣"و تایبەت بە چارەنووسی هەرێمی مووسڵ "!! "، کۆمەڵەی ڕاسپاردووە کە: (پێویستە ڕێزی ئارەزووەکانی کورد بگیرێ کە چاوی بڕیوەتە دامەزراندنی کارگێڕی کورد نەژاد بۆ ڕێبەریی کردنی کاروباری وڵاتەکەی! پێویستە خوێندن لە قوتابخانەکاندا ییکسان بێ و لە هەموو کاروبارێکدا زمانی کوردیی پێ ڕەو بکرێ! (٤/ص١٥٤).

بە ئەم پێیە ئەوە پێ ویست بووە کە حوکوومەتی مەملەکەتی عێراق، بە وەزارەتی مەعاریف –زانستیی– یەوە، بەشی هەرە گەورەی ئەو گفتەی خۆی و ڕاسپاردە نێو دەوڵەتییەکەش جێ بە جێ بکات، بۆییکا پرسیار ئەوەیە، چەند و چۆن ڕەفتاریان کردووە؟

-ڕەفتاری وەزارەتی مەعاریف، بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی گشتیی یێکێ لە دەزگە بەرپرسەکانی وەزارەتی مەعاریف، بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفی گشتیی بووە کە بەشێکی گەورە و گرنگی ئەو ئەرکەی بەرەوڕوو کرابووەوە.

ساتیعولحوسەریی-عەرەبی یەمەن: ١٨٨٠ز-١٩٦٨ز، ڕێبەری گشتیی مەعاریفی عێراق لەنێوان ١٩٢٣/١/٥-١٩٢٧/٧/٣١ز. دا- ئەو ئەرکەی هێندە پچووك کردووەتەوە، نێوی لێ ناوە (باسی نووسین بە زمانی کوردیی/قضية الكتابة باللغة الكردية - قەزییەتولکیتابە بیللوغەلکوردییە!). ئەم نێونیشانە پچکۆلانەیەو لە ئەم چێوە تەسکەدا کە جێگەی (باسی سەپاندن و بڵاوکردنەوەی کوردیی) گرتووەتەوە، هەر لە یێکەم تەماشاوە مایەی گومانە!! گریمان پەسەندیش کرا، دەی چۆن و چەند و چاك یان خراپ ڕەفتاری لەگەڵ کردووە؟

-یاداشتی ساتیعولحوسەریی

ڕێبەری مەعاریفی گشتیی، هەر لە داندراوە عەرەبییەکەی خۆیدا (موزەککەراتی فیلعێراق /یاداشتەکانم لە عێراقدا) دەڵێت: (کاتێ کە حوکومەتی عێراق باوەڕی هێنا و بڕیاری دا لە بازێڕ و گوندەکانی کورداندا، زمانی کوردیی ڕەسمیی بێ، لەسەر وەزارەتی مەعاریف کەوت کە چیی پێویستە دەستی بداتێ و ڕاپەڕێنێ بۆ سەپاندنی ئەم بڕیارە لە مەیدانەکانی فێرکردندا! بۆ ئەم مەبەستە لیژنەییێك -بەچاودێریی خۆی/کەمال-لەچوار ڕۆشنبیری دانیشتووی بەغداد پێك هات کە: تۆفیق وەهبیی، عەبدوڕڕحمان ساڵح، شوکریی فەزڵیی، نووریی بەرزنجیی بوون. ئەرکی لیژنەکە ئەوە بوو کتێب وەربگێڕن بۆ کوردییو لەقوتابخانەکانی سەرەتاییەوە دەست پێ بکەن! بەڵام لەئەم هەلانەدا مقۆ مقۆ پەیدا ببوو لەمەڕ وەرگێڕانی کتێبەکانی قۆناخی ئامادەییش وەك فیزیا و کیمیاو جەبرو ئەندازە.

خۆم هەر زوو لیژنەکەم ئاگادار کرد کە کتێبەکانی سەرەتایی، بەتایبەتی بۆ پۆلەکانی یێکەمین مەبەستە ! لەیێکەم کۆبوونەوەی لیژنەکەدا-ڕەنگبێ لە نێوندی شوباتی١٩٢٦دا/کەمال-تۆفیق وەهبیی ڕاییێکی نواند کە ئەمەیە: "بەر لەوەرگێڕاندن، پێویستە کێشەی نووسینی کوردیی چاك بکرێت!" ئەو وەك لایێنگیری نووسیینی لاتینیی نییە، تیپەکانی عەرەبیی بۆ دەنگەکانی کوردیی، بە کەمو ناتەواو دەزانێتو دەڵێت: "پێویستە تیپی دی دابڕێژرێت کەچاپخانەکانیش ناچار دەبن ئەو تیپانە بەکارببەنو ناشێت دەست بدرێتە چاپکردنی چ کتێبێ تا ئەو تیپانە ئامادە نەکرێن!).

ساتیعولحوسەۆیی پتر دەگێڕێتەوە کەدووای یێکەم کۆبوونەوە، محەممەد ئەمین زەکیی وەزیری ئەشغالی دیتووەو ئەویش پێی گوتووە: (فێرکردن-پێ خوێندن- دەبێت بە کوردیی هەموو قوتابخانەکان بگرێتەوە تا دەشگاتە خوێندنی بالاّ و دەشبێت لە کۆلێجی قانووندا بەشێکی تایبەتیی بکرێتەوە. هەروەها لە کۆلێجی سەربازییشدا!). پتر دەڵێت: (بەلاّم باوەڕی هەبوو کەدەبێت لە قوتابخانەکانی سەرەتاییەوە دەست پێ بکرێت!).

ڕێبەری مەعاریفی گشتیی پتر باسەکانی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (لە کۆبوونەوەی دووەمی لیژنەکەدا، تۆفیق وەهبیی پرۆژەیێکی پێشکەش کرد کەپێویست دەکات پانزە تیپی نوێ دابڕێژرێت بەزیادکردنی چەندین خاڵ و نیشانە بۆ یانزە تیپی عەرەبیی باوە ئەمەش-بەقسەی ئەلحوسەریی/کەمال-مانای دانانی: چلو پێنج شێوە تیپە کە دەبێت لەچاپخانەکاندا زیاد بکرێن و دابڕێژرێن کەخۆی گیروگرفتە بۆ خوێندن و نووسینی کوردیی و بۆ چاپخانەکەش!!). (واتە ئەو شێوە تیپانەی پێشنیازنامەکەی لە ئێرەدا بلاوە /کەمال).

ساتیعولحوسەریی لە یاداشتەکانیدا لەسەر قسەیی دەڕوات و دەڵێت کە تۆفیق وەهبیی و عەبدوڕڕەحمان سالح هەڵوێستەیان یێگدگیر بووە و ئەوانی دی - وەك چاویان

لە دەمی خۆی کردبیێ/کەمال – لایێنگیریی خۆی بوون!! هەروەها دەشلێت کە دووای مشت و مڕێ، ڕاستو ڕەوان بە ئەم جۆرەی باس دەکرێ، بڕوای خۆی بۆ تۆفیق وەهبیی ئاشکرا کردووە و پێی گوتووە: (من لە ئەم باسەدا ناتوانم بڕیاری ببڕای ببڕ بدەم و پێم وەیە کە لیژنەییێکی بەرفراوانتر دەبێت تەماشای باسەکە بکات و لێی بکۆڵێتەوە و بڕیاری بدات!!). تۆفیق وەهبیی بە نارەزاییەوە وەلامی داوەتەوەو گوتوویێتی، (بۆچیی؟ ئەدی ئێوە نین کە هەڵتانبژاردووین؟ ئێوە بانگتان نەکردووین؟ ئەدی بۆچیی ڕای ئێمە پەسەند ناکەن؟).

ڕێبەری مەعاریفی گشتیی، ساتیعولحوسەریی لە یاداشتەکانیدا پتر باس دەگێڕێتەوە و دەلێت: کە (باسی ناکۆکیی!!) کەوتەوە دەم محەممەد ئەمین زەکیی و عەبدولموحسین ئەلسەعدوونی سەر وەزیران و سەبیح نەشئەتی وەزیری مەعاریف، پێیانگوت: (تۆ کە کوردیی نازانیت، بۆچیی کارێ دەکەیت – چۆن شیعەکان ناحەزتن – کوردیش ناحەزت بن؟). نێوبراو پتر دەگێڕێتەوە کە دووای ئەمسەر و ئەوسەری لیژنەکە و ئەو کاربەدەستە گەورانەو (ئەدمۆندس C.. J. Edmonds) ی ڕاوێژکاری وەزارەتی نێوخۆ، پێکهاتن لەسەر (پلانێکی نێونجیی) بۆ یێکلایی کردنەوەی کێشەکە!

ڕێبەری مەعاریفی گشتیی لەمەڕ پلان و کردەوەی خۆیان پتر باس دەگێڕێتەوە و دەلێت: (پلانەکە بریتیی بوو لە ڕاوەرگرتنی هەموو ڕۆشنبیر و زاناکانی کورد و بەبێ بانگ کردنیان بۆ کۆبوونەوە"!!" و بەتەنێ قاییل بوون بەناردنی پێشنیازی نووسراو و وەرگرتنی بیروڕای نووسراویان"!!"). پتر هەڵوێستەی خۆی دەنوێنێت و دەلێت: (من ئەم پلانەم پەسەند کرد، چونکە هێندە بەس بوو کە باسەکە لەچێوەی تەسکی لیژنەکەدا دەرهاوێژرێت و یارمەتیی بدات بۆ بەشدار بوونی کۆمەڵێ ڕۆشنبیری کورد لە بڕیارداندا کە بەڕێگەوەیە.. ئەوانەی کە پێشنیازە باس کراوەکەیان بۆ دەچێ، بۆیان هەیە یێکێ لە ئەم سێ چارەسەرە هەڵبژێرن: قاییل بوون بە بەشێکیان، پەسەند

نەکردنی ئەوانەی دی، قاییل بوون بە ئەو تیپانەی کە لە نووسینی فارسیی و تورکییدا خراونەتە سەر تیپەکانی عەرەبیی!)·

ڕێبەری مەعاریفی گشتیی ڕەفتاری خۆیشی دەنوێنێت و دەڵێت: (بۆ ئەمە، بە پەلە کەوتمە کارکردن و بەپێی ئەم پلانە: تۆفیق وەهبیی ڕاپۆرتێکی دوور و درێژی بە زمانی کوردیی نووسیی و پێشنیازەکانی بە هەوای خۆی هۆنییەوە! لیژنەکەش بڕیاری ئەو نێوانەی دا کە پێویستە ڕاپۆرتەکەیان بۆ بچێ و لێی بکۆڵنەوە و ڕایان بەرامبەر پێشنیازەکان بنوێنن! دیوانی وەزارەتیش چەند ژمارەی پێویستی لەگەڵ ڕاپۆرتەکەدا دەنێردرێ.. لەنێویدا مەبەستیشم ڕوون کردەوە و بە ئەم ڕستانەش براندمەوە: " تکام هەیە کە ڕای خۆتان بەرامبەر پێشنیازەکانی نێو ڕاپۆرتەکە بنووسن، لەگەڵ تێ بینیی کردنی: چۆنیێتی گونجاندنی خوێندنەوەی کوردیی لەگەڵ خوێندنەوەی قرآنی پیرۆز؟ "، دیوانی وەزارەتیش ژمارەی نامەی پێویستی چاپ کرد. لە ئەو ڕۆژەدا کە کارگێڕەکانی دیوان وێنەی ڕاپۆرتەکە و نامەکەیان دەخستە زەرفەوە تا نێوی کەسەکان و نێونیشانیان بنووسن، تۆفیق وەهبیی هات بۆ تەماشا کردنی ڕەوتی کاروبار.. کاتێ نووسیینەکەی منی دیت، زۆر پەشۆکا و بە تووڕەیی و ڕەخنە لێ گرتنەوە پێی گوتم: " بۆچیی ئەم قسانەتان تێ خستووە؟ لیژنەکە بڕیاری ئەوتۆی نەداوە؟! ".منیش لەسەرخۆ گوتم،" من بەنێوی لیژنەکەوە نەمنووسیوە، بەڵکو بە ئەو نێوەوە کە ڕێبەری مەعاریفی گشتیم. پێشنیازەکانیشتان بەشێوەی خۆیانەوە، چۆنتان نووسیون، تەواو دەگەنە دەستی کەسانی نیشانە کراو! ".

تۆفیق وەهبیی درێژەی دا بە پرسیار و ڕەخنەگرتن و گوتی: " بۆچیی قرآن تێ هەڵکێشی ئەم باسە دەکەن؟ ". گوتم: " چونکە فێربوونی قرآن لەبەرنامەی خوێندنی بڕیار دراودایە بۆ موسڵمانان! دەشمەوێ تیچ بینیی بکەن کە من لەمەڕ ئەم باسە هێشتا

ڕای یێکجارەکیم نەداوە، بەڵکو داوام لێ کردوون کە ئاگاداری ئەو تێ بینییە بن کە بەبێ ئەوەی ڕێگەم لێ بڕیی بن بۆ دەربڕینی ئەو ڕایەی پێی دەگەن! ".

دووای بیرکردنەوە و وردبوونەوەیێ، تۆفیق وەهبیی بە تووڕەییەکی زۆرەوە ژوورەکەی بەجێ هێشتم!

دەمزانیی کە ئەو دەست بەجێ دەچێتە کن ئەمین زەکیی و ئەویش دەست دەخاتە کارەکەوە و دەچێتە کن موحسین ئەلسەعدوون، بۆییێکا بڕیارم دا کە هەموو لایێ بخەمە بەردەم قەوماوەکە.. بە سەرۆکی دیوان شوکری ئەلحەمانیم گوت، بە پەلە نێو و نیشانەکان بخەمە سەر زەرفەکان و دەست بەجێ بیاندەنە پۆستە خانە و چاوەنۆڕیی تەواو کردن و پێچاندنەوەی نووسراوەکانی دی – ئەوراق /کەمال – مەبن، بەڵکو چ ئیش و کاری دیتان هەن بەلاوەی بنێن تا هەموو زەرفە کوردییەکان دەپێچنەوە"!! ".

درەنگێ پێم زانیی کە ئەوان – وێڕای ناڕەزایی بوونیان – دڵنیا بوون لە ناردنی زەرفەکان و بڕیاریان داوە کە وێڕای پڕوپاگەندەیان، هێندێ کەس و نامەش بنێرن بۆ کن ئەو کەسانەی داوامان لێ کردوون، تا بە ئەوان ڕابگەیێنن " ساتیعولحوسەریی دەربەستی قرآن نایەت و ئەویی ئەو نووسیونی بۆ کار تێ کردن و دەستخەڕۆ کردنتانە!").

ڕێبەری مەعاریفی گشتیی هەر لە یاداشتەکانیدا، مەتنی دوو ڕاپۆرتنامەی نیشان داوە کە بۆ سەروەزیرانی عێراقی ناردووە و ڕایگەیاندووە کە پێنجسەد و بیست نامەی بۆ موتەسەڕیفەکانی (هەولێر، سلێمانیی) ڕەوانە کردووە و بە تەنێ بیست و سێ وەلامی کەسانێکی وەك وەزیر، ئەنداماني پەرلەمان، ئەنجوومەنی پیران، ئەفسەر، ئایینناس، ڕۆژنامەوان، کاربەدەستەکانی وەرگرتووەتەوە!

ساتیعولحوسەریی ڕێبەری مەعاریفی گشتیی لە ئەو دووا ڕاپۆرتنامەیەدا هاتووە لەسەر وەزیرانی مەملەکەتی عێراقی گەیاندووە گۆیا (پرۆژەکەی تۆفیق وەهبیی سەری نەگرتووە ! !). (٥/ل٤٥٧-٤٧٤).

■ لێ کۆڵینەوە

بۆ دەستگیرکردنی ئەنجامی کرد و کۆششی ڕێبەری مەعاریفی گشتیی ساتیعولحوسەریی، زۆر پێویستە وردببینەوە، بکۆڵینەوە و هەرچیی نهێنییێ هەیە، تەنانەت ڕووداوەکانی ئەودیو ڕاپۆرتنامەکە و هەر ڕەفتارێکی دی بەراوورد و یێکالا بکەیینەوە و بە ئەم شێوەیە:

١. ئەو باسە و هەڵوێستەکانی مەعاریفی گشتیی، لەسەرەتای ساڵی ١٩٢٦ دا هەڵکەوتوون و لە هەلی ڕەوتی خوێندندا هاتوونەتە پێشەوە و زۆری بەدەمەوە هەیە کە خۆیان بۆ ساڵی خوێندنی ئاییندە، ١٩٢٦ – ١٩٢٧ ئامادە بکەن و هەموو باسەکەش گەورەیە و لە قەبارەی دانیشتنێ و دوو، یان نامە گۆڕینەوە و ڕا وەرگرتنێکی خێرادا نییە !

٢. ئەو ساتیعولحوسەریی – بەڕۆشنایی قسەکانی خۆیشی کە دەڵێت: (لەسەر وەزارەتی مەعاریف کەوت کەچیی پێویستە دەستی بداتێ و ڕاپیپەڕێنێ بۆ سەپاندنی ئەم بڕیارە لە مەیدانەکانی فێرکردندا !). هەروەها بۆ خۆپەڕینەوەی لە ئەو هەڕەشەیەی کە سەروەزیران و وەزیری مەعاریف لییان کردبوو کە: (تۆ کوردیی نازانیت، بۆچیی کارێ دەکەیت – چۆن شیعەکان ناحەزتن – کوردیش ناحەزت بن !). بەڵێ دەبوو خۆی وەك کارگێڕی دەزگەیێکی بەرپرس بچێتە مەیدانەوە و دیدەنیی کوردستانی – تازە لکێندراو بە مەملەکەتی عێراقی عەرەبەوە – بکردبایە و لە نزیکەوە تەماشای هەموو بارێکی خوێندن، قوتابخانەکان، مامۆستاکان، تەنانەت بیروڕای موتەسەڕیفەکان، ئەنجوومەنی مەعاریفی بکردایە ! دەبوو کۆبوونەوەی لەگەڵ پسپۆڕان، ڕۆشنبیرەکانی

باژێڕەکان بکردایە و لە ئەوان و هاوتایان لە بەغداد دا – نەك بەتەنێ لیژنەیێك – چەندین لیژنەی پێك بهێنایە !

ڕاستییەکەی –وەك یاداشتەکەی بەڵگەیە– ئەو هیچ پلانێکی پەروەردەیی، خوێندەواریی، زانستیی، هیچ حسابێکی دارایی بۆ ڕاپەڕاندنی تەواوی ئەرکەکە بەبیردا نەهاتووە و لەدەستدا نەبووە، بۆیێکا دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم، بیر و بنچینەی ڕەفتاری پووش بووە و دامەزراندنی لیژنەیێکی ئەوها پچووکی دانیشتووی بەغداد و کەم دەسەڵاتیشی، هەر بە بیانوویێ زانیوە بۆ ڕانەپەڕاندنی (ئەرکە قانوونیی و زانستییەکە !) کە بەڵگەکانی داهاتوو ئەم ڕاستییە پتر دەسەلمێنن!.

٣. ئەو، وەك مەتنی دووا ڕاپۆرتنامەی بۆ سەروەزیران گێڕاوەتەوە گۆیا بە ئەو پێیەی ڕێزی ڕۆشنبیرانی کورد و شارەزایانی گرتووە، لە پێنجسەد و بیست نامەدا، هەر بیست و سێ وەڵامی بۆ هاتووەتەوە ! ! هەروەها ڕایگەیاندووە کە بە ئەو ڕۆشناییەدا دەردەکەوێ گۆیا: (پرۆژەکەی تۆفیق وەهبیی سەری نەگرتووە !)، ئەوە بە دڵنیاییەوە، فێڵی کردووە و ڕاستیی لە سەروەزیران شاردووەتەوە.. بەڵگەش ئەمەیە:

١/٣. هیچ پێوانەیێکی زانستیی ئەو ئەنجامە پەسەند ناکات کە لە کۆی پێنجسەد و بیست نامەدا، پشت ببەسترێ بە وەڵامی بیست و سێ نامە !

٢/٣. ئەو بیست و سێ وەڵامەش کە هاتوونەتەوەو (پشتی پێ بەستوون و بەڕۆشناییان بڕیاری ناسراوی خۆی داوە گۆیا پرۆژەکەی تۆفیق وەهبیی سەری نەگرتووە !) ڕاستییەکەی زۆربەیان – بە نێواخن و ئامانجەوە – لایێنگری تۆفیق وەهبین، تەنانەت هێندێکیان داوای بەکاربردنی لاتیینیان کردووە کە یێکێکی وەك تۆفیق وەهبیی –بەڕۆشنایی یاداشتنامەکە – لایێنگیری نییە !

٣/٣. سلێمانیی لەکۆنەوە و هەتا ئەو ڕۆژگارەش، مەڵبەندی خوێندەواریی و ڕۆشنبیریی کورد بووە. ساتیعولحوسەریی – ناحەزانەش نەبێ – نازانستانە ڕەفتاری

لەگەڵ کردووە، خۆی لە دووا ڕاپۆرتنامەکەیدا بە سەروەزیرانی گوتووە، (.. بەڵام وەڵامەکانی سلێمانیی هێشتا نەگەیشتوونەتە جێ! چونکە باسەکەش زۆر دوواکەوت "!!!/کەمال" پێم چاك بوو کە پوختەی پیشنیازە-پرۆژە ئەسڵەکە و تێ بیینەکانم بۆ خاوەند بەرزیتان بنوێنم!). (٥ /ل١٦٦).

لە ئێرەدا بەڕۆشنایی ڕەفتار و قسەی خۆی و بە بەڵگەشەوە باسەکەی ورد دەکەمەوە:

ئە: ئەو خۆی -یاداشتنامەکەیشی بەڵگەیە- بێ پێچ و پەنا گوتوویێتی: (بڕیارم دا هەموو لایێ بخەمە بەردەم قەوماوەکەوە. بە سەرۆکی دیوان شوکری ئەلحەمانیم گوت: بەپەلە نێو و نێونیشانەکان بخەنە سەر زەرفەکان و دەستبەجێ بیاندەنە پۆستەخانە و چاوەنۆڕی تەواو کردن و پێچاندنەوەی نووسراوەکان -ئەوراقەکان- ی دی مەبن، بەڵکو چ ئیش و کاری دیتان هەیە بەلاوەی بنێن تا هەموو زەرفە کوردییەکان دەپێچنەوە!).

بێ: نامەکەی مەعاریفی گشتیی و پێشنیازەکەی لیژنەکە، وەك لەبەردەستدان، (ڕۆژی ٧ /٣ /١٩٢٦) ڕەوانەی بازێڕەکان و ئەنجوومەنەکانی مەعاریف و کەسانی دی کراون. بە گەییشتنی -بۆ وێنە- بۆ سلێمانیی، دەستبەجێ -لە١٩٢٦/٣/٢١دا - بەرەو ڕووی شارەزایان و ڕۆشنبیران کراوە و داوایشیان لێ کراوە کە تا ڕۆژی (پێنجشەممە١٩٢٦/٣/٢٧) سەرنج لە پێشنیازەکە بدەن و وەڵامیان گەڵاڵە بکەن.

ئەمە مانای ئەوەیە، لەلاییکەوە نامەکە و پرۆژە پێشنیاز کراوەکە، دووای دوو حەوتۆ لە بەغدادەوە گەیشتوون. لەلاییکی دیەوە ڕۆژ دووای گەیشتنە سلێمانیی، بەپەلە بەرەو ڕووی شارەزایان و کەسانی دی کراوە. دوواجار ماوەییێکی کەمی وەك پێنج ڕۆژ بۆ وەڵام وەرگرتنەوە دەست نیشان کراوە.. ئەمانەش هەمووی چست و چالاکیی و پەلە کردن دەنوێنن!

وێـرا، ڕۆژنامـەی (ژیـان–پێنجشـەممە۱۹۲٦/٤/۲۲) هـەواڵ ڕادەگـەیێنێ کـە (ڕۆژی دووشـەممە ۲۹ی مـارتی۱۹۲٦ لەمـەقامی موتەسـەڕڕیفییەتدا بـۆ بـەیان و موتالەعـەی ئیقتیراحی لیژنـەی تەرجەمـەی وەزارەتـی مـەعاریف لـە خوسـووس حـورووفی کـوردیی و حەرەکاتەوە، تەودیعی بەعزێ زەواتـی مونـەوویر و موتەفـەککیر کـراو بۆ جوابـەکان لـە ئەنجوومەنکـەدا خوێندرایـەوە. فەقـەت لەبـەر موسـاعەدەی وەقـت تـەئجیل کـرا بـۆ جەلسەیێکی تر!(" تکایە دووا ڕستە ورد تەماشا بکە: –کەمال). (۷/ل۲)

ئـەم هەواڵـەش لەلایێکـەوە ڕاسـتیی دەسـەلمێنێت کـە ئەنجوومـەنی مـەعاریفی سـلێمانیی، هـەر دوو ڕۆژێ دووای وەڵام وەرگرتنـەوە –۲۷و۲۸– دانیشـتووە و لـە وەڵامـەکان وردبووەتـەوە. بـێ گومـان لەبـەر زۆریـی کەسـەکان و وردیـی باسـەکە، وردبوونەوە بە دانیشـتنێ تـەواو نـەبووە و هـەر کـۆڕێکی دی ویستووە! بۆ ئەمـە و بۆ ڕێگەی بەغدادیش ئەو ئەوپەڕییەکەی دوو حەوتۆی دی ویستووە کە بـێ گومـان ماوەکـە ئاسـاییە بـۆ ئـەو ڕۆژگـارەی بـاری هاموشـۆی تێدا سـەخت و گـران بـووە! هەڵبـەت تـا ئەوڕۆش لە ئەم وڵاتەدا نەبووەتە باو، پۆست بە فڕۆکە بگواسترێتەوە!

کەواتـە ئەگـەر ڕێبـەری گشـتیی مـەعاریف بـە ڕاسـتیی پەرۆشـی – ئەگـەر نـەڵێم ئەرکەکـەی خـۆی – باسـەکە و پێشـنیازی لیژنەکـە بووایـە، ئەگـەر بـە ڕاسـتیی ڕێـزی ڕۆشنبیرەکانی بگرتایە و فەڕی خەڵکی کوردی بویستایە دەبوو (دوو حەوتۆیێ) چاوەنۆڕ ببووایـە.. دەبـوو نرخـی مانـدوو بـوون و ڕای کۆمەڵـە خـەڵکانێکی داوا لـێ کـراوی لـەلا هەبووایـە، دەبـوو قـەدری موتەسـەڕڕیفییەتی سـلێمانیی و ئەنجوومـەنی مـەعاریفی نەشکاندبایە و بیروڕای ئەوانی – هەروەها هەولێریشـی – تێکـەڵ بـە ئـەو بیسـت و سـێ وەڵامـە بکردبایـە و ئـەوجا دروسـت بـوو دووا ڕاپۆرتنامـەی خـۆی بـۆ سـەروەزیرانی بنوێنێ!!

ئەو بەپەلە نامەکان ڕەوانە و داوای وەڵامی پەلە دەکات، بەڵام بۆ باسێکی گـەورە – ڕا وەرگرتن –چاوەنۆڕیی پـێ نـەکرێ و ڕای خـۆی بەسـەر پێنجسـەد و بیسـت ڕا دا تـێ

بپەڕێنیّ و بڵیّ: (پێشنیازەکەی تۆفیق وەهبیی سەری نەگرتووە !)، ئەوە ڕاست و ڕەوان خۆی ساخ دەکاتەوە کە باوەڕی بە ڕۆشنبیرەکان، بە شارەزاکان، بە ئەنجوومەنەکانی مەعاریفی ئەو بازێڕانە، بە چارەسەرێکی زانستانە و چاکەخواز و بەئەنجامیّ کە ڕووی حوکوومەتەکەی سپیی بکات (نەیبووە !) و لەناخی دەروونندا باوەڕی بە ڕاپەراندنی ئەرکەکەیشی نەبووە نەخوازەلا بە ئەو چارەسەرە نێونجییە کە پێشنیازەکەی لیّ کەوت بووەوە. . .ئیدی ئەم نامە نووسین و سەرقالّ کردنەش بەتەنیّ یاریی بووەو چیی دیَنا !.

**ئەنجام**

وردکردنەوەی باسەکە، کۆمەڵیّ ئەنجامی ڕاست و گرنگمان دەخاتە لەپی دەستەوە:

١. ئەنجامەکەی ڕێبەری مەعاریفی گشتیی، هیچ متمانەییێکی زانستیی پیّ نابڕێت و دەچێتە خانەی ساختەوە !

٢. باسەکە وەك باسێکی تایبەتی کەسی تۆفیق وەهبیی و مەعاریفی گشتیی و ڕێبەرەکەی، هەروەها وەك کێشەی ڕێنووسیّ نایێتە بەرچاو بەڵکو تەواو دیارە کە گەورەترە و ئەو بڕوبیانووانەی بەنێوی نووسین یان ڕێنووسەوەن، فێڵێکە بۆ مەبەستێکی گەورەتر.

٣. چ کەسێکی ژیر باوەڕ ناکات کە ڕێبەری مەعاریفی گشتیی بە ئارەزووی خۆی – بیّ پشتیوانیّ – ئەم هۆش و ئەتوار و ڕەفتارانە بنوێنیّ و بڕیار بدات! ڕاستییەکەی دەبێت گەورە کەسانیّ لە پشت پەردەوە ئافەرینیان کردبیّ! سەرچاوەکانی مێژووش ڕادەگەێنن کە هەر حیجازیی (پاشا فەیسەڵ) ئەم کەسەی هێناوەتە عێراقەوە و پێی دەنازیّ! دیارە کێشەکەش سیاسییە و ئەم کابرایە دەسکەلاییێتی !

# داوێنی بەشی یێکەم

## بەڵگەنامەکان

١. مەتنی نامە عەرەبییەکەی مەعاریفی عێراق

وزارة المعارف

العدد: ١ /٣/ ٦٣٨

التأريخ: ٧ مارت ٩٢٦

الى سعادة متصرف لواء السليماني المحترم

الى سعادة متصرف لواء اربيل المحترم

تحية وتوفيراً

ان وزارة المعارف الف لجنة لترجمة الكتب المدرسية الى اللغة الكردية. وبما ان بعض اعضاء اللجنة قد اقترحوا في مسألة الحروف والاملاء اقتراحاً خاصاً، ارتأت الوزارة أن تطلع على اراء منوّري الاكراد بخصوص مسألة الحروف والاملاء. وقد استفسرت رأيهم تحريراً في المسائل الاتية:

١- ماهي الحروف أو الحركات التي يجب أن تضاف الى الحروف المستعملة في والفارسية لكتابة اللغة الكردية و العربية؟

٢- الى أي درجة يمكن أو يجب أن يستفاد من الحركات المستعملة في العربية؟

٣-مارأيكم في الاقتراح المربوط والمتعلق بوضع اشارات على بعض الحروف للدلالة على الأصوات المختلفة؟

فنرجو أن تجمعوا اعضاء مجلس المعارف مع من لهم المام في المسألة وتخبرنا عن رأيهم بصورة مفصلة مع ملاحظتهم (كيفية التوفيق بين قراءة الكردية و قراءة القران الكريم؟)

نرجو أن يصلنا جوابكم باعظم سرعة ممكنة. هذا ولسعادتكم فائق الاحترام. *

مدير المعارف العام

-مەتنی وەرگێڕاندکەی بۆ کوردیی " لەلایێن منەوە " ئەمەیە:

وەزارەتی مەعاریف
ژمارە: ١ /٣/ ٦٣٨
مێژوو: ٧ مارت ٩٢٦

بەڕێز سەعادەتی موتەسەڕڕیفی لیوای سلێمانیی
بەڕێز سەعادەتی موتەسەڕڕیفی لیوای هەولێر

سلاو و ڕێز
وەزارەتی مەعاریف بۆ وەرگێڕاندنی کتێبەکانی قوتابخانە بۆ زمانی کوردیی، لیژنەییێکی پێکهێناوە. لەبەر ئەوەی هێندێ ئەندامی لەمەڕ باسی تیپەکان و ڕێنووسی کوردیی، پێشنیازێکی تایبەتییان کردووە، وەزارەت دەبینێت کە لەمەڕ باسی تیپەکان و ڕێنووسی، چاکتر ئاگاداری بیروڕای ڕۆشنبیرەکانی کورد بێ، پرسیش بۆ بیروڕای نووسراویان ئەم لایێنانەی خوارەوە دەگرێتەوە:
١.ئەو تیپانە، یان ئەو بزوێنانە چین کە پێویستە بخرێنە سەر تیپە بەکاربراوەکانی عەرەبیی و فارسیی بۆ نووسینی کوردیی؟
٢.تا چ ئاستێ دەتوانرێ، یان پێویستە کەڵك لە بزوێنە بەکاربراوەکانی عەرەبیی وەربگیردرێ؟
٣.ڕاتان چییە بەرامبەر پێشنیازێ بۆ دانانی نیشانە بەسەر هێندێ تیپەوە بۆ دەربڕینی دەنگە جوداکان؟
ئەوجا تکا دەکەین ئەندامانی ئەنجوومەنی مەعاریف لەگەڵ ئەوانەی شارەزان کۆبکەنەوە و بیروڕای تەواویمان ئاشنا بکەن. لەگەڵ تێ بینیی کردنی: (چۆنییێتی گونجاندنی خوێندنەوەی کوردیی لەگەڵ خوێندنەوەی " قران " ی بەخشندە؟).
تکادەکەین یێکجار خێرا وەلاممان بدەنەوە. ئیدی ڕێزی یێکجارمان بۆ سەعادەتتان.
(ڕێبەری گشتیی مەعاریف)

"تەواو"

٣. مـەتنی پێشنیازە کوردییەکـەی لیژنەکـە (کوتـو مـت وەك خـۆی و بـەزیادکردنی ڕێنووسی خۆمەوە !).

بۆ نووسینی زمانی کوردیی بە حـورووف عـەرەبیی ئـەم تەرتیبـەی خـوارەوە بـەباش زانراوە

هەموومان ئەزانین کە حورووف دوو بەشە:

١- بێ دەنگەکان - الحروف الصائتة.

٢- دەنگ بەخشەکان - الحروف الصائتة.

حەرفە بێ دەنگەکان هەریێکێ بۆ پێشان دانی دەنگێك دانراون، بـەڵام لـە خۆیانـەوە دەنگیان لێ دەرنایەت. حەرفە دەنگ بەخشەکان کە بخرێنە پاڵیان، دەنگداریان ئەکەن. ئەمجا ئێمە ئەبێ تەماشای بکەین چەند دەنگمان لە هیی عەرەبیی زیاد و یا کەم هەیە و چەند دەنگ بەخشیان زیادە. بۆ زیادەکان وەك میللەتەکانی تر، هەر یێکە لە تیپی خۆی حەرفە عارەبییەکەی بـۆ قوبـووڵ ئەکـەین و نیشـانێکی بـۆ دائـەنێین. ئـەم تەرتیبـە زۆر چاکە، چونکە حەرف زیاد ئیجاد ناکرێ و حورووف عەرەبییش تێك نادرێ.

| ناوی تیپی حروف | عارەبیی | زیادی کوردی | وەك |
|---|---|---|---|
| گەرویی | ح خ ع غ ھ | ----- | ----- |
| لیوی | ب ف م و | پ ڤ | هەڤدە |
| دانی | ت ث د ذ ظ | ت ب | دەست کورتە. نادری |
| زمانی | ن ل ر | ل ر<br>. | فرین (فڕین)، هەلمات (هەڵمات) |
| فیشکەیی | ز س ش ص ض | ژ | ژوور |
| مەڵاشویی | ج ط | چ | چاو |
| زمانە بچکۆلەیی | ق ك ی | گ | گوشت (گۆشت) |

لەلیستەی سەرەوەدا، سیی و حەوت حەرف بیٚ دەنگ ئەبینریٚ، لەمانە هەشتیان (ح ع ف ظ ص ض ط) خاص عارەبین.

کورد (ح ع ق) ئەبیٚژیٚ وەلیٚ زۆر سووکیان ئەبیٚژیٚ. (ث ظ ص ض ط) تەلەففوز ناکا، بەلاّم لە پیٚنج شەش کەلیمەدا (س) نزیکی (ص) یەعنی نەختیٚ ئەستووری ئەبیٚژیٚ. لە کوردییدا حەرف (ذ) یش نەماوە.

لە نۆ (٩) دەنگە زیادەکەمانا: (ب چ ژ ك) لە هەموو شیٚوەکانی کوردییدا هەن! (ڤـ) لەلای ئیٚمە هەر لە کەلیمەی: (هەڤدە، ڤنگە، بڤە، ڤڕە ڤڕە)دا هەیە. ئەم حەرفە لەژیٚر تەئسیری عارەبیی، لای ئیٚمە نەماوە، ئەگینا لە کوردیی سەروودا هەیە.

(ت. ب. ل) ئەم دەنگانە لە کوردیی سەروودا نین، بەلاّم لە کوردیی ئەردەلاّن و لوڕ و ئیٚمەدا هەن.

دوو ( ٢ ) (ر)مان هەیە.. ییٚکیٚکیان سووکە وەك (بەرد)، ئەویتریان سەختە وەك (کەر /کەڕ – کەمال).

حورووفی دەنگ بەخش

| شکڵ | تلفظ | ناوی | وەك |
|---|---|---|---|
| ا | ئا | هەلکیش (هەڵکێش) | بابا |
| ء | ئە | سەر | بەبە |
| یِ | ئی | ژێر | گیرفان، بەردی رەش. دەستی فەرهاد |
| یٖ | ئیٖ | داکێش | زیر (ژییر)، کزیر (گزییر) |
| و | ئو | بۆری کورت | کورت، کورد، کوڵاو |
| وو | ئوو | بۆری درێژ | دوور، شارەزوور، موو |
| ۆ | ئۆ | بۆری کراوە | زور (زۆر)، خوم (خۆم) ئەروم (ئەڕۆم) |
| ۏ | ئۏ | بۆری خوراو | کۏر(کوێر)،خۏت (خوێن) سۏنە(سۆنە) |
| وٖ | ئوٖ | بۆری داخوراو | دوٖر (دویـــــر) بەشـــــێوەی کوردەکـــــانی ژوورو) قـــوٖل (قوویڵ) |

(ا) ئەم حەرەکەیە لە (ئەلفی مەمدوودە)ی عارەبیی کورتترەو لە(فەتحە)ەوە نزیکە.

(ء) سەر، وەك (فەتحە) ی عارەبیی نییە — لە مەیانی (فەتحە) و (نەناسراو) ایە.

(ی) بۆ تەرکیبی ئیزافیی بەکەڵك یەت، وە لـە کەلیمـەکانی ئەجنەبییـدا هەیـە، بـەڵام هەر لە شێوەی سلێمانییا تەرکیبی ئیزافیی بەژێر ئەکرێ، ئـەگینا لـە هـەموو شـێوەکانی

ترا ئەمێنێتەوە، ئەبێ لە کوردییا (ژێر/ژێر/کەمال) نەبووبێ. (و) بۆری داخوراو لای ئێمە نییە، لە شێوەکانی ترا هەیە، ساکین – لەناو کەلیمەدا هەر بێ دەنگێ دەنگ بەحسێکی لەدوواوە نەبێ (ساکین) ئەخوێنرێتەوە، بەڵام هەووەڵ حەرفی هیجاییێک لە پاشیەوە، حەرفێکی بێ دەنگی حەرەکەدار بێت، ئەم هەردوو بێ دەنگە بەسەر یێکەوە حەرەکە ئەخوێنرێتەوە، کەچیی حەرەکەیێکی زۆر سووک لە مابەینانا هەیە، نەنووسینی گەرەك نییە!

(و، ء) شکڵی (و) لە واوی بێ دەنگ ئەچێ، بەڵام بۆ جویێ کردنی، ئەبێ بزانرێ چی (و) چی (ءَ).

(ءَ) ئەگەر مەیانی دوو دەنگ بن وە یا لەلاییێکیانەوە دەنگ بەخشێ بێت، بێ دەنگن ئەگینا دەنگدارن، بەڵام ئەبێ شکڵی (ـە) لەگەڵ (ـە –ء) ی بێ دەنگا دائیما جویێ بکرێتەوە.

٣– مەتنی نامەی موتەسەڕڕیفی سلێمانیی (بۆ شارەزاکان /بەدەستکاریی ڕینووسەوە – کەمال)

دائیرەی موتەسەڕڕیفی لیوای سلێمانیی

ژمارە: ٤٥٩١٦

ڕۆژ : ٢٢ /٣ /١٩٢٦

بۆ جەنابی موعەللیم مەلا سەعید ئەفەندیی

لەپاش ئیحترام

بە پێچراوەیی سووڕەتێکی تەحریراتی مودیر عامی مەعاریفی عێراق، ژمارە: (٦٣٨/٣/١)ی ڕۆژی ٧ مارت ١٩٢٦ لەگەڵ سووڕەتێکی ئەو تەرتیباتە کە بۆ حورووف و حەرەکەی زمانی کوردیی تەسەوور و دەرجیان کراوە، نێررا. مەمنوون ئەبم کە لە پاش موتاڵەعە و تەدقیق هەتا ڕۆژی پێنجشەممە ٢٧ مارت، پاش نیوەڕۆ فیکر و نەزەرییە و

ئیقتراحی خۆتان لەم خوسووسەوە لەسەر کاغەزێك بنووسن و بینێرنە ئەم دائیرەیە. ئیتر مەوەددەت.

(ئیمزا)

موتەسەڕڕیفی لیوای سلێمانیی

٤- مەتنی وەڵامنامەی مامۆستا مەلا سەعید ئەفەندیی (سەعید سدقی کابان – بە دەستکاریی ڕینووسیەوە ! /کەمال).

٩٠٠ (بسم الله)

ئەم ئوسووڵە و دانانی ئەم حەرفانە لەگەڵ بەعزێ ئیشارات بۆ نووسینی کوردیی کە لە تەرەف لیجنەی موحتەرەمەوە تەرتیب کراوە، زۆر بەجێیە و گەلێ موناسیبە، فەقەت بەعزێ مولاحەزات هەیە کە دەبێتە سەبەب بۆ تەسهیلاتی، بە لازمی دەبینم کە عەرزی بکەم..

زبانی کورد، هەروەك حەرفانی هیجای عەرەبیی لە عەمەل دێنێ، موحتاجی بە هەشت حەرفی تریشە کە ئەمانەن: (پ، چ، ژ، ڤ، گ، ڵ، ۆ، ێ) ئەم حەرفانە، هەرچەندە لەسەر شکڵی حەرفانی عەرەبین، لاکین بە نوقتەی زیا لە بەعزێکیان دێری زیاد و ئیشارە لە بەعزەکەی ترا جوێ بوونەوە. بۆ (ۆ،ێ) ئەم ئیشارانە زۆر موناسیبە. لە کوردییدا (ل) دوو نەوعە. (١) لام (لەر /لەڕ – کەمال) نیشانەی ناوێ. (٢) لام (قەلەو/قەڵەو–کەمال) بۆ ئەم نەوعە نیشانە لازمە، سێ نوقتە موناسیب بینراوە و (و) یش دوو قیسمە: (١) گوشراو، نیشانەی ناوێ. (٢) کراوەیە: نیشانەی گەرەکە. (و) گوشراویش دوو ڕەنگە: (١) بۆری کورت نیشان دەدا وەك (خولە کوردە !) (٢) بۆری درێژ نیشان دەدا وەك (دوو روو /دوو ڕوو – کەمال) دوو دەفعە نووسینی موناسیبە. (و) کراوەش دوو نەوعە: (١) بۆری کراوە نیشان دەدا، وەك (تۆلەکە، چۆلەکە /تۆڵەکە –

کەمال). (٢) بۆری خوراو نیشان دەدا، وەك (قول) لاکین ئەم نەوعە ئیجاب ناکا داخلّ بکریّ. بۆ خاتری تەسهیلات لازمە تەئخیر بکریّ!

(ی) ش دوو قیسمە. (١) ڕاستە، نیشانەی ناویّ. ئەم نەوعە ژێر نیشانە دەدا وەك (نیمە، قیمە). (٢) داکێشە، نیشانەی گەرەکە، وەك (میر، قیر/مییر، قییر - کەمال)، ئەم نیشانەیە زۆر باشە. ئەمما بۆری خوراو وەك (کور، خون /کوێر، خوێن - کەمال) و بەر وەك (کلینجان /گلّێنجان-کەمال) و نەناسراو وەك (میز، دیز /میێز، دێز - کەمال) هەموویان داخلّی داکێشن، چونکو سوورەتی تەلەففوزی (کور، خون) بۆ ئێمە بەم ڕەنگەیە: (کوێر، خوێن، و هەم ئەگەر دیقەت بفەرمووریّ بە بەرو نەناسراویشن. بەو ڕەنگە دەردەکەویّ! ئەمما بۆ نووسینی لوغەتی کوردیی، لەباتیی حەرەکە، ئەو حەرفانەی کە واجیبە عەلاوەی حورووفی موستەعمەلە لە عەرەبییدا بکریّ، هەر ئەم حەرفانە بن!

"ی" موشکیلەیە، چونکە دەبێتە زەمیری موفرەدی غائیب، وەك (خوێندی) و لەپاش موزاڤ یا مەوسووڤ کە ئاخیر حەرفەکانیان حەرف ئیملای پیّ واقیع دەبیّ، وەك (خورمای بەسرە، شەربەی بەغداد، لیمۆی شیرین، تریّی ترش) و هەم بۆ وەحدەت دەبیّ وەك (پیاوی، مندالّی). ئەمما ئەگەر بە حەرەکاتا لە عەمەل بێنریّ، موشکیلات ڕوو دەدا و جویّ کردنەوەی ئەم حالاتە نەختیّ زەحمەتە. تەدبیری حەوالّەی ڕەئی مونیری ئەنجوومەنە.

ئیقتیراحی داعیی دائیر بە مەسئەلەی حورووف و ئیملای کوردیی ئەمەیە کە عەرز کرا، وە بەندە قەواعیدێکی سەرف و نەحووی کوردیم تەرتیب و بۆ تەدقیقات تەقدیمی ئەنجوومەنی مەعاریف کردووە، بە تەفسیل حورووفات و ئوسوولّی کوردیی لەوا بەیان کراوە؛ ئینشاالله بۆ تەبع تەقدیم دەکریّ *. ! /تەواو.

* ئەم وەلامنامەیە کە مێژووی لێ نەدراوە و هەر ڕێکەوتی دووا ڕۆژەکانی مانگی مارتە و لە نێو یاداشتەکانی ساتیعولحوسەریی ڕێبەری گشتیی مەعاریفی عێراقدا، ئاماژەی بۆ نەکراوە، دیارە کە یان نەگەییشتووەتە جێگە کە باوەڕ ناکرێت، یان نرخی – وەك هەر وەلامێکی سلێمانیی – نەگیراوە کە ئەمەیان پتر جێگەی باوەڕە. بۆ پتر تێگەییشتنی ئەم باسە، لە ئاییندەدا ڕاستیی و ڕەوانیی دەخرێتە ڕوو!

# بەشی دووەم

## پێشەکیی

لە مانگی تەمووزی ١٩٢٧ ز. دا ساتیعولحوسەریی ڕێبەری گشتیی مەعاریف لەسەر کار و فەرمانی نەما. دەی باری خوێندن و خوێندەواریی کوردیی لە هەلی کاری ئەو و دووای ئەودا لە چ ئاستێکدا بوو تا - بە کورتیش بێ - بە تێ گەیشتنی بتوانین ڕاستییەکان بناسیینەوە و زووتر بگەین بە وەلامی ئەو پرسیارە گەورەیە: کێشەکە چ جۆرە بوو؟

بۆ ناسینەوەی وەلامی چاك و بەجێ، دەبێت کار ئەوە بێت وردبیینەوە و هێندێ ڕاپۆرت و بەلگەنامەی ڕەسمیی، هێندێ هەلوێستە و نووسینی مامۆستاکانی قوتابخانەکان، تەنانەت هێندێ هەلوێستەی ڕۆژنامەنووسنیی یادبکەیینەوە!

- **بەلگەکان دەدوێن**

بەلگەی یێکەم

چەند داندراوێکی فەرامۆش کراوی مامۆستایان و وێنەیان ئەمەیە:

١: زانستی هندسە -تالیفی عبدالقادر وجدی. مترجمی:ع. و. م. ژ ١. لەسەر پیرەوەی وەزارەتی معارف نووسراوە بو ریزی چوارەم: ١٩٢٨ {بەڕێنووسی خۆیەوە /کەمال}.

٢: مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی، سەعید سدقی کابان، چەند کتێبێکی خوێندەواریی داناوە * و چاپ نەکراون. یێکێکیان ئەمەیە کە دیتوومە و وەلامە ڕەسمییەکەیشیم بەرچاو کەوتووە:

٣: جغرافیا - س ١٩٢٨ (بۆ سونفی سێیەمی مەکتەباتی ئیپتیدائیی لە تەرەف سەیید نووریی بەرزنجییەوە و سەعید سدقیەوە تەرجەمە کراوە! {بە دەستکاریی ڕێنووسیەوە! /کەمال}.

ئەم وەرگێردراوە کە هەرگیز لە خۆڕا دەستی نەدراوەتیٚ لەلایێن بەڕێوەبەراییێتی مەعاریفی مەنتیقەی بەغدادەوە، بە (نامەی ژمارە: ٢٧٧٨/٧/٦ی ٣٠ تەشرین ئەووەل ١٩٢٨) وەڵام دراوەتەوە کە من هەر مەتنە عەرەبییەکەی دەگێڕمەوە و ئەمەیە: (کان قد قدم سعيد صدقي المدرس في السليمانية الاولى كتاب جغرافية في اللغة الكردية للصفوف الثالثة لأجل تدقيقه، ولم يكن كتاب جغرافية مقرراً في اللغة العربية للصفوف الثالثة نرجو –بە موتەسەڕڕیفییەتی سلێمانیی دەڵێٚ/کەمال– ان تخبرو الموما اليه بعدم امكان تدقيقه منْ قبل اللجنة تجدون الكتاب المذكور طياً لاعادته الى الموما اليه !

(التوقيع مدير منطقة معارف بغداد)

بەڵگەی دووەم

محەممەد ئەمین زەکیی نوێنەری سلێمانیی لە ئەنجوومەنی نوێنەران –پەرلەمان–ی عێراقدا (٢) دوو ڕاپۆرتی بە ئەنجوومەنەکە داوە کە ڕۆژنامەی (ژیان – ٢١ ی حوزەیران) بڵاوی کردووەتەوە. ڕۆژنامەکە لە پێشەکییدا نووسیویێتی: (خولاسەی دوو تەقریری مەبعووسی موحتەرەمی سلێمانیی ئەمین زەکیی بەگ کە تەقدیمی مەجلیسی مەبعووسان –پەرلەمان/کەمال–ی کردووە لە خوسووس مەعاریفی کوردستان و تەشکیلی لیجنەیێکی عیلمیی بۆ تەئلیف و تەرجەمەی کتێبانی تەدریسییەی کوردیی و بۆ ئیحداس و تەشکیلی مودیرییەتێکی مەعاریف و تەعینی موفەتتیشینی کورد بۆ مەنتیقەی کوردەکان /تەواو بەدەستکاریی ڕێنووسەوە !).

بەڵگە ١/٢: خولاسەی تەقریری ئەووەڵ:

لە لیوای مووسڵ، هەولێر، کەرکووك و سلێمانیی، حاڵی حازر بیستو هەشت مەکتەبی کوردیی تیا مەوجوودە"! !/کەمال"، لە مەکاتیبی ئیبتیدائیی، سانەویی کوردەکانا، لەسەر مینهاجی ڕەسمیی مەعاریف بۆ پەنجاو هەشت مەوزووع کە مەجبوورن تەدریسی بکەن "! !/کەمال" تەنها بۆ دەرسێکیان کتێبی کوردیی هەیە.

"!!/کەمال" بۆ مەوزووعەکانی کە، چونکە کتێب نییە "!!/کەمال"، تەلەبەکان مەجبوورن نۆت بکرِن و لەسەر ئەو نۆتانە مەحکوومی سەعیی کردنن. "!!/کەمال" لاکین لە سونفە ئەووەلییەکانا چونکە تەلەبەکان ناتوانن بنووسن "!!/کەمال" مومکین نابیٚ نۆتێکی سەحیح بکرِن و لە خاریجی ئیمکانیانا نییە! "!!/کەمال" لە غەیری ئەوەی کە بە غەڵەت و عەجەلە دەفتەرەکانیان ڕەش بکەنەوە ناتوانن سەعییەکی تر بکەن "!!/کەمال" لەبەرئەوە زیهنیان بە مەعلووماتی غەیرە سەحیحە ئیشغال و مانگو – ماندوو /کەمال – ئەکریٚ "!!/کەمال"، هیچ ویجدانێك قوبووڵی ناکات ئەم تەلەبانە کە ئومیدی ئیستیقبالی کوردەکانن، بە مەعلووماتی غەیرە سەحیحە زیهن و دەماغیان موشەووەش و ژەهراویی بکریٚ "!!/کەمال" مەجبوورن ئەم مەکتەبانەی کە کراونەتەوە، بیکەن بە موئەسسەیێکی مەعریفەت بە وەسائیتی تەدریسییەیێکی چاك، ماددەتەن و مەعنەن، تەجهیزیان بکەن! لەبەر ئەمە ئیستیرحام ئەکەم بۆئەوەی دەست بەجیٚ دەست بکەن بە تەرجەمە و تەئلیف، بە عەجەلە (لیجنەیێکی دائیمیی) تەشکیل و لە کوردە مونەووەرە موقتەدیرەکانی ئێرە، ئەعزای بۆ تەعین بکەن! {تکایە ورد سەرنجی دووا بەند بدەن! /کەمال}.

بەڵگە ٢/٢: خولاسەی تەقریری دووەم:

ئەو مەکتەبانەی کە لە لیوای سلێمانیی، هەولێردا مەوجوودن، قیسمێکیان لە تەرەف مودیرییەتی مەنتیقەی مووسڵ و قیسمێکیان لە تەرەف مودیرییەتی مەنتیقەی بەغدادەوە ئیدارە ئەکرێن "!!/کەمال" لەبەرئەوەی کە مودیری هەردوو مەنتیقەکان، کوردیی نازانن "!!/کەمال" عادەتا بێگانەن بەم لیسانە، ناتوانن تەفتیش و موراقەبەی مەکتەبەکان و لە قودرەتی تەدریسییەی موعەللیمەکان تیٚ ناگەن و بەتەواویی عاجزن کە ئیسلاحی تەرزی جەرەیانی ئوسوولی تەدریسییەی مەکتەبەکان بکەن "!!/کەمال"، لەبەر ئەم وەزعییەتە چونکە مەکتەبە کوردەکان لە موراقەبە و نەزارەتێکی موتەمادیی

مەحرووومن و "!!/کەمال" نەتیجە بووە بە سەبەبس عەدەم تەرەققیی و تەکامولیان "!!/کەمال"، لەبەرئەوە تەڵەب ئەکەم ئەو مودیرییەتی مەنتیقەی کە دوو سێ ساڵ لەمەوپێش بۆ ئەم خوسووسە هەبووە "!!/کەمال" بە عەجەل ئیحداس و ئیعادەی بفەرموونەوە و مەکاتیبی سلێمانیی، کەرکووك و هەولێر ڕەبتی مەکتەبە کوردییەکە لە لیوای مووسڵدا هەیە "!!/کەمال" بۆ تەفتیش و موراقەبەیان موفەتتیشی کوردی موقتەدیر ئیستیخدام و عەلاوەی قادوۆی – کادیر، دەستەی /کەمال –مودیرییەتی مەنتیقەی مووسڵی بکەن و موحەققەتەن لێم مەعلوومە کە مەجلیسی عالیتان ئەبێ بە زەهیری ئەم تەلەبە و ئومێدم تەرویج ئەفەرموون. (تەواو). (٨/ل١– ٣).

بەڵگەی سێیەم

لە ١ ی حوزەیرانی ١٩٢٨ دا –وەك ژیان: ژ ١١٨ دەنووێنێ– دەستەیێ لە نوێنەرە کوردەکانی نێو پەرلەمان، لەمەڕ مەعاریف – خوێندەواریی کورد ڕاپۆرتێکیان داوە بە وەزارەتی مەعاریف کە مەتنە تەواوەکەی ئەمەیە:

بۆ وەزارەتی جەلیلەی مەعاریف

لە فەخامەتتانەوە مەعلوومە کە جیهەتی شیمال – کوردستان /کەمال – لە خوسووس عیلاقاتی سیاسییە و ئیقتیسادییەوە، لەناو حوکوومەتە گەنجە تازە پێگەییشتووەکەمان ئەهمییەتێکی گەورەی هەیە، لەبەر ئەمە لازمە ئیزالەی هەموو مەوانیعێك بکرێ "!!/کەمال" لە خوسووسی نەشری مەعاریفەوە و ئەو شتانەی کە جەهل لا ئەبات ئەو ئەسبابانەی کە مەعاریفی مەنتیقەی دوواخستووە ئەمانەن:

١. نەبوونیی کتێبانی تەرجەمە کراو بە کوردیی کە لیسانی تەدریسییەی ئەو مەنتیقەیە و عیبارەتە لە چەند لیواو قەزاییکی موهیم کە توول و عورزیی لە زاخۆوەیە هەتاکوو پێنجوین و خانەقین و بەدرە!

٢. کەمیەتیی موعەللیم لەو مەنتیقەیەدا!

٣. بۆئەوەی ئیرشاد و موراقەبەیێکی تەواوی موعەللیمەکان و مەکتەب بکات و تەرەققیی و تەعمیمی مەعاریف بکات و لەسەر یێك ڕێ و یێك پرۆگرام تەدریس و تەدریسیان پێ بگات، بۆ ئەم مەنتیقەیە مودیرێکی مەعاریف نییە "!!/کەمال"!

٤. لەم مەنتیقەیەدا مەکتەبێکی موکەممەلی سانەویی نییە کە ببێ بە کەفیل و واسیتەی تەواوکردنی ئەو عیلمانەی کە تەلەبەکان لە مەکاتیبی ئیپتیدائییەدا خوێندوویانە و بۆئەوەی کە لەوێدا لەزەت لە خوێندن وەربگرن و عیلمێکی چاك فێری تەلەبەکان بکرێت بەنەوعێك کە بتوانن بچنە مەکاتیبی عالییەوە. "!!/کەمال".

٥. ئەم مەنتیقەیە مەحروومە لە مەکتەبێکی دارولموعەللمینێ کە مەوجوودییەتی ئەلزەمە و یێکانە واسیتەیە بۆئەوەی موعەللیمی موقتەدیر و عالیم پێ بگەیێنێ کە بتوانن چاك و بە کوردیی تەدریس بکەن. "!!/کەمال ".

٦. لەبەر فەقیریی، ئەهالیی ئەو مەنتیقەیە ناتوانن و مومکینیان نابێ ئەولادەکانیان بۆ ئیکمالی تەحسیلی سانەویی و عالیی بنێرن بۆ مەرکەزی حوکوومەت! "!!/کەمال"

٧. زۆر ئەسبابی تر هەیە کە بووە بە سەبەبی ئەوە کە ئەبەونییەکان - بابەکان/کەمال - ئیهتیمام ناکەن بۆئەوەی ئەولادەکانیان بنێرنە مەکتەب. ئەو ڕێیەی کە لازیمە لە خوسووس نەشری مەعاریفەوە تەبەعییەتی پێ بکرێ ئەوەیە کە ئەو نوقسانیانە و ئەو سستیەی لە خوسووس مەعاریفەوە هەیە و زیهنی ئەهالییەکەی ئیشغال کردووە کە ئیهتیمام بە مەعاریف ناکەن "!!/کەمال"، لازمە لابرێ کە ئەمانەن:

١/٧: تەشکیلی لیجنەیێکی تەرجەمە و تەئلیف کە ئەعزاکانی لە عالیم و مونەووەرە مونتەخەبەکانی کوردەکان بێ، کە موافیقی پرۆغرامی کتێب تەئلیف و تەرجەمە بکەن و ئیعتیقادمان وایە کە ئەم لیجنەیە ئیشەکانیان زۆر چاك و بەتەواویی بەجێ ئەهێنن و

وەزارەتی مەعاریف بۆ ئەم خوسووسە مەساریفێکی زۆری ئەبێ و ئەگەر وەزارەتی مەعاریف لە حاڵی مەعزوور لە تەشکیل کردنی ئەم لیجنەیە کە زۆر پێویستە بۆ لابردنی تەزەبزوب، هیچ نەبێ ڕجا ئەکەین ڕەسمەن ئیعلانی بکات کە ئەو کەسانەی مووافیقی پرۆغرامی مەعاریف کتێبێك تەرجەمە و تەئلیف ئەکەن، بە نیسبەت چاکیی کتێبەکانەوە ئیکرامییەیێکی ئەدرێتێ کە ئەقەللەن ڕوپییە کەمتر نەبێ. وە ئەگەر ئەم مەسئەلەیە تەرك بکرێ، بۆ تەشەببوسی خۆیان نابێ، چونکە ئەمە لە میللەتێکا ئەکرێ کە لە ناویانا عیلم موتەرەققیی بێ و قەدری مەعاریف بزانن و ئەگەر مەساریفی ئەم مەسئەلەیە بۆ تەشەببوسی شەخسیی تەرك بکات، باوەڕ ناکەین هیچ کتێبێك لەخۆیەوە ئەم خزمەتە بکات، چونکە بۆخۆی ئینتیفاعێکی ماددیی و زەروریی تیا نابینێ! {لیژنەی وەرگێڕاندن و دانان لەسەردەمی ساتیعولحوسەرییدا پەك خرا! /کەمال}

۲/۷: بۆئەوەی موعەللیمی موقتەدیری عالیم بۆ سونفە سانەوییەکان چنگ بکەوێ، لازمە وەزارەتی مەعاریف لە خوسووسی زیادیی مەعاشەوە ئیهتیمام بکات، چونکە ئیعیقادمان هەیە کە پیاوی زۆر موقتەدیر، عالیم هەیە لە وڵاتەکەمانا، فەقەت لەبەر مەعاش کەمیی ئینتیساب ناکەن بە مەعاریفەوە.

۳/۷: لازمە دائیرەیێکی مەعاریف لەم مەنتیقەیەدا تەشکیل بکرێ بە شەرتێك مەرکەزەکەی لە وەسەتی – نێوەندی /کەمال – ئەم مەنتیقەیەدا بێ کە بتوانێ موراقەبەی هەموو مەکتەبەکان بکات و لازمە مودیرێکی وای بۆ تەعین بکرێ کە لە مەداریسی عالییە دەرچوو بێ کە موقتەدیر بێ، حاڵەتی مەعاریف بگەیێنێ بە حەددێکی مەتڵووبە وە بوونی ئەم دائیرەیەش زەروورییە بۆ نەشری عیلم و مەعریفەت و حوکوومەت لە تەشکیل کردنی ئەو دایەرەیە و مەسرەفێکی زۆری نابێ بە نیسبەت ئێستاوە کە بۆ تەفتیش و موراقەبەی لیوای سلێمانیی و کەرکووکی داوە بە بەغداد و "! !/کەمال"، ئەقزیەکانی شیمال وەك زاخۆ، دهۆك، عەمادییە، عەقرەی داوە بە

مووسڵ"!!/کەمال" لەمەدا هەم لە خوسووس مەعاریفەوە، هەم لە خوسووسی تەدریساتەوە خراپە"!! /کەمال" چونکە تابیعی مەنتیقەیێك نین. تەدریسیان وەك یێك نابێ و غەیری ئەمەیش چونکە موفەتتیشین و مودیرینی ئەم مەنتیقانە کوردیی نازانن"!!/کەمال " هیچ فائیدەیێکیان لێ حاسڵ نابێ! "کەمال".

٧/٤: ئیکمال و تەنزیمی مەکاتیبی سانەویی بە سوورەتێکی وا کە حەسبەلمەتلووب تەکەففول تەربییەی تەلەبەکان بکات و ئیمتیحانیان دەفع بکات و لە خوسووس ئەو مەحزوورەوە کە تەلەبەکان چونکە بە عەرەبیی ناخوێنن، لە مەکاتیبی عالییەدا موشکیلات ئەکێشن"!!/کەمال"، ئەمیش ڕاست نییە، چونکە ئەم مەحزوورە بە زیادکردنی ئەوقاتی تەدریسییەی دەرسی عەرەبیی لە سونفە سانەویەکان لاچێت!

٧/٥: کردنەوەی مەکتەبێکی دارولموعەللیمین "!!/کەمال" بۆئەوەی ئیحرازی موعەللیمینی موقتەدیری چاك بکات کە بتوانن لەسەر ئوسووڵی تازە موافیق و مەتلووب تەلەبەکان پێ بگەیێنن!

٧/٦: کردنەوەی مەکاتیبی کچان!

٧/٧: هەر وەقتێك مەکتەبەکان و مەعاریفی ئەم مەنتیقەیە بەم نەوعە کە عەرزمان کردن، تەنزیم کرا، ئەو وەقتە ئەبەوینەکان شەوقیان ئەبێ کە منداڵەکانیان بنێرنە مەکتەب بۆ تەحسیل! ئینجا ئیسیرحام لە وەزارەتی مەعاریف ئەکەین کە ئیهتیمامێکی کافیی و تەواو بەم مەعرووزاتانەمان بکات، لەم ساڵەوە دەست بکا بەم ئیسلاحاتە مەتلووبە و قەتعییە و ئیزالەی هەموو مەوانیعێك بکات کە ئەبێ بە سەبەبی عەدەم تەرەققیی مەعاریفی ئەم مەنتیقەیە و ئێمەش پێشەکیی تەشەککوری ئەکەین!

| مەعرووف جیاوك | ئیسماعیل ڕواندزی | محەممەد سالْح |
| --- | --- | --- |
| نائیبی ئەربیل | نائیبی ئەربیل | نائیبی سلێمانیی |
| محەممەد جاف | سەبریی | عەبداللە |
| نائیبی کەرکووك | نائیبی سلێمانیی | نائیبی ئەربیل |
| جەمال بابان | سەیف اللە | محەممەد سەعید |
| نائیبی ئەربیل | نائیبی سلێمانیی | نائیبی کەرکووك |

بەغداد (حوزەیران ١٩٢٨)

بەڵگەی چوارەم

لە ٢٠ ی ئابی ١٩٢٨ دا، دیسان محەممەد ئەمین زەکیی نوێنەری سلێمانیی ڕاپۆرتێکی گرنگ و وردتری لەمەڕ نالەباری و دوواکەوتوویی خوێندن و خوێندەواریی کوردیی پێشکەشی پەرلەمانی عێراق کردووەتەوە، چەند و چۆنیی هەموو بارێکی، لەڕووی داراییشەوە و بەدەم بەراووردی ئاستی بازێڕەکانی عێراق و بە ئامارێکی بەڵگەدار و دڵنیاوە سەلماندووە. (ژیان – س٣، ژ ١٢٨، پێنجشەممە ١٩٢٨/٩/١٣ ـــ ژ ١٣٧: ١٥ /١١ /١٩٢٨، واتە لە شەش ژمارەدا ڕاپۆرتەکەی بڵاوکردووەتەوە.. ئێرە بەشی بڵاوکردنەوەی ناکات!).

بەڵگەی پێنجەم

لە ٤ ی نیسانی ١٩٢٩ دا، دیسان نوێنەرانی کورد، سەیف اللە خەندان، جەمال بابان، حازم شەمدینی، ئیسماعیل ڕواندزیی، محەممەد بەگ جاف، محەممەد سالْح محەممەد عەلی، سکاڵانامەیێکیان داوە بە سەروەزیرانی عێراق و وێنەیشی بۆ نوێنەری باڵای

بەریتانیا. لەنێویدا گلەییان لە جێ بەجێ نەبوونی (بڕیارەکانی ئەسپاردەی کۆمەڵەی گەلان) کردووە و داواییێکیشیان ئەوەیە: (خەرجیی – یان بودجەی – پێویست بۆ مەعاریفی کوردستان زیاد بکرێ! هەروەها بەڕێوەبەراییێتیەکی مەعاریفی گشتیی کوردیی دابمەزرێ!).

بەڵگەی شەشەم

لە شوباتی ١٩٣٠ دا، نوێنەرەکانی کورد، سکاڵانامەییێکی دیان داوە بە (نوێنەری باڵای بەریتانیا لە عێراقدا). عەبدوڕڕەزاق ئەلحەسەنیی خاوەندی " تەئریخ ئەلوەزارات ئەلعیراقییە/مێژووی وەزارەتەکانی عێراق " دەڵێت: هەردووجار – بەجاری پێشووەوە – تەماشای داخوازییان نەکراوە! {١ /ج ٣، ص ٦٣}

بەڵگەی حەوتەم

لە مارتی ١٩٣٠ شدا، دیسان چەند نوێنەرێکی کورد، سکاڵانامەییێکی گرنگتریان داوە بە سەروەزیرانی عێراق و وێنەیشیان لێ داوە بە نوێنەری باڵای بەریتانیا و سەرلەنوێ داوای: (بەڕەسمیی ناساندنی زمانی کوردیی، دامەزراندنی بەڕێوەبەراییێتیەکی مەعاریفی کوردیی لە بازێڕێکی کوردستاندا، بایێخدان بە وەرگێڕاندن و دانانی کتێبی کوردی) یان کردووە!

**هەڵچوون!**

کورد و مافەکانی و حوکومەتی مەملەکەتی عێراقی بەرچاو تەنگ و دەسەڵاتدار و پشت ئەستوور بە ئینگلیزی چاودێری، دوو بەرە بوون، ڕۆژ بە ڕۆژ لە یێکدی بەگومان بوون، بەتایبەتیی کە کەمترین مافی خوێندن و خوێندەواریی ڕەوای کورد – وەك ئەو بەڵگانە ساخیان کردەوە – ڕەفتاری چەوت چەوێڵی لەگەڵ دەکرا!

لە ئەو هەلانەدا کۆڕی باسی پەیمانبەستنی نوێی ئینگلیز – عێراق گەرم بوو. ئەو دوو لایێنەی هەرییێکە بۆ فەڕی خۆی و بەجۆرێ پەرۆشی هاتنە دیی و مۆرکردنی بوو.

لەلایێکی دییەوە، کورد وەك چاوەنۆڕی ئەنجامی ئەو پەیمانە بوو – چۆنی ڕێز دەگرێ – هەروەها چاوەنۆڕیی بێ هوودەیشی بۆ ماق تەواوی خوێندەواریی، بەتایبەتی دووای هەردوو سکالآنامەکەی (نیسان ۱۹۲۹ – مارت ۱۹۳۰) کارێکی زۆری تێ کردبوو، بێزار و ڕوو لە هەڵچوون بوو.

حوکوومەتی عێراق – بێگومان بە ئامۆژگاریی ئینگلیز – ویستی سروەیێکی خۆش بەرامبەر بە کورد بنوێنێ و هێووری بکاتەوە، بۆیێکا پێش مۆرکردنی پەیمانەکە لە ۱۰ /نیسان /۱۹۳۰ دا، بەیاننامەیێکی بڵاوکردەوە گۆیا (لەبەر تیشکی مادە " ۱۷ " ی بنچینەی قانوونی عێراقیی، لەمەڕ بەڕەسمیی ناساندنی زمانی کوردیی، پێشنیازی بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران کردووە تا لێی بکۆڵێتەوە و پەسەندی بکات!). {۲ /ج ۲، ص ۱۲– ۱۳}.

پێش بەرگرتنی ئەم بەیاننامەیەش لە ۳۰ /حوزەیران /۱۹۳۰ دا، چوارەمین پەیمانی ئینگلیز – عێراق بۆ ماوەی بیستو پێنج ساڵی دیی مۆرکرا!

ئەم پەیمانە –وەك هێندێ پارتی عەرەبی عێراق پێی گران بوو – لەلای هەموو جۆر بە جۆرەکانی گەلی کورد ناپەسەند و پێ شێلی هەموو (مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد) بوو، بەتایبەتیی کە لە هیچ برگەیێکی پەیمانەکەدا، لەمەڕ هەر مافێکی کورد و ئەسپاردەی کۆمەڵەی گەلان، دەنگ و ڕەنگێکی نەبوو!

لە ئێرەوە (ماق تەواوی خوێندەواریی) وەك ئەڵقەیێکی پچووك تێکەڵی تەواوی ڕستەکانی کێشەی سیاسیی گەلی کورد بوو! زۆربەی جەماوەری کوردستان – باشوور – لەنێوان مانگەکانی تەمووز و ئەیلوول ۱۹۳۰ دا، ئاشتی خوازانە کۆبوونەوە و خۆنیشان دانی نارەزاییان دەست پێ کرد.. سکالآنامە و بروسکەیان کردە سەر نوێنەری باڵای بەریتانیا لە عێراقدا، هەروەها سکرتێری کۆمەڵەی گەلان!

حوکوومەتی عێراق – بە ئامۆژگاریی و هاریکاریی هاوپەیمانەکەی – دوور کوژانە دەینۆڕی و مەبەستی گەورەی لەبەردەمدا بوو، یێکیان ئەوە بوو هەڵبژاردنی نوێی ئەنجوومەنی نوێنەران جێ بەجێ بێ و پەیمانەکە پەسەند بکات!

لە ئەو پێناوەدا و بۆ بەرگرتن لە هەڵچوونی جەماوەری کورد، کەوتە کرد و کۆش و لەپێشدا جێ نشینی تەختی عێراقیی –وەلیی عەهد– لە١٩٣٠/٧/١٦ دا دیدەنیی سلێمانیی کرد. جەماوەریش بە خۆنیشان دانێکی ئاشتیانە و ناڕەزایانەوە، پێشوازیی کرد. دوواتر بۆ هەمان مەبەست، هەروەها بۆ نواندنی هاوپەیمانیی و یێکدگیریی هەڵوێست، جێگری سەروەزیرانی عێراق و جێ گری نوێنەری بالای بەریتانیا، دیدەنیی بازێڕەکانی کەرکووك، هەولێر، سلێمانیی کرد و لەگەڵ کۆمەلانی ناسراوان وەك ژمارەیێ نوێنەری نێو پەرلەمان، دەوڵەمەندەکان، سەرخێڵەکان، ڕۆشنبیرەکان، چەند کۆبوونەوەیێکیان کرد کە هەموو خەڵکەکە، نەك هەر بێزارییان بەرامبەر پەیمانەکە دەنواند، بەڵکو لەتاو زۆر و ستەمی ڕیزە حوکوومەتەکانی عەرەبی عێراق و بە پشتیوانی برێارە جۆر بەجۆرەکانی کۆمەڵەی گەلان، بەئاشکرا (داوای جوێ بوونەوە و دامەزراندنی: حوکوومەتی کوردستانی سەربەست – چاودێری کراو ئینگلین) یان دەکرد!

جێگری سەروەزیرانی عێراق، جەعفەرولعەسکەریی، چیی نوێی لە هەگبەدا پێ نەبوو، ئەوەی هەیشی بوو، کۆی بکەیتەوە لە ئەم دەنکە قسانە پتر نەبوو، (عێراقین.. یێکسانین.. گەلاڵەنامەیێکی قانوونیی بۆ بەڕەسمیی ناساندنی زمانی کوردیی پێشنیاز کراوە و چاوەنۆڕی پەسەندی پەرلەمانە.. پشکنەرێکی مەعاریف بۆ قوتابخانە کوردییەکان داندراوە!). {١٠/ل١– ٢} . (بنۆڕە پاشکۆ)

مێجەر یۆنگ Young جێگری نوێنەری بالای بەریتانیا، ئەویش شتێکی چاکی لەژێر شەپقەکەیدا پێ نەبووە، هێندە نەبێ بە ئەم مانایەوە سەلماندی: (پەیمانەکە هەرگیز

لایێنگیری جویێ بوونەوەی کورد نییە ! دڵنیایە کە حوکوومەتی عێراق قەدری زمانی کوردیی و ئارەزووەکانی دەگرێت ! ) {١٠/ل ١-٣} .

ڕووداوەکان دەیسەلمێنن کە نوێنەری باڵای بەریتانیا، کۆمەڵەی گەلان، حوکوومەتی عێراق، هەموو ئەو ناڕەزایی و سکاڵانامە و برووسکانەیان نەگرتە بەرچاو و گوێ و دڵیان نەدایێ و نرخیان نەگرتن! ئەوپەڕی وەڵامێکیش کە دەستگیر بووبێ، وەڵامێکی ساکاری (لیژنەی چاودێریی /ماندات) بوو کە دەڵێت: (با سکاڵانووسەکان ئاگاداربن و تێ بگەیێندرێن کە کۆمەڵەی گەلان کۆشش دەکات هەمیشە ڕێزی مافەکانی کورد بگیردرێ، ئەگەر دەرکەوت کوردەکان دڵسۆزیی بۆ حوکوومەتی عێراق دەنوێنن و لە کردوکۆشدا دەبن بۆ سەقامگیربوونی ئاساییش ! ) {٦/ص ٢٩٩} .

دووای هەموو بێزاریی و لە یێك نەگەییشتن و بەدەنگەوە نەهاتن، هەڵچوونی ڕەوا و کارەساتی (٦ ی ئەیلوولی ١٩٣٠ - شەڕی بەردەرکی سەرا - ی سلێمانیی) قەوما کە کاربەدەستەکانی حوکوومەتی عەرەبی عێراقیی و ئینگلیز بە پلانێکی بڕیاردراو و زووتر، خۆنیشان دانی ئاشتییانەی جەماوەریان بە منداڵ و گەورەوە، کوژران و دەیانی دی بریندار و گیران و بەندکران !

دەی لەنێو ئەم هەموو بارە ئاڵۆز و خوێناویەدا (ماف تەواوەتیی خوێندەواریی کورد ! ) چیی لیێ بەسەرهات؟

## وەرچەخاندنێکی ناچاریی

گەلی کوردی خاوەندی مافەکان، ورەی بەرنەدا. لەبریی نووچ دان، لە مانگی تەشرینی یێکەمی ١٩٣٠ دا - بە خوێنی شەهیدانی ٦ ی ئەیلوول - سەرلەنوێ حەفیدزادە مەحموود، مەشخەڵی شۆڕشی داگیرساندەوە، هەروەها لە کانوونی یێکەمی ١٩٣١ ز. دا ڕاپەڕینی (بارزان) یش قەوما و بێزاریی و متمانەنەکردنی خەڵکیش پتر گەرم و گوڕ بوو، ئەمانە هەموویان بۆ ئامانجەکانی ئینگلیز و عێراق ترسناك و مۆلەکەبوون !

بریتانیا، هەروەك حوكوومەتی عێراق، هەڵپەی بوو پەیمانە مۆركراوەكەیان بكەوێتە گەڕ. حوكوومەتی عێراقیش لەلایێكەوە پەرۆشی كۆتایی هاتنی (چاودێریی ئینگلیز /ماندات) بوو. لەلاییێكی دیەوە بەنێوی هاتنەدی سەروەرییەوە، عێراق پەرۆشی بەئەندام بوون لە كۆمەڵەی گەلان.. بە ئەو ڕۆشناییانە، هەردوولا، دەبوو هاریكاربن و هەنگاوی وەرچەرخاندن بنوێنن!

لە ئەم ڕووەوە، بەهاریكاریی هەردوولا، دووا شۆڕشی چەكدارانەی حەفیدزادە مەحموود، بە شەڕی (ئاوباریك - ٢٠/٤ /١٩٣١) و بەدیل گرتنی لە ١٩٣١/٥/٣١ دا، كۆتایی پێ هێنرا. هەر بە ئەو هاریكاریەش ڕاپەڕینی (بارزان) دامركێندرایەوە!

لەسەرێكی دیەوە، حوكوومەتی عێراق بۆ جوان كردنی وێنەی و لە ڕاپێڵەی (قانوونی زمانەكانی نێوخۆیی /ژ ٧٤- مادده "دە"ی ساڵی ١٩٣١) دا زمانی كوردیی بە ڕەسمیی ناسیی!

كۆمەڵەی گەلان - بێ گومان بە فیتی بریتانیا- مەرج و بەڵێنی كۆكتری لە حوكوومەتی عێراق دەویست بۆ (پەسەندكردنی بە ئەندام بوونی!). یێكێ لە ئەو بەهانانەی، گۆیا (پاراستنی مافەكانی نەتەوە كەمەكان بوو!!) كە بێ گومان ئەم باسەی هەر كوردی نەدەگرتەوە.

حوكوومەتی عێراق ناچار ما لە ١/٢٨ /١٩٣٢ دا، بڕیاری چەند بەڵێنێ بدات و لە ١٩٣٢/٥/٥ شدا، پەرلەمانی عێراق پەسەندی كرد. لەنێو یێكێ لە بەڵێنەكاندا، بۆ یێكەمین جاری، بەڵێنی بە كۆمەڵەی گەلان دا: (حوكوومەتی عێراق، قاییلە لە قەزا كوردنشینەكانی لیواكانی مووسڵ، هەولێر، كەركووك، سلێمانییدا، زمانی كوردیی ڕەسمیی و هاوشانی زمانی عەرەبیی بێ! بەڵام لە قەزاكانی كفری و كەركووكی سەر بە بازێڕی كەركووك - كە بەشی زۆریان گۆیا توركمانن!! - ئەوە زمانی ڕەسمیی

هاوشانی عەرەبیی، کوردیی یان تورکمانیی دەبێت! /مادده: ٩ بەندی: ١).{١ /ج ٣،ص ١٩٧}.

شەش مانگی پیێ نەچوو، ڕاستتر لە٣ /١١ /١٩٣٢ دا، لەلاییکەوە عێراق بوو بە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان. لەلاییکی دیەوە، چوارەم پەیمانی بریتانیا– عێراق، هەر لە ئەو ڕۆژەوە کەوتەگەڕ!!

## ئە نجامی گشتیی

دەرکەوت کە کێشەیێ بەنێوی نووسین و خوێندەوارییەوە بنچینە نییە و ڕاستییەکەی (کێشەی تەواوی مافەکانی گەلی کوردە) کە یێکی لەنێویاندا، مافی تەواوەتیی خوێندن و خوێندەوارییە لەنێو مەملەکەتی عێراقی تازە دەوڵەتدا. هەروەها دەرکەوت کە ئەم مافە کەمەش چۆن پەتپەتێنی پیێ کراوە و چەندی خایاندووە!

وێڕای ئەوانە و گەلیێ باسی دی – لەئێرەدا جێگەیان نابێتەوە – زۆر پێویستە بەدووای ئەنجامی ئەم کێشە پچکۆلەیەشدا بگەڕێین و بپرسین: داخۆ ڕیزە حوکوومەتەکانی عێراق، بەتایبەتی تا ساڵی ١٩٥٨، بڕیار و بەڵێنی قانوونیی خۆیان و ڕاسپاردە و بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلانیان ڕاست و ڕەوان جیێ بەجیێ کردووە!

وەڵامدانەوەی پرسیارێکی ئەوها هێندە گەورە، بیێ گومان بە چەند لاپەڕە و بەڵگەنامە و چەند هەڵسەنگاندنیێ تەواو نابێت و نابڕێتەوە، بەڵام کۆشش دەکەم ڕوواڵەتە گرنگەکانی – لێم کۆڵیونەتەوە – لە چەند خاڵێکدا نیشانە بکەم و بڵێم:

١. لە ساڵانی ١٩٣١ – ١٩٣٢ بەدوواوە، وەك زمانی کوردیی بەڕەسمیی ناسرا، ئەوە ئەم قانوونە هەموو دەزگەکانی دەوڵەتی لە کوردستانی باشوور – باکووری عێراق!! – دا نەگرتەوە!

٢. پلان دانانی خوێندن و ئاوەدان کردنەوەی قوتابخانە و مسۆگەرکردنی پێویستییەکانی، بەپێی هەوا و ئارەزووی وەزارەتی مەعاریفی بەغداد بووە و بەڕۆشنایی پێویستیی و ئارەزووەکانی نێوچەکە و خەڵکەکەی نەبووە!

٣. هەر لەسەرەتاوە خوێندن بە زمانی کوردیی، هەر بەشی قوتابخانەکانی سەرەتایی بووە نەك قوتابخانەکانی نێوەندیی، ئامادەیی، کۆلیجەکان.

٤. هەر لەسەرەتاوە چەند وانەیێ لە کۆی گشت وانەکاندا بە زمانی کوردیی بووە نەوەکا گشتیی (بێ لە عەرەبیی و ئینگلیزی).

٥. لە ساڵی ١٩٣٠ بەدوواوە کە (موفەتتیشییەتی مەعاریفی مەنتیقەی کوردستان) لە بازێڕی کەرکووکدا دامەزرا، بەچەند کادرێکی کەم و کەسانی نەشارەزا — وەك نووریی بەرزنجیی کوردیی کەمزان — بەڕێگەوە دەبرا، گۆیا سەرپەرشتی باری خوێندن و خوێندەواریی قوتابخانە کوردییەکانی ئەو شوێنە نیشانە بکەن!! ئەم دەزگە پڕ لە کەم و کورتییەش هەر لەگەڵ دەست پێ کردنی جەنگی گێتیی دووەمەوە تا ساڵی ١٩٤٥ پەکی کەوت و بەرەبەرە لەچاو ون بوو!

٦. لەبێك کاتدا نا، لەبەرەوە، بازێڕەکانی مووسڵ، هەولێر، کەرکووك، سلێمانیی بەڕێوەبەرایێتی مەعاریفیان تێدا دامەزرا وتوانای دارایی و کەرەستەکانی قوتابخانەکان و خوێندنیش بەسترابوون بە وەزارەتی مەعاریفی بەغدادەوە.

٧.هەر لەسەرەتاوە بگرە هەتا ئەمڕۆ، هێندێ نێوچەی کوردستان بڕیاری خوێندنی کوردیی بەسەردا نەسەپێندرا. بۆ وێنە گەلێ نێوچەی کەرکووك خۆی و دەوروبەریشی، هەروەها نێوچەی براکانمان کە بە شێوە کورمانجیی باکوور دەئاخڤن.

٨.هەر لەسەرەتاوە مندالانی کورد لە قوتابخانە سەرەتاییەکانەوە تا ئامادەیی، بێ بەش بوون لە خوێندن و ناسینی ئەدەب، مێژوو، جوگرافیا، کەلەپووری نەتەوەیی

خۆیان. بەپێچەوانەوە هەمان بەرنامەکانی خوێندنی منداڵێکی عەرەبی نێوەند و باشووری عێراق بەسەر قوتابیانی کوردستاندا سەپێندرا بوو.

٩.تا درەنگێکی زۆر، لە هیچ بازێڕێکی کوردستانی باشووردا – باکووری عێراق!! – فێرگەی پێ گەیاندنی مامۆستایان بۆ هەر جۆرە خوێندنێ ئاوەدان نەکراوەتەوە. ئەم بارەش گەلێ ئەنجامی تاڵی بەخشیوە.. لەلایێکەوە کەم و کورتیی کادیری مامۆستا، لەلایێکی دیەوە پڕکردنەوەی هەر کەم و کورتییێ بە مامۆستای عەرەب و هاوتای کە بێگومان ئەرکی خۆیان لە قوتابخانە کوردییەکاندا پێ نەبراوەتە سەر، یان ناتەواو بووە. دیسان ئەم بارە زەبری لە پێشکەوتنی فێربوونی قوتابیان و خوێندەواریی داوە! (کوردان چ عەرەبان چاك دەزانن ئەگەر مامۆستاییێکی عەرەب بە ڕژێمەکان ناڕازیی بووایە، یان لەسەر کێشەیێکی خێڵەکیی دوور بخرابایەوە، ئاوارەی کوردستان دەکرا!). دوواجار نەبوونی فێرگەیێ، ئەرکی دارایی گرانی دەخستە ئەستۆی هەر خوێندکارێ کە بۆ مامۆستایی ڕووی بکردایەتە فێرگەی مامۆستایانی بەغداد یان مووسڵ!!

١٠. خوێندکاری کورد یێکسان لەگەڵ خوێندکاری دی نێوچەکانی عەرەبی عێراق ڕەفتاریان لەگەڵ نەکراوە، چ لە وەرگرتن بۆ مامۆستایی، چ لە تەواوکردنی کۆلێجەکان، چ لە ناردنیان بۆ هەندەران و خوێندنی بالا.. تەنانەت تا ئەمڕۆش هێندێ کۆلێج لە خوێندکاری کورد قەدەغەیە!!

١١. سیاسەتی پەروەرشت و خوێندەواریی ڕیزە حوکوومەتەکانی عێراق بەرامبەر منداڵان، لاوان، مامۆستایانی گەلی کوردستانی باشوور – باکووری عێراق!! – هەمیشە بەدەم نۆڕینێکی جودا و نواندنی توند و تیژییەوە، نەیاری هەست و سۆزی کوردایەتیی خەڵك بووە!

ئەو خەڵکە هەمیشە ناچارکراوە هەستی فەرزکراوی هاونیشتیمانیی عێراقییشیان لاواز بێ بە ئەوەی بەلای ڕژێمەکان و پارتەکانیاندا بەزۆر ڕاکێشراون و بیروڕای

سیاسیانەی خۆیان و عەرەبایەتییان بەسەردا زاڵ کردوون! هەردەمێ، بەهەربیانوویێ – داتاشراو و ساختەوە – بووبێ، چۆنیان ویستووە، دەستیان لێ کردوونەتەوە و زەبری گورچك بڕیان لێ داون.. سا یان دەرکراون، بەندکراون، نان بڕاوکراون، لە سێدارە دراون. هەڵبەت ئەم کارە نائاسایی و ناقانوونیی و نا ئینسانییە، خۆی مایەی خولقاندنی دووبەرەکیی و جوداییە، نەك هاوسۆزیی نیشتیمانی و برایی ئینسانیی و ژینێکی ئاسوودە و دڵنیا!

١٢. هێندێ هەواڵی کورت و پێ ویست وەك وەڵام:

–یێکەم فێرگەی ئامادەیی پیشەسازیی لەهەموو کوردستاندا. لە ساڵ ١٩٥٥ دا لە سلێمانییدا دامەزرا!

–یێکەم فێرگەی مامۆستایانی نێرینە و مێیینە لە ساڵی ١٩٥٦ دا لە سلێمانییدا کراوەتەوە.

–یێکەم بەشی کوردیی لە کۆلێجی ئەدەبیاتی بەغدادا، لە ساڵی ١٩٥٨ دا کراوەتەوە.

–بەڕێوەبەراییێتی گشتیی خوێندنی کوردیی، لە ساڵی ١٩٥٩ لە بەغدادا ئاوەدان کراوەتەوە.

–یێکەم زانکۆییێ لە کوردستانی باشووردا، ساڵی ١٩٦٩ لە سلێمانییدا کرایەوە.

–دووەم بەشی کوردیی کۆلێجی ئەدەبییات لە ساڵی ١٩٦٩ لە زانکۆی سلێمانییدا کرایەوە.

–دووای ماوەیێ پەکخستن، لە ساڵی ١٩٦٩ دا بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی کوردیی بووژایەوە.

—لە ساڵی ١٩٧٠ بەدوواوە و دووای بەیاننامەی ١١ ی مارتی ١٩٧٠ بڕیاری خوێندن بە کوردیی بۆ قوتابخانەکانی نێوەندیی و ئامادەیی بەرە بەرە پەیڕەو کرا، بەلام لە هەموو شوێنێکدا نەسەپێندرا! نێوچەکانی کەرکووك و دهۆك فەرامۆش کران!!

—لەساڵی ١٩٧٤ دا، بەپێی قانوونی خودموختاریی نێوچەی کوردستانی عێراق — "!!/کەمال" — پەیڕەوکردنی فێربوون و خوێندنی کوردیی هەموو نێوچەکەی گرتەوە، بەڵام تا ئەمڕۆ وەك بڕیارە لە هەموو شوێنێکدا جێ بەجێ نەکراوە. وێرا زۆر نێوچەی کوردیی گەرمیان خراونەتە سەر بازێڕی " تکریت /سەلاحوددین " دیالە / " کوردان لە خوێندەواریی کوردیی بێ بەش کراون!

١٣. ئەگەر هەر لێ کۆڵێکی زانست پەروەر و بە ویژدان و سەر بە هەر ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیی لە بڕیارە ئەسپاردەکانی کۆمەڵەی گەلان وردبێتەوە و بەراووردی ڕەفتارەکانی ریزە حوکوومەتەکانی عێراقی بکات و هەڵبکشێ بۆ ساڵەکانی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکان، ڕوون دەبێتەوە کە گەلی کوردستانی باشوور، تێ کۆشاوە بۆ مافەکانی خۆی و بەزۆری خۆی هێندێ ماف خوێندەواریی دەستگیر بووە.. ئەوەیشی دەستگیری بووە لەچاو داخوازیی ڕەوادا کەمە و بە درێژایی نیو سەدەش مافە ئینسانیە ڕەواکانی قوتابیان، لاوان، مامۆستایان، تووشی پێ شێلیی بوون و گەلی کورد تووشی پاکۆ بوونی ڕەگەز — جینوساید Genocide بووە!

**پاشکۆ**

هەر لە لیژنەکەی ساتیعولحوسەرییەوە، چەند جارێ نێوی پشکنەری مەعاریف، یان موفەتتیشی مەعاریفی مەنتیقەی کوردستان، (نووریی بەرزنجیی) هاتووە.

ڕاستییەکەی هەر لە ساڵی ١٩٢٤ ز. دا، لە کەرکووکدا پشکنەرێکی مەعاریف بۆ پشکنینی قوتابخانەکانی ئەو بازێڕە و هەولێر و ئەوجا سلێمانیی، دامەزرا بوو. لە ساڵی ١٩٢٥ دا مستەفا مەزهەری — خەڵکی سلێمانیی — بوو بە پشکنەر و ڕۆژنامەی

(ژیانەوە) خۆشحاڵیی دەربڕیوە.. دوایی نووریی بەرزنجیی لە نێوان ١٩٣٠ – ١٩٣٥ دا بوو بە پشکنەری مەعاریفی مەنتیقەی کوردستان لە کەرکووکدا ... ئەم کەسە – ڕەگەز کوردە – وێرای ئەوەی بێژراوە کە کوردیی باش نازانێت و لە لیژنەکەی ساتیعولحوسەریدا ڕەخنەی لێ گیراوە و مستەفا سابیب لە ڕستەگوتاری (بۆ مەبعووسان – س ١٩٢٦) بەتایبەتیش لە دەستنووسی یێکێ لە ئەو گوتارانەیدا، بە نەشارەزای ژماردووە، وەك پرسیومە هێندێ دەبێژن کە خۆبەرەپێش و هەلپەرست بووە..

بۆ کوردیی نەزانینەکەیشی – دەستنووسێکی تێ بینیەکانی لە دیدەنی کردنی قوتابخانەی سەرەتایی فەیسەلییەی سلێمانیی لە ٢٨ /١٠/ ١٩٣٠ دا کە لەبەر دەستمە – دڵنیام کە کوردییەکەی ناتەواو بووە!

هەرچۆنێ بێ، بێ کەسی شاعیری ناسراوی کورد، بەنێوی (قەسیدە رائیعەلیلسەیید نووری بەرزنجیی ئەلکۆنەکۆتری/قصیدة رائعة للسید نوری البرزنجي الکونە کوتری) یەوە، ئەم قەسیدەیەی بەنێوەوە داناوە گۆیا وێنەی هۆش و بیر و زمانی نێوبراوە ... دەڵێت:

ئەو سلێمانیی جیددەن زۆر لەتیف
وەلا سییەما لە فەسڵێ خەریف
موناخ موعتەدیل، ئەشجار موختەلیف
(اشهدبالله) لە خۆم موعتەریف
لاکین لەو بەلەدە هیچ نییە عیمران
بەمەرقەد باوکم میسل سەرقەبران
عەلاوا –علوا– موتەسەرریف دەبم لەیێك ساڵ
ئینقیلاب سهوول دەیدەم بە ئەحوال
ئەو سلێمانیی دەبێ لە جەننەت

ئیزدیهـــار دەیکـــا لـــە عـــیلم و ســـەنعەت
جـــەمیع شـــەواریع تـــەبلیت دەیکـــردم
یێـــك شـــوهرەت گـــەورە لـــەخۆم دەیـــبردم
ئەبنییـــە عومـــووم لـــە تـــەڕاز حـــەدیس
نەشـــر دەیكـــردم تەفســـیر و حـــەدیس
تـــۆ زەن نـــەیكا خـــۆم شـــەخس خـــورافیی
بـــەس یێـــك ئیشـــارە لـــە عـــەقلێ كـــافیی
ئـــەم بەلـــەد حـــالێ مەنـــەزەر حەزینـــە
لازم حـــەدائیق لـــە ئـــەو مەدینـــە
خـــۆم بـــە عـــەون اللـــە زۆر ئەمـــەل دەیكـــەم
ئـــەو دیققـــەت زانـــی عەمـــەل دەیكـــەم
میســـل هـــەموو شـــت لـــەو مەنســـەب جەدیـــد
ئیقـــتیراح ئەیكـــەم یـــەك فیكـــر ســـەدید
تەبعـــەن خـــۆم عـــالم لـــە لوغـــەت كـــوردیی
بـــەعز لـــە ئەشـــخاس میســـل خـــۆم عاقییـــل
ئـــەو لیســـان كـــوردیی زۆر عـــالیم فازیـــل
تەشـــویقات ئەیكـــەم بـــە ئـــەوان هـــەرجار
تـــەئلیف مـــالێ خـــۆم بیكـــەن ئینتیشـــار
یێـــك قـــامووس كـــوردیی دەیكـــەم زۆر غـــەریب
عومـــووم ئیعـــتیراف بیكـــا خـــۆم ئـــەدیب
حورمەتـــەن لـــە كـــورد مـــین بەعـــد دیـــوان
كـــە خـــۆم هەدییـــە بـــە خـــاتیر شـــینیان

لـــەبێك مـــوددەی کـــەم ئـــەو شـــەعب نـــەجیب
لە جەهل خەلاس ئەیکـەم عـەن قـەریب! {١١ /-}

## تەماشاکراوەکان


(١). الحسني: عبدالرزاق (تاريخ الوزارات العراقية، ج ٣، بيروت ١٩٨٦).

(٢). الحسني: عبدالرزاق (تاريخ الوزارات العراقية، ج ٢، بيروت ١٩٨٦).

(٣). الحسني: عبدالرزاق (تاريخ العراق السياسي – ج ٢، ببيروت ١٩٧٥).

(٤). الحسني: عبدالرزاق (العراق في ظل المعاهدات – ، بيروت ١٩٥٢).

(٥). الحصري: ساطع (مذكراتي في العراق، ج ١، بيروت، س ١٩٦٧).

## ڕۆژنامە و گۆڤار

(٦). ژیان – س ١، ژ ١٢، پێنجشەممە ٢٢ /٤ /١٩٢٦

(٧). ژیان – س ١، ژ ١١٨، پێنجشەممە ٢١ /٦ /١٩٢٦

(٨). ژیان – س ٣، ژ ١٢٨، پێنجشەممە ١٣ /٩ /١٩٢٨

(٩). ژیان – س ٥، ژ ٢٥٧، پێنجشەممە ١٤ /٨ /١٩٣٠

(١٠). کـاروان – س ٧، ژ ٧٧، تـەمووز ١٩٨٨ (بێگـەرد جـەلالى – دەستنووسـێکی تـازە دۆزراوە !).

# ٩

# دوو ڕۆژنـــــامـــــەوانـــــی ون!
# عەبدولکەریم سلێمانیی
# مستەفا شەوقیی

## ١. عەبدولکەریم سلێمانیی!
## پێشەکییەکی پێویست!

لە ساڵی ١٩٨١ دا، جەمال خەزنەدار ٣ ژمارەی گۆڤاری تورکیی - کوردیی (ڕۆژی کورد/ رُوژ کرد - ٦ ی حوزەیران، ٦ ی تەمووز، ١ ی ئۆگۆستی ١٣٢٩ ر - ١٩١٣ ن) سەرلەنویَ چاپ و بڵاوکردەوە.

ئەو ڕووناکیی داوە کە گۆڤارەکە وەك سەر بە (کۆمەڵی خوێندکارانی کورد - هێڤی) ی ئەستەنبوولَ بووە، خاوەند و بەرپرسیشی (عەبدولکەریم - یان - عەبدولکەریم سلێمانیی) بووە! هەروەها پتر ڕووناکیی داوە کە دوای ئەو ٣ ژمارەیە، گۆڤارەکە نێوی گۆڕدراوە بۆ (هەتاوی کورد / هتاو کرد - ژ ١ ی ١١ ی تەشرینی یێکەمی ١٣٢٩ ر - ١٩١٣ ن) و خاوەند و بەرپرسیشی عەبدولعەزیز بابان بووە! {٤/ل١٣}

بە ئەم پێیە ، هەواڵی دەرچوونی هەردوو گۆڤاری نێوی سەرکارانیشیان دەزانین.. بەڵام مخابن هەتا ئێستە چ کەسیَ لەڕیزی ڕۆژنامەواناندا نەهاتووە شوناسنامەی ڕاست و خەباتی ڕۆژنامەوانیی خاوەند و ڕێبەری بەرپرسی گۆڤاری (ڕۆژی کورد - عەبدولکەریم سلێمانیی) ورد و ڕوون بکاتەوە.. تەنانەت جەمال خەزنەداریش - دوای ١٢ ساڵان - لە گۆڤاری (ڕەنگین - ژ ٥٤، س ١٩٩٣) دا کەوتووەتە هەڵەیێکی زلەوە و عەبدولکەریم سلێمانیی بە (عەبدولکەریم مەحموود ڕۆستەم) ئاشنا کردووە کە دووهەمەکە بەتەنیَ لە یێك ژمارەی (بانگی کوردستان/ژ ١٤-١٨،١ / ١ / ١٩٢٦. بەغداد) دا وەك ڕێبەری

ئیدارەخانە دەرکەوتووە و دواییەکەی (بانگی کوردستان، ژ ١٤- ٢،٥/ ١٩٢٦/٢) لێی بوردووە و بە کارگێڕی خۆی دانەناوە!

هەڵبەت هەڵەی باس کراو، بەتەنێ هی کەسێ نییە، بەڵکو وێنەی کەم و کورتیی بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردە کە دوای ٨٠ ساڵان، ئەو ڕۆژنامەوانە و هاوتایی پێ نەناسراوەتەوە!!

من لەبەر ڕاستیی و ڕوونەدانی هەڵەی دی - کە لە ئەوەدا بوو ڕووبداتەوە - ناچار بووم و پێویستم زانیی، لەنێو پرۆژەی نووسینی مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردییەوە بێمە زمان بۆ ئاشناکردنی ڕۆژنامەوانی لیبرالیی - ئەقڵناس، (عەبدولکەریم سلێمانیی / واتە خەڵکی سلێمانیی) و تکاش دەخوازم هەرکەسێ وێنەی فۆتۆگراف یان هەر باسێکی ئەوی لەبیردا هەیە، جوامێرانە بێتە پێشەوە و بڵاوی بکاتەوە!

## عەبدولکەریم سلێمانیی!

کۆچ کردوو نەجمەدین مەلا لەکەشکۆڵێکی خۆیدا دەبێژێ: (عەبدولکەریم کوڕی حاجیی عەبدالله - ئەولاً- حەمە کەرکووکیی خەڵکی سلێمانییە. ساڵانی ١٨٨٠ ز "!! " لە سلێمانییدا لە دایك بووە. لە حوجرەی مەلایانەوە دەستی بە خوێندن کردووە. دوایی چووەتە " مەکتەبی ڕوشدییەی سەربازیی سلێمانیی". لە ئەو هەلانەشدا لە کن ئایینناس و شاعیری بەنێوبانگ "مەحویی" دەرزی ئەدەبیاتی فارسیی وەرگرتووە!). {=/١٣}

برازای خۆی، قادری حاجیی مەلا سەعید - لە تەمەنی ٨٨ ساڵاندا بۆ منی گێڕایەوە - کە (بابی: حاجیی مەلا سەعید کەرکووکیی (١)، لە هەلی یێکەم سووڕی مەجلیسی مەبعووسانی عوسمانییدا، ١٧/ ١٢/١٩٠٨، برا پچووکی خۆی، عەبدولکەریمی لەگەڵ خۆی بردووە بۆ ئەستەنبووڵ و لە " مەکتەبی حوقووق - کۆلێجی قانوونی ئێستە " دا نێونووسی کردووە تا خوێندنی ئەوقاتیی - پارێزەریی - تەواو بکات (٢).

بە لێك دانەوەی خۆم ، لە ساڵانی خوێندنی ١٩١١– ١٩١٢ز. دا خوێندنی تەواو کردووە و بووە بە پارێزەر.

نەجمەددین مەلا لە کەشکۆڵە دەستنووسەکەی خۆیدا پتر دەڵێت ، (عەبدولکەریم لەگەڵ ڕەحمەتیی ئیسماعیل حەققی بابان، لە کۆمەڵی تەعالیی و تەرەقیی کورد – ئەستەنبوولێ – دا هاریکاریی کردووە). (٣).

محەممەد ئەمین بوز ئارسەلان لە زمان نووسەری (کێشەی کوردستان " زنار سلۆپیی – نەمرڤەدری جەمیل پاشا / کەمال – هەواڵ ڕادەگەیێنێ کە: (عەبدولکەریم ئەندامی کۆمەڵی خوێنکارانی کورد – هێڤی: ٢٧/٧/ ١٩١٢ ز بووە. هەروەها سەرکاری " ڕۆژی کورد – س١٩١٣"بووە). {٢ / ل ٢٠ – ٢٤}

ڕۆژنامەی لوبنانیی فرەنسیی زمان (لۆ ژووغ LE JOUR – ٢٤ ی نیسانی ١٩٤٥) دەڵێت: (کەریم بەگ – حاکمی سلێمانیی! – لە ئەستەنبووڵدا " ڕۆژی کورد " ی دەرکردووە!). {١١ / ل ٧}

نەجمەددین مەلا پتری لێ گوتووە ، (پۆلیسی عوسمانیی کە زانیی نووسینەکانی – عەبدولکەریم – کوردان هۆشیار دەکات ، گرتیان و هەتا نزیك بوو ملی بکەن بە پەتدا!).

کۆچ کردوو، تۆفیق وەهبیی ناسیاوی سەردەمەکە و عەبدولکەریم – لەلای نووسەر م. ڕ. هاوار باسی کردووە – دەڵێت: (کەریم بەگ یێکێ بووە لە ڕیزی کوردە چالاك و چەلەنگەکانی ئەستەنبوولێ. لەسەر نووسینە توند و تیژەکانی خۆی لە گۆڤاری " ڕۆژی کورد " دا، حوکوومەتی عوسمانیی زیندانی کرد، بەڵام خانەدانی بەبەکان – بابان – فریایی کەوتن و ڕستگاریان کرد!). {١٥ / ل ٢٣٥ – ٢٣٦}

دیارە لەدوای ئەم ڕووداوەوە ، نێوی گۆڤارەکە گۆڕدراوە بۆ (هەتاوی کورد) و عەبدولعەزیز بابان هاتووەتە جێگەی.

قادری برازای خۆی پتر بەمنی گوت، (کەریم بەگ لە سالّی ١٩١٩ ز. دا هاتووەتەوە بۆ کوردستانی باشوور "!!" و چووەتە بەغداد و بە پیشەی پارێزەرییەوە خەریك بووە!).

کۆچ کردوو ، ڕەفیق حیلمیی یاداشتنووس دەبێژێت ، (کەریم بەگ لە سالّی ١٩٢٠ ز. دا - لە هەلی شۆڕشی سالّی بیستی عەرەبی عێراقدا - لە بەغدادی پێتەختدا پارێزەر بووە!). {٥ / ل ٧١}.

قادری برازای دیسان بە منی گوت ، (مامم لە سالّی ١٩٢٠ دا بووە بە داوەری دادگای مونفەریدی باژێری کەرکووك).

ڕەفیق حیلمیی دیسان دەگێڕێتەوە ، (کەریم بەگ لە سالّی ١٩٢٢ ز. دا داوەری دادگای مونفەریدی کەرکووك بووە). {٦ / ل ٩١}.

ڕۆژنامەی (ژیان - ١٧ / ٣ / ١٩٢٦) ڕادەگەیێنێت کە ئەو - کەریم بەگ - تا ئەو ڕۆژگارە سەرۆکی داوەرانی کەرکووك بووە!} ٨ / ل ٣ {هەمان ڕۆژنامەی ٢٤ / ٥ / ١٩٢٧ دیسان هەوالّی ڕاگەیاندووە کە ، (کەریم بەگ لە ئەو هەلەدا بووە بە داوەری دادگای مونفەریدی سلێمانیی). {٩ / ل ٢}.

قادری برازای چارەنووسی ڕوون کردەوە و گوتی ، (مامم عەبدولکەریم تووشی نەخۆشییەکی ددانی بوو. پزیشکێکی فەلەی مووسلّ لە سلێمانییدا ددانی کێشا و تووشی خوێن پژان بوو.. هەر ڕانەوەستا و سەرئەنجام بە شەرابی مەرگی برد!). مێژووی مردنی کەریم بەگ لەلای نەجمەددین مەلا ڕاگیراوە و دەلّێت ، (ڕۆژی چوارشەممە ١٩٢٩/٩/١٨ کۆچی کرد و ئەسپاردەی گۆڕستانی " گردی سەیوان " ی سلێمانیی بوو!).

بەڕۆشنایی قسە و باسی دی قادری برازایی و وردبوونەوەشم، عەبدولکەریم لە ژینی خۆیدا لە ئەستەنبوولّ و کوردستانیشدا هاوسەری خۆی هەڵنەبژاردووە و بێ نەوە سەری ناوەتەوە !

زمانەکانی کوردیی، تورکیی، فارسیی، فڕەنسیی، عەرەبیی – بە نووسین و خوێندنەوە – زانیوە. چ دانراوێکی ئەدەبیی قانوونیی لێ بەجێ نەماوە. هەروەها بەپێچەوانەی ڕای نەجمەددین مەلاوە، دەستی لە شیعر داناندا نەبووە.(٤).

قادری برازای – دوای نیشان دانی وێنە بڵاوکراوەکەی خەزنەدار لە ڕەنگینەدا – سڵەمیەوە و نکوولّی لە خاوەن وێنەکان کرد کە کەسیان وەك مامی جوان بوو بێ، هەروەها نەجمەددین مەلاش لەمەڕ جوانیی عەبدولکەریم نووسیویێتی: (لە ڕۆژگاری خوێندنیدا لەلای " مەحویی " شاعیر، ئەم دوو بەیتەی بەباڵای جوانییدا بڕیوە:

لەسەیری خەستەخانەی عیشق

لەسەر هەر خەستە دێ یا خوێندنی یاسینە یا شینە

ڕۆژنامەی (ژیان – ١٩٢٧/٨/١٨) پیاو چاکیی پەسەند کردووەو لێی گوتووە: (عەبدولکەریم بەگ لە هەموو خاکی کوردستاندا بە عولوویی جەناب و ویژدان پاکیی، تەڕەفداریی عەدل و حەققانیەت ناسراوە !). {٩ / ل ٢}.

شاعیری کلاسیکی کوردی سلێمانیی (بێخود – مەلا مەحموود) لە کۆچیدا بە چوار بەند شیعر لاواندوویەتیەوە کە بۆ مێژوو دەینووسمەوە (٦):

ب – ١

دیسان لە ئێمە قاپییەکەی غەم کرایەوە

دەرگای تەڕەب لە عالەمی دلّ داخرایەوە

دیسان جگەر کرا بە قەنارەی موشەققەتا

یەعنی دوکانی چەرخی جگەرچیی کرایەوە

دیســـان بـــرینی کــۆنی غـــەمی ئێمـــە هاتـــە ســـویٚ

جـــامی فـــەرەح بـــە بـــەردی حـــەوادیس شـــکایەوە

دیسان دوو چاوی سووری وەتـەن بوو بـە گۆمی خوێن

فرمێســـــک وەك فـــــوارە لـــــە دڵ هەڵقوڵایـــــەوە

دیســـان لیـــوای عـــەزا، لـــە لیـــواو ناحیـــە و قـــەزا " ١ "

بـــۆ کـــوردی قـــوڕ بەســـەر بەمەســـەل هەڵکرایـــەوە

ئەســـتێرەییێکی بـــورجی حوقـــووقی هـــەبوو وەتـــەن

ئیمشـــەو لـــەپڕ کشـــاو و بـــەجاریٚ کوژایـــەوە

داخـــی غـــەمی فیراقـــی کـــە دانـــا لەســـەر جگـــەر

زامـــــی هـــــەزار ســـــاڵەیی دڵ وا کولایـــــەوە

گریـــاو وتـــی وەتـــەن جگـــەری مـــن بڕایـــەوە

شـــەوقی چـــرایی مەجلیســـی غـــیرەت کوژایـــەوە!

ب — ٢

ئـــەی چـــەرخی بـــەد موعامەلـــە تاکـــەی خـــەتا ئەکـــەی؟

ئـــەم کـــوردە بـــیٚ کەســـانە بەغـــەم ئاشـــنا ئەکـــەی؟

دەغڵـــی وجـــوودی ئێمـــە هەتاکـــەی ئەکـــەی بـــە ئـــارد

خـــەرمانی عـــومری ئێمـــە هەتاکـــەی بـــەبا ئەکـــەی؟

جـــەڕڕاحیی و کەچـــیی ئـــەکوژیی عالـــەمیٚ بەغـــەدر

گۆیـــا بـــرینی کۆنـــەو و نوێمـــان دەوا ئەکـــەی؟

مەعشـــووق ئەکـــەی بـــە دوشمـــنی عاشـــق وەك ڕەقیـــب

بـــاوك لـــە کـــوڕ ئەکـــەیت و، بـــرا بـــیٚ بـــرا ئەکـــەی؟

کـــوردی فـــەقیر ئـــەبیٚ چ گونـــاحێکی کـــرد بـــیٚ

هەر لەحزەیێ بەسەر ئەلەمێ موبتەلا ئەکەی؟

(عەبدولکەریم) کە دوێنێ لەسەر تەختی (ئینفیراد)

حاکم بوو، ئەمڕۆ مەسنەدی داری فەنا ئەکەی؟ " ٢ "

ئەم دایکی کوردی قوڕبەسەرەت خستە تەعزییە

ئەولادەکانی چونکە دووچاری بەلا ئەکەی!

ئەگریی و ئەڵێ وەتەن جگەری من بڕایەوە

یاران چرایی بەزمی حومییەت کوژایەوە! " ٣ "

" ١ ". لیوای عەزا: ئالایی پرسە!

" ٢ ". واتە: حاکمی مونفەرید بووە!

" ٣ ". حەمییەت: غیرەت

ب - ٣

ئەی خاکی تیرەدڵ هەیە گەر زەڕڕەیێ حەیات

ڕۆحت ئەکەیتە خادیمی سەرچاوەکەی حەیات

زوڵمت نەدیدە چونکە گەییشتی بە ئاوی خزر

تۆ نامریت و عالەم ئەکا یێك بە یێك وەفات " ٤ "

ئەو حاکمەی کە مەرکەزی قانوون بوو سنگی ئەو

ڕاجیع بە تۆیە قوڕبەسەر ئەهلی موراجەعات

ئەو حاکمەی کە عەینی وەفا بوو ، حوقووقی مەحز

تەرکی سەریری مەعدەلەتی کرد و هاتە لات!

تۆش توخودا وەرە وەك تێ گەییوەکانی کورد

تەقسیر مەکە لە خزمەتی ئەی ڕۆحەکەم فیدات!

چەند ئەهلی غەدر و زاڵمی بێ دینیی کرد ئەسیر

چـەند بـێ گونـاحی دا لـە حەپسـخانەدا نـەجات
زاتـێ کـەوا لـە ماتـەمی ئـەودا بـێ ئـەهلی فـەزڵ
چونکی لە زاییعاتی وەتەن بوو لە زاییعات " ٥ "
ئـەگریی و ئـەڵێ وەتـەن جگـەری مـن بڕایـەوە
شـوعلەی چـرایی مەجلیسـی عیرفـان کوژایـەوە !

" ٤ ". ئیشارەتە بەوە کە خدری زیندە ئاوی حەیاتی خواردووەتەوە بۆییێکا نامرێ.
" ٥ ". واتە: نیشتیمان بەهۆی فەوتانیەوە فەوتا.

ب - ٤

ئـەی بولبـولی گـوڵی وەتـەن، ئـەی باغـەوانی کـورد
ئـەی باعیسـی نیمـایی درەخـتی ژیـانی کـورد
ئـەی واسـیتەی تـەرەققیی میللـەت بـەماڵ و ڕۆح
سـەردەفتەری جـەمیعی فیـداکارانی کـورد
زەحمـەت کـە خـۆش ببێتـەوە تـا ڕۆژی ڕەسـتخێز
داغـی غـەمت لـە جگـەر سـەروەرانی کـورد ! " ٦ "
بـۆ غـیرەت و وەفـاو و حوقووقـت لـە ماتـەمان
گـەورە و پچـووکی میللـەت و پـیر و جـەوانی کـورد
ئـەوراقی سـەبری ئێمـە بـەجارێ دڕیـت درێـغ
ڕۆیـی بـەهاری عـەیش و پـەیابوو خـەزانی کـورد
تـا مـوڵکی ئـاوەدانی بـەقا بـوو بـە مـەنزڵت
وێرانەکـەی عـەدەم بووەتـە جـێ و مـەکانی کـورد
تـابووتی تـۆی کـە دیـی وەتـەن ئـەمڕۆ بەچاوی خـۆی

پشـتی شـکا کـە عەشـرەتی سـاحێب نیشـانی کـورد
گریـــاو وتـــی وەتـــەن: جگـــەری مـــن برایـــەوە
ئیمشـــەو ئەلـــەکتریکی شـــەوی مـــن کوژایـــەوە!

"تەواو"

"٦". رەستخێز: راپەرین. مەبەست رۆژی قیامەتە.

**پاشکۆ:- ١**

"وێنەی گوتاری عەبدولکەریم سلێمانیی"

هەر من بم و کەسی تر نەبیّ!

دەردێك، عیللەتێك کە تووشی ئێمە بووە ئەسبابی زۆرە. سەبەبی ئەووەڵ وەك لە نوسخەی ئەووەڵا عەرزمان کرد ، ئەساسەن ئێمە قەومێکی بیّ ئیتتیفاقین. سەبەبی بیّ ئیتتیفاقیشمان وەك هیلالی شەوی جەژن دیارە: گەورەکانمان تا ئیمرۆ بە مەعاریف ئیلتیفاتیان نەبووە!

ئەوان بۆخۆیان بەجیا مەسلەکیان ئیجاد کردووە. ئەو مەسلەکە بە زاهیر ئەگەرچیی لەگەڵ ئامالی خۆیا بە موافیقی دەزانیّ، فەقەت بیلنەتیجە سەبەبی ئیزمیحلالی خۆی و قەومی کوردە.

ئەم مەسلەکە عیبارەتە لە دوو کەلیمە ، (هەر من بم و کەسی تر نەبیّ!). لەبەر خاتری ئەمە کە کەسی تر نەبیّ، بە ئەنواعی حیلە و دەسیسە، تەشەببوس دەکرێت. مەسەلەن نامووس هەتك دەکا، نوفووس قەتڵ دەکا، ماڵان تاڵان دەکا. هەر ئەو شەخسە بەتەنیا موتەزەریر نابیّ، بەڵکە ئەو قەومە، ئەو قەبیلە کە ئەو لە ناویایە ، سەراپا بە پریشکی ئاگری ئەو دەسووتیّ، تار و مار دەبیّ، مەحوو نابوود دەبیّ!

نیهایەت ئەو زاڵمە پایەدار نابێ، چونکە قانوونی ئیجتیماعیی، موحیت، حاڵەتی ڕووحییەی ئەو قەومە موساعیید نییە بۆ ئەو زوڵمە.

ئەگەر لەباتیی ئەم مەسلەکە، مەسلەکی (منیش بم و تۆش ببە!) تەعقیب بکا، هەموو عالەم شك نییە کە لە ئەو موستەفید دەبێ! قەومێك کە حەز بە تەرەققیی یێکتر بکەن و موتتەفیق بن، بێ شوبهە نائیلی هەموو مەرامی خۆی دەبێ. ئەگەر حەسوود و بێ ئیتتیفاق بن، زوو بە زوو زەوالی دەبێ!

عەجەبا ئەساسی (هەر من بم و کەسی تر نەبێ!) چییە؟

بەندە لام وەهایە کە موختەلیف فیهی نییە، موتتەفیق عەلیهی ئەساسی جەهالەتە، بەڵێ جەهالەتە.

جەهالەت دەردێکی بێ ئامانە، خودا تووشی دوشمنی کا! فەقەت دەرمانی جەهلیش زۆر سەهلە ، مەعاریف! مەعاریف چەند لە تەرەققیدا بێ، میللەت ئەوەندە کامڵ دەبێ! مەعاریف چەند تەعەمموم بکا، میللەتیش بەگوێرەی ئەوە هەنگاوی تەوەسسوع دەکا! مەعاریف ببێ، میللەتیش دەبێ، بەلکە بێ ئەمسالیش دەبێ! میسالی ئەمە ئینگلیزە.. ئینگلیز ئەوەندە پڕ لە مەعاریفە کە لە سەدی دوو، پیاوی جاهیلی نییە و ئیمڕۆ کە حاکمە بەسەر کورەی ئەرزا، هەموو لەبەر عیلم و عیرفانە! مەعاریف کە نەبوو، میللەتیش نییە و ڕۆژ بە ڕۆژ لە ئینحیتاتایە وەك ئێران، وەك غەیری ئێران.

ئێران ئیسلامن ، لەبەر دەردی بێ مەعاریفی ڕۆژی ئیقباڵی هەر لە ئاوا بوونایە، قەت ئەمەلی هیلالی بۆ تەسەووڕ ناکرێت!

مەعاریف بۆ تەقوییەی دین ، وەك مووسا، یەدی بەیزای هەیە! قەومێك کە عالیم بێ بە ئیلقای ئەم و ئەو (ضاڵ – گومڕاه) نابێ!

پڕۆتستان کە گاوورن، هەموو ڕۆژێ ڕیسالەیێ دەردەکا. بە ئایەتی (قران) ئیسباتی نوبووەتی عیسا دەکا!

بەڵێ ئێمە تەسدیقی نوبووەتی عیسا دەکەین چونکە ئیسلامین ، حاجەت بەم نەشریاتە چییە، ها؟؟ ئەم نەشرییاتە بۆ نوبووەت نییە، بۆ ئەمەیە کە عیسا بکەن بە خودا، خەڵقیی ئیقناع بکەن کە عیسا خودایە ! !

قەومێك کە جاهیل بوو بەم ئیلقائاتە ئەڵبەتە گومڕاه دەبێ.. عەشائیری ئەتراقی بەغدا سێ ساڵ لەمەوپێش هەموو سوننی ئەلمزهەب بوون، ئیمڕۆ هەموویان یا شیعەیە یا وەهابییە. ئەگەر وا لە خۆمان غافڵ بین، ئیشمان خراپە. خودا ئیسلاحی حاڵمان بکا !/ تەواو

سلێمانیی
عەبدولکەریم

## تەماشاکراوەکان


(١). ئەلعەززاوی — ئەلمەحامیی عەباس — تەئریخ ئەلعیراق بەینە ئیحتیلالەین / تاریخ العراق بین احتلالین، ج ٨، (بەیرووت ١٩٥٦).

(٢). بوز ئارسەلان: محەممەد ئەمین " ژین — جلد ١ " ، (ستۆکهۆڵم ١٩٨٥).

(٣). بێخود: مەلا مەحموود موفتی " دیوان بێخود — محەممەدی مەلا کەریم " ، (بەغدا: ١٩٧٠).

(٤). خەزنەدار: جەمال — ڕۆژی کورد ، ١٩١٣ (بەغدا ١٩٨١).

(٥). حیلمیی: ڕەفیق — یاداشت — ب ٢ (بەغدا ١٩٥٦).

(٦). حیلمیی: ڕەفیق — یاداشت — ب ٣ (بەغدا ١٩٥٧).

(٧). ژیان — ژ ٤٨

(٨). ژیان — ژ ٥٨

(٩). ژیان — ژ ٦٧

(١٠). ژیان — ژ ٧٨

(١١). ژین — س ١٩، ز ژ ٧٨٩، ٧ ی حوزەیران ١٩٤٥.

(١٢). مـەحوی: مـەلا محەممـەدی مـەلا عوسمـان بـەڵخیی " دیـوانی مـەحویی – مـەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس (بەغدا ١٩٧٧).

(١٣). مەلا: نەجمەددین " کەشـکۆڵی دەستنووسـی ١٩٢٧ – ١٩٣٨ " فۆتۆکۆپیی کـراوی عەبدوڕڕەقیب یووسف – سلێمانیی.

(١٤). شێخ ساڵح ، نووریی " دیـوانی شـێخ نـووریی – ئـازاد عەبدولواحیـد " ج ٢. (بەغـدا ١٩٨٩).

(١٥). هاوار: م. ڕەسووڵ " شێخ مەحموودی قارەمان و دەوڵەتەکەی کوردستـانی خـواروو " ب ١ ، (لەندەن ١٩٩٠).

## پەراوێز

(١) . عەبباس عەززاویی لە لاپەڕە ١٧٣ دا دەڵێت ، حاجیی مەلا سەعید کەرکووکیی وەك نوێنـەری سـلێمانیی لـە پارلـەمانی عوسمانییـدا خـۆی نوانـدووە. هـەروەها ئەنـدامی کۆمەڵـەی یێکیەتی و پێشکەوتن – ئیتتیحاد و تەرەققیی – بووە.

(٢) . دیمانـەم لـە ١٨ / ٣ / ١٩٩٣ – سـلێمانیی لەگـەڵ قـادری حـاجی مـەلا سـەعید کەرکووکیی، دیمانەیێکی دەم و دوویی بوو. خۆیشی لە ٢٢ / ٥ / ١٩٩٤ دا مرد و هیـوام نەهاتـە دی وێنەیێکی عەبدولکەریمی مامیم دەستگیر بکات. هەروەها غەفووری برایشی کە چەند جـارێ دیدەنیم کرد – ئەویش لە ١٩٩٤ دا مرد – بە دەنگمەوە نەهات!

(٣) . پـێم وەهـا نەجمـەددین مـەلا هەڵـەی کردبـێ و مەبەسـتی (کۆمـەڵی هاریکـاریی و پێشکەوتنی کورد – / کورد تەعاون و تەرەققی) بێ!

(٤) . کەشکۆڵەکەی نەجمەددین مەلا، بە هەڵەوە شیعرێکی پیرەمێـردی خسـتووەتە پـاڵ عەبدولکـەریم کـە – بـێ ئیمـزا – لـە (ژیانـەوە – س ١، ژ ٣٤، ١٥ موحـەڕڕەم ١٣٣٤، پێنجشـەممە ٦ ی ئاگۆستۆسـی ١٩٢٥) دا بـڵاووە و (پیرەمێـردی نـەمر – محەممـەد ڕەسـووڵ هاوار، س ١٩٧٠، ل ٧٠) ناتەواو بڵاوی کردووەتەوە و سەرەتاکەی ئەمەیە:

**لەگوێم دێ دەنگی لایلایەیی وەتەن دایکی جگەر سووتاو**
**دەرێــژێنێ بەســەر وێرانەکــەی خوێناویــا، خوێنــاو**
**هتد...**

جێگەی گوتنە ئەم شیعرە پلارە لە حەفیدزادە شێخ مەحموود!

(٥) . ئەم دوو تاکە لە قەسیدەیێکدا هاتووە کە (مەحویی) بەسەر یاردا هەڵی داوە. هەڵبەت دەشێ دوو تاکەکە لە سەرەتادا بەسەر ئەودا بێژرابێ بەتایبەتیی کە نەجمەددین مەلا دەبێژێت " عەبدولکەریم خۆی جوان بووە و کەواییکی سەوزی بەری جوانتری کردبوو! " کەشکۆڵەکەی — ل ٢٨٣ — ٢٨٤.

(٦) . لە (دیوانی شێخ نووری) دا ئەم قەسیدەیە بە ئاکاری ئەم شاعیرە نیشان دراوە کە کەمێ وشەی جودایە ... بنۆرە: ل ١٤٥ — ١٤٦. جێگەی خۆییێتی بڵێم، پرسم کردووە بۆ پێوەندیی کۆمەڵایەتی عەبدولکەریم لە سلێمانییدا و بۆم دەرکەوتووە کە شێخ نووریی شێخ ساڵح یێکێ بووە لە هەرە هاوەڵە نزیکەکانی و لە ئاهەنگ و بەزمدا هاودەم بوون!

(٧) . بەدەستکاریی ڕینووسەوە!

**تێبینیی:**

١— دوای گەڕانێکی زۆر و بەڕێکەوت ئەم (ئیمزایەی داوەری مونفەریدی سلێمانیی — عەبدولکەریم) م لە دەفتەری حاڵنامەی ڕەسمیی کۆچ کردوو کەریم بەگی حەمەد بەگی قادر پاشا دۆزییەوە کە ڕێکەوتی ساڵی ١٩٢٧ ەو ئەو هەڵەش ئەم زاتە فەرمانبەری هەمان دادگە بووە!

٢— ر = رۆمیی (ساڵی دارایی عوسمانیی)

ز = زایینیی (ساڵی عیسایی)

٢١ / ٩ / ١٩٩٣. سلێمانیی

**پاشکۆ - ٢**

گۆڤاری (نڤار) جیٚگەی ستایشه کە - لە هەلێکدا باری تەندروستیم گران و لەسەر سەفەر بووم - نووسراوی سدیق سالَحی خستە بەرچاوم و سەرپشکی وەلاٚم دانەوەی کردم، بەتایبەتی کە لە دوولاوە مافی خۆمە.. لەلاییٚکەوە چونکە من (عەبدولکەریم سلیٚمانی) م بە (کەریم بەگی حاجی ئەولاٚی حەمە کەرکووکی / خەلَکی سلیٚمانی) ئاشنا کردووە و لە ڕۆژنامەی (کوردستانی نویٚ) دا باسیم بلاٚوکردووەتەوە.. لەلاییٚکی دیەوە چونکە نیٚوبراو، هاتووە ئەو (عەبدولکەریم سلیٚمانی) یەی بە (کەریم ڕۆستەم - کەریم شالووم) لە قەلَەم داوە !! من چۆن خۆمو ئەویش بە ئازاد دەزانم لە بیرورِا دەربڕیندا، باوەڕم بەهیٚزە کە لیٚکۆلَینەوەی زانستیی دەستوور و ڕیٚ و شویٚنی خۆی هەیە و زۆرە ملیٚ و گومانی بیٚ بنچینەو قسەی هەلَبەستراو پەسەند ناکات.

من نامەویٚت خویٚندەوار بە قسەی زۆرەوە خەریك بکەم و بڕوام هەر بڕوای جارانە (عەبدولکەریم سلیٚمانی) ی هەر ئەوەیە کە ئاشنام کردووە و ئەمەش هیٚندی باری سەرنجمە دوا بەدوای خویٚندنەوەی نووسینەکەی سدیق سالَح:

بیٚکەم: زۆرم پیٚ سەیرە مرۆڤ بۆ سەپاندنی بیر و ڕای خۆی کەللە ڕەقیی بنویٚنیٚ و بەزۆر هەموو نووسراویٚکی کۆن و بیرورِای کەسانی شارەزا و دنیا دیدە و نووسەری دیار پیٚ شیٚل بکات و بە هیچییان نەژمیٚریٚت ...

بۆ ڕاستیش تەماشا بکەن س. سالَح چۆن بیرورِای هەیە بەرامبەر نووسەر و کەلەپوورناسی کۆچ کردوو نەجمەدین مەلا، هەروەها بەرامبەر نووسەری زانا و دنیادیدە و کۆنە ئەفسەری بەنیٚوبانگی عوسمانیی و عیٚراقیی تۆفیق وەهبی و نووسەر و شاعیری ناسراو محەممەد ڕەسوولٚ هاوار دەنویٚنیٚ!

نیٚوبراو بەرامبەر نەجمەدین مەلا دەلَیٚت (هیچ بەدووری نازانم هەر بە هەلَە و لەبەر لیٚك چوونی ناو و زیاتر ناسراویی عەبدولکەریمی حاجی عەبدالله، ئەمی کردبیٚ بە

خاوەنی ڕۆژی کورد ، پاشان – نەجمەدین مەلا – ئەم زانیارییەی لە کوێ و لە کێ وەرگرتووە؟ ئەوە هەر بۆچوونێکی تایبەتی بێ بەڵگەی خۆییێتی! ! !)

نێوبراو بەرامبەر م. ر. هاوار و تۆفیق وەهبیش دەڵێت: (بەپێی گێڕانەوەکە نازانێ کەریم بەگ کێیە! ! بۆیە پێ دەچێ تۆفیق وەهبی مەبەستی ئەم کەریم بەگەیان – کەریم ڕۆستەم – بووبێ و هاوار بە هەڵە هێنابێتەوە! !).

–گۆڤاری ، نڤار – س ١، ژ ٣، پاییزی ١٩٩٨ / سلێمانیی

**تێبینی**

وەك بیستوومە س. ساڵح لەژمارەییێکی (کوردستانی نوێ)دا پەشیمان بووەتەوە کە هەواڵی راستی (عەبدولکەریم سلێمانیی) خاوەند گۆڤاری بۆ دەرکەوتووە. هەروەها گۆیا (داوای لێ بووردنی لەمن ئەو زاتە بەڕێزانە کردووە! !).

## ٢. مستەفا شەوقیی

### پێشەکییەکی پێویست!

مومتاز حەیدەریی لە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نویێ - ژ ٨٣، س ١٩٨١، بەغداد) دا و چاپ کراوی (مستەفا شەوقی و پەیژە - س ١٩٨٥) دا، بە ئەو ڕۆژنامەنووسە و پەیژەوە خەریك بووە و وەك مەتنەکانی پەیژەی چاپ کردووەتەوە و کەڵکی گەیاندووە، دەستی بۆ ناسینەوەی ڕۆژنامەنووسەکەش بردووە، بەڵام بەنیوە چڵیی لیێی گەڕاوە و ژیننامەی پێ ساخ نەکراوەتەوە کە دەبوو کۆششی بۆ بکردایە، بەتایبەتیی چونکە گومان لە نێوەکەی دەکرا!

من بەنێونیشانی " دوو مستەفا شەوقی " یەوە لە گۆڤاری (کاروان - س ٤، ژ ٤١ - ٤٢ ی شوباتی ١٩٨٦، هەولێر) دا، دوای ئەو ڕۆژنامەنووسە کەوتم و بە بەڵگەوە ئاشنام کرد! لەلاییێکی دیەوە - بە بەڵگەوە - دووهەمەکەشم لە ئەو جودا کردەوە کە یێکەم خەڵکی سلێمانیی و (ئاغا زادە) و دووهەم مەهابادیی و (قازیی زادە) بووە.{١} ئەمە کاکڵەی ژینی ئەو ڕۆژنامەنووسەیە..

### مستەفا شەوقی

مستەفا شەوقیی{٢} کوڕی ڕەمەزان ئاغایە{٣}. دایکی و بابی خەڵکی بازێڕی سلێمانین. (٨/-). لە ساڵی ١٨٨٩ ز. دا لە بەغداد دا لە دایك بووە. (١٢ / ل -) {٤}. هەشت ساڵان بووە لە بازێڕێکی کوردستانی باشوور - عێراق- دا ژیاوەو{٥} ئیدی بەهۆی فەرمانی بابیەوە کە ئەفسەری عوسمانیی بووە بەجێی هێشتووە. بە ئەم ڕۆشناییە دەبێت هەتا ئەو تەمەنەی لە فێرگەیێکی ئایینیدا یان لە قوتابخانەیێکی سەرەتایی عوسمانییدا خوێندوییێتیو دواتر درێژەی پێ داوە و پێشکەوتووە تا چووەتە (مەکتەبی حەربییەی ئەستەنبووڵ).{٦} ولەساڵی١٩١٦دا بووە بە ئەفسەر - مولازیمی دووهەم - و دیاریشە تێکەڵی جەنگی گێتیی یێکەمیش بووە! (١٢ / ل -).

بەڵگەی دیار هەیە کە دوای بڕانەوەی جەنگ و لە ساڵی ١٩١٩ دا هاتووەتەوە بەغداد بۆ دیدەنیی کەس و کاری و وێ دەچێ جارێکی دی گەڕابێتەوە بۆ ئەستەنبووڵ. {٧}.

بەڕۆشنایی بیرەوەریی ڕەفیق حیلمیی لە حوزەیرانی ١٩٢٣ دا – مستەفا شەوقیی خەریکی گەڕانەوە بووە بۆ عێراق. (٦/ل١٦١). گەڕاوەتەوە و لە ٢١ ی حوزەیرانی ١٩٢٤ دا و بە فەرمانێکی پاشایانە – بە پلەی جارانیەوە – لە سوپای عێراقدا وەرگیراوە و لە ١٩٢٤/٩/١٥ دا نێویشی دەرچووە. (١٢/ل –). زۆری نەخایاندووە هەر بە فەرمانی پاشایانە لە ٤ ی تەشرینی یێکەمی ١٩٢٥ دا ، خانەنشین کراوە. (١٣ / ل –). لەگەڵ بووژاندنەوەی ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان – س ١، ژ١٤– ١٩٢٦/١/١،٢٨) وەك نووسەرێکی دەرکەوتووە، بەڵام لە (ژ–١٤–١/٣ی نیسانی ١٩٢٦) دا نێوی دیارنەماوە. وێ دەچێ هەر لە ئەو ماوەیەدا لاوەکیانە خەریکی گوتنەوەی وانەی زمانی کوردیی، تورکیی، فارسیی بووبێ بە خەڵك (١١/ ل –). {٨}

دوای ڕاگیرانی ئەو ڕۆژنامەیە، وێ دەچێ –لەبەغداددا– خۆی هەڵپەی بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیێ کردبێ تا سەرئەنجام لە ٢٩ / ١١ / ١٩٢٦ دا خۆی مۆڵەتی دەرکردنی بڵاوکراوە –شێوە گۆڤار–ی (پەیژە– س ١٩٢٧) ی ئەدەبیی، کۆمەڵایەتیی وەرگرتووە و تاکە ژمارەیێکی پێ دەرکراوە. (٩ / ل ٥). {٩}.

باسی بەڵگەدار هەیە لە ١٩٢٧/٧/١٠ دا بووە بە سەرۆکی کۆمەڵی سیاسیی نهێنیی (پشتیوان) بووە لە بەغداد دا (٧/ل٣٠). هەروەها بەڵگەی ڕەسمیانەی ئینگلیزیی ساڵی ١٩٢٨ بەدەستەوە هەیە کە سکرتێری کۆمیتەی نێوەندیی کۆمەڵی سیاسیی نهێنیی (خۆیبوون) بووە لە بەغداد دا. (١/ ل١٤). لە ساڵی ١٩٣١ دا ئەندامی دەستەی ڕێبەری یانەی ڕۆشنبیریی کوردانی بەغداد (یانەی سەرکەوتن) بووە ! (١٠ / ل ٤٠).

بەڕۆشنایی باسی نێو ڕۆژنامە و خزمی خۆیشی، لە ساڵی ١٩٣٦ دا خراوەتەوە سەر وەزیفەی سوپایی و لە مانگی تەشرینی یێکەمی ١٩٣٦ دا ڕێبەری سەربازگر – مودیر

تەجنید–ی هۆزەکانی بازێڕی بەسرە بووە. (٣ / ل ٤). {١٠}. دواتر بەهەمان وەزیفەوە ڕاگواستراوە بۆ بازێڕی ڕواندز و چەند ساڵێکی لێ بووە (٤ / ل ٣١) تا – بەپێی دوا هەواڵێ – لەساڵی١٩٤٢دا، بە نەخۆشییەکی کوتوپڕ هەر لە ڕواندزدا مردووەو ئەسپاردەی گۆڕستانی" گەردە گەرد" کراوە. (٥/ –). {١١}

بەپرس و ڕاوەرگرتن بۆم دەرکەوتووە ، ژنی نەهێناوە، چ دانراوێکی ئەدەبیی لێ بەجێ نەماوە. لە بنەماڵەکەیشی بەتەنێ تاکە خوشکێك – خەدیجە – ی لە خۆی گەورەتری هەبووە و نەوەی لێ کەوتووەتەوە. {١٢}

مستەفا شەوقیی ڕۆشنبیر و (ڕۆژنامەوان) بەهۆش و بیرێکی نەتەوە پەروەرانەوە لە ئەم گۆڤار و ڕۆژنامە و بلاوکراوانەدا گوتاری بلاوە: (ژیانەوە– ١٩/١١/ ١٩٢٥) و (بانگ کوردستان – ١٨و١٥/٢/١٩٢٦) و (ژیان–٢٥/ ٢/ ١٩٢٦) و (پەیژە – ١٩٢٧/٥/٢٣) و (زار کرمانجی – ژ ٢١، س ١٩٣٠). {١٣}

**پاشکۆ**

" وێنەی گوتاری مستەفا شەوقیی ڕەمەزان ئاغا ! "

" بێ نێونیشان " *

**مکن ز غصّه شکایت که در طریق طلب**

**به راحتی نه رسید انکه زحمتی نکشید "١"**

مەسئەلەی کوردستانی شیمالیی بۆ بیناغە دامەزراندنی ژیانی میللەتی کورد، دەرس و عیبرەتێکی زۆر گەورەیە. با بەدخواهانی ئەم میللەتە هەتا پێیان ئەکرێ بە هەڵەتو فێڵو درۆ و دەلەسە ئینکارێ ڕاستیی بکەن ، هیچ کەڵك ناگرێ، چونکە لەلای ئەقوامی موتەمەددینەدا میللەتی کورد لە مێژەوە ناسراوە و لێیان عەیان بووە کە ئەم میللەتە وەك میللەتەکانی تر پێ گەیبشتووە، ئەمڕۆ وا داوای حەققی خۆی ئەکا.

ئەمڕۆ جگە لە میللەتی کورد، هەموو میللەتێ بەپێی خۆی کەم و زۆر ئەم حەققەیان دەست کەوتووە و خۆبەخۆی خۆیان بیناغەیان دامەزراندووە و ڕۆژ بە ڕۆژ، هەنگاو بە هەنگاو بۆ پێشکەوتن ڕوویان گرتووە.

لەناو ئەم میللەتانەدا کەس وەك کوردان بێ ناو و پرش و بڵاو و پەرێشان نەماوە! (فەوائید قەومین عیندە قەومین مەسائیب وە مەسائیبە قەومین عیندە قەومین فەوائید!) "٢". ئەم مەسەلە کەبۆ مەنفەعەتپەرستان مەسەلێکی مەشهوورە، بەتەواویی لە ئێمەی ڕوودراوە.

جەمهوورییەتی تورکیا بۆ دەوامی نەفعی خۆی، شێخ و سەیید و مەلا و گەورەی ئەم میللەتە بێ خاوەنەی تەفنو توونا کرد، بە عالەمی ئاشکرا بە سێدارەوە هەڵیواسین و بە ناحەق کوشتنی، کە ئەم فیکرە نابوود ببێ و هەروەك جاران کورد بدۆشن و بیخۆن! فەقەت ئیتر ڕابوردو ی، کوردان لەمەودوا بە فێلێ و هەڵەت ناخەڵەتێن، خوێنی کوڕ و برا و باوکیان لە بیرناچێ! لەمەودوا منداڵی کورد بە لایلای باوك و برا کوژراو، بۆ تۆڵە بەخێو ئەکرێ، لەبەر کردگاری (ڕۆمیان) "٣" کەس لۆمەیان ناکا. مەسئەلەی کوردستانی شیمالیی کەوا ئێمە لە ڕۆژنامە و ئەم لاو ئەولا خەبەرمان زانیی، ئەمە کردگاری ئەمڕۆ و دوێنێ نییە، بیناغەی ئەم کارە چەند ساڵێ لەمەوپێش دامەزراوە. تورکیش ناتوانێ ئینکاری بکا، چونکە ئیمڕۆ لە هەموو لایێك بە نهێنیی جەمعییەتیان هەیە و بەهیچ لەونێ ناکوژێتەوە و میللەتی کورد هەتا حەققی خۆی دەست نەکەوێ ناسرەوێ!

لەمەوپێش کوردان کە تێ گەییشتن حەقیان بە ئاسانیی ناسەنرێ، لە ساڵی ١٩٢٠ م، هەموو بەجارێك قیامێکی زۆر گەورەیان ڕێکخست بوو، فەقەت ئەو عانە تورکەکان لە شەڕا تێکەڵاوبوون ، یۆنان " پۆلارلی ئەستاشیۆنیی " نیو سەعات نزیك بە (ئەنقەرە) هات بوو. کوردان پیاوەتییان ، نووان و ترسان لەناو عالەمی مەدەنییەتا تووشی تانووت

ببن، لەبەر ئەوە قیامی خۆیان دواخست و هەروەك جاران دەستیان دایە دەستی تورك، لە مەیدانی شەڕا، لە سەنگەرێکا خوێنیان بۆ ڕژانن و لەهەموو لایێکی کوردستانەوە بەنان و بەرگی خۆیان لەشکریان بۆ کرد و یارمەتییان دا تا لە مردن ڕزگاریان کردن، لەپاشا هەروەك پێشنیان فەرموویانە ، کوردان وایان لیَ قەوما: (ئەوەی پێم ئەکرد خێرە، لێم بوو بە گورگ و شێرە!). ئەمما کوردان بەتەواویی ئەولادی جەنگیزیان ناسیی و چاك بڕوایان کرد کە: (گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕویَ!).

ئەو حەققەی کە کوردان داوایان کرد بوو، شتێکی زۆر گەورە نەبوو، داوای تاج و تەختیان لیَ نەکرد بوون، بۆ پێشکەوتن و سەربەرزیی میللەتی خۆیان داوای ئیدارەیێکی تایبەتکاریان کرد بوو کە لەژێر باری جەهالەتا دەرچن! لەپاش ئەم هەموو ئەتکو تەفنو توونای کوردان، تورك تەمایەتی دیسان بە فێلَ و فیشالَ، کردگاری خۆی بپۆشیَ، فەقەت لەمەودوا کەڵك ناگریَ!

ئەمڕۆ وا لە عوسبەتولئومەمەوە، ئایا لە پاریسەوە جەنابی جەنەرالَ (لایدۆنێر) تەشریفی هاتووەتە عێراق بۆ تەحقیقی وەقعەی "گۆیان" "٤" کە ناوچاوەی کوردستانە. جەنابی ژەنەرالَ بەنامی بەشەرییەتەوە ئاوڕیَ بداتە کردگاری تورکان ، ئاخۆ عەسری مەدەنییەت ئەم باری جەهل و زوڵمە ڕەوا ئیَبینیَ کە هەروا لەسەر شانی میللەتی کورد بیَ؟

م. شەوقیی

"تەواو".

* ژیانەوە – س٢، ژ٤٩، پێنجشەممە١٩٢٥/١١/١٩ (یێکەم گوتاری دیاری لە ڕۆژنامەنووسیی کوردستانی باشووردا / بەدەستکاریی ڕێنووسیەوە!)

"١". واتە: لە دەست توند و تیژیی ڕێگای خواستت مەناڵە

چونکە ئاسان نابیَ هەتا بۆی هیلاك نەبیت!

"٢". واتە: قازانجی نەتەوەیێ لەلای نەتەوەییێکی دی کارەساتە و کارەساتی نەتەوەیێ لەلای ییێکیێکی دی قازانجە / فوائید قوم عند قوم مصائب و مصائب قوم عند قوم فوائد !).

"٣" مەبەست تورکە !

"٤" گۆیان، هۆزێکی کوردستانی باکوورە !

## تەماشاکراوەکان


(١). ئەحمەد: در. کەمال مەزهەر " خێر و بێری راپۆرتنووسێکی کورد " ، ڕەنگین – ژ ٨٨ ، (بەغداد ١٩٩٦).

(٢). بوز ئارسەلان: محەممەد ئەمین – ژین، جلد ١ ، (ستۆکهۆلم ١٩٨٥)

(٣). پیرەمێرد – حاجیی تۆفیق ، ژیان – س ١١، ژ ٥٠٠، شەممە ٢٤ / ١٠ / ١٩٣٦.

(٤). حەیدەریی: مومتاز – مستەفا شەوقیی و پەیژە. (بەغداد ١٩٨٥)

(٥). حەیدەریی: مومتاز ، (دیمانەییێکی دوو قۆلیی – دەموو دوویی). (هەولێر ، ١٩٨٦/٤/٢٥)

(٦). حیلمیی: ڕەفیق – یاداشت، بەشی سێیەم، (بەغداد ١٩٩٢).

(٧). خواجە: ئەحمەد – چیم دی ، ج ٣ ، (سلێمانیی ١٩٧٢).

(٨). – گل: عەبدولقادر محیەددین " خوشکەزازای مستەفا شەوقی " (دیمانەییێکی دوو قۆلیی – دەم و دوویی). (سلێمانیی: ٧ / ١١ / ١٩٨٥)

(٩). شەوقیی / مستەفا – پەیژە. (بەغداد ١٩٢٧).

(١٠). فەتاح: شاکیر – خەباتی ڕۆشنبیران ، (بەغدا ١٩٨٢)


## گۆڤار و بلاوکراوە و ڕۆژنامە :


(١١). دیاریی کوردستان – ب ١، ژ ١٣– ١٤ ، ٥ / ٣ / ١٩٢٥

(١٢). ئەلوەقاییع ئەلعیراقییە / الواقع العراقیە – س ٢، ژ ١٩٢ ، ١٠ / ٧ / ١٩٢٤.

(١٣). ئەلوەقاییع العیراقییە – س، ژ ٣٥، ٤ / ١٠ / ١٩٢٥

## پەراوێز

{١}. مستەفا شەوقیی قازیی زادە لەتیف (دکتۆر)، ئەندامی کۆمەڵی خوێندکارانی کورد – هێڤی بووە. لە ساڵی یێکەمی گۆڤاری (ژین: ١٩١٨ – ١٩١٩ ز) دا کۆمەڵێ گوتار و شیعری بەنێو و ئیمزای (قازی زادە – مستەفا شەوقیی، م. شەوقیی) ەوە بڵاوکردووەتەوە! بنۆڕە بوز ئارسەلان محەممەد ئەمین.

جێگەی گوتنە، گۆڤاری (سروە – ٤٦، ل ٢١ / ئەحمەدی شەریفی) و ڕۆژنامەی (ئاویەر – ژ ٤٣، نیوەی ئەووەڵی بەفرانبار ١٣٧٧، ل١١/ د. مستەفا شەوقیی خەڵکی کوێیە، مەهاباد یان سلێمانیی)، هەروەها د. مارف خەزنەدار لە کتێبی (لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردیەوە) هێندێ هەواڵی ناتەواویان لەبارەیەوە نووسیوە و (سەرچاوەکانی یێکەم و دووەم بە مەزەندە نووسیویانە گۆیا لە ١٢٩٢ ك / ١٩١٣ ز میرزاییێکی مێردمنداڵ بووە و لەگەڵ بابی لە مووسڵەوە ڕوویان کردووەتە حەج. هەروەها نووسیویانە گۆیا ڕەنگبێ لە ١٢٧٩ ك / ١٩٠٠ ز. دا لە دایك بووبێ. هەروەها هەرسێ سەرچاوە دەڵێن گۆیا ساڵی ١٣٠٨ ك / ١٩٢٩ ز چووەتەوە بۆ مەهاباد بۆ کاری پزیشکیی و دوایی پۆلیسی ڕەزا شا پێی زانیوە و ڕایکردووە و هاتووەتەوە بۆ ئەستەنبووڵ و لە (ئەسکی شار) ی تورکیادا ژیاوە و مردووە! کەسیشیان بەڕاستیی ساڵی مردنیان نەنووسیوە!

ئەز ئەم هەواڵانە بەناتەواو دەزانم و بڕوام هەیە هەموو بێ بەڵگەن!

(وێنەی مستەفا شەوقی قازیی زادە لەتیف ، لە ڕۆژنامەی ئاویەرەوە وەرمگرتووە!).

{٢} نێوی مستەفا شەوقیی و ئیمزای (م. شەوقی) ی لە ڕۆژنامەنووسیی تۆمارەکانی دەوڵەتدا ئەوەها هاتووە!

{٣}. عەبدولقادر محیەددین دگەل گێڕایەوە گۆیا ، بابی مستەفا شەوقیی " بینباشی ژاندارمی عوسمانی " بووە! سەرچاوەییێکی دیم دەستگیر نەبووە ئەم فەرمانەی ساخ بکاتەوە!!

{٤}. بەقسەی خۆی لە (پەیژە) دا ساڵی لە دایك بوونی دەکاتە ١٨٩١ ز، بەڵام من ساڵی بەڵگەکەم پەسەند کرد!

{٥}. خـۆی نێـوی شـوێنەکەی – لەپەیـڕەدا – نـەهێناوە، بـەڵام وێ دەچـێ (کۆیـە) و دەورووبەرێکی نزیکی بووبێ! (بنۆڕە بیرەوەریی دگل).

{٦}. بەڕۆشنایی بارەکانی خوێندنی ئەوێ سەردەمێ و ئاخاوتنی (دگل).

{٧}. بەڕۆشنایی نووسینێکی عەرەبیی خۆی لەسەر پشتی (وێنە)، فۆتـۆگرافیی کـە – لـە ئێرەدا بڵاوە – پێشکەشی دایکـی کـردووە و مێـژووی: ٥ ی ڕەبیعولئـاخیری ١٣٣٨، بەغـداد / ٢٨ / ١٢ / ١٩١٩ ی لێ داوە!

{٨}. ئاگادارییەکی عەرەبیی لەمەڕ ئـەو باسـە و بـەنێوی (مسـتەفا شـەوقی – موحـەریری بانگی کوردستان)!

{٩}. خۆی لـە پـەراوێزدا نووسیوییێتی، (بـۆ چـاپ کـردن و بڵاوکردنـەوەی ئـەم کتێبـە لـە وەزارەتی جەلیلەی داخیلییە داوای ئیزنم کردبوو، لەسەر فەرموودەی ئـەوان ٢٩ / ١١ / ١٩٢٦، " ٥٨٧ " ژمارە و بەپێی مادده " ٤ " ی قانوون لە چاپ دراوە! م. ش).

{١٠}. پیرەمێرد لە ڕۆژنامەکەیدا ئەمەی لێ نووسیوە: (کوڕێکی دڵسۆزی قەوم و خاوەنـدی هونەر و زانستیمان چەنێك لە بەغداد دا خـەریکی خـەڵك فێـری خوێنـدن کـردن بـوو. ئێسـتە وا دەرئەکەوێ لە وەزیفەیان ئاڵاندووەتەوە زابـتی تەجنیـدی عەشـائیری بەسرەیە. دوو کاغـەزمان لێ وەرگرت. یێکێکیان داوای " ژیان " ی کردووە.. زاتەن " ژیان " خـۆی عاشـقی ئـەو نەوعـە زاتەیە، بۆمان نارد. ئەم جارەیش لە ئاساری پایەدار و بەکاری ئوسـتادی نامـدار سـەیید ئـەمین زەکیی، دوو جلدی " کورد و کوردستان " ی بۆ " زانستیی " ناردووە.

سەیرکەن، چەند بەهیممەتە، خۆی نایەتە ئێرە دەرس بلێتەوە، ئەو شا ئەسـەرەی لـەباتیی خۆی ناردووە، ئافەرین مستەفا شەوقیی کە شەوقی سادەتتان هەر لە زیادایە! / تەواو).

{١١}. کـاك مومتـاز گێڕایـەوە ، مسـتەفا شـەوقیی لـە سـاڵی ١٩٤٢ دا – لـە ڕوانـدزدا – وێنەییێکی خۆی پێشکەشی شاکیر موجریم کردووە و هەر لە ئەو ساڵەشدا خۆی مردووە!

{١٢}. کاکڵەی ئاخاوتنەکانی عەبدولقادر محیەددین دگل ئەمەیە ، (باپیرم حـاجیی ئـەمین، لە کۆیەدا سەرباز بووە، لەلای ڕەمەزان ئاغا کاری کردووە. ئاغا خەدیجەی تاقە کیژی خۆی لـێ مارە دەکات. دوایی باپیرم کە لە سەربازیی دەبێتەوە، دەگەڕێتەوە و خەدیجـەی نـەنکم لەگـەڵ خۆی دەهێنێ بۆ سلێمانیی.. نەنکم بە تەمەن لە باپیرم پچووکتر دەبێ و هەر تاقە کـوڕێکی لـێ

دەبێ کە – بابمە – محیەددین دگلە و ئیدی هەڵناکەن و لەیێك جودا دەبنەوە و بابم لەلای باپیرم دەمێنێتەوە و نەنکیشم دەچێتەوە ماڵە بابی لە بەغداددا. لە ئەوێدا شوویێکی دی دەکاتەوە بە پیاوێکی عەرەب کە (شەوقی) ی نێوبووە و لە ئەمیش کورێکی دەبێ کە نێوی (جەمال) ە و لە ئەڵمانیادا دەژیی. دوای ئەوە نەنکم شوویێکی دی کردووە بە سەیید محەممەد عەبدورڕەحمانی هیندیی مودیری (بیت ئەللەنج) لە بەغداد دا. لە ئەم پیاوەش ساجیدە و ناهیدەی بووە. یێکەم کۆچی کردووە و دووهەم مامۆستای خانە نشینە و کابان فائیق وەترییە. هەر لە بەغدادە و مولاقاتمان هەیە!

... بەهۆی بەکر سیدقیی زابتی گەورەی عێراقەوە کە لەگەڵ مستەفا شەوقی ئاشنا بووە، کراوە بە زابت تەجنید. خۆی تەقاویت کردبوو، بەڵام ئەو بە ڕوتبەی ڕەئیسیی دایمەزراندەوە و ماوەیێ لە ڕواندزدا بوو.

... ژنی نەهێنا بوو. هەموو مەراقێکی هات بووە سەر نیشتیمان و قەوم پەرستیی. بە نەخۆشییەکی کوتوپڕ لە ڕواندزدا مرد و – من قوتابیی بووم – ئێمە چووین بۆ ئەوێ و هەر لە ئەوێدا ناشتمان.

... لە بەغداد دا کە دەژیا لە جادەی "دنکچییە" دا ژوورێکی هەبوو. ئەویی لەدوای بەجێ ما ١١ جانتا کەل و پەل و کتێبێکی زۆر کە هەمووی پرش و بڵاوبووەوە. هەروەها نزیکەی هەزار دینارێکیشی لێ بەجێ ما! / تەواو / عەبدولقادر محیەددین دگل لە ساڵی ١٩٩٠ دا مرد!).

{١٣}. وێنەی فۆتۆگرافی مستەفا شەوقی ڕەمەزان لە کاك جەلال محیەددین دگل وەرگیراوە!

فۆتۆکۆپیی فۆتۆگرافی مستەفا شەوقی قازیی زادە لە ڕۆژنامەی (ئاویەر) ەوە وەرگیراوە!

—— . ——

# ١٠

# جووتێ ژنە گۆرانیبێژی پێکەمی سەر قەوان

## پێشەکی

هەرچیی هونەری هەرە باڵاو جوانی بێ هاوتایە، هەمووی فەڕی خودای پاکو باڵادەستە.. بەڵام هەر خودای توانا،

بەهرەی بەخشیوە بە بەندەکانی تا ئەوانیش بەشی ژینی خۆیان، هونەر بنوێنن!

دەی ئەو بەندانە کێن کە کۆمەڵەکانی دەوروبەریان– بەتایبەتی کۆمەڵانێکی خۆپارێز و دوواکەوتوو– کراسی جۆربەجۆریان لەبەر دەکەن و کوێرانە بەهێندێ دەڵێن، (پاك) و بەهێندێ (پیس)؟

با دوور نەڕۆم و لەخۆمانەوە وێنەی هێندێ بەندە بگرین و دەمودەست بپرسین: ئایا هەر مێژوونووسێکی پایەبەرزی وەك (شەرەفخانی بەدلیسی)ی دەسەلاتدار، شەرکەر، پزیشك "نیگارکێش، مۆسیقەزان" پاك و نەمرە؟ یان هێندێ ژنە کوردی داماوی سەدەی بیستەم وەك (دایکی جەمال) و (مریەم خان)ی گۆرانیبێژ، پیس و مردوون؟

ئەز لەگەڵ ئەوپەڕی شانازیم بە (شەرەفخان)ەوە، دەڵێم: ئەگەر ئەو مێژوونووس و هونەرمەندە، نەمر بێت، ئەوە هەر مەنتیقی مێژوو هەرگیز چاوپۆشیی لەڕاستیی ناکات کە ئەوێکی میری بەدەسەلات و ئازا، لەگەڵ دوژمنەکانی توندوتیژ بووە و "کەللەسەر" یانی هەڵچنیوە!

دەی ئیدی ژنە هونەرمەندانێ کەهونەری ئاواز و دەنگی زمانی کوردیان لەسەر قەوان بەگۆرانیی تۆمار و بڵاوکردبێتەوە– کەللەسەری کەسیشیان هەڵنەچنیوە– بۆچی دەبێت بەچاوی سووك تەماشای خۆیانو نێوو یادگاریان بکرێتو بەمردوویێکی بێفەڕ بناسرێن؟

ئەز دڵنیام مێژووی کورد، هەردوولا کە زۆر و کەم فەڕ و چاکەیان نواندووە، ڕێز دەگرێت، بۆیێکا لەلای منیش هەردوولا هونەرمەندن!

بە ئەم باوەڕەوە، بەیادی فەرماییشتێکی ڕاستی فەیلەسووف فڕانسیی (ئەلبێر کامۆ Albert Camus)ەوە کەدەڵێت:(شتێ کە نەمر بێت هەر هونەرە !)، دەڵێم بەختەوەرم جووتەخوشکێکی هونەرمەند ببووژێنمەوەو هونەریان بەڕاستیی و گەلەکەم ئاشنا بکەم!

## یێکەم

## دایکی جەمال

لەبەڵگەیێکی بەرچاو کەوتوودا نێوی (بەهیجە یاقووب فەتاح)ەو لە گەڕەکەی- سلێمانیی- دا بە (بەهیجەخان) ناسراوبووە. {١}، بەڵام لەسەر قەوان بە (شیرین خانم) و پتر بە (دایکی جەمال) یش بەنێوبانگ بووە.

سەرچـــاوەیێ بەدەســتەوە نییە خانەدانو شوێنو مێژووی هاتنە دنیای یێکلایی بکاتەوە، بەڵام لەچەند کەسو بەتایبەتی لەدایکی بورهانی دراوسێ و دۆستیم بیستووە کە نێوی (فەرحە) و تەنانەت جوو، دووایی نەو موسڵمان بووە ! {٢}

لەمەڕ شوێنی لەدایبك بوونی،خۆیدەڵێت:(بەغداد)ەو خەڵکی دیش دەڵێن (هەڵەبجە) و (کۆیێ) بووە."٣". خۆی ڕادەگەیێنێت کە ساڵی ١٩١٤ز هاتووەتە دنیاوە، بەڵام دراوسێ و دۆستی، نیشتیمان عوسمان دانش دەڵێت- بەڵگەنامەی شووکردنی دیتووە- لەساڵی ١٩٠٨ دا لەدایبك بووە. شێوەی زمانی گۆرانیی گوتنی- وێڕا کە سلێمانیانەیە- پێوەی دیارە لە ڕەگەزێکی دی بووە ! {٣}.

قسەی ناسیاوەکانی، هەروەها وردبوونەوەش دەیسەلمێنن. کە لەتاق لاوییدا بەغدانشین بووە، هەروەها هاوسەری ئەندازیار و (میناس) نێوی بووە. بەباوەڕی من هەر لە ئەو هەلانەدا و تا سەرەتاکانی ساڵانی ١٩٣٠-١٩٣٣ گۆرانیبێژی سەر قەوان بووە. {٤}. بەڵگەی نووسراو تا دەمودووییش بەدەستەوە نییە کە داخۆ گۆرانیبێژێکی (تیاترۆخانەکانی بەغداد) بووبێ، بەڵام من خۆم بەدووریی نازانم! {٥}.

زۆر باوەڕم هەیە، دووای ساڵە باس کراوەکان، شووی کردبێ بە ئەفسەری کورد (حەمید سوڵتان) و ئیدی بۆ بەرەو دووا لە کۆڕی گۆرانیی و قەوان دەرکردندا دیارنەماوە! {٦}

نیشتیمان لێی دەگێڕێتەوە، دووای سێی ساڵ ژن و مێردایەتیی، بەخۆشیی و بێ تەلاق دان لە مێردەکەی جویێ بووەتەوە و منداڵیشیان لێ نەکەوتووەتەوە!. بەڕۆشنایی قسەی خۆی دیارە لە ١٩٦٢ بەدوواوە هاتووەتە سلێمانیی و نیشتەجێ بووە! {٧} هەتا مردنیشی- بە نەخۆشیی شێرپەنجەی مەمك- لە شەوی جەژنی میعراجی ڕێکەوتی ساڵی ١٩٧٨ لە خەستەخانەی مەدینەتولتوببی بەغدادا، دوو کوڕی برازای دووا مێردی، لە سلێمانییدا بەخێویان کردووە. نیشتیمان دەڵێت، لە گۆڕستانی شێخ مەعرووف لە بەغدادا نێژراوە {٨}.

## گۆرانییەکان

تاقە گەنجینەیێکی مۆسیقە و گۆرانیی کوردیی، ڕادیۆی کوردیی بەغداد بووە، بەڵام وەك سەرنجم لێداوە -لەساڵی١٩٦٦بەدوواوە- دایکی جەمال بەتەنێ گۆرانیی (هەی بەللار)ی دیار بوو!! هەڵبەت دۆزینەوەی خۆی و بەتایبەتی گۆرانییەکانی کرد و کۆشی زۆری ویست و بەخت دیار بوو کە بێ وچانو پشوو، لەهەر بازێڕو گەڕەكو کۆڕێکدا سۆراخم دەکرد تا سەر ئەنجام کۆمەڵێ هەواڵ و گۆرانییەکانم لەسەر شریت و قەوان ناسییەوە!

هەواڵی گۆرانییەکانیشی بە سێ جۆر لەبەردەستمن: {٩}

١. گۆرانیی سەر قەوانی دیار. {١٠}.

١/١. کۆمپانیای (ئۆدیۆن ODION — شیرین خانم/ دایکی جەمال). {١١}.

١/١/١. دیوی ١/ : سەوزە مەڕۆ

{ژمارەکەی چووەتەوە}

١/١/٢. دیوی /٢ : دەردێکم گرتووە

{هەروەها}

١/٢/١. دیوی/١ : ئامین و ئامین–

A ٩٠٤٢٨

١/٢/٢. دیوی/٢ : هەی بێنن بێنن–

B ٩٠٤٢٩

٣/١/٣. دیوی/١: ئەسلّیو ئەسلّی سلێمانیی

ژ: ئا. A ٣٢٩٦٣٥ ئێل. ئا. LA

٣/٢/٤: دیوی/ ٢: گوێگرن رەفیقان

ژ: بیَ. B ٣٢٩٦٣٥ ئێل. ئا.LA

٢/١. کومپانیای (بەیزافۆن BAIDAPHON/ دایکی جەمال)

٢/١/٥: دیوی/١: رۆحی شیرینم

ژ: ٠٩٢١٣٢ بیَ. B

٢/١/٦: دیوی/٢: وەتەنی من کوردستانە

ژ: ٠٩٢١٣٢ بیَ B

٢. گۆرانیی سەرقەوانی نادیار!

٢/١: خانمی سلێمانیی!

٢/٢: شارلستۆن! {١٢}

٢/٣: هەی ئاغا و ئاغا! {١٣}.

٢/٤: هەی بەللار و بەللار! {١٤}.

٢/٥: هەی گولّ هەی گولّ! {١٥}.

٣. گۆرانی — لەدەست چوو— باس کراوی خەڵك!!

١/٣: ئامینێ تاقانەی دایە!!

٢/٣: ئەمن دەکەم مەدحی شێری جیهانمان!!

٣/٣: ئەی ئاوێنەی دولبەر!!

٤/٣: چاو مەست چاو مەست!!

٥/٣: لەو ماڵە هاتە دەر!!

٦/٣: نابییە بچی نابییە!!

٧/٣: نەسرینە گوڵێ نەسرینە!!

٨/٣: وەسیەت بێ ئەگەر مردم قالە!!

## باری گۆرانیی گوتنی

نەخۆی—لەدیمانەدا—و نەسەرچاوەییێکی تەواو باوەڕ پێکراو لەمەڕ باری هەڵکەوتنی، هەروەها چۆنییێتی گۆرانیی گوتنی باسێکیان نەگێڕاوەتەوە بۆییێکا ناسینەوەی ڕاستیی تەواو، مەحاڵە!

ئەز هێندەی پێم کرا، چ بۆ ناسین و چ بۆ باری گۆرانیی گوتنی (دایکی جەمال) پرسم بە عومەر قەززاز کرد و ئەویش لە وەڵامدا گوتی:

١. من بە ڕێکەوت لەو ساڵانەدا، ١٩٢٧–١٩٢٩، بەهۆی قەوانەوە مێردەکەیم ناسیی کە نێوی میناس بوو، گوتی: ژنەکەم کوردە. ئەوکاتە کە ئێمە هەر بە دایکی جەمال دەماننناسیی تەمەنی ٢٥ ساڵێ دەبوو!

٢. لەسلێمانییدا قۆندەرەچییەك هەبوو، نێوی حەمەخان بوو.. ئەو بەستە و مەقامی بۆ هەڵدەبەست و دەینارد بۆ من. منیش دەمنارد بۆ ئەو، یان هێندێ جار خۆم دەچووم بۆ بەغداد و بۆم دەبرد و دەمدا بە مێردەکەی کە ئەویش لە ماڵەوە پراوەی پێ دەکرد و پێی لەبەر دەکرد!

## هەڵبەستەكانی گۆرانییەكانی

بەگوێ گرتن لە گۆرانییەكانی بەردەستمان و نێوهەڵدانی ون بووەكانیش، دەتوانین هەڵبەستەكان بە سێ جۆر وەربگرین:

١. هەڵبەستی فۆلكلۆریی، وەك گۆرانییەكانی: سەوزە مەرۆ، ئامین و ئامین، چاو مەست چاو مەست وانابێ،

٢. هەڵبەستی فۆلكلۆریی و دەستكاریی كراو، وەك:

١/٢. گۆرانیی..( خانمی سلێمانیی)

هەروا دەڕوا دەڵێی پۆڕە

گوارەی ئاڵتوون لەگوێی شۆڕە

ئەمان چاو كاڵ دڵ مەگۆڕە

باریكێ، تەنكێ

بەخوا زۆر جوانی

ئەمان چاوم

خانمی سلێمانیی!

٢/٢. گۆرانیی (شارلستۆن)

....................

یارم شێوەی شیرینە

داییم لە گولە بەقینە.

{پێی وتمان} توورە بە تۆ،

باوەڕتان بێ خەڵقینە.

چاو چاو ئەمان مردم،

بۆچ لەتت نەكردم،

سووتام،– دەخیلە ئەمان–

پێم بکە ڕەحمێ!

چونکە یارم بێ مەیلە،

بۆیێ دەروونم کەیلە.

سووتاوی جووتە سێوە،

جێگای سەرقژی لەیلە.

چاوی یارم جوانە،

ئەبرۆی میسلی کەمانە،

(دایکی جەمال ئەخوێنێ،

شارلستۆنە قەوانە).

چاو چاو ئەمان مردم،

بۆچ لەتت نەکردم،

سووتام– دەخیلە ئەمان –

پێم بکە ڕەحمێ!

٣. هۆنراوەی شاعیران.. وەك گۆرانیی و سروودی:

١/٣. ئەی ئاوێنەی دولبەر، شیعری (وەفایی)

٢/٣. وەسیەت بێ ئەگەر مردم قالە، شیعری (عەبدولخالق ئەسیریی).

وەرە سەر قەبرەکەم

بڵێ ئاواتەکەت پێك هات

هەڵستە بێرە دەر خاڵە.

٢/٣. وەتەنی من کوردستانە، شیعری (زێوەر).

## دەنگ و ئاوازەکانی

دایکی جەمال، دەنگێکی ناسکو خۆش، نێونجیی هەیە و توانای چڕینی بەرزی نییە، بۆیێکا گۆرانییەکانی سووکەڵەن و لەشێوەی بەستەدان. هەرگیزیش– تەنانەت لەنێو ئەو چەند یادگارانەدا بەندێ– مەقامی نەچڕیوە.

لەهێندێ گۆرانییدا– ڕەنگبێ لە سەرەتاکانییدا بووبێ– کوردییەکەی و ئەداکردنی کەم و کورتیی پێوە دیارە، بەڵام لە هێندێکی دیدا جوان و ڕەوانترە.

لەنێو گۆرانییەکاندا، سێ ئاوازی گۆرانیی، (ئەسڵی و وەسڵت سلێمانیی)، ئاوازی گۆرانییەکی عەرەبیی گۆرانیبێژی عەرەبی عێراق بەدرییە ئەنوەر (ئەسڵی و ئەسڵەك بەغدادیی/ أصلي و أصلك بغدادي) و ئاوازی گۆرانیی (وەتەنی من کوردستانە) تورکیی و ئاوازی (شارلستۆن) خۆرئاواییە.

ڕاستییەکەی گێڕانەوەی (شارلستۆن) بەتەختی مۆسیقەی خۆرهەڵاتییەوە و بەدەم ئەو وشە کوردیە فۆلکلۆرییەوە و هێندێ تێهەڵکێش و دەستکارییەوە، شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێش و ئەنتیکەیە، بەتایبەتی کە (شارلستۆن) ئاوازی مۆسیقەی دانسێکی گران و بەنێوبانگی خۆرئاوایە کە هەتا ئەوڕۆ دەنگی گەرمە.

لەلاییێکی دیەوە لەچوار گۆرانیی (سەوزە مەڕۆ، گوێگرن ڕەفیقان، هەی ئاغاو ئاغا، هەی گوڵ هەی گوڵ)دا، دەستەی پیاوانی گۆرانیی سەندنەوە– کۆرس– بەشدارنو بەجوانیی هاودەنگین، بەڵام مۆسیقە ژەنەکانیان ڕاستر دابەش بوونی مۆسیقە، جوانییەکی تایبەتیان بە گۆۆرانییەکان نەداوە، بۆیێکا هەست دەکەیت گۆرانییەکان شێوەییێکی بازرگانییان هەیە!

باسێکی گرنگیدی ئەوەیە، ئەگەر –عومەر قەززاز گوتەنیی–یێکێکی نیمچە خوێندەواری وەك حەمە خانی پێڵاو دروو، هێندی ڕستە هەڵبەستی بۆ ئامادە کردبێتو (میناس) ی مێردی یێکەمی پراوەی پێ کردبێت، هەروەها ئەگەر خۆیشی لاسایی ئاوازی

گۆرانیی عەرەبیی‌وتورکیی‌و خۆرئاوایی کردبێتەوە، ئەوە گومان نییە کە گۆرانیی چرپینی هەر ئەوهە سادەو هەرەمەکیی نەبووە، بەڵکو یێکێکی شارەزاش یارمەتیی داوەو ئاوازو هەڵبەستی شاعیرە ناسراوەکان‌و هەڵبەستە بەنێوبانگەکانی سەرزاری خەڵکیی بۆ ئامادە کردووە.. مــن پێم وەیــە ســروودی (وەتەنی من کوردستانە) کەسروودێکی قوتابیانی قوتابخانەی سەرەتایی سلێمانییە– با ئاوازەکەیشی تــورکیی بێت– هــەروەها گــۆرانیی سەرزاری خەڵکی (هەی گوڵ هەی گوڵ)و(وەسیەت بێ ئەگەر مردم قالە)و (ئەی ئاوێنەی دولبەر) و گۆرانیی (ئەمن دەکەم مەدحی شێری جیهانمان) مۆسیقەناسی شــارەزای وەك عەبدولواحیـد ئاغــا مســتەفای کــۆیی (فێرکــەری مۆســیقە) لەســاڵانی ١٩٢٥–١٩٢٨دا، پشتیوانی بووە !

جێگەی باسە دیوێکی قەوانێکی عەرەبیی (بەدرییە ئەنوەر) سروودی کــوردیی (ئێمــە کەمنداڵ‌و نەوجەوانین) ی کوردیی لەسەرە کە سێ دەنگی ژنانە دەیگێرنەوە و یێکێکیان دایکی جەمالە.. هەڵبەت ئەم سرووده هەر لە ئاوازەکانی ئــەو مۆسیقەناســەی ئەوکاتــەی سلێمانییە..

## نرخاندن

پێنج قەوانی دیار، قەوانێکی (ئۆدیۆن)و سێ‌قەوانی (بەیزافۆن)هەشت گۆرانیی دایکی جــەمــالــمــان دەخــەنــە بــەردەســتو گــوێ! هــەروەها پێنج گۆرانیی دی–قەوان نادیار– لەبەردەستن کە مخابن کۆمپانیاکان نەناسینەوە.

بەئەو پێیە(سیانزە)گۆرانیی دیارەو–بەگۆرانیی هەی‌گوڵ هەی‌گوڵەوە کە بە درێژییدا وێ دەچێت لەسەر یێك قەوان بووبێت– هەموویان (حەوت قەوان) یان گرتووەتەوە !

ئەگەر (هەشت گۆرانییە ون) و باس کراوەکانی خەڵکییش ڕاست بن، ئــەوە هــەمووی (بیست و یێك) گۆرانیی لە (دە) قەواندا هەیە. جێگەی باسە، عومــەر قــەززاز ڕای وەبــوو کە هێندەی دەرکردووە ! (٣).

ئەم بەڵگەیە لەلاییێكو دەرنەكەوتنی گۆرانیی دی لەلای كۆمپانیا درەنگ هەڵكەوتووەكانی وەك: هس ماستەر ڤۆیس His Masters Voice و كۆلۆمبیاو Colombia، هەروەها ون بوونی خۆیشی لەدووای سالانی ١٩٣٠-١٩٣٣وە- كە من دڵنیام شووكردنی بە مێردی دووەم مەلامەتەكەیە- هەموو بەڵگەی بەهێزن بۆ تەمەن كورتیی گۆانیی چڕینی!

باسێكی گرنگ ئەوەشە، ئەگەر گۆرانییەكانی ڕەنگی بازرگانییان گرتبێت، ئەوە هەڵبەستەكانی هێندێكیان نرخێكی مێژوویی گرانیان هەیە كە لە شیعری شاعیرانی ناسراوو بەنێوبانگن، یان هەڵبەستەكان پێوەندییان بە خانەدانێكی بەنێوبانگی كوردەوە هەیە!

ئەز لەچەند كەسم بیستووە كەهۆنراوەكەی (ئەی ئاوێنەی دولبەر-وەفایی) بەتایبەتیی دایكی جەمال مەبەستی لە(حەپسەخانی نەقیب) بووە كە ژنێكی بەنێوبانگی كوردە و دۆستایەتییان یێكجار بەهێزبووە! ئەگەر قەوانەكەی بدۆزرێتەوە ڕەنگبێ لەكاتی گوتندا نێویشی بردبێت! جێگەی گوتنە لەسەر قەوانێكدا (دەنگی شێخ قادری حەفیدی مێردی حەپسەخان هەڵكەندراوە!)

لەئەمەش گرنگتر و بەنرختر، گۆرانیی (هەی گوڵ هەی گوڵ) ی دیار- نازاندرێت كێ دایناوە-لەسەر زاری خەڵكی كوردستانی باشوور بەنێوبانگ بووە، تەنانەت بەر لە گوتنەكەی دایكی جەمال. ئەم گۆرانییە - وەك شیوەنێ- بەبۆنەی كوشتنی (شێخ سەعید) ی بابی حەفیدزادە مەحموودە داكەوتووە كە ئەو زاتە و كوڕ و خزمانی لە هەرا ئانقەستەكەی بازێری مووسڵی عوسمانیی لە١٩٠٩/١/٥دا كوژراوە! هەروەها گۆرانیی نادیار (ئەمن دەكەم مەدحی شێری جیهانمان) بەڕای من بەتایبەتی لەسەر سەركردەی نەمر حەفیدزادە مەحموود بووە!

دەی ئەگەر دایکی جەمال نزیکەی (بیست وبێك) گۆرانیی گوتبێتو تەمەنی لە هونەردا کورت بووبێت، داخۆ کردەوەکەی لەمێژووی گۆرانیی کوردییدا چ مانایێکی هەیە؟

لێ نۆڕینی بەچاوی پێشکەوتنی ڕۆشنبیریی و مۆسیقەی ئەمڕۆی کوردەوە، هەڵبەت کارێکی نابەجێیە، بۆییکا پێویستە لە تەرازووی ڕۆژگاری خۆیدا هەڵکەوتن و کردەوەکەیشی بکێشین!

بەر لەهەر چشتێ- لەدووای ڕستگاربوون لە چنگی ستەم و تاریکایی حوکمڕانیی عوسمانییەکان و لەسەرەتای بەسترانەوەی نابەدڵانەی گەلی باشووری کوردستان بە مەملەکەتی عێراقی عەرەبەوە- کۆمەڵێ وێنەی گەورە و گرنگمان دێتە بەرچاو:

١. بارێکی سیاسیی و ئابووریی و ڕۆشنبیریی نوێ.

٢. درێژەکێشانی دوواکەوتوویی باری کۆمەڵایەتیی، بەتایبەتیی گۆشەگیرکردنی ئافرەت!

٣. هەڵساندنەوەیێکی باری خوێندەواریی و ڕۆشنبیریی کوردیی!

ئەوجا هەڵکەوتنی هەڵبەستو هۆنراو، گۆرانییو ئاواز، گۆرانیبێژانی کورد، بەتایبەتیش ژنە گۆرانیبێژو بڵاوبوونەوەی (گرامەفۆن-قەوان)، بەڕاستیی ڕووداوی دانسقەن، چونکە ئەوانە وێنەی گەورەی گۆڕینێکی نوێن بەرەو بەرهەڵستی کردنی دوواکەوتن.

ڕاستە لەئەم سەرەتایەدا، هەڵبەستو ئاوازی سەرزاری خەڵکیی-فۆلکلۆر- کەرەستەی کردو کۆشی ژنو پیاوی گۆرانیبێژەکان بووەو گواستنەوەیشیان بە شێوەیێکی نیمچە هەڕەمەکیی و بازرگانیانە، سەرەتاشە بۆ لە گرێژنەچوونی ئاوازو گۆرانیی سەرزاریی، بەڵام لەهەمان ساتدا سەرهەڵدانی ئاوازی نوێش خۆ دەنوێنێت.

بۆ وێنە گۆرانییەکانی ئەم ژنە، بەشیعری (شاعیرانی ناسراو)و بە ئاوازی تازە بابەتەوەو بەهاریکاریی دەستەی مۆسیقەژەنانەوە– وێڕای هەر ڕەخنەیێ لەکەم و کورتییان– بەڵگەیێکی بەهێزە بۆ سەرهەڵ دانی ئەم گۆڕینە پێشکەوتنخوازە!

تەماشا بکەو وردببەرەوە، هەتا ڕۆژگاری هەڵکەوتنی ئەم ژنەش، چ هەواڵو کردەوەیێ، دەنگێ نابیستین و نابینین کە پیاوێ یان ژنێ، لە لە سەردەمی عوسمانییدا زمانیان بە گۆرانیی و ئاوازێکی کوردیی– لەسەر قەواندا– گۆی کردبێت!!

داخۆ قەوماوێکی گرنگ و مێژوویی نییە، (ژنە گۆرانییبێژێ) بۆ یێکەم جار و بەئاشکرا، بولبول ئاسا بخوێنێت و بڵێت (وەتەنی من کوردستانە!) هەو دەنگەکەیشی لە ماڵانوبازاڕ، لەگوێی ژنو پیاو مێردمنداڵ، خوێندەوارو نادان، وەزیرو گزیردا بزرەنگێتەوە؟

دایکی جەمال، بەئەو گۆرانییانەوە کە بۆ چینی ژێر و ژووروو، بۆ ڕۆشنبیر، ئاغا، شێخ، قوتابیی، خەڵکی ئاسایی کوردەواریی گوتوون– باخۆیشی بە هەوایێکی تێ پەڕیوی لەقەڵەم دابن– لەلای منو هەرژیریێ، بەڵگەی بەهێزی هێندێ نەخشی هونەرانەیە لەسەدەی بیستەم و لە مێژووی گۆرانیی کوردییدا کە هەرگیز ڕەنگ و سەنگیان ناچنەوەو ون نابن!

**داوێن**

(بۆ کەڵکی خوێندەوار، پێویستی دەبینم–بەکەمێ دەستکارییەوە– ئەو ڕیپۆرتاژەم بنوێنم کە دووای دۆزینەوەی و بەدیمانە گەییشتنی، بەنێونیشانی (دە ساڵ گەڕان بۆ ژنە گۆییندەیێك:مردووە..زیندووە..مردووشە!!)بڵاوکراوەی هاوکاری– ژ٣٠٦، ١٩٧٦/٢/٢٧

لەئەوێدا بۆ تاریكو بێزار نەکردنی لانەوازیی– بڕیارم دا تا لە ژییندا بێت– نێوی خۆی و هێندێ کەسی نزیکی و گۆرانییەکانی ئاشکرا نەکەم، تەنانەت لە ڕۆژنامەکەدا وێنەکەیم– بەقەڵەمی براکەم– بەشێوەی پۆزەتیف نواند!

ئەمێستە ئەو نێوانە، لە دوو کەوانی جوێدا، (      ) شاش و رەشدا دەنوێنم. لەلایێکی دیەوە پێویستی دەبینم سوپاسی کابانی حسێن ئەفەندیی موغازەچیی- دایکی بورهان- بکەم کە تاقە وێنەی دووا ڕۆژگارەکانی " دایکی جەمال" ی پێشکەش کردم و لە ئێرەو لە ڕۆژنامەدا بڵاوە !).

## دە ساڵ گەڕان بۆ ژنە گۆیبیندەیێک

## (مردووە..زیندووە..مردووشە !!)

سەدەی بیستەم چارەکێ کەمتری ماوە.. با هەتا زووە هەرییێکە لە باوو باپیری خۆی بپرسێت-ئەگەر ماون؟- سیی چل ساڵ پێش ئێستە، (ژن) بەکوردیی گۆرانییان دەگوت یان نە؟

هەتا ئەوانیش بیردەکەنەوە و زمان دەجووڵێنن، تۆش تەماشاییێکی ئیمڕۆ بکە ! ئایا وەڵامێکت دەست کەوت؟ ئەگەر زەینم ڕوون بێت، وەڵامی ئەوان و مایەی تەماشاکردنی خۆیشت هەر ئەوەیە کە (ژن) لەنێو کورددا- بە ئێستەیشەوە- زۆر زۆر بە دەگمەن گۆرانییان گوتوون ! !

من لێت ناپرسم- هەروەها لە پیرەکانیش- ئەوە بۆچیی؟ چونکە وەڵامەکە، چون مەڵامەتەکەش دەزانن.

بێ درێژدادریی (ئێمە) دەمانەوێت لە وڵاتانی دیەوە (ژن) بهێنین و بیانکەین بە کوردو گۆشیان بکەین و لە کۆڕی ئەدەب و هونەردا کاریان پێ بکەینو ئەوجا سنگ دەرپەڕێنێنینو بڵێین: چاو! ژنانمان شان بەشانی پیاو بۆ ژینی نوێی گەلی کورد لە کۆڕی تێکۆشاندان !

هەرچۆنێ بێ، وادەی ڕازو گلەیی نییە، چونکە ئا لەم ساتەشدا هەر خۆمیش بەرگەی ئەوە ناگرم و هێندە دەتووانم هەتا زووە ئەم پەژارەیەم بخەمە ڕوو و بڵێم:

ئەمە ییێك لە ژیانمدا نەزانم لەکوێوە، چۆن و چیی بنووسم ! !

ئەگەر بیری قەدیمەکانیش کول بووبێت و نەزانن، سیی چل ساڵ پێش ئێستە، بە قەوان چ جا لەسەر ڕادیۆدا (چەند ژن) گۆرانییان گوتووە؟!! بەوەی باشە دەفتەر و تۆمارەکانی ڕادیۆی کوردیی بەغداد، ئەم نێوانە دەخوێنێتەوە، (مریەم خان، ست ئەڵماس، فەوزییە محەممەد، نازدار و ئەسمەر فەرهاد!!).

بەڵام لە ئێرەدا ئەفسووس بۆ دوو چشت:

یێکەم: زۆربەی گۆرانییەکانی (ئەوان) لە ئەوێشدا نەماون و ئەگەر تاك و تەراییێکیش مابنەوە، ناتەواو و پچڕ پچڕن!

دووەم: تۆ ئاسایی–قەدیمەکانیش–و ئەو ڕادیۆیەش ئاگەتان لێ نییە، ئەو ئافرەتانە بە ڕاستیی کێ بوون؟ چەند گۆرانییان گوت؟ دوواجار– ئەمەش گرێ کوێرەییێکی زۆر ناخۆشە!!– چییان لێ هات؟

ئایا دەتانەوێت ئەو گرێ کوێرانە بکەیینەوە؟ ئەگەر پێتان خۆشە، ئەوە جارێ با ئەم ڕاستییەت بخەمە دەستەوە کەئەمەیە، (چۆن ڕاستیی ڕاستییە، چۆن مرۆڤە مرۆڤە، ناتوانم – بەتایبەتی ئێستە – هەرچییێ پێی بڵێن، نێوی گۆرانیی، نێوی شار و گەڕەکت بۆ بگێڕمەوە!!). ئەگەر ئەم مەرجە پەسەند دەکەیت ئەوە لەسەر خوێندنەوەی باسەکەم بڕۆ...

لەلای ڕادیۆی کوردیی بەغداد، ساڵی ١٩٦٦ بەتەنێ (یێك) گۆرانیی هەبوو،(هەی بەللار و بەللار). لەدووای کرد و کۆشێکی زۆر بێ وچان، گۆرانییەکی دیم لەلای ئەو ڕادیۆیە تۆمار کرد، (هەی ئاغا و ئاغا)، بەهاری ساڵی ١٩٧٥ یش، لە هەر کەسێکم دەپرسیی، بەتایبەتی قەدیمەکان، سەدی نەوەد و نۆیان دەیانگوت "مردووە!"، بەڵام پار پیرەمێردێکی هونەر دۆست، (یەحیا ئەفەندیی ڕەسام / فۆتۆگرافگری پێشڕەو لە سلێمانییدا) ڕۆشنایی خستە دڵمەوە و ئەو سەدی نەوەد و نۆیەی بەدرۆخستەوە و گوتی: (دایکی جەمال بەهیجە خانی نێوە. ئەوەتە لە ماڵێکدا ژوورێکی گرتووە لەسەروو

ماڵی شێخ قادری حەفیدەوە و نزیك بەدوكانی ئەوڕەحمانە شەلە ! هەر بچۆ لەو بپرسە پێت دەڵێت كامەیە ! بەڵام ئەگەر چوویت مەڵێ ئەو ناردوومی ! ).

... بەڵام من وام لێ هات بوو هەتا خۆم بەهەردوو چاوی خۆم نەیبینم باوەڕ بەكەس نەكەم.

نێوی دووەمی و گەڕەك و نێوی دراوسێكەیم لەسەر پسووڵەیێك تۆمار كرد و بە ئەم شێوەیە، خۆم و–بەنێو– براكەم كەخوێندكاری هونەری نیگارە، كەوتینە سەركێشیی...

ئەوە سێ بەشی ئاسمان هەورە... هەوری ڕەش، خۆڵەمێشیی.. زەرد كە خۆر بەسەریدا زاڵە. نمەنمەش باران دەبارێت وەك لەبریی منداڵان داوای سامال بكات كە سبەینێ جەژنە ! بەڵام خۆر، خۆری ڕۆژی پێنج شەممە١٩٧٥/١٢/١١ـەو سەعاتیش چوارو نیوەو ئێمەی جووتە براش، ئەم كۆڵانو ئەو كۆڵان دەكەینو بەدەم پرسیارەوە جاروبارە بۆ سوحبەت پەلاماری مزراحی منداڵانمان دەداو یادێكی جارانمان دەكردەوە.. هەڵبەت ئێمە نێوی (بەهیجەخان)مان دەهێنا، چونكە ئەو هەمان نەكردایە، ڕەنجمان بێ وەر بوو، نێوی (دایكی جەمال) نائاشنا بوو!

منداڵێك، كۆڵانێكی تەنگەبەری نیشان داینو گوتی، (.. لە ئەوێدایە !). بەڵام لە كۆڵانەكەدا چەند دەرگایێ بەیێكدا هات بوون و نەم دەزانیی لەكامیان بدەین و لەكامەشدا (ئەو!) دەژیێ! ! ناچار بووین لەدەرگەیێكی سەوزمان دا و ئافرەتێكی جوان و كەڵگەت و ڕێك و پێك – بەشێوەی جلی كوردییەوە– هاتە دەرەوە. دیار بوو ئەم (ئەو) نییە.. وێڕا گوتم:

+ ماڵی (بەهیجەخان) ئەمەیە؟

نەرمۆكە گوتی:

– نا، ئەوبەرە !.

لە ئەوە پتر لـەلای خۆیـەوە، بـانگی نێـوی (بەهیجـەخانی)دا کەئێمـە مەبەسـتمانە.. چوونە بەر دەرگەیێکی دی– ئاسنو ڕەنگ خۆڵەمێشیی–و لێمان دا..." لە ئەوەو پێش یەحیا فەندیی هونەر دۆست کەمێك باسی لەش و لاری بۆ کردبووم!".

زۆری پیێ نەچوو، ئەو لەش و لارە– کەڵەگەت و گۆشـتنە و ڕەش پۆشـە– هاتـە بـەر دەرگە و بەڕوویێکی ڕووناکەوە سەیری کردین و خێرا دەمم هەڵهێنا:

+ تۆ، زەحمەت نەبێت (بەهیجە خان)یت؟

بەڕووخۆشییەوە وەڵامی دامەوە!

– بەڵیێ!

وێڕای خۆرپە و خۆشیی دڵم، گوتم:

+ ئەوە هاتووین بەمیوانیت. جا نازانم بەمیوانمان ڕادەگریت؟

بەخۆشییەکەوە گوتی:

– دەفەرموو، فەرموو!

جاریێ ئـاهێکم پێدا هاتـەوە کـە شـوکر زینـدووە و مـردوو نییـە! ئەمـە لەلاییێکـەوە، لەولایشەوە ڕووخۆشییەکەی ئەوهەی لیێکردبووم کە دڵنیابم دییدەنییەکەمان سـەرەوخێر دەبێت و ناهومێد نابین! هەر بۆ ئـەو هومێـدەش بـەدەم چـوونە ژوورەوە– لـەبریی خـۆ تاس و لووس کردن بۆ جەژنی بەیانیی– زمانم لووس کرد، گوتم:

+ئەوە چییە بیێ قەزابیت، واخۆت شاردووەتەوە؟ پیاو بە"دە"ساڵیش نەتدۆزیتەوە، چۆن وا دەبێت؟؟

بە پێکەنینێکی هێواشەوە بردیینیە ژوورەکەیی و گوتی:

– ئیدی!! هەروا دەبێت!!

خۆمو –بەنێو– براکەم لەبەردەمی ژوورەکەیدا پـێڵاوە قوڕاوییـەکانمان داکەنـد. کـە سەریشمان کرد بـە ژوورەکـەدا، هـەوا خـاوێن، ژوور گەچـکاریی، دیمـەنیش ڕێـكو پێـك!

لەسەر فەرشێکی نیوداشت چوار مەشقیی دانیشتین. خۆیشی لەسەر دۆشەکڵەیێکی خۆڵەمێشی لەبەردەم زۆپایێکی عەلائەددین، تەباخێکی نەوتی یێك چاویی کە کتریی و قۆرییەکی لەسەربوو، دانیشت... ساتێ کە سەرلەنوێ خۆش هاتنی پێ گوتین، من وەك دز چاوم دەگێڕا... تەسبیحێکی دەنك درشت– وابزانم قەزوان بوو– بەدرێژییەکەیدا دیار بوو سەد و یێك دەنکە، لە تەنیشت خۆیەوە دانابوو.. لە دەستە ڕاستیشیەوە کاسەیێکی بلووریی سپیی و پچکۆلانە دانردرابوو، ترشیاتی تێدا بوو. سێ شفتەش لەسەر کاشییەکی پچکۆلانەدا بوو.

خەریك بوو چامان بۆ تێ بکات کە گوتی:

– بەڕۆژووم!

خێرا گوتم:

+ دە مادامەکێ وەیە، چامان بۆ تێ مەکەو ڕێگەی پچووکت بدە جگەرەیێك بکێشم!

بەڕووخۆشییەوە گوتی:

– قەیناکە، فەرموو!

بەدەم جگەرەکێشانەوە لە شێوەیی و جل و بەرگی خاوێنیم دەنۆڕیی! گوتم:

+ چەند ساڵە لە ئێرەدایت؟

لەسەرخۆ بەساردێکەوە گوتی:

– نۆ!

گوتم:

+ نۆ ساڵ؟ خۆ وەڵڵە ژوورێکی ڕێك و پێکە! ئەی لەوەو پێش.

گوتی:

– چوار ساڵ لە ماڵی (مەلا مەحموود)ی دوکانداردا بووم!

پرسیم:

+ ئەی لەوەو پێشتر؟

ساردتر وەڵامی دامەوە:

– لە بەغداد، دراوسێی ماڵ (مەجید عەلیی/ ئەفسەر) بووم، ئەگەر بیناسیت؟

خێرا گوتم:

+ ئا.. بەڵێ بەڵێ! هاوەڵێکم (ئەکرەم ڕەشید/ ئەندازیار) کیژێکی ئەوی خواستتوە!

هەتا ئێرە، مەندیی جێگەی ڕووخۆشییەکەی گرت بووەوە، بەڵام هەر لە ئەو ساتانەی من لەدڵی خۆمدا دەمگوت، (بۆچیی ناپرسێت کێن و چین و بۆچیی هاتوون؟). هەروەها کە بیرم دەکردەوە چۆن و لەکوێوە دەست پێ بکەم، چاوانم بە ژوورەکەدا دەخولاندەوە. پێم وەیە –بەنێو– براکەشم لەهەمان باردابوو. ! بەڕاستیی ژوورە چوارگۆشەکەی دلگیر بوو.. لەپشتمانەوە تەختێکی خەوتن کە بە چەرچەفێکی سپیی و خاوێن ڕازابووەوە، هەروەها لەگۆشەی دەستە ڕاستیشدا بۆفییەیێکی فۆرمیکای قاوەیی –هیچی لەسەرو لەنێو شووشەبەندەکەیدا نەبوو– داندرابوون. لەلای دەرگەکەشەوە تەباخێکی گازی دووچاویی، سەری دادرابووەوە، ڕاییێخی نێو ژووریش ئەو فەرشە و کومبارێکی بۆر بوو.. ڕاستییەکەی چ شتێکی چەوت و نارێکت نەدەدیت! خۆیشی قەڵە و ڕەش پۆش، بەڵام ڕەنگ و ڕووی ڕووناك و بێ ئارایشت بوو.. چرچ و لۆچیی زۆری پێوە دیار نەبوو، بـــەپێچەوانەوە –بەچاوێلکەکەیشیەوە– هێشتا جوانیی دەنواند، بەڕادەیێ قسەی خەڵکم لەگوێدا دەزرنگایەوە کە دەیانگوت لەتاف لاوییدا زۆر جوان بووە بۆیێکا نێوناسی (دایکی جوانیی/ دایکی جەمال) ی بەسەردا دابڕابوو!

دووای ماوەیێ بێ دەنگیی ماقووڵ و ناماقووڵ، ئەو پەتی پچڕیی و پرسیی:

– ئێوە کێن و...

ئیدی من زمانم کرایەوە و قسەییم قرتاند و گوتم:

+ من نیۆم کەمال ڕەئووف محەممەدە، خەڵکی ئێرەم، لەدەزگەی ڕادیۆو تەلەفزیۆندام (ئەمێستە بۆ شەش مانگێ لەکتێبخانەی مووزەخانەی سلێمانییدا داندراوم) ئەوە دە ساڵیشە تامەزرۆی ئەم کاتەم!

ئەوجا ئەگەر ڕێگەی پچووکیشت بدەیت، حەزدەکەم شتێ لەمەڕ ڕابردوو، لەمەڕ گۆرانییەکانت بزانم!!

ئیدی دەمم سووتاو بەبەرچاومەوە ڕووخۆشیی و مەندیی ڕەوییەوەو نەجارێ، نەدوو، نەسێ، بە گرژیی و ڕوویێکی وشکەوە گوتی:

– هیچ نازانم، هیچ هیچ، هیچم لێ مەپرسە، هەرهیچ!

بەدڵشکاوییەوە لەسەرخۆ گوتم:

+ باشە، هەرهیچ نەبێت ژمارەی گۆرانییەکانت، نێویان؟؟

– نا، نایەتەوە بیرم، هیچ نازانم!

+ تکا دەکەم هەر ژمارەیان!!

بەدەنگێکی نزم و هەستێکی بێزارەوە گوتی:

– هەرچەندێ بووبن، حەوت هەشتێ، بەڵام هیچی دیم لێ مەپرسە! وە بزانە من ئەو نیم، هەوایێ بوو ڕۆییشت و بەسەرچوو، بەسەرچوو!!!

هیلاکی گەڕان، هومێدی دەساڵ، خۆشیی یێکەم چاو پێ کەوتن، ئەوانەم هەموو لەبیرچووەوە. باڵی خەم و هیوا بڕاویی، بێ ئارامیی بەسەرمدا کشا. نەم دەزانیی بڵێم چیی؟ مێشکی خۆمم دەگوشیی، گوشین بۆ فێڵێ، بۆ تەگبیرێ، بۆ وشەیێ کە دڵی نەرم بکاتو بێتە زمانو (گەلێ ڕاستیی) ون نەبێت کە ئەو ڕاستییانە بۆ من نییە و بۆ مێژووی هونەری گۆرانیی کوردە.

بەدەم ئەو هەموو ژان و پرسیارە خنکاوانەمەوە، بیریشم لە دەنگو گۆرانییەکانی جارانی دەکردەوە کەئێستە نکوولیی لەئەوانو هەر شتێ دەکاتو ئەوەتە سەری

داخستووە و گرژە و خوا خوایەتی زوو بڕۆین، تەنانەت کێ ناڵێت بەتەما نییە دەریشمان بکات؟

چاییەکەش دەمی کێشا بوو، بۆنی دەهات، بۆی تێ نەکردین، نازانم لەبیری چوو، یان بە ئانقەست بوو!!

چارم نەما، لەسەرخۆ پرسیم:

+ ئێستە هەر ئەوهە بە دڵشکاوییەوە بڕۆیین؟

سەیر ئەوە بوو بە گەرمییەوە گوتی:

– ئەرەوەڵڵە!

لەدڵی خۆمدا بڕیارم دا– مادامەکێ دەرمان دەکات– با دەم درێژبم و بڵێم:

+ لەمەڕ مەریەم خان، غەفوور ئاغا، فلانێ، فیساری باسێ نازانیت؟

بەلێوهەڵقورتانەوە گوتی:

– هیچ نایەتەوە بیرم! پێم گوتی هیچ نازانم، هیچم لێ مەپرسە!

تاوێك تاس بردمییەوە و بەدەمیشیەوە لێی ورد دەبوومەوە.

هەر درێژەم پێدا:

+ دەتوانم بزانم عومرت چەندە؟

بەساردییەوە تەماشاییێکی کردم و گوتی:

– بۆ ناتوانیت؟ عومرم شەست و یێك ساڵە!

+ یانی ساڵی ١٩١٤ هاتوویتە دنیاوە؟ لە هەڵەبجە.. یان؟

– لە بەغداد!

ئارامم لەبەر بڕابوو، نێوچەوانی ڕەشی خۆمم گوشیی و پێم گوت:

+ بە کوڕی خۆتم بزانە و پێم بڵێ چۆن دەژیت؟

لەسەرخۆ گوتی:

– دەژیم! ! ئەوان(دوو کوڕی برازای مێردی دووەمی– کوڕانی مەجید سوڵتانی پێڵاو فرۆش لە سلێمانییدا! !). بە هەردووکیان مانگی (پانزە) دینارم دەدەنێ و ڕجاشتان لێ دەکەم کە لێرە چوونە دەرەوە، مەیەنەوە، مەزانن هەم! مەعیشەتم مەبڕن!

پرسیم:

+ دیارە لەبەر دڵی ئەوان؟

بەساردییەوە گوتی:

– ئەی گوایە چیی؟ ئەوان نەبێت بەچیی ئیدارە بکەم؟

+ گوێت لە گۆرانییەکانت نابێت؟

دیسان گرژ بووە و لەسەرخۆش گوتی:

– نا شوکر! گۆرانیی چیی ئینسان با خواپەرستیی بکات!

تاوێکی دی خۆم خنکاند و دووایی گوتم:

+ ئاخر هەر دەبێت ئەوهە ون بێت؟

هەڵبەت لەدڵی خۆیدا گاڵتەی بەخۆمو پرسیارەکەم هات بۆییکا بە گەرمییەوە گوتی:

– وا خۆشە! پێشت بڵێم خۆت هیلاك مەکە!

یێکسەر –بەنێو– براکەمم گوت:

+ هەڵستە با بڕۆیین!

خێرا پێڵاوەکانمان لەپێ کرد. ئەویش بە ساردییەوە بەڕێی کردین..

– خواحافیزتان بێت!

کە هاتینە دەرەوە یێکسەر –بەنێو– براکەم لێی پرسیم:

+ + چیی دەڵێیت؟

+ جارێ تۆ دەڵێیت چیی؟

++ شێوەییم لەبەرکردووە و نیگارێکیت بۆ دەکێشم!

+ دەم خۆش!

++ بەڵام کاکە شتەکە سەری نەگرت، فاییدەی چیی؟!

+ دیتنی خۆی، ئەو چەند قسە تفتەیشی هەرکەم نییە، بگرە ئەوانە بۆ خۆیان ڕاستیی و گرنگن!

++ ئەوجا ئەوە بەچیی دەچێت؟

+ چۆن؟ ئەی ئەو وێنە گەورەیەی بێ هوودەیی ژین و هەبوونی؟ دەزانیت چ وێنەیێ؟ ژنێکی ئەوهە، ژوورێکی ئەو هەلە، حەقیقەتی ئەم خۆ هەڵواسینە زۆرەملێیەی بە ژیانەوە؟ ئەمەیە ژیان؟ چەند ساتێ خەو، خواردن، خۆشوشتن و لەبەر کردن، ئەوجا چەند ساتێ گفتو گۆ لەگەڵ دەر و دراوسێ و هیچ گۆڕینێ لە گۆڕێشدا نەبێت!! ئەمە چیە؟

++ کە ئیش و کارییشی نەبێت، مردنە!

+ ڕاست دەکەیت! هەرچۆنێ بێ، ئەمێستە دوو شت، دوو ئەرکم کەوتە ئەستۆ کە گەلێ گرنگن..یێکەم: هەتا ئەو ڕۆژەی دەمرێت هەرگیز نێو و شوێنی ژیانی باس نەکەم! دووەم: ئەو ڕاستییەش بەمن ناشاردرێتەوە کەدەساڵ لەدووی دەگەڕێم و دڵنیا بووم (دایکی جەمال)ی گۆرانیبێژ، ماوە و نەمردووە!

"تەواو"

## پەراوێز

{١}. خانم نیشتیمان عوسمان دانیش دەبێژێت،(بەڕێکەوت ڕۆژێکیان عەقدی نیکاحی ئەوم بەرچاوکەوت!).

{٢}. یەحیا ئەفەندیی، عومەر قەززاز، نیشتیمان عوسمان دانیش، دایکی بورهان و خەڵکی دیش بەدەم و دوویی ئاگاداریان کردم کە جوو، ئەوجا تەو موسڵمان بووە! بۆ مێژووش ڕاستییە دەنوێنم و دەڵێم، خواپەرستیی و ڕۆژوگرتنی– لە هەلی دیدەنیی کردنمدا– گەلێ

سەرنجی ڕاکێشام، چونکە ژنە گۆرانیبێژ، کۆنەکان چ تازەکان بەپێچەوانەی ئەوەوە ژیانیان ڕابواردووە.. بۆوێنە ژنە گۆرانیبێژی بەتەمەن و پیر (ئەڵماس محەممەد) لەساڵی ١٩٧٠ دا کە هێنامە سەر تەلەفزیۆن و لە بەرنامەمدا (پەیامی هونەر) گفتو گۆم لەگەڵ کرد، بەر لە هێنانی بۆ ستودیۆی تەلەفزیۆنی بەغداد، بەفرکانێ چارەکێ (براندی) هەڵقوڕاند ! !

{٣}. لەهێندێ خەڵکم بیستووە !

{٤}. عومەر قەززاز دەیگوت تا ساڵی ١٩٣٠. لەلایێکی دییەوە بەبڕوای خۆم لەنێوان ١٩٣٠-١٩٣٣ دا گۆرانیبێژ بووە. دۆستە هەولێر نشینەکەم دەیگوت لە ئەو دووا ماوەیەدا لە بازێڕۆکێکی پچووکی- وەك کۆیێ- دیتوویێتی ! وێڕا ڕەنگبێ لە ئەو دووا ماوەیەدا کە تیاترۆ هاتوونەتە سلێمانیی و ئاهەنگیان گێڕاوە (دایکی جەمال)یش هاودەنگیان بووبێت. دۆستم ئازاد جەمیل ساییب لە ١٠ / ٨ / ١٩٩٩ لە بازێڕی (دێڵفت Delft)ی هۆڵاندەدا بۆمی گێڕایەوە کە دێتەوە بیری، باب و گەورەکانی دی وێنەی فۆتۆگرافیان لەگەڵ دایکی جەمال گرتووە، ئەوجا ڕەنگبێ ئەوە ڕێکەوتی ئەو دووا ماوەیە بێت !

{٥}. بەڕۆشنایی گۆرانیی گوتنی لەگەڵ چەند ژنە گۆرانیبێژی عەرەبیی وەك بەدرییە ئەنوەر کە سروودی (ئێمە منداڵ و نەوجەوانین)ی کوردییان گوتووە. هەڵبەت دیارە ئاشنایی زۆری لەگەڵیان هەبووە.

{٦}. یەحیا ئەفەندیی، عومەر قەززاز، تەنانەت بابیشم، هەروەها چەند کەسی دی بۆیان گێڕاومەتەوە کە (حەمید سوڵتان)ی مێردی دووەمی، چووەتە هەر چاپخانەیێك و گوێی لە قەوانی گۆرانیی (دایکی جەمال) بووبێت، بەکڕین و بە زۆر قەوانەکانی لێ وەرگرتوون و شکاندوونی !

{٧}. وەك بیستوومە دووای بەغداد، بەهۆی فەرمانی مێردی دووەمیەوە، هاتووەتە کەرکووك، ئەوجا دووای جودا بوونەوەی هاتووەتە سلێمانیی.

{٨}. دایکی بورهان دەیگوت، (دۆستە نزیکەکانی ئێمە بووین.. هەروەها غەفووری مەلا عەلیی خێرخوا- برای کۆنە ئەفسەر مەجید عەلیی کۆنە دراوسێی بەغدادی- کە بە ڕاستیی لە هەموو کەس پتر پەرۆشی ڕستگار بوونی بوو لە نەخۆشییەکەی).

{٩} . بەڕۆشنایی ئەو گۆرانییانەی بەردەست کەوتوون، هەروەها بەڕۆشنایی دیارنەبوونی چ گۆرانییەکی دی– وەك عەرەبیی– لەگەنجینەی ڕادیۆی بەغدادی عەرەبیی. شایانی باسە چەند جارێ رووم نا لە کۆچکردوو غەفووری مەلا عەلی کەچی دەزانێ بیگێڕێتەوە، بەڵام هەرگیز قاییل نەبوو!

{١٠} . بنۆڕە وردبوونەوەم، هاوکاری– ژ٤٩٤، ١٩٧٩/١٠/١ / کۆمەڵێ قەوانی بەنرخ "قەوانەکانی گەنجینەی محەممەد شەریف ڕەسووڵ نانەوا– سلێمانیی".

{١١} . مخابن ژمارەکانی قەوانەکە چووبوونەوە!

{١٢} . ئەم گۆرانییە لە دوکانی تۆمارگە و موغازەی (عەلی شێخ فەرەج– سلێمانیی)دا لەساڵی ١٩٧٢ دا کڕیومە!

{١٣} . نەتەوەپەروەر و وێنەگری سینەمەیی تەلەفزیۆنی بەغداد، کۆچ کردوو کاکە مین حەوێزیی لە زستانی ١٩٦٦ دا، قەوانی ئەم گۆرانییە و (هەی بەللار) ی پێشکەش بەرنامەکەم (دەنگی هونەر) م کرد!

{١٤} . هەر ئەم تاقە گۆرانییە لە گەنجینەی ڕادیۆیی کوردییدا لەسەرەتای ١٩٦٦ دا بەرچاوم کەوت!

جێگەی باسە، دایکی بورهان بیرەوەرییەکی لەمەڕ ئەم گۆرانییە و دایکی جەمال گێڕایەوە و گوتی: (خۆی هەرگیز باسی ڕابردووی نەدەکرد، ڕۆژێکیان لە ڕادیۆوە دەنگی گۆرانیی" هەی بەللار و بەللار " دەهات. هەر لەخۆیەوە گوتی: ئەو دەنگە کێیە؟ ئۆی گڵە کوێر بیت! گوتم: توخوا بەهیجە خان چۆن دڵت دێت وابڵێیت؟).

لەلایێکی دییەوە ئەز پێم وەیە ئەم گۆرانیی (هەی بەللار و بەللار) لە ئەو سەردەمەدا هەڵکەوتووە و زۆر کۆن و فۆلکلۆریی نییە، بەتایبەتی (بەللارێ) بە زمانی ئیتالیایی مانای (دانس–سەما) دەگرێتەوە! ڕەنگبێ لەهێندێ تیاترۆی ئیتالیایی بەغداد نشیینەوە گۆرانییەکی ئیتالیایی هەڵکەوتبێت و دەنگی دابێتەوە تا ئەم ڕستە هەڵبەستراوە کوردییانەش (هەی بەللار و بەللاراوە، توسەری دایکیت وەرە ماڵەوە.. هتد) یێکێکی وەك ئەو حەمە خانی پێڵاو درووە ڕێکی خستبێت!!

{١٥}. هەروەها لە (عەلی شێخ فەرەج) و لە ساڵی ١٩٧٢ دا کڕیومە!

**سەرچاوە**

(١). گفتوگۆی تۆمارکراوم لەگەڵ بورهان حسێن: ١٩٧٩/٨/٣١ سلێمانیی.

(٢). گفتوگۆی تۆمارکراوم لەگەڵ دایکی بورهان: ١٩٧٩/٨/٣١ سلێمانیی.

(٣). گفتوگۆی تۆمارکراوم لەگەڵ عومەر قەززاز: ١٩٧٥/٥/١١ سلێمانیی.

(٤). نامەی دەستنووسی فوئاد ڕەسسوڵ ناجی: ١٩٧٩/٢/٢٦ هەولێر.

(٥). گفت وگۆی تۆمارکراوم لەگەڵ نیشتیمان عوسمان دانیش، ١٩٧٩/٨/٣١ سلێمانیی.

(٦). گفتوگۆی دەم و دوییم لەگەڵ وێنەگر یەحیا ئەفەندیی ڕەسسام و ئاکتەری کۆن، ١٩٧٥/١٢/٩ سلێمانیی.

(٧). گفتوگۆی دەم و دوویم لەگەڵ کەسێکی هەولێر نشین- نەیخواست نێوی دەرکەوێت- ١٩٨٠/١/٢ هەولێر.

---

## دووەم

## مریەم خان

لــــەسـەر قـەوان بـە(مریەم خان)بەنێوبانگە.ڕیشەی خانەدان و شوێن و ساڵی لەداییک
ونی بێ بەڵگەی نووسراوە ! ! {١}.
سەگڤان عەبدولحەکیم–لەبابە مامۆستاکەیەوە– دەڵێت: بابی مریەم خان محەممەدە
لەساڵی ١٩٠٤ز.دا هاتووەتە دنیاوە.
هاوەڵی مریەم،ئەڵماس محەممەدی گۆرانییبێژی بەتەمەن،بەمنی گوت،خزمەە ! {٢}.
کۆنە ئەفسەری پۆلیس–پارێزەر– عومەر جەلال حەوێزیی بۆ منی گێڕایەوە، ئامۆزای
ڵماسە !.
سەگڤان بەهەڵە بەخەڵکیدەشتی(سلۆپیی)،هەروەها ئەب یووسف سەعیدیش بەهەڵە
فەلەیێکی خەڵکی (نسیین) یان داناوە. ڕاستییەکەی ئـەڵماس و حەسـەنی جزیریـی و
ســرین شیـروان بەخـەڵکی گـونـدی (دێرگول)ی سـەر بەجزیرو بۆتـانی کوردستانی
کووریان پێ ناسیم.
سەگڤان دەڵێت:لەساڵی١٩٢٤ز.دا ئاوارەبووەو هاتووەتەبازێڕۆکی زاخۆی کوردستانی
شوورو ماوەیێ تێیدا جێگیر بووە ! من خۆم پێم وەیە دووای شکسـتی شۆڕشـی سـاڵی
١٩١ی کوردسـتانی بـاکوور، ئـەویش لـەڕیزی کـوردە ئاوارەکانـەو وەك ئـەب یووسـف
ڵێت: لەگوندی (عەین دیوەر)ی سەر ڕووباری دیجلـە شـووی کـردووە بـە ئەفسـەرێ لـە
وەی بەدرخانییەکان! {٣} وێ دەچێت شووەکەیشـی بـێ ئـەنجام بووبێـت و ناچـار–
ك حەسەن دەڵێت: کەهاتووەتە زاخۆ، مووسڵ، بەغداد! نەسرین دەڵێت: کەهاتووەتە
خۆ ماوەیێ لەگەلیی زاخۆدا کرێکار بووە ! حەسـەن دەڵێـت: لەماڵـە ئاغـاییێکی زاخـۆدا
ڕکەرەکەر بووە !

ع.ج.حەوێزیی پێی گوتم،مریەم لەسالانی١٩٢٦-١٩٢٧دا لەگەڕەکی"سینەك/بەغداد" دا دەژیا!. سەرچاوەییێکی عەرەبییش دەڵێت: لەدووا ڕۆژگارەکانیدا لە" بابولموعەززەم/بەغداد "دا دەژیا!

وێنەگری سینەمەیی تەلەفزیۆن- کۆنە وێنەگری فۆتۆگرافیی- کاکەمین حەوێزیی بۆ منی گێڕایەوە: ئەو هێناویەتە بەغداد بۆ قەوان دەرکردن!{٤}. حەسەن دەڵێت، لەلای کۆمپانیاکانی قەوانی (ئۆدیۆن، بەیزافۆن، کۆلۆمبییا) قەوانی دەرکردووە{٥}، بەلام بەلگەو قەوانی یێکەمو دووەم کۆمپانیام دەستگیر نەبووە تا لە مێژووی قەوان دەرکردن تەواو دلنیابم!!

هێندەی ڕاستییە قەوانم لەبەر دەستە کە ڕۆشنایی تەواو دەدات بەر لە سالی ١٩٣٨ قەوانی لەلای کۆمپانییای (ئەبوو کەلب/ هس ماستەر ڤۆیس) دەرکردووە! خۆم زۆرم پێ وەیە کە لەسەرەتاکانی سالە سییەکاندا هەلکەوتبێت!

یێکەم سەرپەرشتی ڕادیۆی کوردیی بەغداد لەسالانی١٩٣٩-١٩٥٨دا، کامیل کاکەمین بۆ منی گێڕایەوە، مریەم لەبەردەستگیر نەکردنی ڕەگەزنامە بۆی نەلواوە ببێتە گۆرانییبێژی ڕادیۆ..

مۆسیقەزانی ناسراو مونیر بەشیر بۆ منی گێڕایەوە کە درەنگانێ هێندێ ئاهەنگی بۆ ڕادیۆ گێڕاوە..

گەڕانم بۆ ڕاستی دلنیای کردم کە هەتا سالی ١٩٤٦ پێوەندیی بە ڕادیۆوە نەبووە، بەلام دوواتر لەپاییزی سالێ ١٩٤٧دا حەوتەی نیو سەعات ئاهەنگی بۆ ڕادیۆ گێڕاوەو دوایی ئاوابووە!!{٦}.

هەلبەت ڕەگەزنامەیشی دەستگیر بووەو وەك گۆرانییبێژی ڕادیۆ هاریکاریی کردووە، بەتایبەتی بەلگەی دیار ئەوەیە هەر گۆرانییبێژەکانی ڕادیۆ، حەوتانە ماف ئاهەنگ گێڕانی نیو سەعاتییان هەبووە!{٧}.

وردبوونەوەم ئەو هەواڵەش بە هەڵە دەناسێت کە سەگڤان دەڵێت، لەساڵی ١٩٤٩ دا مردووە. ڕاستییەکەی دووای ئاوابوونی لە ڕادیۆ، وێ دەچێت ڕووی لە نەخۆشیی گران کردبێت و لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٨ دا مردبێت. {٨}.

حەسەن و نەسرین، بەپێچەوانەی هەواڵی گۆڤارێکی عەرەبییەوە ڕایان یێکدگیرە کە مریەم لەدووا ساڵەکانی ژینیدا گوزەرانی خۆش و دارایی تواناو کۆک بووە، بەلاّم بەهۆی نەخۆشییەکی ژنانەوە –خوێن پژان لەدووای عەمەلیاتەوە– مردووە. حەسەن مردنەکەیشی بەئەنجامی پیلانی هێندێ تەماعکار و ناسیاوی مریەم و پزیشکێ دەزانێت بۆ دەست گرتن بەسەر سامانیدا. {٩}

ئەڵماس، حەسەن، نەسرین جەختیان کرد کە مریەم لە بەغداد دا مێردی نەکردووە و وەجاخی کوێر بووە. {١٠}.

نەسرین دەڵێت، لەخەستەخانەی "میر ئەلیاس/بەغداد" مردووە و خۆی و ئەڵماس و هێندێ دۆست و ناسیاوی دی لە گۆڕستانی شێخ مەعرووف لە بەغداد دا ناشتوویانە!

## قەوان و گۆرانییەکانی

لەبەرنەبوونی گەنجینەو دەزگەییێکی کوردیی بۆ پاراستنی یادگاری مۆسیقەو گۆرانیی کوردیی، هەڵبەت بەختی مریەمیش وەك بەختی نالەباری هەموو گۆرانییبێژە کۆنەکان کە گەلێ یادگاری ڕەنجی ئینسانییان پرش و بلاّو و بەزۆریی کوێر بووەتەوە!

وەك گوتیشم، قەوانە کۆنێکی کۆمپانیای " ئۆدیۆن، بەیزافۆن"م دەستگیر نەبووە تا بە ڕۆشناییان سنووری ڕۆژگاری قەوان دەرکردنی بخەملێنم، بەلاّم هێندەی ڕاستییە بەڵگەییێك دەیسەلمێنێت کە بەر لە ١٩٣٨ قەوانی دەرکردووە!

مەلا کەریمی گۆرانیبێژ{١١} لەلای کۆمپانیای (هس ماستەرس ڤۆیس) قەوانێکی دیاری هەیە کە دوو گۆرانیی (گەبری مەقام) و (شەرقی نەشید: کە دەڵێن ئەمرۆ دەشت و کێو شینە)یەو ژمارەکەی " ن: ١١٠٠٧ / 11007 " ـە.

مریەمیش لەلای هەمان کۆمپانیا قەوانێکی دەرکردووە و ژمارەکەی "ن: ١١٠٠٨/ 11008) ـە.. ئەوجا مەلا کەریم خۆی لە حوزەیرانی ١٩٣٨ دا مردووە و ڕەنگبێ بەر لە مردنیشی بەچەند ساڵێ ئەم قەوانەی دەرکردبێت. بە ئەو ڕۆشنایییە دیارە مریەمیش لەهەمان ڕۆژ و هەر لە ئەو ساڵانەی بەر لە١٩٣٨ دا ئەو قەوانەی دەرکردبێت.

دەی وەك ناتوانم بڵێم لە ساڵانی ١٩٢٦-١٩٢٧ دا کەوتبێتە قەوان دەرکردن، دەتوانم بڵێم لە سەرەتاکانی ساڵە سییەکاندا قەوان دەرکردنی لێ وەشاوەتەوە !{١٢}.

وردبوونەوەم لەگەنجینەی ڕادیۆی کوردیی بەغدادیش، دڵنیای کردووم، گۆرانییەکانی مریەم- ئاهەنگێکی کۆمەڵیی لێ دەربچێت- هەموو لە قەوانەوە خراونەتە سەر شریتی موگناتیسیی. مخابن نێوی کۆمپانیاکان نەنووسراونەتەوە.. بەڵام خۆم-بەکڕین- بەکردو کۆشێکی بێ وچان (شەش) قەوانم دەستگیر کردووە کە(چوار) یان بڵاوکراوەی کۆمپانیای "هس ماستەرس ڤۆیس"و شەشیان (دووانزە) گۆرانییان -بەلاووك و بەستەوە- لەسەرە و لەڕیزی گۆرانییەکانی سەر شریتەکانی ڕادیۆشدان !

ئەز ئەو گۆرانییانە بە دوو شێوە ڕیز دەکەم و دەنوێنم:

١. گۆرانییەکانی سەر شریت:

١/١. لاووك...

١/١/١. ئەحمەدی سەلیم.

٢/١/١. دۆتمام

٣/١/١. جەمیلی چەتۆ.

٤/١/١. چوومە چەمی بشیریێ.

١/١/٥. سیّڤیّ.

١/١/٦. شەڕی ڤاڕو.

١/١/٧. فەرمان ئاغا.

١/١/٨. کور ئۆغلّی. {١٣}

١/١/٩. لۆ لۆ سوارو.

١/١/١٠. لیّ داییّ.

١/١/١١. لیّ دەلای.

١/١/١٢. محەممەدی ڕۆنی.

١/١/١٣. یار حەلیمیّ.

١/١/١٤. یار گەوریّ.

١/٢. بەستە..

١/٢/١. هەی بەردە بەردە.

١/٢/٢. ترسم بمرم.

١/٢/٣. هەی دەلال.

١/٢/٤. سدیقیّ.

١/٢/٥. قومریکا.

١/٢/٦. کراسیّ تە مەلەزە.

١/٢/٧. گریسیرا ب سیرا.

١/٢/٨. گولیّ وەی نار.

١/٢/٩. لاوییینە.

١/٢/١٠. لۆرکە لۆرکە.

١/٢/١١. لیّ دینیّ.

١/٢/١٢. لێ لێ وەسۆ.

١/٢/١٣. مالا عەدلێ.

١/٢/١٤. میرە مێ.

١/٢/١٥. وا ل بن بیێ.

٢. گۆرانییەکانی سەر قەوان: {١٤}.

٢/١. قەوانی کۆمپانیای، هس ماستەرس ڤۆیس **HIS MASTER VOICE**.

٢/١/ د ١/١: مەقام (لاووک) سێڤێ

ژ- ن: ١٠٠٨ / **N-1008**

**OMD.301**

٢/١/ د ٢/٢: مەقام – لاووک – محەممەدی ڕۆنی

ژ – ن: ١٠٠٨/ **N-1008**

**OMD.302**

٢/١/ د ١/٣: چووما چەمی بشیریێ (لاووک)

ژ – ن: ١١٠١٢ / **N-11012**

**OMD.303**

٢/١/ د ٢/٤: لێ لێ وەسۆ (بەستە)

ژ- ن: ١١٠١٢/ **N-11012**

**OMD. 304**

٢/١/ د ١/٥: کور ئۆغلی (لاووک)

ژمارە- ن: ١١٠١١٣/ **N-110113**

**OMD. 325**

٢/١/ د ٢/٦: گریسیرا بە سیرا (بەستە)

ژمارە- ن: ١١٠١١٣/ **N-110113**

**OMD. 326**

٢/١/ د ١/٧: هەی دەلال (لاووك).

ژمارە- ن:١١٠١٥/ N-11015

OMD. 317

محەممەد ئاغا جەزراوی و مریەم خان{١٥}

٢/١/ د ٢/٨: هەی بەردە بەردە (بەستە)

ژمارە- ن: ١١٠١٥/ N-11015

OMD. 320

محەممەد ئاغا جەزراوی و مریەم خان

٢/٢. قەوانێ کۆمپانیای: کۆلۆمبیا Columbia

٢/٢/ د ١/١: شەڕی ڤارۆ (لاووك) مەقام

ژمارە- ج.ئای.ئەی، ٢٩/ GIA.29

سی.ئۆ. ئێف، ١٢٤/ C.O.F 124

٢/٢/ د ٢/٢: لێ دینێ (بەستە)

جی.ئای.ئەی، ٢٩/ G.I.A. 29

سی.ئۆ.ئێف، ١٢٥/ C.O.F. 125

٢/٢/ د ١/٣: جەمیلی چەتۆ (لاووك) مەقام

ژمارە: جی.ئا.ئەی، ٥٥/ G.I.A. 55

سی.ئو.ئێف،١٢٦/ C.O.F. 126

٢/٢/ د ١/٤: میرە مێ (بەستە)

ژمارە: جی.ئا.ئەی، ٥٥/ G.I.A. 55

سی.ئۆ.ئێف، ١٢٧/ C.O.F. 127

دەرکەوت (بیست‌ونۆ) گۆرانیی لەسەر نزیکەی(پانزە)قەواندا تۆمارو بڵاوکردووەتەوە کە ئەوانە- هێندێکیان بەهۆی لێدانی زۆرەوە شێواون و ناتەواون- لە ڕادیۆی کوردیی بەغداد دا دیارن!

داخۆ هەر هێندە قەوان و گۆرانیی دەرکردووە؟

ئەز دڵنیام-بەڕۆشنایی توانای- کە پتر گۆرانیی گوتووە و قەوانی دەرکردووە، بەڵام مخابن ونن!! بۆ وێنە- نەسرین شیروان گوتەنیی- گۆرانییەکی خۆشی هەبووە، نێوی (خم خما ئەرتووشی) ی بووە!

ئەدی باری قەوان دەرکردنی چۆن بووە؟

ڕاستییەکەی سەرچاوەی تاک‌وتەنیێ هەر بیرەوەریی پێشینەکانە، بەتایبەتی هاوەڵەکانی مریەم کەهەرییێکەیان شتێ دەگێڕێتەوە. ئەڵماس هەر هێندەی بۆ من گێڕایەوە کە لەگەڵ مریەم لە قەوان دەرکردندا هاودەنگ بووە! قەوانێکی یادگار کە گۆرانیی (وا ل بن بیێ) ی لەسەرە- وەك ئاشناکرا- ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت، بەڵام حەسەن لەمەڕ تۆمارکردنی گۆرانیی سەرقەوان، چەند وێنەییێکمان بۆ زیندوو دەکاتەوە و لەلای من ئەوهە دەیاننوێنێت کە دەڵێت: (لە ماڵی وارتان ئەسکەندەریان کە ئەرمەنیی بوو، کۆمپانیای هس ماستەرس ڤۆیس- ئەبوو کەلبی- بەدەست ئەوەوە بوو، مریەم بە من‌ومحەممەدعارف جزیریی گوت، ئێوە دەنگتان خۆشەو دەتوانن وەڵامی من بدەنەوە!

ئەمجا من لەبەستەی: "لێ لێ وەسۆ"و محەممەد عارف لەبەستەی "گریسیرا ب سیرا"دا وەڵامـمان دایەوە. هەرهەمان کات کە لە ئەو ماڵەدا چووینە ژووری تۆمارکردن(!)، پراوەییێکی خێرامان کرد، دووایی تۆمارکران! سێ دینار درا بە مریەم، من و محەممەدیش پارەمان وەرنەگرت، چونکە قەوانێ بە سێ دینار پڕ دەکرایەوە!).

ئەگەر هەر هێندەی هەواڵی گۆرانیی قەوانەکان و چەند وێنەییێکی پچووکی باری تۆمارکردنیان بناسین، بێگومان پرسیار لەمەڕ چارەنووسی گۆرانییەکانی ئاهەنگەکانی-

ئەو ماوە کورتەی- لەلای ڕادیۆی کوردیی بەغداد دەکرێت، داخۆ چەند بوون و چییان لێ هات؟

ئەز زۆر عەودالّی دۆزینەوەی وەلامی ئەو پرسیارە گرنگە بووم، بەلاّم چەند ورد بوومەوە و لێی گەڕام چ یادگارێکم دەستگیر نەبوو لە ئەوە بەولاوە بەتەنێ پارچە (ئاهەنگێکی تێکەڵی مریەم و ئەلّماس و حەسەن)م ناسییەوە کە گۆرانیی (وا ل بن بیێ) ی بە دەهۆڵ و زوڕناوە ئاشنا دەکات. {١٦} وەك وردیش بوومەتەوە زۆر وێ دەچێت ئاهەنگەکە لە ١٩٤٧/١٠/٢٥ دا بەبۆنەی جەژنی ڕەمەزانەوە گێڕدرابێت.

ئەدی ژمارەی ئاهەنگەکانی و گۆرانییەکانی؟ ڕاستییەکەی ئەگەر ڕادیۆ دەفتەری بگرتایە- کە نەیگرتووە-و ئەگەر ژمارەکانی گۆڤاری (هونابەغداد/هنا بغداد)ی عەرەبیی ئەوکاتەم بەردەست بکەوتنایە، ڕەنگبو توانای وەلاّم دانەوەم هەبووایە، مخابن ئەم هیوایەو چاو هەڵخستنەم بێ ئەنجام بوو، بەلاّم بە ئەو ڕۆشناییەی کە چ یادگارێکی دی تۆمارکراو-هەروەهانووسراو- لەڕادیۆدا نییە، ئەز پێم وەیە کەگۆرانییەکانی ئاهەنگەکان تۆمار نەکراون و هەڵنەگیراون، یان هێندێکی تۆمار کراوە و لە دەست چوون. ئەز هەردوو بارەکەش چاوەنۆڕ دەکەم، چونکە لە سالاّنی ١٩٤٧-١٩٤٨دا بەدەگمەن ئاهەنگو گۆرانیی لەسەر (سیم وایەر)و(قەوانی ڕادیۆیی) تۆمار دەکران و تۆمارکردنیش لەسەر شریتی موگناتیسیی باو نەبوو!

وێڕا-بەڕۆشنایی باسی ئاهەنگ گێڕانی لە ١٩٤٧- دڵنیام کە ئاهەنگ و گۆرانیی جۆر بە جۆر و پتری گێڕاوە و بەرهەوا کەوتوون!

## دەنگ و ئاوازەکانی و بەهرەی؟

دەنگی مریەم خان لەژوور نێوەندییەوەیە، ناسك، بەسۆز و خۆشە، ژیێ خەمگینییش پتر خۆشتریان کردووە.هەناسەی درێژ، قورگی پاك، زمانی تەڕ و پاراو، دەربڕینی ڕەوان و زولاڵێ.

هەموو گۆرانییەکانی میللیی–فۆلکلۆریی–ن و لەنێوان (لاووك و بەستە) دان. بەشێکی لاووکەکان لەمەڕ بەیێکدا چوونی هۆزەکان و ئازایەتییە، وەك، (لۆ لۆ سوارۆ، جەمیلی چەتۆ، شەڕی ڤارۆ، کۆر ئۆغلّی) و بەشێکی دی ئەڤیینداریین وەك (محەممەدی ڕۆنی، دۆتمام، یارگەوریێ، یار حەلیمیێ). هەڵبەستی بەستەکانیش لەمەڕ ئەڤیندارییە و ئاوازیان بۆ شایی و دیلانە!

بەڕۆشنایی یادگارەکانی بەردەستم، چ هەڵبەست و هۆنراوێکی شاعیرانی کۆن و نوێی کوردیان نەنوواندووە، بۆیێکا چ ئاوازێکی نوێیان تێدانییە!

مۆسیقەی هەموو گۆرانییەکانیش بەتەختی خۆرهەڵاتییەوە– بێ بەکاربردنی سازێکی ناسراوی کوردەواریی، وەك تەنبوور– پێشکەش کراون. بەڕاستیی هێندە ڕێك و جوانن، بەتەواوەتیی شیرین و دلّڕفێنن! خۆیشی هێندە کارامە و جلّەوگیرە، هەرگیز کەم و کورتییێ، زمان گیرانیێ، شلّەژانی پێوە دیار نییە و ئەو پراوەکەمەی ڕووسووری کردووە، بەڕادەییێ هەست دەکەیت کە زۆر شارەزای گۆرانیی گوتنە و ئاشناییێکی کۆنی مۆسیقە و دەستەی مۆسیقە ژەنە جۆربەجۆرەکانە، بۆییێکا دلّنیا دەبیت کە ئەو دەستەیە، بەگشتیی ئاسانو جوان هاریکارییان کردووە. ڕاستییەکەی ئەوان– هێندیێ جاریش لەئاستی چڕینی بێ پشوویدا دەستە پاچەن– بەدەگمەن ناسازییان لێ دەرکەوتووە!

یێکیێ لە توانا جوانەکانیشی ئەوەیە، هێندیێ ئاوازەو ڕەزمی ڕەسەنی کوردیی بە قورگ و بە لێو زۆر جوانو ورد دەربڕیوە. ئەمەیشی کارم لێ دەکەن بلّێم لەنێو ژنە گۆرانییبێژەکاندا– بەکۆن و نوێوە– تا ئەورۆ کەس وەك ئەو ڕۆحییەتی کوردەوارییانێ

ئەوهە جوان‌و ڕەوان نەنوواندووە! دەشتوانم بڵێم ئەو بەهرەو توانایەی خۆی دەدات لەشانی گۆرانیبێژە بەنێوبانگەکان، وەك کاووس ئاغا، سەعید ئاغا، حەسەنی جزیریی، محەممەد عارف جزیریی!

بۆ ڕاستییش دەبێت ئەو باسەش بکەمەوەو ببێژم، ئەگەر ناتەواویی بەیتی لاووکەکان-واتە کێڕانەوەی بەیتەکان بەکورتیی- بەلەکەیێ لە قەڵەم بدرێت، ئەوە هەرگیز لەکەو گوناهی ئەو نییە، بەڵکو ئۆباڵەکەی لە ئەستۆی کۆمپانیاکانی قەواندایە کە هەمیشە-باوبووە-لەچەند دەقەیێکی کەمدا گۆرانیی لەسەر قەوان تۆمارو بڵاوبکەنەوە و مەبەستێکی بازرگانییان لەبەرچاو بووە نەك تەواو و ناتەوایی گۆرانییەکان.

خاڵێکی سەرنج ڕاکێشیش کە پێویستە قسەی لێ بکرێت ئەوەیە هێندێ گۆرانیی وەك: (میرەمێ، لێ دینێ، وا ل بن بیێ)، فەرمان ئاغا) هێند کۆکەیێ گرپی دەنگ و ساردییان پێوە دیارە و جۆش و خرۆش، ناسکیی و سۆز، چێژی خۆشی گۆرانییەکانی دی نانوێنن!

ئەز حەزدەکەم ئەوانە وێنەی دووا گۆرانییەکانی‌و سەردەمی نالەباریی ژین‌و تەندروستیی بن، یان بەتایبەتی لەبارێکی تەندروستی‌و تەنگانەی دەروونـدا بێژرابن. وێنەی فۆتۆگرافی دووەمی- لاوازە و ژاکا و خەمگینە- ئەم باوەڕەم بەهێزتر دەکات!

## بەهرەی و نرخاندنی!

پرسیارێکی سادە و ئاسان بۆ ناسینی سەرچاوەی هونەرەکەی ئەگەر بکرێت، دوو لقی هەیە: ئایا -وەك مرۆڤی وڵاتە پێشکەوتەکان- لەفێرگەیێکی هونەردا پێ گەییشتووە؟ یان داخۆ بنەماڵەکەی مەڵاشوویان بە هونەر هەڵ دابێتەوە؟

ڕاستییەکەی- ئەگەرچی باری ڕۆشنبیریی و خوێندەواریی ڕوون نییە- پێم وەیە کە وەك هەر کوردێکی گوندنشین ژێردەستەی تاریکیی سەڵتەنەتی عوسمانیی، نەك هەر

فێرگەیێکی هونەری نەدیتووە، بەڵکو بەشی خوێندەواریشیی بەرنەکەوتووە. هەر بەڕۆشنایی ئەو سەردەمە و باری نالەباری نیشتیمان و گەلەکەیشی- لە کۆمەڵی کوردەواریی خۆپارێز و دەستەمۆی داب و نەریتی کۆمەڵیی و ئایینیی- هەرگیز باوەڕیش ناکرێت کە بنەماڵەکەیشی بۆ هونەریان پەروەردە کردبێت!

دەی ئەم هونەر و توانا نایابەی لەکوێ ڕاوە ڕێچکەی گرتووە؟

ئەز پڕ باوەڕم کە فریشتەی هونەر، هەر لە منداڵییەوە فووی بەگیانی مریەمدا کردووە و بەهرەی پێ بەخشیوە و خۆیشی ماخولیای بووە بەڕادەیێ لە هەر شوێنێ، لە هەر ژن و مێرێکی کوردەوە دەنگ و ئاوازی کوردیی هاتبێت. بەهۆش و زەین و ئارەزووی چڕەوە ڕووی تێ کردوون سوێی بووەتەوە و لە ئامێزی گیانی گرتوون!

ژینی مریەم، بەتایبەتی- لەتاف جوانیی لاوییدا- دابڕانی لە بنەماڵەیی و هەوارگەی، شووکردنی ناکامی، ئاوارە بوون و کرێکاریی و کارەکەرێنیی- دەشڵێن لە ئەم هەلەدا دەستیشی بۆ درێژکراوە-ئەوجا پەرەوازە بوونێکی جوداوازو گیرساندنەوەی لەپێتەختی مەملەکەتی عەرەبی عێراقی نامۆدا، هەموو وەك وێنەی ژینێکی سەخت و دژوار و تاڵ و خەم بەخشن، بەڵگەیێکی دی عەشقی گیانی بەگیانیی ئەو بەهرە هونەرەیە کە پڕ باوەڕم هەرگیز نان پەیداکردن نەیتەقاندووەتەوە.. تەنانەت پێم وەیە هەر ئەو بەهرەیە لەخانە خوێی کردووە و قوربانیی پێ داوە و سەری پێ هەڵگرتووە، بۆیێکا هەمیشە تا جوانە مەرگ بوونی، ئاوازەی خەم هاوڕێی خۆی و گۆرانییەکانی بووە!

بەهرەی مریەم- بۆ وێنە- چەشنی بەهرەی دایکی جەمال نییە کە تازە تازە فێر و گۆرانیی بۆ ئامادە کراوە و بەکەم و کورتییەوە خۆی پێ نواندوون، بەڵکو بەهرەی مریەم وەك خۆرسکی دێتە بەرچاو، بۆیێکا بێ ئەوەی شارەزای مۆسیقە بوو‌بێت ئەو لاووك و بەستە ڕەنگینانەی زۆر جوان و نایاب گێڕاوەتەوە- کە بێ گومان هەریێکەیان لە ڕەگەزێکی مەقامی خۆرهەڵاتیی و کوردیی جۆر بەجۆرن-و ڕۆحییەتی نەتەوەییانی

دلّسۆزانه پاراستووه. هەروەها ئەگەر بەهرەی لەگەلّ بەهرەی ئەلّماس محەممەدی خزم و هاوڕێی بەراوورد بکرێت کە ئەمیان وێڕای دەرکردنی هێندیّ قەوان، لەنێوان ۱۹٤٥–۱۹٥۱ دا گۆرانیبێژی ڕادیۆش بووە و لە دوو سەد لاووك و بەستەی جۆربەجۆر–لەدەست چوو–ی گێڕاوەتەوە {۱۷} ئەوە نەك هەر لەڕووی دەنگو ئاوازەو دەربڕینەوە، بەلّکو لەڕووی سەلیقەو ڕەوانبێژییو جۆشو خرۆشەوە، بالاّی بەهرەو توانای گەلیّ گەلیّ بەرزترە!

تۆ وەرە– بۆ وێنە– گویّ لەلاووکی (محەممەدی ڕۆنی) بگرە کە لەدەروونی پڕ سۆزو ئارەزووی کیژێکی ئەڤینداره‌وە هەلّقولاّوە، هێندە بەیت و ئاوازەکانی بە کولّی دلّ دەگێڕێتەوە، بەدلّتدا دێت کە خۆی خاوەندی بەسەرهاتەکەی بێت کە تێیدا نزا لە هەرکەسیّ دەکات لە دلّدارەکەی بکات..دەلّێت، (ئەگەر مێربیّ ژنی بەنسیب نەبێت، ئەگەر ژن بیّ سك نەکات، ئەگەر کیژ بیّ خێر لە جوانیی خۆی نەبینێت..هتد.)

بەڕاستیی من بە یێکیّ لە گۆرانییە ئەنتیکەو نایابەکانی گەنجینەی گۆرانیی کوردیی دەزانم.

هەروەها ئەگەر– بۆ وێنە– گویّ لە بەستەی (گریسیرا ب سیرا) بگریت کە ئەویش لە دلّو دەروونی کیژیّ یان کابانێکی کوردی پیشەزان و ئەڤیندارەوە هەلّقولاّوە، هەست دەکەیت کە –وێڕای ئاهەنگی تەختی مۆسیقەی خۆرهەلاّتیی– بەستەییێکی دیلانیّ بۆ حەزو ئارەزووی دلّی گەرمی دەبێژێت، تەنانەت هێندە بەجۆشو خرۆشە، هەست دەکەیت ژێکانی خەمباریی سست و تەزیون و هەرخۆیشی ئەو کیژە یان ئەو کابانەیە و دەست و پەنجەی لەگەلّ ڕەزم و ئاوازەی دلّی یێکیان گرتووە بۆ ڕستنی گوریسێکی جوان و ڕەنگین بۆ دلّدارەکەی تا پەسنی بکات!

لەئێرەدا هیوام هەیە ڕۆژێکی نزیك مۆسیقە ناسیّ هەلّبکەوێت تا بە خوێندنەوەییێکی مۆسیقیانە، بەهرەی بەراوورد بکات پتر نهێنییەکانی بەهرەی ئەم ژنە بسەلمێنێت!

دەی ئەگەر دایکی جەمالیش یێکەم ژنە گۆرانیبێژی شێوەی سلێمانیی بووبێت لەسەر قەوان، ئەوە مریەم خان یێکەمە بەشێوەی کورمانجیی باکوور.

لەلاییکی دیەوە ئەم–بەرۆشنایی یادگارەکانی بەر دەستم– بووژێنەو پارێزگاری کۆمەڵێ لاووك و بەستەی باو و باپیران و داپیرانن کە هێندێکیان هەر ئەو گوتوونی، بەتایبەتی ئەوانەی کە تایبەتن بە گێڕاندنەوەییێکی ژنانە.

وێڕای ئەو باسانەش مریەم خان لەڕیزی ئەو دەستە گۆرانیبێژ و مۆسیقەزانە کارامە و یێکەمەدایە کە لەدووای یێکەم جەنگی گێتیی لە کوردستانی باکوورەوە کۆچیان کردووە بۆ باشوورو لەمەملەکەتی عێراقیعەرەبدا بەگۆرانییو مۆسیقەو قەوان دەرکردن، سامانێکی بەنرخی کەلەپووری هونەری کوردیان بووژاندووەتەوەو بڵاوکردووەتەوەو بەشێکی مێژووی هونەری نەتەوەکەیان بۆ هەتا هەتا نووسیوەتەوە. وێنەی ئەو دەستە یێکەمەش سەعید ئاغای جزیریی، حەسەنی جزیریی، محەممەد عارف جزیریی، محەممەد حەسەن کروویی، هەروەها کەمانژە ژەنی زانا– ون بوو– ئەسکەندەریی جزیریی{١٨} و حسێن عەبداللەی جزیریی دومبەکژان! {١٩}.

دوواجار ئەز دڵنیام ئەگەر مریەم خانی ئەستێرە گەشە تاكو خەمناكو بێ کەسەکەی کورد، وڵاتو گەلەکەی ئازاد و پێشکەوتوو بووایە، بێ گومان بەرهەمی پتر و دیارتر، نێوبانگی گەورەتر دەبوو، چەشنی ژنە گۆرانیبێژی فرانسیی ناسراوی دنیا، (ئێدیت پیاف EDITM PIAPH) کە ئەویش– لەهەمان سەدەی مریەم خاندا– بێ کەس و داماو و سەرگەردان لە کووچە و کۆڵانان و مەیخانانددا هەڵکەوت، بەڵام ئازادیی و پێشکەوتوویی وڵات و گەلەکەی پشتیوانی بوون و یاد و یادگاریان پاراست و هەقی ژانەکانی ژینیان بۆ کردەوە، بەڕادەیێ ئێستە و بەرەودوواش لە دنیادا شانازیی پێوە دەکەن و هەر ساتە ناساتێ بەرهەمەکانی بەسەدان هەزار قەوان و CD بڵاودەکەنەوە!

تۆ بڵێبێت ڕۆژ ببێتەوەو گەلی کورد ئازاد بێتو یادو یادگاری ئەم هونەرمەندە گەورە و جوانەمەرگەی لە پەیکەری زێڕین بگرێت؟ ئەز دڵنیام.

## داوێن

لــەســـەرەتای ســـاڵی ١٩٦٦ـەوە تاساڵی١٩٧٠.لەسەر ڕادیۆی کوردیی بەغدادا، بەرنامەکانی (دەنگی هونەر)، (دنیای ئەدەبوهونەر)، (بۆ خۆشیتان) و لە ١٩٧٠-١٩٧٣ شدا بەرنامەی (پەیامی هونەر)، لە تەلەفزیۆندا پێشکەش کرد!

گوێگرەکانی ڕادیۆو تەلەفزیۆن ئاگادارن کەخولیاییێکی گەورەم دۆزینەوەو ناسینەوەو ئاشناکردنی گۆرانیبێژەکانی ڕابووردوو بوو.. بەشوێن قەوانو وێنەو هــەر یادگارێکیانـدا دەگەڕام ئەوان و گۆرانیبێژە زیندووەکانیشم بانگ دەکرد بۆ هاریکاریی.

ڕاستییەکەی گۆرانیبێژە زینـدووەکان-بـە ئـەڵماس محەممـەدەوە- وێنـەی هاوەڵـە ناسیاوەکانیان دەستگیر نەکردم، تەنانەت گوێگرەکانیش.

هەر لەو هەلانەدا پەنام بردبووەوە بەر وێنەگری ستۆدیۆکانی بەغداد کـە گـەلێکیانم پشکنی بۆ وێنەی فۆتۆگراف، سەیید عەلی ئەسغەری کوردستـانیی، مـەلا کـەریم، دایکـی جەمال، مریەم خان، سەعید ئاغا، غەفوور ئاغاو هاوتایان، بەڵام چ ستۆدیۆیێ وەڵامێکی شیرینو ڕاستیان نەدامـەوە! یێکـی لـەنێو ئـەو سـتۆدیۆیانە سـتودیۆنێ بـوو کـەدرەنگێ (وێنەیێك)ی مریەمی بەنێوی (مریەم کەچەڵ)ەوە خستبووە بەر خۆری گۆڤـاری (الأذاعـة والتلفزيون-س ١٩٧٧).

ئەز ئەو هەلە- لەڕادیۆ دوور خرابوومەوە بۆ مۆزەخانەی سلێمانیی- دەسـت بـەجێ چووم بۆ بەغدادو چونکە نێـوی سـتۆدیۆکەش لـەلای گۆڤارەکـە ئاشـنا نـەکرابوو، چـەند ڕۆژێ بە(وێنە پچکۆلانەکەی نێو گۆڤارەکەوە)دیسان بەنێو ستۆدیۆ کۆنەکاندا گەڕامەوەو سۆراخی ئەسڵی وێنەکەم کرد. دوواجار لەستۆدیۆی (الاهالی/ئەلئەهالیی)ی سەرشەقامی

ڕەشیدی بەغدادا وێنەکەو ئەو چەند وشە ساکارەی گۆڤارەکە—بەنێوەکەشەوە—دامنەوە بەڕووی خاوەند ستۆدیۆکەدا کە " دە " ساڵێ لە ئەو بەرەوە دیدەنیم کردبوو. منی نەهاتەوە بیرو گوتی:

– ئەم وێنەیە و قسەکان هی ئێمەیە. ئەسڵەکەشم داوە بە گۆڤارەکە!

پتر گوتی:

– ئەم وێنانە بابی کۆچ کردووم گرتوونی!

پرسیم:

– ئەی وێنەی دیت نییە؟ هەروەها تۆ مریەم کەچەڵت نەدیتووە؟ پێوەندییێك و ئاشناییێتان نەبووە؟

– من چ پێوەندییەکم نەبووە و ناییناسم و هەر هێندە دەزانم لە بابولموعەززەمدا ژیاوە. چەند جارێ هاتووە بۆ وێنەگرتن!

تکام لێ کرد کە بگەڕێت بۆ (جام) ی وێنەکە و هەر وێنەیێکی دی مریەم!

گوتی:

– ئەمە وەختی پێ دەوێت و بە ئەم دەمودەستە بۆم نادۆزرێتەوە! پانزە ڕۆژی دی سەرم لێ بدەرەوە!

گوتم:

– من لە سلێمانییەوە هاتووم و سێ ڕۆژە ستۆدیۆکانم پشکنیوە!

چەندم کرد لە قسەی خۆی دانەبەزی. ناچار بە قسەکەی قاییل بووم و گەڕامەوە بۆ سلێمانیی.

دووای پانزە ڕۆژی دی چوومەوە بۆ بەغداد. ئەم جارە هەر دووای سڵاو لێ کردنی، (وێنە) یێکی نوێ مریەمی خستە بەردەستم و گوتی:

- جامی وێنەکەی دیم نەدۆزیوەتەوە، بەلام شانست هەبوو ئەم وێنەیەم هاتە دەست!

زۆرم سوپاس کرد و پارەم بۆ ڕاگرت و بەتەنێ (٥٠٠) فلسی لێ هەلگرت.. بەلام من رلەنوێ تکام لێ کردەوە کە ئەگەر بیرەوەرییەکی لەگەلێ مریەم هەیە، یان باسی ىتبێت ئاگادارم بکات، مخابن بەبیانووی بێ ئاگایی و سەرقالییەوە خۆی پەڕاندەوە.

بۆ ڕاستییش دەلێم: (وێنەی یێکەم/ بلاوکراوەی گۆڤارەکە**) کە بێ گومان دیارە ەی تاقی جوانیی و قەوان دەرکردنیەتی، هەروەها (وێنەی دووەم) ی نوێ، بلاوم کردنەوە تا چەند قەوان و هەوالی پترم دەستگیر کرد.. ئەوجا بەورد بوونەوەمەوە بمن بۆ (هاوکاری:١٠/١٢/ ١٩٧٩) و بلاوکرانەوە.. تا ئەو هەلەش هیچ کەسێ وێنەی کەم و دووەمیشی نەناسیی بوو، تەنانەت لە هەشتاکاندا درەنگێ (الاذاعة والتلفزيون) ەی دووەمی- دیسان بەنێوی مریەم کەچەلەوە- بلاوکردەوە.

ئەز- ئێستە لەدووا مانگەکانی سالی ١٩٩٩ و لە مەنفای ئەورووپادا- ئەم پاشکۆیە نووسمەوە، هێشتا سەیرم پێ دێت کە هێندێ کەس، وێنەکان، تەنانەت لە ڕۆژنامەی یەتی ١٩٩٩ و لە گۆڤارێکی کوردیی سوید لە ١٩٨٩ دا، بلاودەکەنەوە و سەرچاوەیان رامۆش دەکەن. لە ئەوەش سەیرتر شەعبان مزیری نێوی لە گۆڤاری (ڕەنگین- ژ٢٤ و ١ ی تەشرینی یێکەم و دووەمی ١٩٨٩) دا- لەگەلێ وێنەی یێکەم- بەنێونیشانی ریەم خان سترانبێژا کورد) بلاوکردبووە و نووسراوەکەیشی (کورت کراوە - تەلخیس) ربەی وردبوونەوەکانی سالی ١٩٧٩ی منەو هەرگیز -وەك زانا بێت- ئاماژەی بۆ ەرچاوەیش نەکردبوو. وێڕاش خۆی چی نوێی پێ نەبووە!

ئەز کاتی خۆی لە بەشە کوردییەکەی ڕۆژنامەی (عێراق- لا ١٣٨ ی ٢٥ /٨/ ١٩٩٠)دا نێوی (ڕەخنە)ەوە هێمن لێم نووسیی و گوت بووم: (خۆزیا ئەم جۆرە کردەوانە لە ژنامەنووسییدا دووبارە نەدەبوونەوە کەبێگومان دەبنە مایەی خولقانی پیرۆزیی

وشەی چاك‌و ڕۆژنامەنووسیی کوردیی!). سەیرو سەمەرە گەورەترە کاتێ کە(باکووریی) حازر خۆر لەکتێبەکەیدا (گۆرانیبێژە نەمرەکان) لەئەو کەسە خراپتری کردووەو رەنجو کردو کۆشی منی پێشێل کردووەو شەعبان‌و رەمەزان پێش دەخات‌و بێ پرسم لێکۆڵینەکانم‌و وێنە کۆکراوەکانمی بڵاوکردۆتەوە کەئەمە بەڵگەی بێ وێڵییەکی گەورەیە!!!

* نێوی خاوەند ستۆدیۆکەم لە پسووڵەیێکدا نووسیی بوو، خست بوومە ئارشیفی نووسینەکانمەوە، بەڵام مخابن لە نێو سەدان پسووڵەدا –بەتایبەتی بەهۆی تاووتوێ کردن و ماڵ گواستنەوەوە– لەنێو چووە، چەشنی دەیان شتی لە ئەم بابەتە.

** ئەز بەهەڵە لەمەڕ (وێنەی دووەم)قسەم کردبووو گوتبووم:(دەشێ هی سەرەتای هاتنە بەغدادی بووبێ!!). ڕاستییەکەی وەك دوواتر خۆم زۆری لێ وردبوومەوەو بەراووردی یێکەمیشم کرد، هەروەها وەك پێ نیشانی نەسرین شیروانم دا، ئەم وێنەیە هی دووا ساڵەکانی تەمەنیەتی!

## پەراوێز

{١}. تا ئێستە چ بەڵگەنامەیێکی ڕەسمییانەی بەردەست نەکەوتووە!

{٢}. ئەڵماس محەممەد (١٨٩٤ هارگول– کوردستانی باکوور– ١٩٧٩ بەغداد). جێگەی باسە ئەڵماس ئەلبوومەکانی فۆتۆگۆافی پێنیشان دام، پێم سەیربوو چ وێنەیێکی فۆتۆگرافەکانی مریەم یان هاوەڵەکانی دی هەڵنەگرت بوو.

{٣}. یووسف سەعید لە خزمانیەوە هەواڵەکانی وەرگرتووە!

{٤}. کاکەمین حەوێزیی بەهەشتیی، ئەوکاتە تەمەنی نزیکی حەفتا ساڵ دەبوو، ڕەبەن بوو، لەلای خوشکەزاکانی لە گەڕەکی ئیسکان دەژیا لە بەغداد دا. پیاوێکی نەرم، ڕۆح سووك، دەم بەخەندە بوو. تا بڵێیت نەتەوەپەروەر و دڵسۆزی کەلەپووری گۆرانیی کوردیی بوو.. قەوانە کوردییەکانی هەڵگرت بوو، تەنانەت ئەو گۆرانییانەی کاوس ئاغا کە ئێستەش لە ڕادیۆدا لێ دەبڕێن– زۆربەیان لە قەوانی ئەوەوە من خستمنە سەر شریتی ڕادیۆ– بیرتیژ و زەین ڕوون

بوو، بەلاَم مخابن دەیان جار لەنێوان١٩٦٦-١٩٧١دا گفتی پیێ دەدام کە دوو بە دوو بەتایبەتی باسی گۆرانیبێژەکانی ڕابردوو، باسی کۆمەڵی لاوانی کورد- بەغدادم بۆ بکات، کەچیی هەرگیز ئەم هیوایەم نەهاتە دی. مەلامەتیش سەرقاڵیی و هاتوچوونی زۆری بوو بە کارەکەیەوە کە وێنەگرێکی کارامەی سینەمەیی تەلەفزیۆن بوو، زۆر کات لەگەڵ کاربەدەستە گەورەکان لە هەندەران و بە بازێڕەکانەوە بوو.

ئەز لە ساڵی١٩٧١دا بووم بە نوێنەری ڕادیۆ لە سلێمانییدا، ئیدی بەدەگمەن لە دیدەنیی کردنی بەغدادا بمدیبایە.. بەدرێژایی ناسیاویشمان هەمووی بخەیتە سەرییێك (دە) سەعات قسەمان نەکردووە، بەلاَم زۆر خۆشەویست و بەڕێز بوو. مخابن لە ساڵی ١٩٧٢ دا دەزگەی ئاسایشی دڕندەی حوکوومەتی بەعس- هەر لەبەر ئەوەی کوردە و خزمی وەزیر نافیز جەلال حەوێزیی بوو- گرتیان و لەزیندانی " قەسرولنهایە" ئەشکەنجەیێکی زۆریان دابوو، ئەو وەزیرە نەبووایە، هەرگیز بەرەلاَ نەدەکرا. دووایی خۆی خانەنشین کرد و لەماڵدا گۆشەگیر ژیا تا لە سەرەتای هەشتاکاندا گیانی پاکی دەرچوو.

ئەز زۆرم کۆشش دەکرد دیدەنیی بکەم، بەلاَم هێندێ ناسیاو و خزمی نەدەهاتنە ژێرباری یارمەتیی دانم بۆ دیدەنیی، کەمن ماڵیانم پێ نەدەزانیی.

کاکە مین وێنەگری فۆتۆگراف لەمووسڵدا، ئەوجا تەکنیککارێکی نێرووی هەوایی عێراق لەسەرەتای دامەزراندنی ئەم نێرووەدا، دووایی بووە بەوێنەگری سینەمەیی و لە١٩٥٦دا لە تەلەفزیۆندا دامەزراوە. ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵی لاوانی کورد-بەغداد بووە. هەروەها لەپارتی "هیوا"دا. بۆ یادگاریش دەیگێڕمەوە، ڕۆژێ لەسەر جاددەو لەلای ڕادیۆوە باسی لاووکەکانی کاوس ئاغای بۆ کردم، زۆرم پێ سەیر بوو، بولبول ئاسا بەیتی (گەنج خەلیل و حەفسەد)ی بەڕەوانیی و بێ پشوودان بۆ گێڕامەوە. بەڕاستیی لەدەست چوونی کاکە مین و باسەکانی، هەتا بژیم وەك کەسەرێکی گەورەیە لەدڵی مندا!

{٥}. کۆمپانیاکانی قەوان لە مەملەکەتی عێراقدا، مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ دووای یێکەم جەنگی گێتیی و دامەزراندنی ئەم مەملەکەتە لەساڵی١٩٢١دا. بەپێی هێندێ نووسراوی بلاَوکراوو بیرەوەری کەسانێ، کۆمپانیای (بەیزافۆن **Baidaphon**) بەر لەهاتنە عێراقەوە بە(دەنگی

خاتوون) ناسرابوو- لە١٩٢٤دا هاتە عێراقەوە- کە کۆمپانیاییێکی بازرگانیی بوو بەنیشانەی "سەگێ گوێ لەخاتوونی دەگرێت"و لەساڵی١٨٩٧دا گرامەفۆن- ئامێری قەوان /لێ دانی/ داهێنا. ئەم کۆمپانیایە لە ساڵانی بیستەکاندا کۆمپانیای (بەیزافۆن) ی بەهۆی خاوەندەکانەوە، جووتە برا (جوبرا و پەتروس بەیزا) دامەزران‌و لەساڵی١٩٢٦دا (جوبرا) لقی عێراق‌و ئەوجا (پەتروس) لقی لە میسر و سودان و ئافریکا کردەوە. کۆمپانیاکەش ئەڵمانیی بوو.

هەروەها لەساڵی١٩٢٩دا کۆمپانیای (ئۆدیۆن Odion)ی فرانسیی لقی لە عێراقدا کردەوە. ئەوجا کۆمپانیای (پۆلیفۆن Poliphon)ی ئینگلیزیی کە (ج.کالدرون)ی خاوەندی لقی لەمیسر و عێراق و وڵاتانی دی عەرەبدا کردەوە! ئەم کۆمپانیایە دوایی گۆڕدرا بۆ کۆمپانیای (پۆلیدۆر) کە هەتا ئەورۆ دەژیی.

دوایی کۆمپانیای ئینگلیزیی (دەنگی ڕێزدارەکەم/صوت سیدیHis Masters Voice) لە نێوەندی سییەکاندا هەڵکەوت‌و لقی لەعێراقدا دامەزراندو چاپەکەیشی-پێم وەیە بەهۆی دووەم جەنگی گێتییەوە- لەوڵاتی پاکستاندابوو. ئەوجا کۆمپانیای (کۆلۆمبیاColumbia) هەڵکەوت کە پێم وەیە ئەویش لە نێوەندیی ساڵانی سییەکاندا دامەزراوە.

هێندێ کۆمپانیای دیش لە عێراقدا هەڵکەوتوون، چ بێگانە چ خۆماڵیی، وەك (هۆمۆ کۆرد Homokord)،بەلام یێکەمین کۆمپانیای خۆماڵیی عێراق (چەقماقچی فۆن Chakmakachiphon)ی بەغداد بوو کە چاپی قەوانەکانی لەسویدا بوو. ئەم کۆمپانیایەش لەلایێن خانەدانی چەقماقچییەوە لەنێوەندی پەنجاکاندا دامەزرا.

جێگەی باسە، هەرگیز چ پارەدارێکی کورد- وەك کۆمپانیای جگەرە دروست کردنیان لە بەغداددا دامەزراند- بیری بەلای کردنەوەی کۆمپانیاییێکی قەواندا نەچووە کە ئەمەش دیسان وێنەی کورتبینیی ڕۆشنبیرییە!!

ئەمەش لیستی نێوی کۆمپانیاکانی قەوانن لەنێوان ١٩٢٤-١٩٦١دا لەعێراقدا. کوردەکانیش لەلای زۆربەیان قەوانیان دەرکردووە:

* ئۆدیۆن،
* بەشیرفۆن.

* بەیزافۆن.
* پۆلیفۆن. (لە ئێرانیشدا لقی هەبووە و لە ١٩٢٩ دا گۆرانییەکانی سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانیی چاپ کردووە !).
* " دەنگی خاتوون".
* چەقماقچی فۆن.
* سۆڤۆ (عەلی مەردان مەقام– نەوا– ی بەفارسیی لەلاگوتووە.).
* عێراقفۆن.
* کۆلۆمبیا.
* نەعیمفۆن.
* " هس ماستەرس ڤۆیس / ئەبوو کەلب "
* هۆمۆکۆرد (عەلی مەردان ئەڵڵاوەیسیی و گۆرانیی " بوگویلن یار ئۆلایدیی " تورکمانیی لەلا تۆمار کردووە !).
* **سەرچاوەکانیان**

١. عومەر قەززاز / سلێمانیی
٢. بیرەوەریی هێندێ کارمەندی ڕادیۆی بەغداد.
٣. قەوانی جۆربەجۆری ئارشیفم.
٤. ڕۆژنامەی عەرەبیی (ئەلسەفیر / السفیر – س ١٩٩٩) بەیروت.
٥. ڕۆژنامەی (ئەلعێراق / العراق) بەغداد.
٦. گۆڤاری عەرەبیی (ئەلقیتارە / القیتارە) بەغداد.

لەلایێکی دیەوە ڕادیۆی مەملەکەتی عێراق لەدووا ساڵەکانی چلەکانەوە قەوانی کۆمپانێکانی (مارکۆنی، یۆنایتد ئاژانس)ی دەرکردووە و تایبەت بەخۆی بووە !

بیرەوەریی عومەر قەززاز لەمەڕ تۆمارکردنی گۆرانیی سەر قەوان هێندەیە کە بۆ منی گێڕایەوە، (پاش تۆمارکردنی دەنگ بە ئامێری ناسراو بە " ئەبوو بۆریی " دەنگەکە دەنێردرا بۆ ئەلەمانیا و لە ئەوێدا چاپ دەکرا !).

ئەلیاس موری خاوەندێکی کۆمپانیای (مێستری مور) بۆ بڵاوکردنەوەی قەوان– لەلای ڕۆژنامەی ئەلسەفیر– دەگێڕێتەوە: (جۆرێ لە " سیلاندەر " هەبوو، سەعاتێکی لەسەر بوو. کە دەخولایەوە هێلێکی لەولەبیی دەکێشا و سەعاتەکەش هەلّی دەکۆلّیی و دەنگەکەی لەسەر چاپ دەکرد. ئەوەش بۆ داهێنانە رەسەنەکەی باپیری گرامەفۆن،"ئەدیسۆن"ی زانا دەگەڕێتەوە.

دووایی قەوانێکی سواخ دراو بە مۆم داهات. گرامەفۆنی تۆمارکەریش بریتی بوو لە لوولەیێ– بۆرییەکی گەورە و گۆرانیبێژەکە و دەستەی مۆسیقە و گۆرانیی سەندنەوە– کۆرس– لە دەوری خڕدەبوونەوە و گۆرانیبێژیش دەستی دەنایە پەنا گوێی و دەچڕیی!).

هەمان کەس پتر دەبێژێت:(خاوەند کۆمپانێکان دەزگەی تۆمار کردن و ئەندازیاری دەنگیان لە ئەورووپاوە–ئەلّمانیا و فرانسە– دەهێنا. گۆرانیبێژ کە گۆرانیی دەچڕیی بۆی نەدەلووا گوێی بگرێتەوە، بەلّکو چەند جارێ گۆرانییەکەی دەگێڕایەوەو وەردەگیرا و ئەوجا هەمووی دەرنێردرا بۆ کارخانەکان و لە ئەوێشدا لە قالّبێکی ئاسن دەدران و لەسەر چەند هێلّێك ڕیز دەکران، ئەوجا بە کلّێشەی قەوانەکەوە دەنێردرانەوە بۆ وەکیلی بلّاوکەرەوەی لە ولّاتەکەدا. گوێیان لێ دەگیراو کامەیان پەسەند بکرابایە هەلّدەبژێردرا و چاپ دەکراو بلّاودەوبووەوە. ئەو هەلەش گۆرانیبێژەکە دەیتوانیی گوێیان لێ بگرێتەوە!)

{٦}. چونکە بۆ بەرەو دووا لەژمارەکانی (هونابەغداد/هنابغداد)دا نێوی دەرنەکەوتووەتەوە!

{٧}. بەپێی زانینەکانی کارمەندەکانی ڕادیۆ و گۆرانیبێژەکانی وەك عەلی مەردان، حەسەن، نەسرین.. هتد. هەروەها بەڕۆشنایی گۆڤاری (هونا بەغداد/ هنا بغداد).

{٨}. بنۆڕە پەراوێزی (ژ–٥).

{٩}. حەسەنی جزیریی لە گفتوگۆ تۆمار کراوەکەیدا گوتی: (بیستم کە سەبرییە و ڕوشدی عەلیی نێو کەدۆستی بوون، مالّی ئەویان خواردووە و تەماعیان کردە پارەکانی و بە پزیشکیان گوت: بیکوژن!!).

{١٠}. در. عیززەددین مستەفا ڕەسووڵ لە ١٩٧٩ دا بۆ منی گێڕایەوە کە (شووی کردووە بەبرای ئەفسەرێکی کوردی بادینان و منداڵی لێ بووە. ئەو کەسە ئەفسەرە خانەنشینەش دانیشتووی بەغدادەو ناهێنێ نێوی بهێنم! !).

{١١}. مەلا کەریم (١٨٨٥. مەهاباد- حوزەیرانی ١٩٣٩. سلێمانیی).

{١٢}. پێم وەیە بەهۆی دووەم جەنگی گێتییەوە لە چلەکاندا قەوانی دەرنەکردووە!

{١٣}. بۆ تێ گەییشتنێ لە لاووکی بەنێوبانگی (کور ئۆغلی) و چیرۆکەکەی کە ئازایەتییە، بنۆڕە کتێبی، (لمحة عن الاکراد/لەمحە عەن ئەلئەکراد= نۆڕینێ لە کوردان: تۆما بوا- تەرجەمە محەممەد شەریف عوسمان، مەتبەعەت ئەلنوعمان، بەغداد ١٩٧٣).

{١٤}. ئەز وەك دڵنیام کۆمەڵێ قەوانی ونە، چ قەوانێکی لەسەر ڕەفەکانی ڕادیۆی کوردیی بەغدادا نەبوو. هیوام بەخوایە دۆستانی هونەر چەند بتوانن لە قەوانە ونەکانی بگەڕێن و ئاشنایان بکەن!

{١٥}. مەبەست محەممەد عارف جزیرییە.

{١٦}. دەهۆڵ و زوڕنای (هماکیان) ی ئەرمەنیی کە دواتر لەگەڵ (نزار) ی کوڕی گەلێ یادگاریان هەبوو. نزاریش -دوای کۆچی بابی- جێگەی گرتەوە خزمەتێکی جوانی کەلەپووری کوردیان کرد! یاخود خۆیان‌و چاکەیان بەخێر!

{١٧}. بەپێی دەفتەری گۆرانیی گوتنی خۆی. (هەڵگیراو لەلای من!).

{١٨}. ئەسکەندەری جزیریی، کەمانژەنێکی تواناو بەنێوبانگ بووە. هیچ سەرچاوەیێکی کوردیی یان عەرەبیی باسی ڕەچەڵەك و یادگار و ژین و مردنی نەکردووە.

کۆچ کردوو عومەر جەلال حەوێزیی لە ساڵی ١٩٧٨ دا - لەبەغدادا- بۆ منی باس کرد کە ئەو زاتە، ئەسکەندەر ئەوەیە هاوڕێی گۆرانییەکانی لاوك زانی نەمر (کاووس ئاغا)یە. لە جزیرە و بۆتانەوە دەربەدەر بووە و هاتووە بۆ عێراق وەك هاوەڵەکانی، مریەم و محەممەد عارف و ئەڵماس و حەسەن.

{١٩}. حسێن عەبداللەی جزیریی، دومبەکژانێکی توان و لێ هاتوو بوو، لە ڕادیۆی بەغدادا تا ساڵی ١٩٦٩ دا! لە ستۆدیۆی مۆسیقەی ڕادیۆدا تەماشای دەست و پەنجە و ژیریم دەکرد...

کە هاتە دەرێ پیرۆزباییم لێ کرد و بە عەرەبیی لێم پرسیی کە کوێندەریە؟ ئەو بە کرمانجیی وەڵامی دامەوە و گوتی: ئەز کرمانجم. خەڵکی جزیرەمە! گوتم، بمبەخشە تا ئێستە من دەمزانیی عەرەبیت!

زەردەخەنەیێکی نەرم و جوانی پێ نیشان دام و چیی دی لەسەری نەڕۆیشت!

سەیر ئەوەیە ژمارەییێکی گۆڤاری (ئەلقیتارە/القیتارە)ی بەغدادیی هەشتاکان، ژیننامەی نووسیوەتەوەو وێڕای ستاییش کردنی زۆری بە (عەرەبێکی مووسڵی) ئاشنا کردووە. ئەو کاتەی من قسەم لەگەڵ کرد، سەری سپیی و پۆشتەیێکی جوان بوو، تەمەنی نزیك شەست و پێنج ساڵێ دەبوو!

## سەرچاوە

(١). ئەڵماس محەممەد، (گفتوگۆی ڕادیۆیی و دەمودوویم، ١٩٦٦/١١/١٤. بەغداد–ماڵی خۆی لەگەڕەکی ئەلدوورین، عەلاوی حیللە!).

(٢). الاذاعة والتلفزيون، (ذكريات بغداد القديمة من خلال ستوديو أهلي " زیکرەیات بەغداد ئەلقەدیمە مین خیلال ستۆدیۆ ئەهلی/ بیرەوەریی لەمەڕ بەغدادی کۆن بەهۆی ستۆدیۆییێکی خەڵکەوە!"، ٣ تەمووز ١٩٧٧/بەغداد). (گۆڤار).

(٣). حەسەنی جزیریی: (گفتوگۆی تۆمارکراوەم) بۆ بەرنامەی ڕۆژێ لە ڕۆژان، ١٩٧٩/٩/٣. سلێمانیی– ماڵی خۆم).

(٤). سەگڤان عەبدولحەکیم، هاوکاری– ١٩٧٧/١٠/٣/ بەغداد (ڕۆژنامە).

(٥). عومەر جەلال حەوێزیی، (گفتوگۆی دەمودوویم، ١٩٩٦/٣/٢٢. کۆیێ – ماڵی خۆی).

(٦). کاکە مین حەوێزیی، (گفتوگۆی دەمودوویم،١٩٦٨/٣/٢٢.بەغداد–ڕادیۆ و تەلەفزیۆن).

(٧). کامیل کاکەمین، (گفتوگۆی تۆمارکراوم بۆ ئارشیف،١٩٨٤/٣/٦.سلێمانیی–ماڵی خۆی).

(٨). مونیر بەشیر، (گفتوگۆی دەمودوویم، ١٩٨٩/١٠/١٦. بەغداد– مەڵبەندی کەلەپووری مۆسیقا لە وەزارەتی ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندندا).

(٩). نەسرین شیروان، (گفتوگۆی تۆمارکراوم بۆ بەرنامەی ڕۆژیٚ لە ڕۆژان، ١٩٧٩/٩/٢. سلێمانیی- ماڵی خۆم).

(١٠). هنا بغداد- تەشرینی دووەم ١٩٤٧ (المنهاج الكردى " بەرنامەكانی كوردی/ بەغداد). (گۆڤار).

(١١). یووسف سەعید " ئەب "، (التراث الشعبي - ئەیلوول ١٩٧١/بەغداد). (گۆڤار).

# ١١

# نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی

## ڕێڕەوی باس

گەلی کوردی ژێر دەستەو نیشتیمان دابەش کراو، تا کۆتایی سەدەی نۆزدەم، بزاڤی چاپو بڵاوکردنەوەو ڕۆژنامەنووسیی بەخۆوە نەدیت بوو. نووسراوی کوردیی، بەتایبەتیی "شیعر"و "عەقایید"و"مەولوودنامە"، هەر بەشێوەی دەستنووس– بە پارە یان بە دۆستیی – لەلایێن خۆشنووسێکەوە بۆ دەسەڵاتدارێ، گەورەیێ، خوێندەوارێکی ناسراو دەنووسرایەوە !

دوای هەڵ کەوتنی چاپخانەش لە دەوڵەتی عوسمانییدا لەساڵی ١٧٢٧ز. دا، تاقە بەرهەمێکی ناسراوی شاعیرێکی کورد کەبەفەرمانی سوڵتان عەبدولعەزیز چاپ کرابێ، (دیوانی مەولانا خالید– س ١٨٤٤)ە. {٧/ل١٤}.

ئەم بارە تا سەر ئەوها نەمایەوەو بەهەڵکەوتنی یێکەم ڕۆژنامەی کوردیی، (کوردستان) زەنگی بزاڤی ڕۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردیی لێ درا. لە ئەو هەلەشەوە ئەم بزاڤە لە دوو سەرچاوەوە هەڵقوڵاوە:

١. کۆششی تاکە کەسیی و کۆمەڵیی !

١/١:تاکە کەسیی، وەك کردەوەکەی برایان میقدادوعەبدوڕڕەحمان بەدرخان لەیێکەم جاردا، ئەوجا سورەییا بەدرخان لە دووەم و سییەم جاردا، کە ڕۆژنامەی (کوردستان) یان لە نێوان ساڵانی ١٨٩٨–١٩٠٢ز" قاهیرە، ژنێف، لەندەن، فۆلکستۆن"، ١٩٠٨– ١٩٠٩." ئەستەنبووڵ "، ١٩١٧–١٩١٨ز " قاهیرە " وا دەرکرد! {٦/ل ١– ٣}

هەروەها وەك کردەوەی حسێن حوزنی موکریانیی کەلەساڵی١٩٢٥و لەبازێڕی "حەڵەب"دا، چەپخانەیێکی کڕیی و لەساڵی١٩٢٦دا هێنای لە بازێڕی ڕواندز دا دایمەزراند

و لەلایێکەوە گۆڤاری (زاری کورمانجیی، س١٩٢٦– ١٩٣٢ ن) دەرکرد و لەلایێکی دیەوە بەرهەمی هەمە جۆرەی کوردیی خۆی و نووسەرانی دی چاپ و بڵاوکردەوە !

وێنەییێکی دی، وەك کردەوەی شاعیران، عەبداللە زێوەر کە(ڕیسالەدینییە–١٩٢٢) و عەلی باپیر ئاغا–کەمالیی، (دیوانی مەحویی – س ١٩٢٢) یان چاپ و بڵاوکردووەتەوە.

١/ ٢: کۆمەڵیی، وەك کردەوەی (کۆمەڵی هاریکاریی و پێشکەوتنی کورد– س١٩٠٨ –١٩٠٩ز/ئەستەنبووڵ) چاپخانەییێکی کوردیی کڕیی، لەلایێکی دیەوە ڕۆژنامەی (کورد تەعاون و تەرقیی– س ١٩٠٨) ی دەرکرد.

دیسان وەك (کۆمەڵی هێڤی–س١٩١٢)و چاپو بڵاوکردنەوەی هەردوو گۆڤاری (ڕۆژی کورد، هەتاوی کورد –س١٩١٣). هەروەها (کۆمەڵی پێشکەوتن–تەعالیی– کورد: س ١٩١٨.ئەستەنبووڵ)و چاپو بڵاوکردنەوەی گۆڤاری (ژین:١٩١٨–١٩١٩ن)و چاپو بڵاوکردنەوەی چەند کتێبێکی کوردی{٣/ل٢٠–٢٤}(١) دیسان وەك (کۆمەڵی کوردستان – س ١٩٢٢. سلێمانیی)و دەرکردنی ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان – س ١٩٢٢).

٢. کۆششی حوکوومەتیی

١/٢: حوکوومەتی داگیرکەر.. وەك کردەوەی ئینگلیز کە لە بەغدادی داگیرکراودا، یێکەم ڕۆژنامەی کوردیی (تێگەییشتنی ڕاستیی، س١٩١٨–١٩١٩ ن) دەرکرد. دوایی لە سەرەتای١٩٢٠دا یێکەم چاپخانەی کوردیی هێنایە سلێمانیی و ڕۆژنامەی (پێشکەوتن–سلێمانیی:١٩٢٠– ١٩٢٢ن) دەرکردو هێندێ کتێبیشی چاپ و بڵاوکردەوە(٢).

دیسان وەك موتەسەڕڕیفییەت و بەلەدییەی سلێمانیی ژێر ماڵەی مەملەکەتی عێراق کەبەچاپخانە بەجێماوەکەی بریتانیای داگیرکەرو مەملەکەتی کوردستان، ڕۆژنامەکانی (ژیانەوە: س١٩٢٤–١٩٢٦ن) و (ژیان: س ١٩٢٦–١٩٣٤ن)و (زبان:س١٩٣٧–١٩٤٠ن) یان دەرکرد و هێندێ کتێبیان پێ چاپ و بڵاوکردەوە !

٢/٢: حوکوومەتی خۆماڵیی..وەك حوکوومەتی مەملەکەتی کوردستانی مەلیك مەحموودی یێکەم کە بەچاپخانە پاشماوەکەی ئینگلیزی داگیرکەری سلێمانیی، چەند ڕۆژنامەی وەك (ڕۆژی کوردستان، س١٩٢٢-١٩٢٣ن)و (بانگی حەق-س ١٩٢٣) و (ئومێد ئیستقلال، س١٩٢٣- ١٩٢٤) ی دەرکرد و چاپەمەنیی و بەیاننامەکانی حوکومەتیان پێ چاپ و بڵاودەکردەوە.

ئەم سەرچاوانە کامیان بۆ لێکۆڵینەوە بگریت، ئەنجامەکەی چاکتر بەشی تێ گەییشتنی ڕۆشنبیریی کوردە.. من لە ئەوانە هەموو ناکۆڵمەوە و بەتایبەتیی وێنەیێکی دی لە (کۆششی تاکە کەسیی) وەردەگرم. ئەمەش لەبەرئەوە نییە کە هێشتا لای لێ نەکراوەتەوە، بەڵکو لەلاییێکەوە لەبەر ئەوەیە کەسەکان بەناسنیۆی " (کوردیی و مەریوانیی) ەوە، لە ڕۆژگارێکی ناسکی بزاڤی ڕۆشنبیریی کورددا هاتوونەتە پێشەوە و خزمەتگوزار بوون و خۆیشیان، پیشەی یێکەمیان ڕۆژنامەوانیی و چاپ گەریی و بڵاوکردنەوە نەبووە. لەلایێکی دیەوە چونکە هێندێ بەڵگەنامەی گرنگیان لەدوا بەجێ ماوە کە کارەکەیان تۆمارتر دەکات و جوانتر ڕۆشنایی لەباری خوێندەواریی و ڕۆشنبیریی و بارستایی چاپەمەنیی و سنووری بڵاوکردنەوەش دەدات. کەواتە (کوردیی و مەریوانیی) کێن؟ مەبەستیان چیی بووە و چییان کردووە و چارەنووسیان چۆن بووە؟

---

# بەشی یێکەم

## ١. کوردیی و مەریوانیی کێن؟

### ١/١. کوردیی (مستەفا ساییب)

مستەفا ساییب (١٩٠٤/٨/٢٥. کفریی- ١٩٨٠/١٢/٩. سلێمانیی) کوڕی مەلا ئەحمەد ساییب (قازیی)، کوڕی مەلا قادری مەلا حەسەن قەرەداخیی. لەساڵی١٩١٩ز.دا خوێندنی سەرەتایی لە سلێمانییدا تەواو کردووە. لە ئەیلوولی ١٩٢١ز.دا چووەتە قوتابخانەی عیلمییە -پیشازی-ی کەرکووك. لە١٩٢٣ز.دا دوو پۆلی نێوەندیی ئەو قوتابخانەی تەواو کردووە و ئەوجا چووەتە (مەکتەبی ئەندازە) ی بەغداد. لە هاوینی ١٩٢٦ ز. دا خوێندنی تەواو کردووە. لەپاییزی ئەو ساڵەدا بووە بەئەندازەوان لەدایەرەی ئەشغالی سلێمانییدا. لە١٩٢٩ز.دا بەهۆی جم و جووڵی سیاسییەوە ئاشکرا بووە و دوور خراوەتەوە بۆ (گەلیی عەلی بەگ، مووسڵ، بەسرە، دیوانییە، حیللە)کە - بەڕۆشنایی نامەیێکی فوئاد ڕەشید بەکری مامۆستای قوتابخانەی ڕواندز بۆی و بۆ حیللە لە١٩٣١/١/١٦دا- دیارە لەئەیلوولی ساڵی١٩٣٠لە ئەم بازێڕیدا گیرساوەتەوەو لە ئەویشدا ماوەتەوە تا نێوەندیی ساڵی ١٩٣٢ ز کە لە ئەم هەلەوە جارێکی دی هاتووەتەوە بۆ سلێمانیی و- وێ دەچێ- تا پاییزی ١٩٣٦ ز بە ئەندازەوانیی تێیدا مابێتەوە و ئەوجا دیسان لەبەر جم و جووڵی سیاسیی ڕاگواستراوەتەوە بۆ (حیللە، کەربەلا)و لە ساڵی ١٩٣٨ز.دا لەبەغدادا گیرساوەتەوە. لەئەم مێژووەوە-وەك ئەندازەوانێ- هەر لەبەغدادا ژیاوە تا لەسەرەتاکانی حەفتاکاندا خۆی خانەنشین کردووە و لە ئەو دوا ساڵانەشدا بە یێکجاریی هاتووەتەوە بۆ سلێمانییو لەپاڵ برازاکانیدا - کوڕانی جەمیل و جەلال ساییب - ژیاوە تا بەنەخۆشیی پرۆستات کۆچی ماڵئاوایی کردووە و لە گردی سەیواندا ئەسپاردەی خاك کراوە !مستەفا ساییب: هاوسەری هەڵنەبژاردووە و ڕەبەن ژیاوە.

زمانەکانی تورکیی، فارسیی، عەرەبیی، هێندێ ئینگلیزیی زانیوە ! دەستی لەشیعردا نەبووە، بەڵام لە(گەلاوێژ-مارتی١٩٤٥)دا کورتە چیرۆك (دز) ی بڵاوکردەووەتەوە ! ئەوە دوا نووسینی بووە لەڕۆژنامەنووسیی کوردیی،(پێشکەوتن-سلێمانیی،بانگی کوردستان، ژیانەوە، ژیان، زاری کورمانجیی، گەلاوێژ) کە بەئیمزاکانی (زەکی سابیب، کوردیی، کوردێك،ك،نەورۆز،پەروێز،شاهۆ)وە بابەتی هونەری ئەدەبیی، ڕۆشنبیریی، ڕەخنیگیریی کۆمەڵایەتیی بڵاوکردووەتەوە.. تەنانەت-زەکیی سابیب - لە کرەوی نووسینی کوردیی پەتیی (پێشکـــەوتن - سلێمانیی: س١، ژ٣٠، پێنجشەممە١٨/١١/١٩٢٠)دا، پەخشانە هونەرانەکەی"بۆچرووك"خەڵاتی دووهەمی بەرکەوتووەو بەئەوەش بۆری جەمیل سابیبی برا گەورەی داوەتەوە کە خەڵاتی سێهەمی بۆ " ڕۆژەوەبوونێك " وەرگرتووە !

کوردیی، مستەفا سابیب، ئەستێرە گەشەی نەتەوەی کوردە لەڕۆژگار و بارودۆخێکی سەختو ناسکدا.. کوردستان پەرست، پێشکەوتنخواز، ئەدەب و هونەر پەروەر، دۆستی لاوان، لایەنگری ماف ئافرەتـان، سیاسیی لـەخۆبوردووی کـەم دەرکـەوتوو، سەرڕاست، بەخشندە هەڵکەوتووە !

لەمەیدانەکانی ڕۆشنبیرییدا لەزووەکەوە، لەنێوان ساڵانی١٩٢١-١٩٢٦، لە کەرکووكو بەغدادا، دامەزرێنو بڕبڕەی (کۆمەڵەی لاوان) بووە. خزمەتگوزاری هەمیشەیی (کۆمەڵی زانستی کوردان) بووە. پیرەمێردی ڕۆژنامەنووس - خاڵی- چەند جارێ لێی نووسیوەو لـە کـردو کۆشو بەخشـندەیی دوواوە. شـاکیر فـەتاح ستاییشـی چـالاکییو دڵسۆزییو کارامەیی کردووە کە خزمەتگوزاری نەتەوەکەیەتی.

پێشڕەوی شانۆی کـوردیی، کـۆچ کـردوو فوئـاد ڕەشـید بەکر، لەلای من گـوتی: (مستەفا سابیب هەموو کردەوەیێکی ڕەوشت بەرزانە، هێمنانە، نەتەوەپەرستانە بـەجێ دەهێنا ! پارە و پوولی هەمووی بۆ کوردایەتیی عەمەلیی بـوو.. تەنانـەت بـا بزانیـت کـە هەر ئەو لەساڵی ١٩٢٦ز.دا ئێمەی خستە سەر کەڵکەڵەی تەمسیل کردن !).

لەمەیدانی سیاسەتدا " لە کۆمەڵە نهێنییەکانی سلێمانیی " (کۆمەڵەی زەردەشت–س١٩٢٦) دا باوەڕ پیێ کراو و سەرۆك، لە (کۆمەڵی خۆیبوون– س١٩٢٧) دا سەرۆکی لق بووە. {١/ل١٢–١٤}

...بە لێك دانەوەی هۆش و بیری–ئامانجی هێنانە دیی "خودموختاریەتی ئیدارە"ی ڕاستەقینە بووەو بۆ ئەم ئامانجەش حەفید زادە شێخ مەحموودیان بە سەرۆکس گشتیی کۆمەڵی زەردەشت ناسیوە.

هەرچەندە سەرچاوەییێکی باوەڕپیێ کراو بەدەستەوە نییە کە دواڕۆژی باری سیاسیی ڕوون بکاتەوە، بەڵام ویێ دەچیێ تا ساڵانی سییەکان پێوەندیی بەهێزی بە (پارتی خۆیبوون)ەوە هەبوویێو تا ساڵی ١٩٣٣ز–بەڕۆشنایی نامەیێکی عەبداللە عەزیزی هاوەڵی– بەڵگەی ڕاست دیارە. لێم ڕوون نییە پێوەندیی بە (پارتی هیوا–س١٩٣٩)ەوە هەبوویێ! ! باوەڕیش دەکەم لەبەرناتەبایی کۆمەڵە سیاسییەکانی کورد، خۆی لە سیاسەت دوور خستبێتەوە. دوا هەواڵێکی بەرلەمردنی –وەك دوای کەوتووم– پیێ بزانریێ ئەوەیە، یێکجار دڵشکاو بووە بۆ حاڵی میللەتەکەی بەدەست داگیرکەران و ناکۆکیی پارتە کوردەکانەوە! *

---

* سەرچاوەی باسەکانی،(دەستنووسی خۆی لەمەڕ ژین و کردەوەی سیاسیی، تاقە لیێ نووسینێکی کورتی کاك جەمال بابان لەپێشەکیی"لەخەوما"دا، ڕۆژنامەو گۆڤارەکان. هێندیێ نامەی خۆی و هاوەڵەکانی. هێندیێ باسی لەلای خزمانی). بۆێیکا وردیش نیشانم نەداون، چونکە بەنێوی (مستەفا سایب–ئەستێرە گەشەی نەتەوەی کورد!)ەوە هەموو دەستنووس و بڵاوکراوەکانیم کۆ و ساخ کردووەتەوە و لێم نووسیوەو لەساڵی ١٩٩٨دا چاپ کراوە!

**١/ ٢. مەریوانی (تاهیر بەهجەت مەریوانیی)**

تاهیر بەهجەت (١٩٠٥سلێمانیی–١٠/٣٠/ ١٩٧١.ئەمریکا)، کوڕی مەلا مەحموودی سدیقی زادەی خەڵکی گوندی"خەڵووزە"ی سەر بەبازێڕی مەریوانی کوردستانی خۆرهەڵات کە مەلا مەحموودیش بە فەقییەتیی هاتووەتە سلێمانیی و بووە بە مەلای (مزگەوتی هەمزە ئاغا/باپیری دایکی مستەفا سایب)و لە پەناوەش بە مۆر هەڵکەندیەوە خەریك بووە. سەلمای دایکی تاهیر خەڵکی سلێمانییە و خزمی محەممەد ئەمین زەکیی وەزیر و مێژوونووس بووە. تاهیر خوێندنی سەرەتایی– دیارە لەگەڵ مستەفا سایب – لە سلێمانییدا تەواو کردووە. بەڕۆشنایی پیشەی دواڕۆژی، وێ دەچێ کە لەمەڕ تەندروستیی ئاژەڵ – بەیتان–خوێندبیەتی و بووبێ بە برینپێچ بۆێیکا لە ساڵی ١٩٢٦دا بە کارێکی ئەوتۆوە لەئاوایی (شارەبان) دا کارمەند بووە ! بەڕۆشنایی نووسینی ئەحمەد شوکریی ئاشنای –لەرۆژنامەی ژیندا– وێ دەچێ لەساڵانی١٩٢٩–١٩٣٠دا ڕاگواسترابێتەوە بۆ بەغداد. وێ دەچێ بەدەم فەرمانەوە خوێندنی ئامادەیی بەشەو تەواوکردبێ بۆێیکا لە دواڕۆژدا بۆی لواوە لە ئەمریکادا بە خوێندنی پزیشکییەوە خەریك بووە. لەنێوان ساڵانی١٩٣٠–١٩٣٨ دا خۆی و مستەفا سایب بە (نەشرییاتی کوردی و مەریوانی)یەوە خەریك بووە، بەڵام تاهیر(چاپخانەی مەریوانی)دامەزراندووەو وێ دەچێ دوای ڕۆییشتنی بۆ ئەمریکا فرۆشرابێ بۆێیکا دوای ساڵی١٩٣٨چ چاپکراوی بەنێوی چاپخانەکەی ئەوی بەسەرەوە نییە !

وەك نامەی مانگی ٨ی ساڵی ١٩٣٨ی بۆ مستەفا سایب لەبەردەستمدا دیارە، وێ دەچێ لەنیوەی مانگی ئابی ئەو ساڵەدا–بە واپۆڕ–ڕووی کردبێتە ئەورووپاو لە ئەویشەوە بۆ ئەمریکا بۆ خوێندنی پزیشکیی.

نامەیشی–بەڵگەیەو لەبەردەستمە– کە ئەو ساڵە یان لە ساڵی ١٩٣٩ دا لە (کۆلێجی دەرمانسازیی و زانست– College of Parmacy & Sinc- P.la) زانکۆی فەلادەلفیا دەستی بەخوێندن کردووە. دوای ماوەێیکی کەم خەریك بووە بچێ بۆ ئەڵمانیا بۆ خوێندن و نەشچووەو هەر لە ئەو بازێڕەدا ماوەتەوە ! دوای ماوەیێ–وەك مستەفا

سابیب بۆ جەمال بابانی نووسەری گێڕاوەتەوە– لەئەوەدابووە لەبەر تەنگانەی دارایی دەست لە خوێندن هەڵبگرێ، بەڵام محەممەد ئەمین زەکیی بۆی تێ کەوتووە و خراوەتە سەر خوێندکارانی دەوڵەتی عێراق تا باری خوێندن و گوزەرانی ئاسانتر بووە و تەواوی کردووە !

گوتاری لە (گەلاوێژ–س١٩٤٦)دا دەنوێنێ کەباوەڕنامەی (M.S.C)ی وەرگرتووە ! لە ساڵی١٩٤٨بەدواوە –لەگۆڤارەکوردییەکاندا– نێوی بە پزیشك دەرکەوتووە. بەڕۆشنایی نامەیێکی ١٩٥٦/٩/٢٠وگوتارێکی نووسراوی بۆ (هەتاو) و گەییشتوو بە مستەفا نەریمان، ڕادەگەیێنێ کە لەساڵی١٩٥٢دا هاتووەتەوە بۆ نیشتیمانو دیدەنیی‌وئەوجا گەڕاوەتەوە. هەروەها بە نامەکەدا دیارە کە لە بازێڕی (شیکاگۆ) دا پزیشکەو ڕۆژی٢١–١٤ سەعات کــــار دەکـــاتو دەرسیش بەخوێندکارانی کۆلێجی پزیشکیی دەڵێتەوە. لەڕووی زمان زانینیشەوە،وێڕای کوردیی–فارسیی، تورکیی، عەرەبیی،–بەر لەچوونی بۆ ئەمریکاش– ئینگلیزیی زانیوە. ئەحمەد شوکریی گێڕاویەتیەوە کە لە ساڵی ١٩٤٠ دا ژنی لە ئەوێدا هێناوەو– کیژێکی هەبووەو بەژیانەوەیە–دوایی لەساڵانی١٩٤٤و١٩٤٥دا لە هاوسەرەکەی جویێ بووەتەوە.

ت. ب. مەریوانیی (پزیشك) هەر لەغەریبایەتیی‌و – وەك ئەحمەد شوکریی دەڵێت – بە نەخۆشیی بیر تێك چوون مردووە و دیارئاخری نیشتیمان بووە.

تا مابوو، بەتایبەتیی لەنێوان١٩٤٥–١٩٦٣ دا پێوەندیی ڕۆشنبیریی و برادەرایەتیی لەگەڵ هاونەتەوەکانی و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی (ژین، گەلاوێژ، نزار، هەتاو) توند بوو و بە گوتار و نامەشەوە وەڵامی پرسیارە تەندروستییەکانی هاونەتەوەکانی دەدایەوە. مخابن بە هیوا بووە دوو کـــتێب لەســـەر نەخۆشییەکانی نێونیشتیمان – بەیارمەتیی خوێندەواران– دابنێ، بەڵام بەدەنگیەوە نەچوون !

**تەماشاکراو.**

١. جەمال بابان – لە خەوما " س ١٩٧٥

٢. چەند بەڵگەنامە و دەستنووسی مستەفا سایيب و نامەی خۆیشی. هەروەها هێندێ قسە و باسی دەمی بابی من!

٣. ژیان – س ١، ژ ٢٧ " ٥ / ٨ / ١٩٢٦. سلێمانیی.

٤. ژین – س ١٩٧١. سلێمانیی (گوتاری ئەحمەد شوکری لەمەڕ مەریوانیی!).

٥. نامە و گوتارێکی خۆی. لە ٢٠ / ٩ / ١٩٥٦ دا بۆ م. نەریمان. (بڵاوکراوەی: عێراق – ٢١ / ٣ و ٢١ / ٤ / ١٩٧٧.

٦. ڕۆژنامە و گۆڤاری دی.

## ٢. بەرهەمەکان

١/٢. دیوانی نالیی–کوردیی و مەریوانیی، چاپخانەی دارولسەلام، بەغداد ١٩٣١. {٦٩ لاپەڕە!}

٢/٢. دیوانی کوردیی–کوردیی ومەریوانیی، چاپخانەی دارولسەلام، بەغداد ١٩٣١. {٣٨ لاپەڕە!}

٣/٢. یاریی–کوردیی و مەریوانیی، چەپخانەی دارولسەلام، بەغداد ١٩٣٢. {٣٠ لاپەڕە، تا لاپەڕە٢٩ی باسی وەرزش دەکات و دواییەکەی باسی هێندێ یاریی کوردییە!}.

٤/٢. خورشیدی خاوەر – أ. ش، مەریوانیی، چاپخانەی نەجاح، بەغداد ١٩٣٢. {٣٥ لاپەڕە. چیرۆکی کۆنەو لەفارسییەوە کراوە بەکوردیی!}. {ئە.ش=ئەحمەد شوکریی!}.

٥/٢. گۆرانیی–کوردیی و مەریوانیی، چاپخانەی مەریوانیی"!!"، بەغداد ١٩٣٢. {٧٢لاپەڕە، هێندێ گۆرانیی و مەقامی کوردییە وەك: ئەڵڵاوەیسیی، خورشیدیی، قەتار، خاوکەر، ئای ئای}.

٦/٢. یادگاری لاوان – کوردیی و مەریوانیی، چاپخانەی کەرخ، بەغداد ١٩٣٣. {١٠٦ لاپەڕە. ! بەرهەمی شیعر و ئەدەبییاتی لاوانە}.

٧/٢. دیوانی سالم – کوردیی و مەریوانیی، چاپخانەی کەرخ، بەغداد ١٩٣٣. {٣٣ لاپەڕە!}

٢/٨. هەموو کچێك چیی بزانیٚ؟ – کوردیی و مەریوانیی، چاپخانەی کەرخ، بەغداد ١٩٣٣. {٨٨ لاپەڕە.. لە سەرچاوەکانی خۆر ئاواوە گەلاڵە کراوە و شێوەییێکی بە جەرگییە بۆ باس کردنی نهێنییەکانی تەندروستیی ئافرەت!}.

٢/٩. شەرلۆك هۆڵمس لە گوللەییێك لە تاریکیدا – کۆنان دویل، کوردیی و مەریوانیی، چاپخانەی مەریوانیی، بەغداد ١٩٣٥ {٤٠ لاپەڕە.. چیرۆکی پۆلیسییە و بە وەرگێڕدراوی م. سایب دەچیٚ!}

٢/١٠. دیوانی شێخ ڕەزا – کوردیی و مەریوانیی، چاپخانەی مەریوانیی، بەغداد: ١٩٣٥. {٢٣٦ لاپەڕە.. شیعری کوردیی، فارسیی، تورکیی!}

٢/١١. تووتنەکەمان – مەریوانیی "!!" چاپخانەی مەریوانیی، بەغداد: ١٩٣٥. {٤١ لاپەڕە.. دانراوی ئەحمەدی حاجیی ڕەفیقی خەڵکی سلێمانییە نەك مەریوانیی!}.

٢/١٢. دوو تەقەلای بێ سوود – محەممەد ئەمین زەکیی، چاپخانەی مەریوانیی، بەغداد: ١٩٣٥. {٦٩ لاپەڕە.. یاداشتێکی ساڵی ١٩٣٠ یە بۆ مافەکانی کورد دابووی بە حوکومەتی عێراق.. لەگەڵ چاپی و کەوتنە بازاڕەوە، دەست بەجێ بە فەرمانی حوکوومەت قەدەغە و کۆکرایەوە!}.

٢/١٣. دیوانی حەریق – مەریوانیی، چاپخانەی مەریوانیی، بەغداد: ١٩٣٨. {١٠٢ لاپەڕە!}

### ٣.تاریفی نەشرییات

وێڕای دیاربوونی هەردوو نێوی (کوردیی، مەریوانیی) بەسەر زۆربەی چاپو بڵاوکراوەکانەوە، ئەوە بەڕۆشنایی سێیەم خاڵی نامەی ١٩٣٣/١/١ ی مستەفا سایب کە بەئاشکرا وشەی " نەشرییات " و هەروەها سەرەتای (دیوانی سالم) کە دیسان هەمان وشە بەکاردەبات، هەروەها بەڕۆشنایی دەفتەراگرتن و نامەگۆڕینەوە و قسە و باسی تایبەتیی هەردووکیان لەمەڕ چاپ کراوەکان لەنێوان ١٩٣٣/١/١– ١٩٣٤/٦/٣ دا، دیسان بەڕۆشنایی دووبارە بوونوەی نێوی (چاپخانەی مەریوانیی–بەغداد). بەتایبەتیی لەنێوان ١٩٣٣–١٩٣٨دا، دواجار بەڕۆشنایی نووسراوی "نەشرییاتی مەریوانیی " بە دوالاپەڕەی

(دیوانی حەریق) ەوە، ئەوە ڕاست و ڕەوان، نەشرییات - بڵاوکراوە " پڕۆژەیێکی چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردیی - بەرهەمی کەلەپووری ئەدەبیی و هونەریی کورد و بەرهەمی تەندروستیی و کشت و کێڵیی و وەرزشیی و ئەدەبیی خۆبێگانە - یە کە لە سلێمانیی و بەغداد دا گەلاڵە و چاپ کراوە و دوو برادەر ڕایانپەڕاندووە و لەسنووری نیشتیمان و دەرەوەدا بڵاویان کردووەتەوە- خۆیان گوتەنیی لە سەرەتای دیوانی سالمدا - ، (لەم نەشرییاتە مەقسەد قازانج و تیجارەت نییە !).

بە ئەم پێیە (نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی) پڕۆژەیێکی ڕۆشنبیریی-چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردیی خزمەتگوزارە !

## بەشی دووەم

### ١. بنچینەی پڕۆژەکە

هەرچەندە بەڵگەنامەیێکی ڕاستو ڕەوان بەدەستەوە نییە، بنچینەو مێژووی ئەم پڕۆژەیە ڕوون بکاتەوە، ئەوە دەستمایەی تاقانە هەر وردبوونەوەیە لە هێندێ نووسراوو دەستنووس.

بێگومان ئەم پڕۆژەیەی ئەم دوو برادەرە کوتوپڕ سەری‌هەڵنەداوەو دەبێت یێکێکیان یان هەردووکیان لە زووەکەوە خولیای بووبێ! وردبوونەوە لەژیننامەو یادگاری هەردووکیان هەر ئەو ڕاستییە دەنوێنێ کە(مەریوانیی– تاهیر بەهجەت) وەك (کوردیی– مستەفا سابیب)لەزووەکەوە لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکاندا بەبیرورا دەربڕینەوە، هەروەها بە کۆمەڵە سیاسییە نهێنیەکانەوە خەریك نەبووە!

کەواتە پێویستە لە مستەفا سابیب وردببینەوە.. ڕاستییەکەی نێوبراو لە زووەکەوە – بەڕۆشنایی بیر و هۆشی نەتەوەییەوە – خولیای ئەم باسە بووە. ئەوەتە نامەیێکی نووسراوی ١٥لەسەر١٦/١٠/١٩٢٤،(٣)و بڵاوکراوەش لە(ژیانەوە–س١، ژ ١٥، پێنجشەممە ١٩٢٥/١/٢٤)دا، بەرەو ڕووی (مونەووەر و شوببانی کورد) ی ژیاو لە بەغداد کردووەتەوە پێی گوتوون: (غەزەتەو کتێبی کوردی دەرنەکەن و نەشری نەکەن.. ئیتر چیی ئەکەن و بۆچیی ئەفەرموون: کوردین؟!).

لە ئەم بەڵگەیە بەهێزتریش – کاتێ باوەڕ پێکراوی کۆمەڵی سیاسیی نهێنیی: زەردەشت بووە–وەك دەستنووس‌و ڕۆژنامەی (ژیان –س٢، ژ٧٢، ١٩٢٧/٧/٥)(٤) لەبەردەستدان، بە " تکاییێکی تایبەتیی بۆ هەموو کوردێ " کەوە دەڵێت: (مونەوویران‌و لاوانی وڵات.. هەرهیچ نەبێ کە تەئلیفات و تەرجەمە نابن، هەرچیی ئاساری پێشووانمان هەیە کۆی بکەنەوە و یێکە یێکە لە چاپی بدەن و بڵاوی بکەنەوە تا هەم ئەو ئەسەرانە

کە نیشانەی ڕۆحی کوردییە، لەناو نەچێ و ساحێب ئەسەریش ناوی بمێنێ و هەم بەسایەی ئەوانەوە زمانی میللیمان موحافەزە و بەردەوام بکەین.

وەك کتێب نووسینەوە و تەرجەمەی کتێبی عیلمیی و فەننیی پێویستە، کۆکردنەوە و چاپ کردنی ئاساری پێشووانیش موهیم و پێویستە !).

لەئەوەش پتر (کوردیی-زەکیی سایب، مستەفا سایب)بەڕاستیی لەبنچینەی پڕۆژەکەمان نزیك دەخاتەوە کە لە ڕاپێڵەی ئەو گوتارە - دەستنووسەدا، پتر دەڵێت: (من زۆر دەمێکە بەو ئەمەلەوە خەریکم و چەند ساڵە هەرچیی شیعرێك، قسە و باسێکی گەورەکانمان ببینم یا ببیسم، کۆی ئەکەمەوە و حازری ئەکەم. بە دڵ ئەمەوێ تا سەر ببەم و تەواوی بکەم، لەگەڵ نوبزەیێك لەتەرجەمەی حاڵی گەورەکانمان بیکەم بە کتێبێکی چاك، بیخەمە پێش دەمی هەموو کوردێك!.. وەعدیش ئەدەم هەرچیی تەرجەمەی حاڵی جەنابی: نالیی، شێخ ڕەزا، مەولەویی، کوردیی، سالم، وەفایی " یەعنی یێکێ لە شاعیر و ئەدیبەکانم بەڕاستیی بۆ بنووسێ، لەپاش چاپ کردنی دوو کتێبی لەو کتێبە و هەرچیی ١٠٠ شیعر، یەعنی ٢٠٠ میسرەع لە ئەشعار و غەزەلییاتی یێکێ لە شاعیرەکانم بۆ بنێرێ، لەپاشا یێکێ لەو کتێبەی بە دیاریی تەقدیم ئەکەم!).

کەواتە بێ درێژکردنەوە و سڵەمینەوە، بەدڵنیاییەوە توانا هەیە بڵێم " بنچینەی ئەم پڕۆژەیە زووتر و لەئامێزی هۆش و بیری مستەفا سائیب (کوردیی) دا خولقاوە و پێگەییشتووە.

## ٢. قۆناخەکانی پڕۆژەکە

مخابن، بەڵگەنامەکانی مستەفا سائیب لەمەڕ پڕۆژەی (نەشرییات)کە لەبەردەستمدان و بەڵگەنامەی دەستنووسی (مەریوانیی - تاهیر بەهجەت) یشیان لەپاڵدا نییە، هەمووی لە سنووریی ١٩٣٣/١/١- ١٩٣٤/٦/٣ دایە کەمستەفا سایب ئەندازەوان بووە لە سلێمانیدا.

ئەگـــەر ئـــەو دوو مێژووە بەراووردی ساڵەکانی یان تەمەنی چاپ و بڵاوکراوەکـانی ١٩٣١–١٩٣٨بکرێن، دیارە(ئەو ماوەیە)قۆناخێکی پڕۆژەکەیە!! دەی داخۆ قۆناخەکانی دی ڕێکـەوتی کـەی و چـۆن بـوون؟ وردبوونـەوەو لێـك دانـەوەم–بنچـینەی پڕۆژەکـەش یارمەتییە– باوەڕم بەهێز دەکات کــە بڵـێم، قۆناخـەکانی ئـەم پڕۆژەیـە سێ‌و بەئـەم جۆرەی خوارەوەن:

١. قۆناخی سالانی ١٩٢٧ – ١٩٣٢ ز
٢. قۆناخی سالانی ١٩٣٢ – ١٩٣٦ ز
٣. قۆناخی سالانی ١٩٣٦ – ١٩٣٨ ز

وردبوونەوەش لە ئەم قۆناخانە گەلیٚ ڕاستیی پڕۆژەکەی پیٚڕوون دەبێتەوە:

١. **قۆناخی ١٩٢٧ – ١٩٣٢ ز**

ڕەنگبیٚ ئەم سنوورە مێژووییە خوێنـدەوار سەرسام بکـات و بڵێـت: لەسالّی١٩٣١دا یێکەم بڵاوکـراوەی (کـوردیی و مـەریوانیی) دەرکـەوتووە، ئیـدی ئـەو چـەند سـاڵەی دی چییە؟

پرسیارەکە ڕەوایە، بەڵام ئەگەر لە ژیننامەی کوردیی و مەریوانیی (مستەفاو تاهیر)و فەرمان و شوێنی نیشتەنییان وردببینـەوە.. هـەروەها نێـوی چـاپخانەکانی سـەرەتا یـاد بکەینەوە.. دیسان ئەگەر نەشتەر لەنهێنییەکانی ژین‌و دەوروبەری یێکێکی وەك مستەفا سایيب بکۆڵینەوە – وێـڕای دامەزرانـدنی بنچـینەکە–دەردەکـەویٚ کەپڕۆژەکـە قۆنـاخی سەرەتا و گەلالە بوونی بەخۆوە دیتووە و ئەم سنوورەشی ماوەیەتی.. بەڵام ئەو ماوەیە دوو بەشە:

ق ١/١: ماوەی ١٩٢٧ – ١٩٢٩ ز کە ئەمیش دوو بەشە:

١/١/١: ماوەی ١٩٢٧ – ١٩٢٩ ز

ئەم ماوەیە بە بڕواو لێك دانەوەی من – وێڕای بنچینە دامەزراوەکەی مستەفا خۆی – بەڕۆشنایی کاری سیاسیی نهێنیانەی لە دوو کۆمەڵە باس کراوەکەدا، زۆر ویٚ دەچیٚ کە (بەرهەمەکانی ئەم ماوەیە!) وەك وێنەییێکی چالاکیی سیاسیی – ڕۆشنبیریی و بە مەسرەفی کۆمەڵەکان جیٚبەجیٚکرابیٚ و مستەفا سایب ماکینەی بووبیٚ!

لاوان سەرچاوەی هێز و توانای گەل و کۆمەڵی سیاسیین.. وێڕاش لە کەرکووکەوە تا بەغداد (کۆمەڵی لاوان) دامەزراو و ئامانجی مستەفا سایب بوو.. لەژێر سێبەری لاواندا – بە تینی سیاسیی کۆمەڵەکان – زۆر ویٚ دەچیٚ ئەم بەرهەمانە پیٚ گەییشت بن.

تیٚبینی بکە ئەم چاپ و بڵاوکراوانە بەنێوی (لاوان) ەوە چاپ یان پێشکەشی (لاوان) کراوە:

١. ڕەوشتوخوو – لاوانی کورد؟ (نووسەر یان ئامادەکار نێوی نییە!! / کەمال)، چاپخانەی نەجاح، بەغداد ٦/٣٠ /١٩٢٧. {٩٢ لاپەڕەیە}

٢. کورد لەکەیێکەوە خەریکە؟ –عەلیی عیرفان، چاپخانەی فورات، بەغداد ١٩٢٧.

٣. گۆرانیی – کەریم سەعید (زانستیی/کەمال)، ١٩٢٨/٢/٢٨، چاپخانەی فورات، بەغداد ١٩٢٨.

من ئەوە دوو دەستنووسم لەبەردەستە کە یێکەمیان کۆمەڵیٚ بابەتی وەك، (ئیشو کۆشش،بەختیاریی،عەزمو ئیرادە،وەزیفە،وەتەنپەروەریی، مەحەببەت، ئیزدیواج، منالٚ، تەربییەو تەحسیلٚ، خێرو چاکە، شەجاعەت، عەدالەتو برایەتیی، سیحەتو تەربیەی بەدەن، تەربییەی شەخسیی، ئومید، تەربییەی ئەهلی، تەربییەی فیکرییە، زەوق). لەنێوان٢٠/١٢/١٩٢٨ –١/١/١٩٢٩ دا و لەلایێن زەکیی سایبەوە گەلاڵە کراون.

هەر ئەم بابەتانەو بەهەمان نێونیشانەوە – بەهێندیٚ دەستکاریی قسەو باسێکەوە– پاکنووس کراونەتەوە و بەشێوەی کتێبۆکیٚ ئەوها نیشان دراون:

---

ژمارە }

رێگای سەرکەوتن

بۆ

لاوانی کورد

کوردیی و مەریوانیی

**Kurdy – Mariwany**
**Jimare**

حوقووقی لێ دەرهێنان و تەرجەمە و نەقلێ هی بڵاوکەرەکانە.

چاپی یێکەم **Chapiy Yekem**

چاپخانەی........ بەغداد

**.......Chapxaney** { **Beghdad**

پێشکەشەکەیشی ئەمەیە:ئەم کتێبە پچووك و باشە پێشکەشی هەموو لاوێکی زیندەو ئازاد و ساحیب عەزم و ئیرادەی کوردیی ئەکەین! کوردیی و مەریوانیی.

مخابن ئـــەم وێنە پـــاکنووسە کـــەدەستنووسی مستـەفا خۆیێتی، چ مێـژوویێکی بەسەرەوە نییە!

ئەگەر ئەم نووسراوانەوکتێبووکەیە، بەراووردی (ڕەوشتوخوو–١٩٢٧/٦/٣٠) بکەین، ئەوە بەڕاستیی هەست دەکەین کەبابەتو شێوازو زمانو ئامانج هەر یێکێکەو وێ دەچـێ – بە تۆزەڵقـانێ دەسـتکاریی ئێـرەو ئـەوێوە– لـەنێوان١٩٢٨–١٩٢٩ز.دا گەلاڵـەو بـۆ (دووبارە چاپ کردنەوە) یشی لە ساڵی١٩٣٠بەدواوە پاکنووس کرابێ.

بـــە ئـــەم ڕۆشنـــاییە، دیارە مستـــەفا سایبی ئەندازەوان لە١٩٢٧/٦/٣٠دا وەك سیاسییەکی نادیار، ئەم کردەوە ڕۆشنبیرییەی نواندووە.

ئەگەر لە کتێبۆکەی (کورد لە کەیێکەوە خەریکە؟) وردببینـەوە کـە خـۆی بابـەتێکی سیاسیی نووسراوی (ڕۆبین پاشـا)ی ئەرمەنییـەو لـە تـەمووزی ١٩٢٥ز. دا لـە ڕۆژنامـەی

(تروشاق)ی ئـەرمـەنییدا بڵاوی کردووەتـەوەو بێگومـان عـەلی عیرفـان لەتورکییـەوە گۆڕیویەتیو (پێشکەشی لاوانی کورد)ی کردووە، ئەوە وێڕای خزمایەتی مستەفاو عەلیی – ئەمیان برای براژنی مستەفا بووە– بەڕۆشنایی بەڵگەنامەی بەریتانیایی، عەلیی عیرفان لەئـەم هـەلانەدا (ئەندامی کۆمەڵـەی زەردەشت)و دوواتر(خۆیبوون)بووە ! وردبوونەوەشم وێنەی عەلیی عیرفانی گرتووە کە لە ئەو هەلانەدا مامۆستای قوتابخانەی هەڵەبجەو دەست کورت بووە، بۆیێکا گومانم نییە کە (کۆمەڵەکە) ی مەسرەفی چاپ کردنی کێشاوەو مەبەستەکەش سیاسییو بۆ ڕاکێشانی لاوانە ! ئـەگـەر بەرهەمی (گۆرانیی) کەریم سەعیدیش– کە لە ئەو مێژووەدا خوێندکارێکی بەغداد و دەست کورت بووە– تەماشا بکەین و سەرەتاکەی دەوربکەینەوە کە دەڵێت: (بۆ لاوانی کورد – لەبەر ئەمەی گۆرانیی خزمەتی ڕۆح و حیسییاتی میللیی دەکات، ئەم کتێبی گۆرانییە بەدیاریی پێشکەشی ئێوە ئەکەم ! /کەریم سەعید).(٥) ئەوە دیسان بەڕۆشنایی بەڵگەنامەی بەریتانیایی، کەریم سەعیدیش (ئەندام) ی ئەو کۆمەڵە نێوبراوانە بووە و ئەمەش دیسان وێنەی چالاکییانە !

ئەنجامی ئەم بەشە باسەش ئەوەیە لەنێوان ١٩٢٧ –١٩٢٩ز.دا، پرۆژەی چاپو بڵاوکردنەوەی کوردیی کە دواتر بوو بە (نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی)، سەرەتاکەی لەسلێمانییو لەژێر سێبەری کۆمەڵە سیاسییە نهێنییە چاودێر کراوەکانی مستەفا سایبب هەڵکەوت و ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵانە جێبەجێیان کردووە.

ق ٢/١/١. ماوەی: ١٩٢٩ – ١٩٣٠ ز

ئەم ماوەیە ئەووەڵی ساڵی١٩٢٩– بەر لەئەیلولی١٩٣٠دەگرێتەوە کەمستەفا سایبب دەستی سیاسیی کەوتووەتە ڕوو، بەیاننامەی لێ کەوتووەو ئاوارە کراوەو سەرئەنجام لە حیللەدا گیرساوەتەوە.

وردبوونەوە لەئەم ماوەیە نیشانی دەدات کە چ چاپ کراوێ بلاونەبووەتـەوە.. بـەلام سێکی گرنگ ئەوەیە کە لە حیللەدا مستەفا نزیك بووەتەوە لە هاوەلەکانی، بەتایبەتیی ریوانیی تاهیر بەهەجەتی بەغداد نشین.

من باوەڕدەکەم لەئێرەوە بەرنامەکانی کارکردن بۆ قۆناغەکانی پاشەڕۆژ دەستی پـێ دووە!

ق ٢ / ١. ماوەی ١٩٣٠ – ١٩٣٢ ز

ژینی مستەفا لە حیللەدا شایانی وردبوونەوەیە.. خۆی نووسیوییەتی، (کـە هەراکـەی ی ڕەشی ئەیلوولی١٩٣٠ ڕووی‌دا، لەحیللەوە پەیتا پەیتا دەنگو باسی ئەو ڕۆژە ڕەشە جەنگی شێخ مەحموود–١٩٣٠و١٩٣١/کەمال – پاش ئەو هەرایە و هەرچیی موزاهەرات کرا لەکـــوردستان، ئـــەم–واتـە خـۆی/کـەمال–بـەتورکیی ئەینووسییو ئـەینارد بـۆ درخانییـەکان لەشـامو بـەیرووتو پـاریسو بـۆ حەلّـەبو ئـوردونو میسـرو بـۆ تـێ ‌ییشتووەکانی کورد.. هتد). {٤ / ل٣}

لەلایێکی دیەوە، سەرنج دانی نامەکانی هاوالەکانی فوئاد ڕەشید بـەکری مامۆسـتای ڕتابخانـەی ڕوانـدز و عەبدولواحیـد نـووریی مامۆسـتای قوتابخانـەی شـەقلاوە لـە١٦/١ ٢١/٣/١٩٣١دا کەنهێنییەکانی دەزگەکانی دەولەتیان بۆ ناردووە، ئەمانە هەموو بەلگەی ‌هێزن بۆ شوێنی لەڕیزی پێشەوەی جم و جوولّی سیاسیی و نهێنییدا.(٥)

وێـڕای ئـەو باسـە –لـەقۆناخی دووەمـدا– مسـتەفا خـۆی لـە ١٩٣٣/١/١٧دا کـە لـە لێمانییەوە نامەییێکی بۆ تاهیر ناردووە و پێی گوتووە، (کاغەزەکەتم وەرگـرت.. خـۆت ‌یزانیی من حسابی پێشووم هیچ نەگرتووەو سـەرم لـێ دەرناچـێ!) ئەمەیشـی دیسـان ‌لگەیێکە بۆ ڕۆشنایی دان لە کرد و کۆشەکانی " حیللە " یدا.

کەواتــە لــە ئەوێـدا وەك چـۆن بـە جـم و جـوولّی سیاسـییەوە سـەرقالّ بـووە، بـە ‌ەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی) یەوە خەریك بووە!

بەکورتیی بەنزیك بوونەوەی مستەفاو تاهیر–لەئەم قۆناخەدا – وێڕای ڕێچکە گرتنی بەرهەمەکانی بۆ چاپو بلاوبوونەوە. پێنج بەرهەمی ئەو پرۆژەیە– هێشتاش چاپخانەی خۆبەخۆی نەبووە– جێبەجێکراوەو چاپو بلاوبوونەتەوە.

ق ٢/٢. ماوەی ١٩٣٢ – ١٩٣٦ ز

ئەم بەشە قۆناخەی دووەم–تاڕادەیێ بەبەلگەوە.ڕووی جمو جووڵەکانی (نەشرییات) ەکەمان نیشان دەدات. بەلێ کردو کۆشەکەی مستەفاش لە ئەو سنووورەدایە کە جارێکی دی ڕاگواستراوەتەوە بۆ سلێمانیی و گەرم و گوڕ تێکەلی ژینی سیاسیی و ڕۆشنبیریی بووەتەوەو جارێکی دیش لە دەوروبەری پایزی ١٩٣٦ دا دیسان دوورخراوەتەوە بۆ سەلماندنی قسە، پێویستیشی دەبینم کەرتێکی چەند دێڕی نامەیێکی هاوەڵ و هاوبیری مستەفا خۆی، مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە: عەبداللە عەزیز بنوێنم کە لە ١٩٣٣/٥/٦ دا، دوای ئاگادارکردنی لە هەرە دەنگ و باسی ورد و نهێنیی دەزگەکانی کۆیە، پێی گوتووە: (ئەگەر مومکینتان ئەبێ نەشرەی پێنجی "خۆیبوون"مان بۆ پەیدا بکەن! زۆر خزمەتێکی گەورەیە بۆ کوردانی ئێرە، نەماندیوە! ئیتر حورمەت و حەمییەت، بژیی بۆ ئەم میللەتە هەژارەمان کە چەند کەسان بەسایەی ئەوەوە ئەژیێ و خیانەتیشی لێ ئەکەن!). {٥/ل٤}.

کەواتە دیسان دیارە کە جم و جووڵی سیاسیی ڕاستە و بەلگەنامەکانی تایبەتیش بە (نەشرییات)ەکەیەوە، پێوەندییە ڕۆشنبیرییەکەیشی ساخ دەکەنەوە.

ئەم بەشە قۆناخە گرنگییەکەی ئەمەیە:

یێکەم: حەوت بەرهەم بەرچاپوبلاوکردنەوە کەوتوون..واتە لەنێوان١٩٣٣–١٩٣٥ دا.

دووەم: چاپخانەی مەریوانیی هەلکەوتووە!

سێیەم:دەفتەر–ئەویی دیارە لەلای مستەفاوە–بۆکاروباری کۆکردنەوەی کەرەستەی بەرهەمەکان، کاروباری چاپو بلاوکردنەوە، هەواڵەکانی خەرجییو سنووورو ڕادەی

پەخش و فرۆشتنی بەرهەمەکان.. هتد، تۆمارکراون و وەك بەڵگەنامەیێکی مێژوویی بزاڤی چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردیی – بۆ مێژوو– ماونەتەوە.

چەسپ کردن و ئاشنابوونی ئەو بەڵگەنامانە پێویست دەبینم، بۆیێکا دەیانخەمەڕوو..

**بەڵگەنامەکانی (نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی)**

لەنێوان ١٩٣٣/١/١٧–١٩٣٤/٦/٣ دۆسییەیێکی تایبەتیی بۆ (نامەکانی مستەفا سایبب –کوردیی) بۆ تاهیر بەهجەت مەریوانیی کراوەتەوە کە هەمووی ١٠ نامەن لە سلێمانییەوە ناردوونی بۆ بەغداد.

مخابن دۆسییەکە (وەڵامنامەی مەریوانیی) تێدانییە، بەڵام بە گۆڕینەوەی قسە و باس، ڕەنگ و ڕووی ئەویش دێتە بەرچاومان.

ڕەنگبێ خوێندەوار ببێژێ، داخۆ بۆچی دۆسییەکە تا ١٩٣٤/٦/٣ی دیارە؟ منیش ئەم کەرەسەم لە دڵدایەو هیوادەخوازم کە(هاوتایێکی ئەم دۆسییەیە کەوتبێتە لای دۆستانی مستەفا سایبب، بەتایبەتی نووسەر جەمال بابان کە گەلێ یادگاری ئەوی کەوتووەتە لا! !)(٧)

** نامەکان بۆ مەریوانیی – تاهیر بەهجەت!

* ن: ١

سلێمانیی Sulemany (٨)

ژمارە: 1 – Jimare

ڕۆژ : Roj ٣٣/١/١

برا ...

١. ئەمە دەفتەری حسابی لای من، وا من ناردم! تۆیش هی خۆت بنێرە! وەك بۆم نووسیی بوویت، کتێبی (گۆرانیی) مەنێرە بۆ هیچ لایێك و زۆری لەناو مەبە! چونکە کەمەو لەپاشا داوا ئەکرێ. منیش هەروا ئەکەم. وەك نووسیم "٢٥٠" نوسخەی بنێرە بۆ

ئێرەو "١٠" نوسخەییێکیش بنێرە بۆ شێخ سالح(٩)و ئیتر جارێ بۆ هیچ لاییێک مەنێرە! حەز ئەکەی بە کارتێك خەبەر بدە بە عەبداللە سامیی(١٠) لە(کۆیە)، بزانە ئەویش داوای ئەکا یان نا؟ بەلام بنووسە بۆیی کە پارەکەیمان زوو ئەوێ!

٢. لەپاش ئەمە،تەقریبیی حیسابێکی(دیوانی سالم)یش بکە! بزانە چەندی ئەوێ!

٣. تۆیش لەمەولا کاغەزێ کە عائید بە (نەشرییات) بێ، بە قۆپییە بینووسە و بە ژمارە وە سوورەتی لای خۆت بێ، لە دوسێیەکەتا وەك من. وا زۆر باشترە و لەمەولا ژمارەیشی لەسەر دابنێین باشە، تا ئەگەر موراجەعەتمان کرد، بە کاغەزێك ژمارەی بەیان بکەین و دۆزینەوەی تێ گەیشتنی ئاسانتر بێ. ئیتر بە عەجەلە چاوەڕێی کتێبەکان و کاغەزی درێژتم!

کوردیی
**Kurdy**

جەدوەلی حیسابی مانگی کانوون ئەووەل ١٩٣٢ / 932 .. (١١)

| | | |
|---|---|---|
| پاشەکەوتی ٣ مانگ: ت ١، ت ٢، کا ١: هی من<br>که لەسەر خۆت حیسابم کردووه | ١,٠٠٠ | ١,٠٠٠ |
| قیمەتی دیوانێکی (کوردیی | | ٠,٠٦٠ |
| | ١,٠٠٠ | ١,٠٦٠ |
| | | ١,٠١٠ |
| لای عەبدالله بەگ موعەللیمی هەڵەبجە {١٢}.<br>کتێبی (یاریی)<br>عەدەد<br>١٥ هێشتا پارەی وەرنەگرتووه | | ٠,١٥٠ |
| ٨لای مەکتەبی دووەمی سلێمانی: کتێبی یاریی | | ٠,٠٨٠ |
| ٤٠ = = متوەسیته =: = = | | ٠,٤٠٠ |
| ئەو کتێبانەی لای خۆم ماوەو نەفرۆشراوه | عەدەد | ٠,٦٣٠ |
| نالی | ٦٥ | |
| کوردی | ٢٩ | |
| یاریی | ١٠ | |

"تەواو"

* ن: ۲

سلیمانیی

ژمارە: ۲ / B

۱۵ / ۱ / ۳۳

برا ....

۱. کاغەزەکەتم وەرگرت. خۆت ئەیزانیی من حیسابی پێشووم هیچ نەگرتووەو سەرم لیَ دەرناچیَ(۱۳)، چونکە من و تۆ قەت فەرقمان نەکردووەو هەر پارەییَك سەرف وە یا وەرگیرابیَ، بۆ هەردوو لامان وەك ییَك وابووە، باخوسووس هەرتۆیش نەختیَ حیسابت باشتر ڕاگرتووە! تەبیعیی خۆت شارەزاتری!

۲. حەقی پۆستەی کتیَب، حیساب بکە!

۳. جوابی مستەفا ئەفەندیی موفەتتیش(۱٤) هاتەوە، ئەلّیَ: ئیمکان نییە لەو ناوە هیچ بفرۆشریَ، بەلاّم نوسخەییَکی (گۆرانیی) بۆ بنیَرە، بەناوی هەردووکمانەوە دوو کەلیمەی تیا بنووسە، ئایا بەناوی خزمەتەوە مومکین نییە لەم کتیَبی (گۆرانیی) یە هیچ بفرۆشن؟ بنووسە، جوابەکەی بنووسنەوە بۆ فلاّن کەس لە سلیَمانیی!

٤. جوابی فوئادم(۱٥) بۆ هاتەوە، فوئاد ئەلّیَ: (یاریی) ۲۰ نوسخەی هاتووە. تۆ لە حیسابەکەدا نووسیوتە ۱٥ نوسخە! ئەم فەرقە چییە؟ داوای ۳۰ نوسخەی تر ئەکا لە (یاریی) ی، بۆی بنیَرە!

٥. لەمەولا لەجیاتیی (A.B) (۱٦)، ئەووەلّی حەرف شارەکەمان بنووسن مەقبوولّترە. یەعنی تۆ بیکە بە (B) و من بیکەم بە (S) (۱۷).

٦. (گۆرانیی) یەکان نەهاتوون، شەقم برد. بچۆرە سەریان یا پییان بنیَرە! یا خۆت ییَکیَ بدۆزەرەوە، زوو پیَش جەژن بینیَرەوە! درەنگە!

**Kurdy**

(کوردیی)

"تەواو"

* ن: ٣
ژمارە: ٣ / S
ڕۆژ: ٢٤ / تووبرین (١٨) " ٢ / ٣٣
برا....

١. دیوانی شێخ ڕەزا بارمتە نییە! نەم زانیی ئەوەندە زەرووریيە. سبحەینێ بێرمەوە!

٢. (ئەنجوومەن)ەکە (١٩) جارێ بالات بێ. هەر لەناونەچێ، قەیناکە!

٣. عەرزێ ئەمین زەکیی بەگ بکە، نەم زانیی کوڕی جعێدنی(٢٠) وابێ غیرەتە! گێلاسەکانم نارد. پێرێ دیسان ٥-٦ لقی ترم بۆ ناردووە. تۆ گەییشتنی لێ بپرسە و بنووسەرەوە.

٤. ئەگەر مومکینە بەکابرای ئاڵەمان (٢١) لەنەشرییاتەکەمان، هەریێکەی نوسخەییێکی بدەرێ!

٥. تەرجەمەی (سالم)، ناهییە خانیش هەر ئەوە ئەزانێ کە من ناردوومە بۆت، ئەگینا ئەوانەی من، لەهەڵەبجە نووسیومە(٢٢) لێرەزاتی کەسێ نایزانێ، حەتتا بەکانی خۆیشی. ئەگەر ساڵح زەکیی(٢٣) ئەوەندە هیممەتی بکردایە، هینەکەی پیی باپیر ئاغای بدایایە، باش بوو.

٦. کتێبەکان، جارێ ١٩٩نوسخەم بۆ هاتووە. ڕەواجی باشە، لەبەرەوە فرۆشرێ، بەڵام دووبارە بچۆرەوە سەریان بڵێ: باقییەکەیشی بنێرن زوو!

٧. ئاخۆ ئەتوانین لەنیوەی دوای مانگی ڕەشەمێدا(٢٤) دەس بکەین بە (سالم)؟ موسەوەدەی تاجەکەم بۆ بنێرە بیخوێنمەوە.(٢٥)

٨. خاڵم(٢٦) هان دا، وا خەریکی مەولەوییە(٢٧)! ئەزانیی چۆن؟ شیعرەکانی مەولەویی عەینەن ئەنووسێ، لەژێریا تەرجەمە و مەئالی. ئەوە زۆر باشە بە کوردیی سلێمانیی و بە شیعر ئەینووسێتەوە. گەنجینەییێکی زۆر بەقیمەت ئەبێ! خوا بکا بێ و بەرە بیباتە سەر، زۆر موهیممە، زۆر!

٩. ئەم مانگە ئەتوانیی داخڵی " کۆنکۆردیا Concordia" ببی(٢٨)، یا من لەسەر حیسابی پاشەکەوت بۆت بدەم و لای خۆت قەیدی بکەی! ئەڵێی چیی نیو دینـارە " زۆر خۆشە!

١٠. (یاریی) یەکانت نارد بۆ فوئاد ڕەشید یان نەء؟

**Kurdy**

(کوردیی)

"تەواو"

* ن : ٤

ژمارە: ٤ / S

ڕۆژ : ٣١ / ١ / ٩٣٣

...... (٢٩)

١. لەبەر پرسەی ژنی کاکم(٣٠)، نەپەرژام (شێخ ڕەزا) بنێرم، یا سبەینێ یا دووسبەی ئەینێرم!

٢. حالەن بە ئەووەڵ واسیتەدا "٥٠" دانەی تر کتێبی (گۆرانیی) بنێرە! ئەو "٨٩" نوسخەیە کە نووسراوە، ماوە، لەتەواو بوونایە، هەندێکی فرۆشراوە! سبەینێ پارەی وەرئەگرم. دەس بەجێ ئەو "٥٠" نوسخەیە یا بە پاکەتێك یا بە دوو پاکەت، ئەگەر کەسێ حازر نەبوو، قیروسیا بە پۆستەدا بێ وەستان بینێرە بەناوی ئەحمەد سەعیدەوە لە دوکانی خەیات ئەحمەدی خاڵە عەلی(٣١)، چونکە داماوین لەسەر کتێب، " هێشتا بۆ هەڵەبجەیشم نەناردووە!

٣. بچۆرە ماڵەوە، ئەگەر خۆیان بیری هاتنیان نییە بۆ سلێمانیی کتێبەکانی ئەوانیش کە ماوە، بە ئەووەڵ واسیتەدا بیاننێرە!

٤. تۆ هیچت لێ فرۆشتووە لە (گۆرانیی) یان نا؟

٥. کەی ئەتوانین دەس بکەین بە چاپی (سالم)؟

٦. زوو (گۆرانیی) یەکان بنێرە! یێك کتێبم لانەماوە!

٧. ئەگەر خوشکم بێتەوە سلێمانیی(٣٢) ڕەنگە من بێم بۆ بەغداد! بەتەلەغراف خەبەرت ئەدەمێ. کـە بۆم نووسیت ڕاست لەماڵەوە بمبینە! جارێ بزانین، بەڵام

کتێبەکان ئەگەر کەسی حازر و ئەمین نییە، حالەن بە پۆستەدا بینێرە ! لێرە هەمووم بە "٢٠" فلس فرۆشتووە. باشە.

**Kurdy**

(کوردیی)

| | نالیی | کوردی | یاریی | گۆرانیی | ف | د | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١- فرۆشراوە | | ٤* | ٨ | ١٠٨ | ٨٠<br>١٦٠ | ٢ | *(کوردیی) لەسەر نووسینی خۆت داومەبە مەلا ڕەحیم وە پارەم وەرنەگرتووە. |
| ٢- ماوە | ٦٥ | ٢٥ | ٤٠ | ٨٩ | | | * ٢ (گۆرانیی) م داوە بە (ژیان). وە مەکتەبی کچان بێ پارە |
| ٣- وارداتی مانگی پێشوو | | | | | ٢١٦ | – | |
| ٤- پاشەکەوتی مانگی پێشو | | | | | ٤٠٠ | – | |
| ٥- هەموو وارداتی ١٩٣٣ | | | | | ٨٥٦ | ٢ | |

"تەواو"

* (ئەم نیشانەیە نیشانەی بەخشینە بە خۆڕایی!/ نووسەر دایناوە).

* ن : ٥

ژمارە: ٥ / S

ڕۆژ : ٢ / ٣ / ٩٣٣

....... (٣٣)

١. لەو چل و پێنجە " ١٠ گۆرانیی " لە چەمچەماڵە. لەم ڕۆژانەدا ڕەنگە پارەکەی بنێرن. ئەوانی تریش لە فرۆشتنایە.

٢. (سالم) ت دا بە چاپ یان نە؟ لەقەبی " بیمار " ی نییە! لێرە هەموو وا ئەڵێن! پارەکەت وەرگرت؟

٣. بۆ چاپی کتێب و لەو کاغەزە عادیانەی پێم وتیت: پرست کرد یا نەء؟ فەرقی چۆنە؟

٤. لەدوای (سالم) ئەڵێم: (هەموو کچێك چیی بزانیێ) و کتێبێك لەو " حیکایەتە پچووکانەی تەرجەمەم کردوون! !(٣٤) " لە چاپ بدەین باشە! تۆ ئەڵێی چیی؟

٥. جەدوەلی حیساباتی مانگی پێشووم و ئەم مانگەی خۆت زوو بنێرە، چونکە هی مانگی پێشووت نەناردووە. تەمەڵیی مەنوێنە! تەواو

**Kurdy**

(کوردیی)

=

| | نالیی | کوردیی | یاریی | گۆڕازیی | قیمەت | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مەوجوود | ٦٥ | ٢٥ | ٤٠ | ٣٠ | ف | د | |
| فرۆشراو | ١٢ | ١٦ | ١٥ | ١١٣ | ١٥٠<br>٨٦٠ | —<br>٢ | *داومە بە مەلا ڕەحیم پارەم هیچ وەرنەگرتووە |
| ماوە | ٥٣ | ٠٩ | ٢٥ | B ٤٥ | — | — | B: ٢ نوسخەم داوە بە مەلا ڕەحیم پارەم وەرنەگرتووە. |
| واریداتی پێشوو | | | | | ٨٦٥ | ٢ | |
| پاشەکەوتی ڕەشەمێ ٣٣/٢ | | | | | ٤٠٠ | — | |
| هەموو واریدات | | | | | | | سەرفییات<br>٥١٥٠<br>٥٠٧٥بۆکۆنکۆردیا حەواڵە<br>٦٢٦٥<br>٠,٠٠١ |
| | | | | | ٢٦٦ | ٦ | ٦,٢٦٦ باقیی |

* (نیشانەی بەخشینە / کەمال).

* ن : ٦

ژمارە: ٦ / S

رِۆژ : ٢٢ / ٣ / ٣٣

براکە ...

١. ئەو کتیّبە وردانە بۆچیی بە ٥٠٠ حیسابت پرسیوە؟ بەشکو زیاتر لە چاپ بدەین! حورووفەکانی وەك کتیّبە بچکۆلە تورکییەکان بیّ باشە! لە٧٠٠ F (فلس/کەمال)، کەمتر نییە!

٢. ئەلّیی (دیوانی سالم) لە چاپدایە و ١٤ لاپەرِەی لە چاپ دراون، کەچیی ئەلّیی لەو نموونەیە قوبوولّم نەکرد! ئەی چ نموونەییّکە و چۆن؟

٣. بەحیسابی نیهائی (سالم) هەمووی چەندی تیّ ئەچیّ؟

٤. تەرجەمەی حالّی (سالم) لەوە زیاتر نییە لیّرە.. تۆ لە هەردووکیان ییّکیّکی مەعقوول و باش رِیّك بخە کە نزیك هینەکەی سالّح زەکیی بیّت!

٥. لیّرە هەر خەریکم بەشکو بەلەدییە حورووفاتیّ بکرِیّ بۆ چاپخانەکە. وەختە سەر بگریّ! کە سەری گرت ئەلّیّم لیّرە کتیّب لە چاپ بدەین! (٣٦)

٦. باشە، کاغەز ئەنووسم بۆ فوئاد رِەشید!

٧. نوخشەی چار (٣٧)، جوانە، خراپ نییە!

٨. قەرارمان دابوو کە (ئەلفا بیّ) ی وەهبیی بەگ(٣٨) بمیّنیّ، چونکە پارەی زۆری ئەویّ. من ئەلّیّم ئەو بمیّنیّ لەگەلّ (ناوە کوردی) یەکاندا(٣٩)، لەهەلیّکدا بلاّوی ئەکەینەوە!

٩. تا ییّك دوو رِۆژی تر " (ژیان) ەکان ئەنیّرم، ئەگەر دەست کەوت(٤٠)!

١٠. وا سەرەتاکەم بۆ ناردیتەوە، شتی وا دریّژ بۆ ئیّمە گرانە. هەلّی گرە بۆ وەختی خۆی! /تەواو

**Kurdy**

(کوردیی)

* ن: ٧

ژمارە: ١ / S

ڕۆژ: ٢٣ / ١ / ٣٤ (١٩)

برا ...

١. ڕاپۆرتەکەم وەرگرت. وەك خۆت ئەیزانیی دەمێکە هیچ نانووسم..(٤١) بەڵام ڕاپۆرتە کۆنەکان ماوە و تەماشام کرد، هەروایە وەك خۆت نووسیوتە! تەبیعیی لە بەشی فرۆشراودا فەرق هەیە! ئەوسا فرۆشراو کەم بوو. تا ئێستا دیارە هەندێکی تر فرۆشراوە.

٢. لە ڕاپۆرتەکەتا وا دیارە لە بەشی کتێبی (گۆرانیی) دا سەهووی تیایە، چونکە لێرە میقداری " ٣٠٠ " نوسخە ساغ بووەتەوە بە " ٢٠ " فلس کە ئەکاتە (–٦ د). جگە لەوانەی لای خۆت و کەرکووك و سائیرە.. وە لای من ئێستا هیچ (گۆرانیی) نەماوە. ڕەنگە لەوێش لای ئێوە شتێکی وای نەمابێ. وەلحاڵ تۆ لە فرۆشراودا بۆ کتێبی (گۆرانیی) تەنها ٢,٧٩٨ فلست نووسیوە. تکا ئەکەم ئەم فەرقە لە چییەوەیە؟ زوو بۆم بنووسە با تێی بگەم!

٣. وا بەپێچراوەیی " منیش مەوجوودی کتێب لێرە چییە " بۆم نووسیت، لەگەڵ مەوجوودی سندووق! سەری مانگ مەوجوودی سنووق چیی بوو، بۆت هەواڵە ئەکەم!

٤. لوتفەن " ٢٠ " نوسخە (خورشیدی خاوەر) بنێرە. هەندیچ کەس داوای ئەکا، بەشکوو ساغی بکەینەوە!

٥. وا دیارە بەپێی ڕاپۆرتەکەت " جگە لە کتێبی (هەموو کچێك) هیچ کتێبی ترت لانەماوە. لای من (نالیی، کوردیی، یاریی) و ئەوانە زۆر ماوە.. ئەگەر پێ ویست بوو خەبەرم بدەرێ!

٦. لەمەولا و دیسان بەڕێك و پێكیی ڕاپۆر بگرین و بینێرین. تۆیش وەك من ئاچەندەییێك(٤٢) یا دەفتەرێكی گەورە و سپیی بكڕە " واریدات، سەرفییات، دابەش، پاشەكەوت و ئەوانە بە ئوسوولێكی جوان و ڕێك بنووسە ! كە سەرت لێ تێك نەچێ و ئیشت مونتەزم بێ!

٧. پیاوی چابە " (سالم) تەواو بكە ! لەمە درەنگتر بێ زۆر عەیبە و مەیدانی فەوتانی مەدە ! با ڕەنجمان بە با نەڕوا.(٤٣)، (شێخ ڕەزا) ی عەلیی كوردیم(٤٤) بۆ ناردی، گەییشتنی بنووسە !(٤٥).

Kurdy

(كوردیی)

* ن: ٨ (٤٦)
ژمارە: ١ / S
ڕۆژ: ٢٥ / ١ / ٩٣٤

| | نالیی | کوردیی | یاریی | گۆرانیی | هەموو کچێك | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| لەمەوپێش ماوەتەوە | ٥٨ | ١٥ | ٢٥ | ٥ | ١٥٠ | |
| فرۆشراوە یان دابەش | – | – | – | – | ٤٣ | "٣"نوسخەی(هەموو کچێك) نێرراوە بۆ قەرەداخ. پارەم وەرنەگرتووە "٤٠"دانەیفرۆشراوە بە پارە ! |
| ئەویی ئێستا ماوە | ٥٨ | ١٥ | ٢٥ | ٥ | ١٠٧ | |

| واریدات | فلس | د | سەرفییات | فلس | د |
|---|---|---|---|---|---|
| لەوەپێش ماوەتەوە | ٠٠١ | – | داومە بە خۆت لە مووسڵ لە ١٥ / ٨ / ٣٣ | ٠٠٠ | ١ |
| مانگانەی خۆم بۆ ئاخیری مانگی تووبڕ ٩٣٣ | | | ناردوومە بۆت بە حەواڵ لە مووسڵ لە ٣١ / ٨ / ٣٣ | ٠٠٠ | ١ |
| پارەیکتێبی فرۆشراو لە مووسڵ | ٦٠٠ | – | لە ٢٠ / ١١ / ٣٣ | ٥٠٠ | ١ |
| پارەی کتێبی فرۆشراو لە سلێمانیی | ٤٠٠ | – | | ٦٠٠ | ١ |
| هەموو | ٨٠١ | ٣ | بە شێخ فەتاحدا لێرە بۆت نێرراوە | ٤٠٠ | – |
| باقی ماوە<br>زیادەی سەرفییات | ٦٩٩<br>٦٩٩ | – | هەموو | ٥٠٠ | ٤ |

نۆت (تێبینی) / کەمال): تۆ (هەموو کچێك) مەوجوودی ئێرەت. "٢٠٠" نووسیوە، بەڵام لەمە خۆت هاوینێ "٥٠ " نوسخەت بردووە و لەمە مەوجوودی ئێرە دەرت نەکردووە/ تەواو
کوردیی / KY

* ن : ٩

ژمارە: ٢ / S (٤٧)

ڕۆژ : ١٦ / ٢ / ٣٤

برا ...

١. ئەووەڵەن، ئەوە بزانین کە کار و زیان بۆ هەردووکمان یێکەو نابێ ئەگەر هەرییێکمان زیان بکەین، لەبەرئەوە مەسەلەن تۆ ئەو کتێبانەت ناردووە بۆ(خانەقی) نابێ لە باخەڵی خۆت پارە بدەی! ئەبێ لە سەرفییاتی دابەشدا بە نەگەییشتووی دابنێیت تا پارەکەت بۆ دێت. ئەوسا بە واریداتی حیساب بکە! دیاریی و شتی وایش داییم بەجیا بنووسە و بەڵام لە واریداتدا مەینووسە! پێویستە بزانین چەندی بە دیاریی و خۆڕاییش ئەڕوا. تەبیعیی وەك قەرارماندا، حەقی پۆستەیش هەر بنووسە!

٢. مەهدیی(٤٨) ئەگەر ئەزانیی حەزی پێ ناکا، لای دامەنێ، یا یێکێکی تر بدۆزەرەوە یا با هەرلای خۆت بێ!

٣. هی (یاریی) یەکانی ڕواندز، هیچم وەرنەگرتووە، وا کاغەزێکی باش لەو بابەتەوە بۆ فوئاد ئەنووسم.

٤. من هەر کتێبە سەرفییات و هاتووی جیا جیا ئەنووسم لە دەفتەری عوموومیدا، بەڵام لە ڕاپۆردا ئەیکەم بە یێك. لەمەولا لە ڕاپۆریشدا بەجیا ئەینووسم!

٥. ئەو دینارە، هەر لە مووسڵەوە ناردوومە بۆت، حەتتا هێشتا قەبزی حەواڵەکەم لاماوە. تۆ سەهووت کردبوو، نەتنووسی بوو.

٦. کتێبی (هەر کچێك..) من کەپرسیومە، هەر سەد و پەنجا نوسخە بووەو "١١٠" نوسخەم وەرگرتووە. "٤٠"نوسخەیشی پێش هاتنەوەم فرۆشراوە. لەم"١٠ " نوسخەیەش "٣" نوسخەم ناردووە بۆ قەرەداخ. پارەکەیم تازە وەرگرت و "١٠٧" نوسخە مەوجوودە لای من. ئیتر نازانم ئەم فەرقە لە چییەوەیە و چۆنە؟ چاك لێکی بدەرەوە، بزانە لە چییەوەیە؟

٧.هێشتا فەرق لە هیی (گۆرانیی) دا زۆر ماوە، چونکە بەپێی ڕاپۆری ژمارە(٣/ B و ڕۆژ٤/٢/٣٣) تا "٢٠" نوسخەش ناردووە بۆ کەرکوك‌و کۆیەو بەپێی ڕاپۆرەکانی دوای ئەوە تا "١٩" نوسخەیشی لە بەغداد دا بەش کراوە و بەپێی ڕاپۆری دوایی تریشدا وا دیارە هیچت لانەماوە وە منیش وەك لە ڕاپۆرەکەما دیارە تەنها پێنج نوسخەی ماوە و تەنها فرۆشراوی ئێرە کە "٣٠٠" نوسخە بووە "٦,٠٠" دیناری گرتووەتەوە.جگە لەوانەی لای خۆت کە فرۆشتووتەوە، غەیری ئەو "٣٩" نوسخەیە. وە ئەگەر بیلفەرز ئەم "٢٠" نوسخەیەشی بخرێتە سەر – جا نازانم ئەم بیست نوسخەیە گۆرانییە یا کتێبێکی ترە چونکە ناوت نەبردووە – هێشتا فەرقەکە یێکجار زۆرە کە فرۆشراو ٣,٢٢٨ فلس ئەنووسیت.. هیچ لەم حیسابە حالّی نەبووم!

تکام وایە چاکی لێك بدەرەوە و حیساب ڕابگرە کە هەردوولامان تیّ بگەین‌و سەرمان لیّ نەشێویّ‌و ئەم فەرقە بدۆزنەوە.مەقسەدم ئەوەیە ئینتیزام‌و ئوسوولێك بدەین بە حیساب و مالییە و نووسینمان و فێربین!

٨. مەلا عەلیی سەحاف "١٠٠ خورشیدی خاوەر"ی بۆ هاتووە و هیچی نەدامیّ، تەنها "٥" نوسخەم لیّ سەندووە، قەیدی بکە لەسەر من و لە حیسابی ئەوی دابگێڕەوە. بۆ من بەجیا مەنێرە، قەیناکا! ئەگەر یێکیّ ویستی ئەوا ئەینێرمە لای ئەو.

٩. ئەو "دە" نوسخە کتێبەی کە لەفەقەر ٧دا نووسیوتە لە هیچ لایێك نەنووسراوە، لەکویّ حیساب ئەکریّ و بۆچیی ساخی ناکەیتەوە لە قیسمی دابەشدا.

١٠.هێشتا هەر تیّ نەگەییشتم (دیوانی شێخ ڕەزا) کەت وەرگرتووە یان نەء؟

١١. لەمەلا ڕاپۆرەکەت نەختیّ باشترو درێژتر بنووسە، چونکە هی تۆ ئەبیّ تەفسیلاتی زیاتر بیّ! وەك وێنەیێکم بۆ ناردی لەسەر ئەوە با هەردووکمان چاك لە حیسابەکەمان بگەین!

١٢. سەری مانگی تر، ڕاپۆری تر ئەدەم، چونکە ڕاپۆرەکەم هیچ فەرقێکی وای نەکردووە. تەنها ئەو "٥ خورشیدی خاوەر"ەم وەرگرتووە و لێم فرۆشتووەو "٤٠٠" فلس پاشەکەوتم عەلاوەی واریدات بووە!

١٣. لەمەولا شتی خوسووسییات نەنووسین لە"ڕەسمییات"داو ئەگەر قسەی خوسووسیمان بوو بەجیا لە عەینی پۆستەدا، لە کاغەزێکی تر بینووسین باشە، چونکە ئەم ڕەسمییاتە، تەئریخە! /تەواو

KY

١٦/ ٢ / ٣٤

جەدوەلی – ١

| | نالیی | کوردیی | یاریی | گۆرانیی | هەموو کچێك |
|---|---|---|---|---|---|
| لەچاپ دراو | ٥٠٠ | ٥٠٠ | ١٠٠ | ٧٠٠ | ٧٠٠ |
| دابەش‌و فرۆشراو | ٤٠٠ | ٤٥٠ | ٣٥٠ | ٦٠٠ | ٢٠٠ |
| ماوە | ١٠٠ | ٠٥٠ | ٢٥٠ | ٠٥٠ | ٥٠٠ |
| هەموو | ٥٠٠ | ٥٠٠ | ٦٠٠ | ٧٠٠ | ٧٠٠ |

جەدوەلی – ٢

| | نالیی | | کوردیی | | یاریی | | گۆرانیی | | هەموو کچێك | | هەموو | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ف | د | ف | د | ف | د | ف | د | ف | د | ف | د |
| مەسرەف | ٠٠٠ | ١٠ | ٧٠٠ | ٨ | ١٠٠ | ١٢ | ٨٠٠ | ٩ | ٠٠٠ | ١١ | ٦٠٠ | ٥١ |
| واریدات | ٧٠٠ | ٤ | ٠٠٠ | ٧ | ٣٠٠ | ٠١ | ٠٠٠ | ٨ | ٧٠٠ | — | ٧٠٠ | ٢١ |
| ماوە | ٣٠٠ | ٥ | ٧٠٠ | ١ | ٨٠٠ | ١٠ | ٨٠٠ | ١ | ٣٠٠ | ١٠ | ٩٠٠ | ٢٩ |

جەدوەلی – ٣

| شار | نالیی<br>ن | کوردیی<br>ك | یاریی<br>ی | گۆرانیی<br>گ | هەموو کچێك<br>ه | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| سلێمانی | ٢٠٠ | ٢٠٠ | ٢٠٠ | ٣٠٠ | ١٥٠ | |
| کەرکووك | ٥٠ | ٢٠ | ١٠ | ٥٠ | ١٠ | |
| بەغداد | ١٠ | *٥ | – | ٥٠ | ١٠ | |
| سابلاغ | *٢٠ | *١٥ | ٢ | *١٠ | *٥ | |
| راواندوز | ٢٠ | ١٠ | ٥٠ | ٥٠ | ٥٠ | |
| سووریا | *٢ | *٣ | *٢ | *٥ | *٥ | |
| میسر | ٣ | ٢ | *٣ | *٥ | ٢ | |
| کۆیە | | | | | | |
| خانەقین | | | | | | |
| هەولێر | | | | | | |
| هەموو | ٣٠٥ | ٢٧٥ | ٢٦٧ | ٤٧٠ | ١٨٧ | |

"تەواو"

*ن: ١٠
ژمارە:S/٣
رۆژ: ٣٤/٦/٣
٠٠٠٠(٤٩)

١- وا راپۆرەکەم نارد، گەییشتنی زوو بنووسە!
٢- (شێخ رەزا) لەچییایە؟ هیممەت بکە بائەویش وەك (سالم) خراپ چاپ نەکرێت!
٣- لەدوای (شێخ رەزا) چیی چاپ ئەکەی لەو چیرۆکانە(٥٠)؟

کوردیی
**KY**

| | نالیی | کوردیی | یاریی | هەموو کچێك | خورشیدی خاوەر | سالم |
|---|---|---|---|---|---|---|
| هەموو مەوجوود | ٥٨ | ١٥ | ٢٥ | ١٥٠ | ٥ | ١٠ |
| فرۆشراو | ١ | ٣ | — | ٥٠ | ٣ | — |
| دابەش | ٥٠ | ١٠ | — | ٢٠ | — | — |
| ماوە | ٧ | ٢ | ٢٥ | ٨٠ | ٢ | ١٠ |

| واریدات (هاتوو) | پارە | | رۆشتوو | پارە | |
|---|---|---|---|---|---|
| | ف | د | | ف | د |
| بەپێی راپۆری مانگی (سەربر) لە ٩٣٤/١/٢٥ | ٨٠٠ | ٣ | بەپێی راپۆری مانگی (سەربر) لە ٩٣٤/١/٢٥ | ٥٠٠ | ٤ |
| واریداتی کتێب | | | بەهۆی:م فەرەجەوە ناردم لە ٣٤/٥/٣٠دا | ... | ٥ |
| پاشەکەوتی خۆم هی مانگی ١، ٢، ٣، ٤، ٩٣٤/٥ | ... | ٢ | هەموو رۆشتوو | ٥٠٠ | ٩ |
| هەموو هاتوو هاتوو تا ئیمرۆ | ١٢١ | ٦ | | ١٢١ | ٦ |
| | | | زیادەی رۆیشتوو | ٣٧٩ | ٣ |

"تەواو"

## بەشی سێیەم

### ١. پڕۆژەکە و پێوەندیی سیاسیی

ئەو باسانەی لەچەند کەرتێکی بەشی دووەمدا ڕابوردن، کاریێ دەکەن لەخۆ بپرسین، ئایا هەڵکەوتنی (نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی) پرۆژەیێکە و بە ڕاسپاردەیێکی سیاسیانەوە هەڵکەوتووە، یان بە هەستێکی لایێنگر و نەتەوەپەروەرانە و ڕۆشنبیریی خوازانەی دوو هاوەڵەوەیە؟

ڕاستییەکەی وێڕا کە چ بەڵگەنامەیێکی خۆیی یان ڕەسمییانە بەدەستەوە نییە لایەنگریی بەشی یێکەمی پرسیارەکە بێ ئەوە ئەگەرچیی کوردیی — مستەفا سائیب، بنچینە و باوەڕ و پێوەندیی بە کۆمەڵە نەتەوەپەروەرە نهێنییەکانەوە لە ئێمە ڕوونە و چاوەنۆڕیش دەکرێ کە (مەریوانیی — تاهیر بەهجەت) — با نێویشی دیار نەبێ، هاوسۆز بێ، ئەوە... وەك لە قۆناخێکی پرۆژەکەدا نامەکانی مستەفاشمان لێ دیارە، دەتوانم بڵێم کە ڕەچەڵەکی پرۆژەکە ڕاسپاردەی چ کۆمەڵەیێکی سیاسیی نییە! ئەگەر ئەوهاش بووایە، نهێنبرەکانی دەوڵەت—چۆن مستەفا سائیبو هاوەڵەکانیان بۆ دەزگەکانی ئینگلیز و عێراق ئاشکرا دەکرد و تا ئەو ماوەیەش بڕی نەدەکرد!

چاپخانەکەیش — ئەگەر ماوەیێ پەکی کەوت بێ — گومانم نییە لەبەر پێوەندییەکی سیاسیی ئەو بارەی لێ نەقەوماوەو ئەو پەڕییەکەی بیانووی سەرپێچیی لەقانوونی چاپەمەنیی تووش بووە.

وردبوونەوەش لەهەموو چاپو بڵاوکراوەکان — بێ لەچاپ کراوە قەدەغەبووەکەی محەممەد ئەمین زەکیی— هەموویان ڕووی ڕۆشنبیریی پرۆژەی نەشرییاتەکە دەنوێنن و هەردووکیان ژیرانە کاریان کردووە و بۆ ڕیش چوون و سمێڵیان نەدۆڕاندووە!

## ٢. پرۆژەکە و چاپخانەی مەریوانی

ئەگەر لەپرۆژەی نەشرییاتەکە وردببینەوە، لەڕووی چاپ کردنەوە دوو خاڵی گرنگ خۆ دەنوێنن و ڕاست تێ گەییشتنیان پێویستە:

٢/١. لە یێکەم تا هەشتەم بەرهەمەوە و لەنێوان ١٩٣١– ١٩٣٣ دا، سێ چاپخانەی (دارولسەلام، نەجاح، کەرخ) ئەرکی چاپ کردنیان بەجێ هێناوە و ئەمەش مانای خۆی هەیە کە قازانجێ بەر ئەو چاپخانانە کەوتووە.

٢/٢. لە نۆیەم بەرهەمەوە، (گوڵلەییێك لە تاریکییدا–س١٩٣٥) تا دوا بەرهەم (چاپخانەی مەریوانیی) خۆی ئەرکی چاپ کردنی بەجێ هێناوە.

ڕاستییەکەیشی، پێنجەم بەرهەم: (گۆرانیی – س١٩٣٢) کەنێوی چاپخانەی (مەریوانیی) هێناوە، ئەوە لەلای من هەڵەیە، چونکە کوردیی–مستەفا سایبب لە (نامە–ژ٦ی٢٢/٣/١٩٣٣)دا بەئاشکرا، نەبوونی چاپخانەی تایبەتیی دەسەلمێنێ کە دەڵێت، (لێرە–لەسلێمانییدا/کەمال– خەریکم بەشکو بەلەدییە حورووفاتێ بکڕێ بۆ چاپخانەکە، وەختە سەربگرێ! کە سەری گرت ئەڵێم لێرە کتێب لە چاپ بدەین!).

کەواتە بەڕاستیی تا ساڵی ١٩٣٥ (چاپخانەی مەریوانیی) دانەمەزراوە و لە خزمەتی پرۆژەی نەشرییاتەکەدا نەبووە!.

ئێستە وادەیە بپرسرێ،(چاپخانەی مەریوانیی) بەشێکی پرۆژەی نەشرییاتەکە بووە، یان موڵکی تایبەتیی مەریوانیی – تاهیر بەهجەت بووە؟

من–وەك زۆر بۆ بەڵگەنامەی ڕەسمییانەی ئەم چاپخانەیە گەڕام{٥١}–چ نووسراوێکی باوەڕ پێ کراوم لەمەڕ نەدۆزیوەتەوە و ئەویی لەبەر دەستدا هەیە، هەر ئەو چەند نامانەی مستەفا سایبب (کوردیی) یە کە هەرگیز باسی (چاپخانەی مەریوانیی) ناکات.. دەڵێم باسی وەك بودجە دانانێ بۆ دامەزراندن یان گەشە پێ دانی یان لیستە ڕاگرتنێ بۆ چاپ و بڵاوکراوەکانی و خەرجیی و داهاتەکانی چاپخانەکە.

لەلاییێکی دیەوە، (چاپخانەی مەریوانیی) وەك هەر چاپخانەییێکی دی، خۆی دانەناوە بۆ چاپو بڵاوکردنەوەی (بەرهەمی کوردیی)، پێچەوانەوە خۆی —بۆ وێنە— لە پێشەکیی (شەرلۆك هۆڵمس لە گوللەییێك لە تاریکییدا—س١٩٣٥) دا بەئاشکرا دەڵێت، (بۆ زانین.. چاپخانەی مەریوانیی ئامادەیە بۆ تەبعی کتێبو ئەوراقی تیجاریو کارت بەهەرزانو بێ غەڵەتو بەهەر زمانێ!).

ئا ئەم شێوە بازرگانییە ڕەوایەش، بەڵگەییێکی دیە کەچاپخانەکە سەروبەر بۆ پڕۆژەی (نەشرییاتی کوردییو مەریوانیی) دانەنراوەو زۆر وێ دەچێ کە موڵکی لایەنێکی سیاسیی، یان دەستەیێ نەبووبێ، هەر هی مەریوانیی بووبێ. لەهەموو ئەو بەڵگانەش بەهێزتر ئەوەیە کە (لەدوای ساڵی١٩٣٨ەوەو ڕۆیشتنی مەریوانیی بۆ ئەمەریکا) چاپخانەکە و نەشرییاتەکەش نەمان و نێویان ون بوو.

بەکورتیی، من هەستم هەیە کەمەسرەفی چاپ کردن (بەجودا) و لە دەفتەری گشتییدا — چۆن کوردیی: مستەفا سایب لە نامەیێکدا نێوی بردووە — ڕاگیراوە و چاپخانەکە بەتەنێ هەر هی مەریوانیی بووە!

باسێکیش شایانی لێ پرسینەوەیە، ئایا پێویست دەکات لە ڕەنجی نووسین و گەڵاڵە کردن و وەرگێڕانی بەرهەمەکان وردببینەوە، بیانناسینەوە لە کامیان وەشاونەتەوە؟

من بۆ ڕاستیی ئەم باسەم کردەوە، دەنا بەش بەحاڵی خۆم، ئەو لێك تێ گەییشتنە برایانە و نەتەوەییانەی هەردووکیان، هێندە بەرز دەبینم کە کارم تێ دەکەن نرخی پرسیارەکەم لەلا هەرزان بێ.. هەرچۆنێ بێ لەبەر ڕاستیی چەند قسەیێ هەر کەڵك دەگرێ!

لەهەمووان ڕوونە—بۆ وێنە— مستەفا سایب لەزووەکەوە، لەساڵی ١٩٢٠ — ١٩٤٥دا بەرهەمی ئەدەبییو گوتاری جۆربەجۆری لەڕۆژنامەکاندا بڵاوە. لەلاییێکی دیەوە لە زووەکەوە — لە هەڵەبجەوە: س١٩٢١— خەریکی کۆکردنەوەی کەلەپووری ئەدەبیاتی

کوردیی بووەو لەئێرەو ئەوێشدا پێوەندیی بە ئەمو ئەوەوە کردووە، تەنانەت لە١٩٢٧دا و لەڕۆژنامەدا –وەك باسی ڕابورد– دەنگی بەرزی دیارە.

لەلاییێکی دیەوە –هەر بۆ وێنە– لەنامەی ژ – ٥ ی ٢ / ٣ / ١٩٣٣ دا بەئاشکرا باسی (وەرگێڕانـی چـیرۆکی بێگانـە)دەکـات.. هەڵبـەت (شـەرلۆك هـۆلمس لـە گوللـەیێك لەتاریکییدا) وەرگێڕدراوی ئەوە، چۆن–وەك باسی دێت–کورتە چیرۆکێکی وەرگێڕدراوی (لەبەر دەستی مندا هەیە !) و مخابن بەربلاو کردنەوە نەکەوتووە !

من باوەڕم زۆرە کەچۆن (مەریوانیی) لەبەغدادا زۆر خـۆی بـۆ چـاپ و چاپخانەکە داناوە، (کوردیی)ش لەسلێمانییو شوێنی دیدا خەریکی کۆ و نووسـین و گەلاڵـە کـردن و وەرگێڕان بووە. هەروەها وەك بەئەو چەند نامەیەی(کوردیی–مستەفا سابیب) دا دیارە، هەردووکیشیان چاویان بە بەرهەمەکاندا خشاندووەتەوە.

جێگەی خۆیشیەتیی بلێم کە من هەرگیز لایەنگیری ئەو ڕا هەڵەیـەی نووسـەر جـەمال بابان نیم کە لەڕۆژنامەی (هاوکـاریی – ژ٢٢٨،١١/١٠/١٩٧٤)دا– وەك ستاییشـی توانـای مستەفا سابیب دەکات– تاهیر بەهجەت مەریوانیی بە قەڵەم کول و بێ توانـای ئـەدەبیی دەناسێت ! !

### ٣. پێوەندیی نەشرییات و خەڵکیی؟

لە دوو گۆشەوە تەماشاکردنی ئەم باسە پێویستە:

١/٣. پێوەندیی و تێکەڵیی خۆیان و مەبەستیان و ڕادەی هاریکاریی خەڵکیی ! !

لە (دیوانی سالم–س١٩٣٣) دا گوتوویانە، (ئێمە لەم نەشرییاتە مەقسـەدمان قـازانج و تیجارەت نییە !). ئا ئەم بڕوایە لە زووتریشەوە دەرخراوە کـە لـە (دیـوانی کـوردیی – س ١٩٣١) دا گوتوویانە، (هیچ فیکرێکی تیجارەت و کار و قازانجمان نییە. هەر مەقسـەد و غایەمان خزمەتێکی زمان و ئەدەبییاتی کوردییە !).

بە ئەم هەستەشەوە، لەلاییکەوە —بۆ وێنە— لەسەرەتای (شەرلۆك هۆلمس.. س ۱۹۳۵) دا ڕوویان لە (هەموو ئودەبا و شوعەرای کورد) کردووە بۆ هاریکاریی.

لەلاییکی دیەوە—نەتەوە و زانستپەروەرانە — تەماشای هەر هاریکارێکیان کردووەو نرخی چاکەیان فەرامۆش نەکردوون، بەپێچەوانەوە لە ئەو بەرهەمانەدا (نێویان بۆ مێژوو تۆمار کراوە). بنۆڕە، لە پێشەکی (دیوانی کوردیی—س۱۹۳۱) دا نێوی ئەحمەد خواجە، محەممەد سەعید قادر پچکۆل (قوتابیی زانستیی) یان تۆمار کردووە کە دیوانی شیعری (کوردیی — مستەفا بەگی ساحێبقڕان) یان بۆ ناردوون!

هەروەها لەپێشەکیی، (دیوانی شێخ ڕەزا—س۱۹۳۵) دا — دیارە قسەش هی مستەفا ساییبە—ڕاگەیاندراوە کە لەجەنابی مەلا ڕەئووف ئەفەندیی سەلیم ئاغاو محەممەد عەلیی ئەفەندییەوە، دیوانی شێخ ڕەزایان وەرگرتووە!

وێنەییکی دی ئەو پێوەندیی و تێکەڵییەش ئەوەیە لە پێشەکیی (دیوانی شێخ ڕەزا)دا بێژراوە: (لەبەردڵیخەڵك—هەڵبەت کەسانێکی بەگومان/کەمال—حەزم بە بڵاوکردنەوەی نەکرد! کە خەڵك زانیی ئەم دیوانەم لایە و نەشری ناکەم چ بە کاغەز و چ بە قسە زۆر تکای نەنەشریان لێ کردم!).

وێنەییکی دی جوان و باڵای پێوەندیی گیانیی گیانیی خاوەندەکانی (نەشرییات) لە ئەو ڕۆژگارە تەنگ و تارەدا ئەوەیە کە لە(هەموو کچێك چیی بزانێ — س۱۹۳۳)دا لە سەرەتادا دەڵێن:(بۆ ئەوەی هەموو کچە کوردێك خۆی بناسێ، ڕوو لەدایکییەتیی و ژیان و شارەزا بێ، ئەم کتێبەمان چاپ کرد!).

بەڵام بە چ باوەڕێکەوە؟.. ئەوەتە دەڵێن:(بیرمان وایەو حەز ئەکەین لەبابەت ئافرەت و ژنەوە چیی باشە و چیی پێویستە وەریگرین و لەبەرەوە بڵاوی بکەینەوە بۆ خزمەتی پێ گەییشتن و سەرکەوتنی ئافرەتی کورد!..

چونکە باوەڕمان هەیە کە هەتا ئافرەت نەخوێنیٚ، پـیٚ نـەگا و سـەرنەکەویٚ، میللـەت پێش ناکەویٚ و پیٚ ناگا !).

٢/٣. خوێندەواران و بەرهەمە چاپ و فرۆشراوەکان !

ئـەو ئامارەی کـەکـوردیــی—مستەفا ســـاییب ڕایگرتوون، دەست دەگـــرن بـۆ تیٚگەییشتنی باری سەردەمێکی ڕۆشنبیریی‌و چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردیی، بەتایبەتیی خۆشبەختیەکە ئەو ئامارە لەگەڵ (دوا هەواڵەکانی ساڵی ١٩٣٨) ی نەشرییات ڕابگیریٚ.

لیستێکی ڕاگیراوی نەشرییاتەکە لە (دیـوانی حـەریق — س ١٩٣٨) دا، لـە بەرامبـەر ئەم بەرهەمە چاپ و بڵاوکراوانەدا ئەوها دێتە بەرچاو:

١. دیوانی نالیی — س ١٩٣١ (لە ساڵی ١٩٣٨ دا تەواو بووە)
٢. دیوانی کوردیی — س ١٩٣١ (لە ساڵی ١٩٣٨ دا تەواو بووە)
٣. شارلۆك هۆلمس.. — س ١٩٣٥ (لە ساڵی ١٩٣٨ دا تەواو بووە)
٤. گۆرانیی — س ١٩٣٥ (لە ساڵی ١٩٣٨ دا تەواو بووە)
٥. یاریی — س ١٩٣٢ (لە ساڵی ١٩٣٨ دا زۆر کەمی ماوە)
٦. هەموو کچێك.. — س ١٩٣٣ (لە ساڵی ١٩٣٨ دا ماوە)
٧. خورشیدی خاوەر — س ١٩٣٣ (لە ساڵی ١٩٣٨ دا ماوە)
٨. دیوانی سالم — س ١٩٣٥ (لە ساڵی ١٩٣٨ دا ماوە)

نۆڕینێکی زانستانە لە ئەو بەراووردە، هێندیٚ مانای گرنگ دەبەخشن، ئـەوجا ماناکـە شیرین بیٚ یان تاڵ.. بەڵام — لەلای من — بەهەرحاڵ بەراوردەکە مایەی خۆشییە و گەڕی پێوەندیی خوێنـدەواری کـورد و پـڕۆژەی (نەشـرییات)ەکـەی دوو کەسـی جگـەر سـۆزە دەسەلمێنیٚ کە لە شوێنی خۆیدا ئەنجامەکەی پتر ڕوون دەکرێتەوە !

**٤.چارەنووسی؟**

وەك سەرەتایێ بۆ خەریك بوون بەوەلامی ئەم پرسیارەوە، چاك ئەوەیە یادی هێندێ قسە و باسی نێو نامەکانی کوردیی – مستەفا سایب بکرێتەوە.. وێنەیێك (ن – ٥ی١٩٣٣/٣/٢)ە کە دەلێت: (لەدوای هەموو کچێك... ئەلێم کتێبی لەو حیکایەتە پچووکانەی تەرجەم کردووە لەچاپی بدەین!). لەلاییێکی دیەوە لە(ن– ٦ی ١٩٣٣/٣/٢٢)دا نێوی (نوخشەی چار!!)و هێشتنەوەی(ئەلفا بێیەکەی تۆفیق وەهبیی) و (ناوە کوردییەکان!!) بۆ کاتی دی پێشنیار کراوە!

ئەم باسانە هەلبەت بەلگەن بۆ ئەوەی کاری گەلالە و نووسین و نیازی چاپ کردن لەلاییێن سلێمانیی–مستەفا سایبەوە درێژەی هەیە! ئایا دەنگ و باسێ لە بەغدادەوە شتێکی ئەوتۆ رادەگەیێنێت؟

(دیوانی حەریق–س١٩٣٨،ل ٢) وەلاممان دەداتەوە و دەلێت: (ئەو کتێبانە لەمەولا لە چاپ ئەدرێن:

١– لە چاپخانەیێکی سوورەتدا – لیۆ تۆلستۆی
٢– ژنێکی دەولەمەند. جیازیی – موپاسان
٣– شەوێکی بێ خەویی – مارك توین
٤– پشیلەکەم –!!
٥– دیوانی ناریی –!!

هەروەها نووسراویشە، " نوخشەی چار!! " لەژێر چاپدایە! / تەواو).

جێگەی گوتنە، لەسەرەتای "شەرلۆك هۆلمس–س١٩٣٥" دا نووسراوە: (بۆ جەژنی نەورۆز نیازمان هەیە کتێبێك بەناوی " نەورۆز "ەوە لەچاپ بدەین!!).

ئایا ئەم بابەت و نێونیشانانە بەر چاپ و بلاوکردنەوە کەوتوون کە گۆیا هەیانە لەژێر چاپدایە؟

ڕاستییەکەی لەڕیزی (نەشرییات) باس کراودا تا ساڵی ١٩٣٨ چ بەرهەمێکی دی چاپ و بڵاونەکراوەتەوە و کەسێکی دیش لە هیچ ڕۆژگارێکدا ئەوانەی — بێ لە دیوانی نارییی — نەخستووەتە بەر چاوی خوێندەواران و کەواتە، دوای (دیوانی حەریق — س ١٩٣٨) پرۆژەی (نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی) پەکی کەوت!! وێڕاش وەك ببڕای ببڕ چ چاپ کراوێکی کوردیی دی، نێو (چاپخانەی مەریوانیی) بەسەرەوە نییە، دیارە چاپخانەکەش لەنێو چووە و فرۆشراوە.

بە ئەو پێیە نە (نەشرییات) و نە (چاپخانە) نێویان دیار ماو ئەم پرۆژە ڕۆشنبیرییە چاپ گەڕییە کوردییە خزمەتگوزارەش کوێر بووەوە!

پرسیاری گرنگیش ئەوەیە: بۆچیی؟

من وەك گەڕاوم و وردبوومەتەوە، چەندم کرد لە چەند هۆیێکی خۆیی و گشتیی بەئەولاوە چ مەلامەتێکی دیم نەهاتە بەرچاو.

یێکێ لە ئەو هۆ خۆییە گەورانە، کۆچی مەریوانیی — تاهیر بەهجەتە لە مانگی ئابی ١٩٣٨دا بۆ خوێندن لە ئەمەریکادا. ڕاستییەکەیشی من چەند جار لە زمان ئەحمەد شوکریی هاوەڵییەوە بیستوومە کە نێوبراو (چاپخانەی مەریوانیی) بەر لە ڕۆیشتن فرۆشت کە ئەمەیشی بۆ خەرجیی کۆچەکەی بووە و بە ئەوەش پشتی پرۆژەکەی پێ شکاوە و بۆ هەر کەسێکی دی، بەتایبەتیی بۆ کوردیی — مستەفا سابیب گران بووە دەروازەیێکی ئەوتۆ خۆیی و جگەرسۆزە بدۆزێتەوە.

لەلاییێکی دیەوە — وەك دوای ئاوارە بوون و تاڵیی چێژتن مستەفا سابیب لە ساڵی ١٩٣٨دا لەبەغدادا گیرسایەوە — وێ دەچێ توانای تەنیا باڵیی و ئەرکێکی ئەوتۆ گرانی چاپوبڵاوکردنەوەی پێ جێبەجێنەکرابێ. خۆ دەشگونجێ چاوی بۆ کەسێکی ئەوتۆ هەڵخست بێ و بەتەمای کردەوە بوو بێ، بەڵام هیوای نەهاتبێتەدی.

لەلاییێکی دیەوە، مەزندە دەکەم کە کەسانێکی ژیری وەك مستەفا سایب چاوەنۆڕی قەومانیدووەم جەنگی گێتیی کردبێو هەر زوو نەچووبێتە ژێر باری تەنگو چەڵەمەکانی چاپو بڵاوکردنەوەوە کە دوای قەومانی جەنگ لە ١٩٣٩—١٩٤٥دا، زۆر کێشە ڕوویان دا.

ئەوەش فەرامۆش ناکرێ کە مستەفا سایب، ئەندازەوان بووە نەك پیشەزانێکی چاپ و بڵاوکردنەوە.

ئێستە وەك چارەنووسی ئەم (پرۆژەیەو چاپخانەی مەریوانیی)ی ڕوون بوو، پرسیارێ کە وەڵامی لەلای من هەیەو خوێندەواران لێی دەگەڕێن، ئەوەیە: داخۆ ئەو نووسینە گەڵاڵە و ئامادەکراو و وەرگێڕدراوانە، بەتایبەتیی باس کراوەکانی ساڵی ١٩٣٨ چییان لێ بەسەردا هات و کەوتنە کوێ؟

من هێندەی وەڵامم لەلابێ — وەك جاڕ بۆ دراوەکانی س١٩٣٨هیچیان چاپو بڵاونەکراوەتەوە —زۆر وێ دەچێ کەئەوانە کەوتبنە لای (کوردیی—مستەفا سایب) بەتایبەتیی کەدوو بابەت بەشێوەی دەستنووس لەگەنجینەیدا بەجێ ماوەو لەبەردەستی مندان:

١– ڕێگای سەرکەوتن — س؟؟ (کوردیی و مەریوانیی)

٢– جیازیی — س؟؟ (دانراوی موپاسان / کورتە چیرۆکێکی باس کراو لە جاڕدانەکەی س ١٩٣٨ دا.. {بنۆڕە: پاشکۆ — ژ: ١}

بۆ یادگارەکانی دی، ڕەنگبێ کەوتبنە لای کەسانی دی، یان لەنێوچووبن!!

**ئەنجام**

وردکردنەوەی هەموو باسێکی ئاشکراو نهێنیی (نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی) و (چاپخانەی مەریوانیی) کۆمەڵێ ڕاستیی بۆ مێژوو ڕوون دەکاتەوە.. لەلاییێکەوە بنچینەی ئەم پرۆژە رشۆشنبیرییە — ڕۆژنامەگەرییە، لە بیروباوەڕی نەتەوە پەروەریی — دوو کوردی دڵسۆز و کارامە — وە هەڵقوڵاوە!

لەئەوەش گرنگتر هەلی هەڵکەوتنی ئەم کردارە کەڕێکەوتی ڕۆژگارێکی ناسکی ژین و هەبوونی کوردە، بەتایبەتیی دوای بەیێکجار لکاندنی کوردستانی باشوور — لە ١٩٢٤ دا — بە مەملەکەتی عێراقەوە.

لەئەو مێژووە بەدواوە نەتەوەپەروەرانی ڕاستەقینەی کورد دوو ڕێگەیان لەبەردەمدا هەبوو: شۆڕش بە سەرکردایەتیی حەفیدزادە شێخ مەحموود، یان پەلاماری هۆش و بیر و کردەوەی قەڵەم بۆ سەلماندنی هەبوونی گەلی کورد و زمان و کولتووری و هیوای زیندووی بۆ پێ گەییشتن و سەرکەوتن!

بەڵێ لەدوای کاری ناڕەوای لکاندنە زۆرەملییەکە، پاشا و گەورە کاربەدەستەکانی مەملەکەتی عێراق — بە ئامۆژگاری ئینگلیزی هەرە دوژمنی گەورەی کورد — جاروبارە، لە ئەم کۆڕ و ئەو شوێندا لاف و گەزافیان لێ دەدا گۆیا، کورد دەبێ یێکسان بژی لەگەڵ هاووڵاتەکانی دی عێراق و ڕێزی مافەکانی بگیرێ. بەڵام ڕاستییەکەی هەر لە ساڵی ١٩٢١ ەوە — هێشتا کوردستانی باشووریش نەلکێندرابوو بە عێراقەوە — کەللەپووتە ڕقاویەکانی عەرەبی عێراق تانەو تەشەریان لە کورد دەدا.. بۆ وێنە ڕۆژنامەی (ئەلعێراق: ١٩٢١/١١/٢٣) گوتاری بۆ قەدر شکاندنی کورد و قەدەغە کردنی خوێندنی زمانی کوردیی بڵاودەکردەوە.

وێنەیێکی دیش هەر (ئەلعێراق:١٩٢٩/٤/٩)ە کە دوای سکاڵادانی نوێنەرە کوردەکانی نێو پارلەمانی عێراق بەحوکوومەت لەنیسانی ئەو ساڵەدا بۆ چاك کردنی باری خوێندەواریی کوردیی، ئەو ڕۆژنامەیە هەڕەشەی قەلاچۆکردنی کوردی بڵاودەکردەوەو دەیگوت: (ئەگەر کوردەکان داوای ئەوتۆ پێشکەش بکەن، بە دەردەکەی ئەرمەنەکانی تورکیا دەبرێن!!).

هەڵوێستەیێکی دی خراپی کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراقی عەرەب بەرامبەر زمان و نووسین و فێربوون و خوێندەواریی کوردیی، ئەو ناجوامێرییەی (ساتیعولحوسەریی)

ڕێبەری گشتیی مەعارف عێراق بوو کە لەنێوان سالآنی ١٩٢٩– ١٩٢٧ دا فەرمانەکەی کردبوو بە دەسکەلا بۆ بەربەرەکانێی زمان و خوێندەواریی و بلاوکردنەوەی کوردیی.

وێڕای ئەمانەش دوای ڕاپەڕینی جەماوەری٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ ی سلێمانیی و سێیەم شۆڕشی حەفید زادە و ئەوجا شۆڕشی بارزان لە نێوان ١٩٣١ –١٩٣٢ دا، هەروەها دوای چەندین یاداشتی بێزاریی‌و جمو جوولّی سیاسیی نهێنیی و چالاکی هێندێ نوێنەری نێو پارلەمان – وەك محەممەد ئەمین زەکیی – تەنانەت دوای چەند یاداشتێکی کوردان بە کۆمەڵەی گەلان، ئەوجا لە سالّی ١٩٣٢ دا حوکوومەتی عێراق زمانی کوردیی بەڕەسمیی بۆ خوێندن و بەکاربردن ناساند!

ئا لە ئەم جۆرە کەشە سەخت و دژوار و گەردەلوولە پڕ مەینەتیەدا، لە سالّی١٩٢٥ بەدواوە، نەتەوەپەروەرە کارامەکان، بە نهێنیی و بەئاشکرا کەوتنە خۆ بۆ پاراستنی کەسی کورد و زمانی کورد و کەلەپوور و مافەکانی گەل چ بە کۆمەڵ پێکەوەنان – ڕۆشنبیرانەی ئاشکرا و سیاسیانەی نهێنیی – چ بە نووسین و چاپ کردن و بلاوکردنەوە لەسەر ئەرکی خۆ و هاریکاریی هاونەتەوەییانە.

لە ئەم ڕووەوە دوو وێنەی دانسقەمان لەبەرچاوە کە یێکێکیان نەتەوەپەروەری لەخۆبوردوو حسێن حوزنی موکریانییە، ئەم زاتە لە سالّی ١٩٢٥ دا لە "حەلەب"ەوە چاپخانەیێکی کۆنەی هێنا و لە ڕواندزی کۆنە مەڵبەندی میرنشینیی سۆراندا بەتوانا و دەرامەتی لاوازی، بەدەستو پەنجەو قەڵەم و بڕبەندی خۆیەوە لەنێوان ١٩٢٦–١٩٣٢دا "٢٤" ژمارەی گۆڤاری (زاری کرمانجیی) دەرکرد و لەنێوان ١٩٢٥–١٩٤٧دا "٢٤" چاپ کراوی کوردیی بلاوکردەوە کە "٢٠"ی بەری قەڵەمی خۆی بوو!

وێنەی دووەمی تاکە کەسیی بۆ چاپوبلاوکردنەوەی کوردیی (کوردیی و مەریوانیی) و پرۆژەی (نەشرییاتو چاپخانەی مەریوانیی)بوو کە لەنێوان١٩٣٠–١٩٣٨دا دەستیان دایێو چالاکانە"١٣"بەرهەمی کوردیی‌و بێگانەیان بە زمانی کوردیی چاپ و بلاوکردەوە.

نۆڕینیٚ لەسنووری نەخشەی بڵاوکردنەوە کە: (بەغدا، چەمچەماڵ. خانەقین. ڕواندوز. سابڵاخ. سلێمانیی. قەرەحەسەن. کۆیە. کەرکووك. هەڵەبجە. هەولێر) و (سوریا. میسر) گـــــرتووەتەوەو پۆستکارو مامۆستای قوتابخانەو دوکاندار، بەرگدروو، سەعاتچیی، تووتنچیی، دەلاك، سەحاف، - بەرگ تیٚ گر - مەلای مزگەوتی تێکەڵ بووە، هەروەها ئەگەر لەسنووری ساڵانی١٩٣٠-١٩٣٨ ١.١ لە کوردستانی باشوور - لکێندراو بە عێراقەوە -هەمووی"٥٩" کتێبیی چاپو بڵاوبووبنەوە و " ١٣ " یان بەرهەمی ئەم (نەشرییات) ی ئـەم دوو کـوردە دڵسـۆزە بـیٚ، ڕوون و ئاشـکرایە کـە ڕەنـج و چ کۆششـێکی مەردانـە کەوتووەتە گەڕ بۆ سەپاندنی چاپ و بڵاوکردنـەوەی زمـانی کـوردیی، گومـان نییـە کـە چـاپگەریی نەشـارەزای زمـانی کـوردیی لـە بەغـدادا، هەڵـەی زۆری لەچـاپ کردنـی بەرهەمەکاندا خولْقاندووە، بگرە باری بڵاوکردنەوە و ڕەواجیشیانی گرانتر کردووە، بەڵام ئەم باسە لەچاو پرۆژەکەدا کێشی یێکجار سووکە.

وێڕای ئەو باسانە، هێندیٚ خاڵی گرنگتر شایانی تیٚ ڕامان و بایەخ پیٚ دانە:

١. نەشـرییاتی کـوردیی و مـەریوانیی - لـە کوردسـتانی باشـووردا - بەڕاسـتیی لـە کۆششە یێکەمەکانە بۆ بووژاندنەوە و ئاشنا کردنی کەلەپووری ئەدەبی کلاسیکی کورد.

چاپکردنی دیوانەکانی (نالیی، کوردیی، سالم، شێخ ڕەزا، حەریق) بەڵگەی گەورەن و کردەوەی یێکەمییە!

٢. هان دانی بەرهەمی لاوان و وزەو توانایان، چ بە چـاپ و بڵاوکردنـەوەی (یادگـاری لاوان)، چ بە ئاشناکردنی سروود و گۆرانیی و وەرزشی کوردیی، دیسان بەڵگەی بـەهێزن کە مەبەست هۆشیاری نەتەوەیی و پێشکەوتنی ژیریی ئینسانی کوردە.

٣. چاپو بڵاوکردنەوەی بەرهەمی دانسقە و گەلاڵەکراو، (هەموو کچێك چیی بزانـیٚ؟) بەڵگەی ئەوپەڕی ژیرییـە بـۆ ڕێزلـیٚ کـرتنی ژنـی کـورد و هـان دانـی بـۆ تـیٚ گەییشـتن و پێشکەوتن. ئەو کردەوەیە لە ئەو ڕۆژگارە ناسکەدا وێنەی کارێکی بەجەرگانە و هەسـتی

نەتەوەیی بەرز و پیرۆزە کە تا ئێستەش وێنەی لە چاپ و بڵاوکراوەی کوردییدا دەگمەنە.

٤. نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی، پێشڕەویی نواندووە - بەتایبەتیی بە کرد و کۆشی‌مستەفاساییب—بۆ نزیك کردنەوەی ئەدەبییاتی بێگانەی پێشکەوتوو، بەتایبەتیش هونەری ڕۆمان و کورتە چیرۆك.

خۆخەریك کردن بە وەرگێڕانی وێنەی بەرهەمی ئەو جۆرە بابەتە —با زۆریشیان جاری بۆ درابیێو. بەرچاپوبڵاوکردنەوە نەکەوتبن—وەك بەرهەمەکانی نووسەرە بەنێوبانگەکان، (ئارتەر کۆنان دۆیلی ئینگلیز، تۆڵستۆی ڕووس، مارك توینی ئەمریکایی، موپاسانی فەڕەنسییوهتد..) بەڵگەی نیازێکی گەورەیە بۆ کەلێن پڕکردنەوەی ڕۆشنبیریی کوردو بڵاوکردنەوەی ئەدەبییاتی بێگانەی پێشکەوتوو..

ڕاستییەکەیشی دوای ڕۆژنامەی (پێشکەوتن— سلێمانیی: س ١٩٢٠ - ١٩٢٢) کە دوو ڕۆمانی بێگانەی بڵاوکردووەتەوە، بڵاوکردنەوەی ڕۆمانی پۆلیسیی (شەرلۆك هۆڵمسی لە گوللەیێك لە تاریکییدا) سییەم وێنەی وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەیە.. تەنانەت - وەك لە پاشکۆدا دەخرێتە بەرچاو— مستەفا سابیب وەك یێکەم وەرگێڕی (کورتە چیرۆکی بێگانە) دێتە بەرچاو.

گومانیشم نییە ئەگەر (نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی) بڕی بکردایە و ئەو ڕۆمان و کورتە چیرۆکانە بە کوردیی چاپ و بڵاوبکرابانەوە، توانای نووسین و وەرگێڕانی چیرۆك و ڕۆمان لەنێو ڕۆشنبیرانی کورددا - کە کارەکەیشیان بەسەر ئەوڕۆدا دەبریسکایەوە— پێشکەوتووتر دەبوو!

گرنگیی ئەم پڕۆژەیە و کاریشی لە دڵی تیێ گەییشتووەکانی کورددا - دوای پیێ پەڕینی بیست ساڵی بەسەر پەك کەوتنیدا —بەئەو قسەیەی زانا تۆفیق وەهبییدا دیارە کە لەساڵی ١٩٥٦ولەدیمانەی(مەریوانیی—تاهیر بەهجەت)دا، پیێی گوتووە: (بۆ نایەیتەوە

کتێبمان بۆ لەچاپ بدەی؟ دەزانم کە تۆ هەر خــــەریك دەبیو ناسرەوی!). {بنـۆڕە: پاشکۆ – ٢}

بەکورتیی، پڕۆژەی (نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی) و چاپخانەکەیش، ئەگەر پـتر بەهۆی تایبەتیی خوێندنی تاهیر بەهجەت مەریوانییو بەهۆی تەنیا باڵیی مستەفا سایب و هۆی گشتیی دیەوە پەکیان کەوت بێ، ئەوە هێشتا لەلای من پڕۆژەیێکی زیندووە و – مستەفا وتەنیی لە نامەیێکییدا بۆ تاهیر – کارەکەیان مێژوویيە.

ڕاستییەکەیش هەر ئەوەیە کەوێنەیێکی گەورەی توانای مرۆڤی کوردە بۆ بەرهەڵستی تاریکیی و دوژمنانی نەتەوەی کورد!

٤ / ٤ / ١٩٩٨– سلێمانیی

## پاشکۆ – ژ: ١

وێنەیێکی دەستنووسی بەجێ ماوی (نەشرییاتی کوردیی و مەریوانیی): جاپ بۆ دراو و چاپ نەکراو، وەرگێڕدراوی مستەفا سایب خۆی و بەجێ ماوی ئارشیفی.

### جیازیی

گەی دی موپاسان[١]

ئاوقات[٢] سیمۆن لە شارێکی موناسیبدا نزیک پاریس مەحاماتی ئەکرد و لەگەڵ مادموازێل ژان کۆردییەدا ڕێك کەوت و مارەی کرد. ئەو کچەیش هەندێ پارە و شتی هەبوو، بەجیازیی لەگەڵ خۆی هێنابووی. بەڵام لای باوکی دابنابوو. لەپاش مارەکردن و گواستنەوە، مادموازێل ژان، مێردەکەی زۆر خۆش ویست، وای لێ هات کە نەیئەتوانی تۆزێك لێی دوور کەوێتەوە. ڕۆژ تا ئێوارە بەدەور و پشتیا ئەهات و جارجار ئەیگرت و ماچی ئەکرد، یا لەسەر ئەژنۆی وەك منداڵێکی خۆشەویست دائەنیشت و دەستی ئەکردە ملی و ئەیوت: چاوت بنووقێنە و دەم بنێ بە دەممەوە!

---

{١} داستان – ڕۆماننووس و کورتە چیرۆکنووسی فرانیسس (١٨٥٠ – ١٨٩٣) گەلێ داستان و کورتە چیرۆکی نووسیوە وەك " ژیانی برادەرێکی جوان – س ١٨٨٥ " و " پییێرو جان – س ١٨٨٨ " و " دڵمان – س ١٨٩٠ " وە پتر لە " ٣٠٠ " کورتە چیرۆك، کە داشنراوە بە یێکێ لە چیرۆکنووسە ناسراوەکانی دنیا و گەلێك یادگاری گۆڕراوە بۆ زمانانی دی.

جێگەی گوتنە و دەتوانم بڵێم کە ئەم کورتە چیرۆکەی بۆ کوردیی یێکەم یادگاری وەرگێڕانی نووسەرانمانە و لە هیچ ڕۆژنامە و گۆڤارێکی دیدا چ چیرۆکێکی " موپاسان " م نەدیتووە هێندە نەبێ درەنگێ لە گۆڤاری (گەلاوێژ) دا چەند کورتە چیرۆکێکی کراوە بە کوردیی.

{٢}. ئاوقات: ئادڤۆکات، پارێزەر

{٣}. ئیستاسیۆن: وێستگە. محەتتە!

– ئەویش ئیتاعەی ئەکرد و چاوی نەختێ ئەنووقان.

ژنەیش دەمی ئەنا بە دەمیەوە، یێك لەسەر یێك سەد جار ماچی ئەکرد و لێوی ئەمژیی!

لەپاش هەفتەییێك مێردەکەی وتی:

– ئەگەر حەز ئەکەی ئەم دووشەمووە ئەچینە پاریس وەك دوو عاشق ئەکەوینە کەیفی پاریسەوە هەتا تێر ئەبین..

ژانیش وتی:

– ئۆخەی، هەزار جار، با بچین!

سیمۆن پێی وت:

– بەلاّم هیچمان لەبیر نەچێ بۆ ئەسبابی کەیف و ئیستراحەت! بچۆرە لای باوکت پارە و مارەت هی جیازییەکەت هەرچیی هەیە وەریگرە و بیهێنە کە لەسەر پارە پەکمان نەکەوێ و ئەو قەرزانەش بدەینەوە!

ژنە چووە لای باوکی و هەرچیی سەروەتێکی هەبوو، هێنای و تەسلیمی مێردەکەی کرد و خۆیان کۆکردەوە و ئامادە بوون.

ڕۆژی دووشەمە باوك و دایکی ژان هاتن تا سەر ئیستاسیۆن[٣] کە کچەکە و زاواکەیان ڕەوانە بکەن. باوکی ژان بە زاواکەی وت:

– باوەڕ بکە شتێکی چاك نییە ئینسان ئەوەندە پارە هەلگرێ لەگەلّ خۆی بەسەفەر!

زاوایش بە زەردەخەنەییکەوە وتی:

– ئەوەندە مەراق و غائیلە مەکە! من فێرم بە ملیۆن پارەم پێ بێ چونکە مەسلەکەکەم وا هەلّ ئەگرێ!

ئـاخریی شـەمەندەفەر هەسـتاو جووتـە عاشـقی ڕفـان بـەرەو پـاریس. لـەپاش دوو سەعات شەمەندەفەر گەییشتە پاریس.. ئاوقات بە ژنەکەی وت:

– ئەگەر حەز ئەکەی شتەکانمان لە ئیستاسیۆن دابنێین و بچینە لۆقەنتەییکی خۆش نان بخۆین ئینجا بێینەوە بۆ شتەکانمان و بچینە ئوتێل!

ژنەکەیش موافەقەتی کرد، وتی:

– با سواری ئارابەیێك بین [٤] !

سیمۆن وتی:

– وا ئیقتیساد ئەکەی، بۆ ڕێگەییکی پێنج شەش دەقیقـەیی ئارابـەیێك بـە دوو سـێ فرانق بگرین. سواری ئومنیبووسێك [٥]– وەك تراموای وایە – ئەبین بـە پـارەییکی کـەم باشترە!

ژنەکەی زۆری پیٚ خۆش بوو وتی:

– دەباشە!

لەو ئانەدا ئۆمنیبووسێك گەییشتە ڕاستی ئەوان. سیمۆن ئیشارەتی کـرد. وەسـتانی و دەستی گرت بە قۆڵی ژنەکەیەوە، سەری خستە سەری و پێی وت:

تا حەرەکەتی نەکردووە من لێرە ئەوەستم، شـێت بـووم بـۆ جگـەرەیێك. نەفەسـێك ئەکێشم و..

ژنەکەی نەگەییشت بپرسیٚ وە یا بوەستیٚ لەگەڵیا،

ژان وتی:

---

{٤}. ئارابە: گالیسکە. عارەبانە.

{٥}. ئۆمینبوس: پاسێکی درێژە بە کارەبا دەڕوات.

{٦}. ئەمە یێکەم جارە وەرگێڕ وت ووێژەی دوو کەس ئەوها بنوێنیٚ.

– بۆچی ئێمە زۆر لە شەقامی گەورە دوورین؟

وتی:

– زۆر دەمێکە تێ پەڕمان کردووە!

ژان وتی: {٦}

– ئاه، دە بە مێردەکەم بڵێ!

– مێردەکەت؟ بۆچی لە کوێیە؟

– لەبەر دەرکی ئۆمینبوسەکەی بەر دەرگە!.

– خۆ سەعاتێکە کەسی هەر لێ نییە..!

– چۆن، قابیل نییە! لەگەڵ منا سەرکەوت!

زەریف بڕوانە، موحەققەق لەوێیە!

کابرای ئۆمینبوسگێڕ تورە بوو، قیژانی:

– بەس قیرەمان دەربهێنە. پیاوێکت ون کردووە بیستس ترت دەس ئەکەوێ. کەسی لێ نییە.. بچۆ لەچادە زۆری تر ئەدۆزیتەوە.

ئەوسا ژان موتەئەسسیر بوو کەوا خراپی تێ گەییشتووە. بەگریانەوە وتی:

– تۆ خراپ تێ گەییشتووی! من لەوانە نیم. ئەو پیاوە مێردم بووە وە جانتاییێکی لەبن باخەڵا بوو.

ئینجا کابرا تێ گەییشت و پێ کەنیی، وتی:

– جانتاییێکی پێ بوو، ئێ، ئێ، وابیرم کەوتەوە. بەلام ئەو هەر لە ئەووەڵ ئیستاسیۆن دابەزیی و ڕۆیشت!

ها ها! بەجێی هێشتووی و بەرەڵلای کردوویت و بەخۆت نەزانیوە!

ساحێبی ئۆمینبوسەکە پەلی گرت و ڕایکێشایە ژووریێ کە نەکەوێتە خوارەوە، بەلام لە ڕاکێشاندا کەوت بەسەر پیرێژنێکدا لە ناوەوە.. ئیتر کەوتە ناو قەڵەباڵغیی ڕێبوارەکان

کە هەریێکە لە چەشنێ بوون، هەروا واقی وڕما بوو.. لە دڵی خۆیشیا ئەیوت گوایە، (بۆچیی لەگەڵم نەهاتە ژوورەوە. نەیئەتوانی.. لەبەر من ئەم جگەرەیە ئێستە نەکێشێ؟ لەخۆیەوە دڵی تەنگ بوو..).

ئۆمینبوس هەر ئەڕۆیشت و ڕێگە نەبڕایەوە، لەسەر شەقامەکان جاروبار ئەوەستا، خەڵق دائەبەزی و سوار ئەبوو، ژانیش هەروا حەپەسا بوو وە لەبەر خۆیەوە وتی:

– دیارە زۆر دوورە لۆقنتەکە، وا هەر نایگەینێ!

ئەگەر خوانەخواستە شتێکی بەسەر نەهاتبێ یا خەوی لێ نەکەوت بێ لەوبەر دەرکی ئۆمینبوسە، هەر باشە ! !

بەرەبەرە ڕێبوار کەم بووەوە و ئاخریی کەسی تیا نەما جگە لەخۆی.

ئۆمینبوسگێڕەکە قیژانی:

– ئێستاسیۆن!

ئەم هیچ نەجووڵایەوە.

دووبارە بانگی کرد:

– ئاخیر ئێستاسیۆن!

ژان بە تەعەججوبێکەوە سەری هەڵبڕی و سەیری کابرای کرد چونکە تێ گەییشت کابرا لەگەڵ ئەویەتی. وتی:

– گەییشتینە کوێ؟

کابرایش بەڕوویێکی گرژەوە وتی:

– گەییشتینە ئاخیر ئێستاسیۆن و ئەمە بیست جارم قیژان هەر تێ ناگەی!

.. ئیتر ئۆمینبوس وەستا. ئەویش دابەزیی.

بەحیرەت و ئەندێشەوە ڕووانییە دەوروپشتی خۆی، تەماشای کون و قوژبنی ئۆمینبوسەکەی کرد. چونکە باوەڕی نەدەکرد، بە عەقڵیا نەئەچوو سیمۆن بێ سەبەب وا

زوو بەرەڵلای بکاو بڕوا.. دەسی کرد بەگریان لەو سەر شەقامە، دنیای لەبەر چاو تاریک بوو.. لەبەرخۆیەوە وتی:

– قوڕی کویێ بکەم بەسەرما. ئینجا من چیی بکەم؟

موفەتتیشی ئۆمینبوس هات، پرسیی:

– چیی بووە؟

ئۆمینبوسگێڕ وتی:

– ئەم ژنە مێردەکەی لەڕیێ بەرەڵلای کردووە..

موفەتتیش وتی:

– ئاه، هیچ نییە، گویێ مەدەریێ! بڕۆرە سەر ئیشت!

هەموو بەجێیان هێشت.. ژان لەو شەقامە زلەدا، لەو شارە گەورەیەدا تەنها مایەوە، ترسا، واقی وڕما..

هەر نەیزانیی چیی بکا، نازانیێ مێردەکەی چووە بۆ کویێ و چیی لیێ هات و بۆچیی وای کرد! هەموو سەروەت و پارەکەش بەوە، تەنیا دو فڕانقی پێیە! لەپڕ بیری کەوتەوە مامێکی هەیە لە وەزارەتێکدا مەئموورە لە پاریس.

بەو دوو فڕانقە سواری عەرەبەیێك بوو، چووە ماڵی مامی. لەو ئانەدا مامی خەریك بوو ئەهاتە دەریێ بچیێ بۆ سەرا، گورج دابەزیی و ڕایکردە لای مامی.

مامی زۆر عاجباتی لیێ ما. وتی:

– ژان! ئەوە چیی ئەکەی لێرە؟ کەی هاتی، بۆچیی وا بەتەنهای؟!

ژان لەبەر هەنسکی گریان قسەی بۆ نەدەهات. چاوی پڕ بوو لە فرمێسك، وتی:

– تۆزیێ لەمەوپێش مێردەکەم لیێ ون بوو!

– مێردەکەت لیێ ون بوو، لەکویێ و کەی؟

ئەویش بەگریان و شیوەنەوە مەسئەلەکەی بۆ گێڕایەوە.

مامیشی قەدەرێ لێکی دایەوە. دوایی وتی:

– ئەم بەیانییە عەقڵی لەجێی خۆی بوو، تێك نەچوو بوو؟

– بەڵێ، ساغو سەلیم بوو.

– پارەی زۆر پێ بوو؟

– بەڵێ، هەموو پارەی جیازییەکەی من بەو بوو کە شتی پێ بکڕین لێرە.

– کەوا بوو ئەی خوشکەزا عەزیزەکەم! مێردەکەت ئێستە بەڕێی وڵاتێکی دوورەوەیە!.. (ئەویش هیچ تێ نەگەییشت و بۆڵە بۆڵێکی کرد!!)

مامی وتی:

– ئەڵێم مێردەکەت سەروەتەکەی دزیت و بردوویەتی و هەر بۆ ئەوەیش مارەی کردوویت!

ژان هەروا وشك بوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، لاڵ بوو وتی:

– چۆن! مێردەکەم.. کەوابوو دزە!

ئیتر خۆی پێ نەگیراو دایە پڕمەی گریان.. مامیشی بردیە ژوورەوە و زۆر بەسەریا هات و تەسەللای دا..

ژانیش ژیر بووەوە، بەڵام ئەوەی قەت لەبیر نەچوو قەت شووی نەکرد..

---

**پاشکۆ – ژ: ٢**

ئەمە یێکێکە لە دوا یادگارەکانی (مەریوانیی – تاهیر بەهجەت) کە ئاوێنەیێکی پاکە بۆ ناسینی باریژین‌و هۆش‌و بیرو هەلۆیستی زانستیی‌و نەتەوەیی.من لەڕووی زانستیەوە نیشان دانەوەیم پێ ویست زانیی *

## خۆشەویستم مامۆستا نەریمان**

وتارەکەتان کەلە(هەتاو) دا بلاوکرابووەوە، خوێندمەوە وە کتێبەکەتان (هەلبەست بۆ قوتابیان) لەگەلٚ کاغەزەکەتاندا گەیشت. زۆر زۆر سوپاستان دەکەم. لێم ببوورن لە سستیی وەرام دانەوەم.

وەرامەکەم نووسیی‌و چەنگ–چەند/ کەمال – جار خەریك بووم بینێرم بۆ (هەتاو)، کەچیی هەموو جارێك پەشیمان دەبوومەوە..

کاکی خۆم، گۆڤار دەرهێنان لێرە زۆر گرانە، هەر ژمارەی ٢٠٠ دیناری تێ دەچیّ، جگە لەحەقی پۆستە. کێ لێرە یاریەم دەدات؟ لەوێ چەنگی–چەندی/ك– دەفرۆشریّ؟ من ڕۆژی١٢–١٤سەعات ئیش دەکەم، پشوودان لێرە کەمە! من هەموو مانگێك ناتوانم ٢٠٠ دینار فرێ بدەم، مەسرەفم زۆرە!

ئەوا ئەو وتارەی کەچەنگ –چەند – ویستم بینێرم بۆ (هەتاو) لەگەلٚ ئەم کاغەزەدا بۆ ئێوەم نارد. ئەزانم کە بلاوکردنەوەی لە (هەتاو) کەلکێکی نابیّ. کەواتە بیخوێنەوە و لەپاشان فرێی دە!

ئیتر هیوام هەیە کەجاروبار کاغەزتان وەرگرم، زۆر حەز بەخوێندنەوەی وتارەکانتان و کاغەزەتان دەکەم. دیارە کە دلسۆزو ڕۆح پاکن. خوا هاوالتان زۆر بکات بۆ قەومی هەژاری کورد!*** (مەریوانیی)

---

* عێراق، ژ – ١، دوو شەممە ٢١ / ٣ / ١٩٧٧ – ل ١١ {بەدەستکاریی ڕینووسەوە!}.

.................................................................................

**. مستەفا نەریمان بە نێونیشانی (نووسینێکی بڵاونەکراوەی تاهیر مەریوانیی) یەوە – لە ئەو ژمارەیەدا – سەرپۆتێکی (بڵاوکراوەکانی کوردی و مەریوانیی) و هێندێ باسی ژیان و خوێندن و پێ گەییشتنی مەریوانی ڕوون کردووە و دەڵێت کە بە گەڕانەوەی تاهیر بەهجەت مەریوانیی. لە ساڵی ١٩٥٢ دا ناسیاویم لەگەڵ پەیدا کرد و ئیدیی کەوتمە نامە گۆڕینەوە لەدوای گەڕانەوەی بۆ ئەمریکا!

***. م.نەریمان ئەو (نووسینەی مەریوانی) شی – وەك بەشی دووەم – لە عێراق، ژ – ٢، پێنجشەممە ٢١ / ٤ / ١٩٧٧ دا بڵاوکردووەتەوە کە لەبەر گرنگییەکەی دەیخەمە ڕوو، ئەمەیە:

**(من و کتێب و گۆڤار...**

شیکاگۆ – دوکتۆر ت. ب. مەریوانی

لە١٩٥٢ دا کە هاتمەوە بۆ سەردان لە وڵات، تۆفیق وەهبیی بەگ لێی پرسیم، " بۆ نایەیتەوە کتێبمان بۆ لە چاپ بدەی! دەزانم کە تۆ هەر خەریك دەبی و ناسرەویی؟ نەریمانیش دەیەوێ گۆڤارێك لێرە دەربێنم و دەڵێ: یاریەت دەدەین!!

من لەوێ وەرامی تۆفیق وەهبیی بەگم دایەوە و وتم: ئەی ئێوە چیتانە؟ ئێوەش دەتوانن هەر خەریك بن و نەسرەوون!.

وەرامم لە ئێوە! تەنیا تۆفیق وەهبیی نەبوو، هەموو خوێندەوارێکی کورد بوو، هەر کەسە لە چ مەیدانێکدا دەستی درێژە، لەو بابەتەوە بنووسێ، بۆ لەچاپ دانی کتێب تەنیا پیاوێك – دەوڵەمەندیش بێ – ئەرکێکی گرانە. چوار پێنجێك کۆببنەوە و کۆمەڵی چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی ڕێك بخەن. ئەمانە بە پروپاغەند و هان دانی خەڵك بۆ خوێندنەوەی کتێبی کوردیی، لەدوای بەینێك، پارە پاشەکەوت دەکەن!

**من و کتێب و نووسین:**

لام وایە ماوەم لەهەموو کوردانی کوردستان زیاتر هەیە بۆ کتێب نووسین، چونکە دە ملیۆن زیاتر کتێبم لەبەر دەستدایە. لەهەموو شەرقی وەستدا باوەڕ ناکەم سەدیێکی ئەم دە ملیۆنە ببێ. نیشانەی ئەمەش: سستیی قوتابیانە. کە لە کوللییە و جامیعەی ئەوێ دەردەچێ و دێن بۆ ئێرە بۆ دوکتۆرا وەرگرتن، لەجیاتیی بە سێ ساڵ دوکتۆرا وەرگرن بە ٨ – ١٠ وەریدەگرن!!

لەیێکێکی خەڵکی "ناسرییە"م پرسیی، " ئەرێ بۆچیی ئەمەریکایی و ئەوروپاییەك، لە پاش چوار ساڵی کوللییە، بە سێ ساڵ دوکتۆرا وەردەگرن، کەچیی ئێوە بە ٨ – ١٠ ساڵ!؟، وتی: چونکە بە

.....................................................................................

زمانی خۆمان ناخوێنین بۆیێ!. لە میسرپیەکیشم پرسیی، وتی: لای ئێمە کتێب لە مستەوای سانەویی بەرزتر نییە!!.

وتم: من ماوەم لە ئێوە زیاترە، چونکە کتێبی زۆرم لەبەردەستدایە. ئەمە مێژوو، ئەدەب، هۆگریی وەزمانی کۆن ناگرێتەوە. ئێوە لەم مەوزووعانەدا دەستتان زۆر درێژە و سستیی کردن شوورەییە! لەبابەت ئەمانەوە ئەورووپایی و ئەمەریکایی نووسیویانە، بەڵام کەمیان بەکاری خوێندنەوە دێن.
کابرایێکی ئینگلیز لەبابەت ژیانی هۆگریی کوردەوە کتێبێکی نووسیوە، پیاو تەریق دەبێتەوە کە دەیخوێنێتەوە. هەموو باسی شێخێکە کە چۆن لەگەڵ چوار ژنەکەیدا رایدەبوێرێ!!

**من و کتێب و گۆڤار**

کە من پێم نایە ئەمەریکا، هەر چاوێکم کرد بە هەزار چاو، بۆئەوەی لەهەموو شتێك بگەم و زۆر شت فێربم. دیم لەهەر شارێکدا ٨ – ٩ یۆنانیی، یا پۆڵاندی، یا فرانسز، یا ئەڵمانیی، هتد... یانە و رۆژنامەیان هەیە. ئەمە شڵەژاندمی، بۆ کورد گەڕام تا یانەیێك و رۆژنامەیێك بۆ خۆمان پێك بهێنن.

دوکتۆر نەجیب بەکر لە فەلادیلفیایە کوردیی نازانێ، وتار بە تورکیی دەنووسێ وە بە ناوی هەواڵێکەوە دەینێرێ بۆ تورکیا تا لە گۆڤاری توببیی ئەوێدا بڵاوبکرێتەوە. حەبیب الله ئیسماعیل موکریی لە شیکاگۆ هەر "میللتفتی!!" دەزانێ و قەت خۆی بە کورد دانەناوە.

دەستەیێك کوردی نەخوێندەوار لە " دیترۆیت" هەیە، ئێستاش لە دەوری – سوڵتان / کەمال – عەبدولحەمییددا دەژین و لەگەڵ " ئارنائوودەکان " دا لە چاخانەیێکدا کۆدەبنەوە وەك جێی بەنگ کێشەکان وایە. هەرچەندم کرد نەم توانیی ئەو کابرایانە بخەمە سەر هەوەسی خوێندن و دامەزراندنی یانە و رۆژنامە، لام وایە پیریی وای لێ کردوون. من بەتەنیا گۆڤارم پێ دەرنایەت، من هەموو رۆژێك لە کوللیەی توببییە دەرس دەڵێمەوە. تەماشای نەخۆشان دەکەم و خەریکی سەرکارییم. تەنیا رۆژیی یێکشەممەم هەیە بۆ پشوودان. ئەو رۆژەش گەرەکە گۆڤاری پزیشکیی، پسپۆریی و زانستیی بخوێنمەوە، جگە لەمەش جاروبار خۆم لە نەخۆشان بدزمەوە بۆ کۆبوونەوەی کۆمەڵی زانستیی، پزیشکیی و پسپۆریی.

ئەمانەش مانگی ٢ – ٣ جار هەیە. بێجگە لە ساڵی ٢–٣ جار کۆبوونەوە کە هەفتەیێك دەخایێنێ. هەر چوار پێنج ساڵیش جارێك هەفتەیێك دەبێ بچینەوە مەکتەب بۆ فێربوونی رێگەی تازە دۆزراوە بۆ تەشخیسی نەخۆشیی، ئالەتیی تازە و داو و دەرمانی تازە بەکارهێنان.

..................................

لێرە پیاو کە لە جامیعە دەرچوو مانای ئەوە نییە کە " وەك مەل جریوەی تێ! " وە یا " بووە بە دوانگزە — دوازدە — عیلم " هەتاماوی دەبێ کتێب بخوێنێتەوە و ناوبەناو لە مەکتەب بخوێنی، ئەگینا دوادەکەوی، وە دواکەوتنی لە مردن ناخۆشترە. پیاو دەبێ هەمیشە هەوڵ بدات بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتن، قەناعەت خراپە! من کە شتێکی باشم کرد ئەوە ناکەم بە تەرازووی تەوانام و لەسەری برۆم و خۆمی پێوە هەڵکێشم، زیاتر هەوڵ دەدەم تا شتێکی باشتر بکەم.

کە منالّ بووم لەسلێمانیی، جارێکیان ئەمەم لە پیاوێك بیست و لە مێشکمدا چەسپیی، پیاو خۆ گا نییە تا دەمرێ لەپێستێکدا بێ!. هەمیشە هەوڵ دان بە سەرکاریی و کتێب و گۆڤار زۆر خوێندنەوە پیاو پێش دەخات. ئینجا ئەگەر تۆ قەسیدەیێك وەیا وتارێکت نووسیی و خەڵك پەسەندیی کرد، مانای ئەوە نییە کەتۆ بەمەرامی خۆت گەییشتی، ئیتر دەبێ پشتی لێ بکەیتو چرچی لنگی لێ ڕاکێشی، هەوڵ بدە شیعری جوانترە یا وتاری باشتر بنووسە. کورسیی چاکتر وە یا خانووی خاستر دروست بکە. شەو و ڕۆژ هەوڵ بدە بۆ پێشەوە بۆ سەرکەوتن!

من دەمەوێ دوو کتێب بنووسم و لە چاپیان بدەم:

" ١ " خۆپاراستن لە نەخۆشیی تەشەنە و " ٢ " نەخۆشیی: بڵاوبوونەوەی و چارەی.

زۆر هیوام بە خوێندەوارانی " گەلاوێژ " بوو کە ناوی ئەو نەخۆشیانەی کە من نایزانم بۆم بنووسن، بەڵام کەس گوێی نەدایە. لە " هەتاو " دا هەر ئەو هیوایەم هەیە — هیوام هەیە دوو ساڵی کە ئەم هیوایەم بێتەدی. کە ئەو دوو کتێبەم بڵاوبووەوە و، بەناو کوردەکاندا، من خۆم بە بەختیار دەزانم.

بۆ گۆڤار، لام وایە ئەگەر هەموو کوردە بە غیرەتەکان دەست بدەنە باڵ " هەتاو " م ئابوونەوەی لە هەزار تێپەڕ بکا، ئەوسا خاوەنی هەتاو هەم تیپی باشتر، هەم کاغەزی چاکتر بەکار دەهێنێ وە هەم لاپەڕەکانیشی زۆر دەکات. من هەتا بتوانم لە نووسین دەست کورتیی ناکەم...

با لێرەدا باسی کابرایێکی بەغیرەتتان بۆ بکەم:

جۆنسۆن: کابرایێکی قولەڕەشە. کە لە مەکتەبی سانەویی بوو، تەماشای کرد قولەڕەشەکانی شیکاگۆ ڕۆژنامە و گۆڤاری خۆیان نییە! ڕۆژنامە و گۆڤاری قولەڕەشانیان لە شارانی کەوە بۆ دێت. زۆر شتی هۆگریی، مێژوویی، ئەدەبیی کە لێرە ڕووی دەدا، ڕۆژنامە و گۆڤاری دەرەوە یا باسیان نەدەکرد وە یا بەکورتیی دەیاننووسیی. جۆنسون کە لە مەکتەب دەرچوو، ویستی گۆڤارێکی هەفتەیی دەربێنێ تا هەموو جووڵەییێکی قولەڕەشی ئێرەی تیا بنووسرێ.

ئەم لاوە بێ پارە بوو، بەڵام زۆر باوەڕی بە سەرکەوتن هەبوو، هات "٥٠٠" دۆلار کەل و پەلی ماڵی دایکی بە بارمتە دانا. ئەمجا بەخۆی وژنەکەی "٢٠,٠٠٠" کاغەزیان بۆ خەڵك نارد پێیان وتن کە گۆڤارێکی هەفتەیی بۆ قولەڕەشی ئێرە دەردەچێ! ئەوانەی دوو دۆلار پێشەکیی بنێرن گۆڤارەکەیان هەتا ساڵێك بۆ دێت، "٣,٠٠٠ " کەس وەرامیان دایەوە. سەرمایەی جۆنسون لە "٦,٠٠٠" دۆلار تێپەڕی کرد.

جۆنسون دوکانێکی بەکرێ گرت، بە خۆی و ژنەکەی یێکەمین ژمارەیان دەرهێنا. لە ساڵی ١٩٤٣ گۆڤارێکی کەشی دەرکرد. ئەم گۆڤارە دووەمە کە ناوی "عەبەنووسە" نیو ملیۆن ئابوونەی هەیە. ئەمرۆ جۆنسون چوار گۆڤاری هەفتەیی دەردەهێنێ و نزیکی سەد کەس لەبەر دەستیا ئیش دەکەن.

جۆنسون لاوێکی بەغیرەتە و ئەوانەی گۆڤارەکانی دەخوێننەوە بەغیرەتن.. ئەویی ئێمە دیومانە قولەڕەشی ئێرە ئەوەندەی نەدیی.. کەچیی قولەڕەشەکان بە زیرەکیی خۆیان، خاوەن سەدەها گۆڤار و ڕۆژنامە و دەزگەی ڕۆشنبیرن!).

"تەواو"

## پەراوێز

(١). وەك: عەقیدەی کوردان "مەنزووم"، عەبدوڕڕەحیم ڕەحمی ئەفەندیی ٢- مەم و زین. {بنۆڕە: ژ ٥، ١٢ ی کانوونی یێکەمی ١٣٣٤ ی ڕۆمیی = ١٩١٨ ز / ئەستەنبوول}.

(٢). وەك: ریسالە دینییە / رسالە دینیة - زیوەر عەبدالله،س١٩٢٠,٢- دیوانی مەحویی - س ١٩٢٢.

(٣). لە دەستنووسەکەی بەردەستم و ڕۆژنامەدا، ئیمزای (کوردێك) ی لێداوە!

(٤). بە ئیمزای زەکیی سابیبەوە!

(٥). گۆرانییەکان، سرروودی نیشتیمانیی و نەتەوەیی شاعیران: (ڕەفیق حیلمیی، عەبداللە زێوەر، عەبدولخالیق ئەسیریی، م. تۆفیق، م. جەودەت، م. نووریی) ن.

(٦). بەڕۆشنایی نامەیهاوەڵانی:فوئاد ڕەشید بەکرو عەبدولواحید نووریی لەساڵی١٩٣١ دا.

(٧). نووسەر جەمال بابان لەکۆتایی (لەخەوما — س ١٩٧٥) بەئاشکرا نووسیویێتی: (پڕ بەدڵ سوپاسی مام مستەفا—مستەفا ساییب— ئەکەم کە ئەوەندەی بڕوا بە من بوو دەست خەتەکەی لەخەوما و گەلێك شتی تری دامیٚ ! !).

(٨). خۆی بەتیپی لاتینیی ئەوهای نووسیوە.

(٩). شێخ ساڵح ئەفەندیی ساعاتچیی فرۆشیاری بڵاوکراوەکان لە کەرکووکدا.

(١٠). عەبداللە سامیی، کوڕی سامیی ئەفەندیی کارگێڕی پۆستە و تەلەگراف کۆیە کە خەڵکی جزیرە و بۆتانە. مامۆستا و کورد پەروەر و دەرچووی فێرگەی کشت وکێل بووە کە دوای خوێندنی قوتابخانەی سەرەتایی ئەو ڕۆژگارانە خەریکی ئەو خوێندنەی بووە !

(١١). خۆی خشتەکەی بە ئەم جۆرە ڕیزکردووە.

(١٢). مەبەست شاعیر عەبداللە سلێمان (گۆران) ە.

(١٣). هەڵبەت مەبەستی ئاماری ڕۆژگاری حیللە—بەغدادی ساڵانی ١٩٣٠—١٩٣٢و سەرەتای پرۆژەکەی نەشرییاتەکەیە !

(١٤). مستەفا مەزهەر (١٨٨٨—١٩٤٦ ز) پشکنەری مەعاریفی ئەوکاتەی کەرکووك و دواتر ڕێبەری مەعاریفی سلێمانیی.. کۆنە ڕۆژنامەوانی ساڵانی ١٩٢٠ — ١٩٢٢.

(١٥). مەبەست فوئاد ڕەشید بەکری مامۆستای قوتابخانەی ڕواندزی سەرەتایی ئەوکاتەیە.

(١٦). A.B دوو نیشانەی پێشنیار کراوی مەریوانیی بووە، کە خۆی {A} و کوردیی {B} بووە لە نامەگۆڕینەوەدا.

(١٧). واتە B: بەغداد، ئێس: S سلێمانیی.

(١٨). مانگی ڕەشەمیٚ!

(١٩). مەبەست (ئەنجوومەنی ئەدیبان— ئەمین فەیزیی، چاپخانەی تەرجومانی حەقیقەت، ئەستەنبووڵ ١٩٢٠. {کەشکۆڵی کۆمەڵیٚ شاعیری کوردە !}

(٢٠). وەك پرسم کردووە، مەبەست حەمە ساڵح زەنگەنە—حەمە ساڵح سەعید — ی خەڵکی سلێمانییە کە بە بابی ئەسپی جعیدنی هەبووە و ئەم ئەسپەش لەبەرەی (ئەسپی عوبەیدە و کەحێلە) جوان و چاکە.

(٢١). نەمزانیی مەبەست چ کابراییێکی ئەڵەمانییە.

(٢٢). ڕەنگبێ لە ١٩٢١ دا کە لە هەڵەبجەدا بووە، مشووری ئەم باسەی خواردبێ!

(٢٣). مەبەست سالح زەکیی ساحێبقرانی خاوەند گۆڤاری (دیاریی کوردستان) ە کە بەهۆی کردوکۆشی شاعیر عەلی کەمال باپیر ئاغا — کەمالیی—یەوە لە گۆڤارەکەدا دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی ژیننامە و شیعرەکانی سالم.

(٢٤). مانگی شوبات.

(٢٥). مەبەست پێشەکییە!

(٢٦). مەبەست پیرەمێردی شاعیر و ڕۆژنامەنووسە!

(٢٧). ئەم کارە بەنرخەی پیرەمێرد، نوخشەکانی لە (ژیان) و (ژین) دا بڵاوە.

(٢٨). یاریی پاشەکەوتی پارە!

(٢٩). بێ پێشەکیی نووسیوییێتی!!

(٣٠). مەبەست حەبیبەی مەلا عەبداللەی عیرفان، کابانی جەمیل سایبی گەورەیەتی!

(٣١). فرۆشیاری بڵاوکراوەکان لە سلێمانییدا.

(٣٢).مەبەستماڵی "فەهیمە"یخوشکیەتی کەکابانی میرزا فەرەجی ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران بووە!

(٣٣). بێ پێشەکیی نووسویەتی!

(٣٤). لەنێو یادگارە بەجێ ماوەکانی مستەفا سایبدا — کە لەبەر دەستمدان— ئەم چەند ڕۆمانە ناتەواو و کورتە چیرۆکە وەرگێڕدراوانە دیارن:

١—ڕۆبنسەن کرووزێیە: لە١٩٢٨/٨/٢داو لەنێوچەی" تاسلووجە " ی سلێمانییدا دەستی بە وەرگێڕانـدنی کـردووەو بەمەرەکـەبێکی سـوورو لەدەفتـەرێکی (X٢١ ١٥سـم) دا پـڕی کردووەتەوە. مخابن تەواوی نەکردووە.

٢— کۆمەڵە کورتە چیرۆکێکی بێگانە بەنێوبانگـەکانی بـە مەرەکـەبێکی ڕەش و لەسـەر دەفتەرێکی (٢٠— ١٦سم) دا چوار کورتە چیرۆکی وەرگێڕدراوی دیارە: (ژنی بێ کەڵك — ماکس

فیشەر. دڵی دڵدادەیێك – ئالڤۆنس ئالێیە. جیازیی – گی دی موپاسان. ژن چۆن مێردی خۆش ئەویێ؟ – گی دی موپاسان).

به پارچه قاقەزێکی نێو هەمان دەفتەردا دیاره – له لاپەڕه ٦٣ تا ٨١ ی تێداماوه– که ده کورته چیرۆك له ئەو دەفتەرەدا بووه و شەشەکەی دی لێ کراوەتەوه.

بەڕۆشنایی جاڕەکەی نێو (دیوانی حەریق–س١٩٣٨) لەمەڕ نیازی چاپ کردنی هێندێ چیرۆك، زۆر وێ دەچێ (ئەم کورته چیرۆکه لێ کراوانەی ئەم دەفتەره) هەر ئەوانه بێ، بەتایبەتی که له نێویاندا کورته چیرۆکی (جیازیی – گی دی موپاسان) دەرکەوتووه!

(٣٥). مەبەست مەلا ڕەحیمی مەریوانیی مەلای مزگەوتی هەمزەغایه له سلێمانیی ئەو کاتەدا!

(٣٦). ڕاستییەکەی – وەك ڕۆژنامەی ژیان هەواڵی ڕاگەیاندووه – له ئەو ساڵەدا تیپی نوێ بۆ چاپخانەی ژیان لەلایێن بەلەدییەوه کڕدراوه، بەڵام هەرگیز نەلواوه بەرهەمەکانی (کوردیی و مەریوانیی) لەسلێمانییدا بەر چاپ بکەون! (بنۆڕه: ژیان: ١٩٣٣/٥/٢٥ که هەواڵی کڕینی حورووفات ڕادەگەیێنێ!).

(٣٧). بەڕۆشنایی جاڕەکەی نێو (دیوانی حەریق – س١٩٣٨) دیاره ئەمه چیرۆکێ بووبێ و بۆ چاپ کردن دانراوه.

(٣٨). ڕەنگبێ مەبەست(خوێندەواریی باو–تۆفیق وەهبی)ی بێ کەساڵی١٩٣٣له چاپخانەی دارولتیباعەی حەدیسه / دار الطباعة الحديثه – بەغداد، چاپ کرا.

(٣٩). دیاره ئەم دانراوه بەر بڵاوکردنەوەی پرۆژەکه نەکەوتووه بۆیێکا لەڕیزی بیبلۆگرافیای کتێبی کوردیشدا نێوی دەرنەکەوتووه!

(٤٠). مەبەستی ڕۆژنامەی (ژیان)ه

(٤١). دیاره له١٩٣٤/٣/٢٢ بەدواوه و تا ئەم کاته نامەی لەگەڵ نەگۆڕیوەتەوه.

(٤٢). واته سیججل (سجل).

(٤٣). ساڵی چاپ کردنی (دیوانی سالم) به١٩٣٣ نیشانەکراوه و تا ئەم هەلەی ساڵی ١٩٣٤ هەر چاپ نەبووه!

(٤٤). مەبەست، محەممەد عەلی کوردیی(١٨٩٨—١٩٧٠/ بەغداد) محەممەد عـەلیی کـوردیی کۆنە ئەفسەر. ئەدیب و چیرۆکنووس و سیاسیی نەتەوەپەروەر. لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا گوتـار و پەخشان و چیرۆکنووس. لە عەرەبییەوە، (حیکایەتی زادیج — چاپخانەی ئەلمەعاریف، بەغدا ١٩٥٤) ی بە کوردیی و بڵاوی کردووەتەوە.

(٤٥). لە پێشەکیی (شێخ ڕەزا) دا ئاماژەی ئەم زاتە کراوە.

(٤٦). ئەم نامەیە و هەردوو خشتەکە بە کوردیی لاتینیی نووسراون!

(٤٧). خشتەکەی پاڵ ئەم نامەیە بە لاتینیی نووسراوە!

(٤٨). مەهدیی ئەفەندیی لە(مەیدان)ی بەغداد دا فرۆشیاری بڵاوکراوەکـان بـووە! هـەروەها ڕەئـووف دەلاك لـە (ڕەئسـولقەریە)و محەممـەد بـەقاڵی هـەورامیی لـە(بابولشـێخ) ی بەغـدادا، سەیید ئیسماعیل ئەفەندیی ساعاتچیی لە هەولێر و کاکە ئەفەندیی حاجیی مەحموود لە کۆیـەدا و عەبدالله فەوزیی ئەفەندیی تووتنچییو محەممەد ڕەشید تووتنچیی لە خانەقینداو مەلا عـەلیی سەححاف لە سلێمانییدا بڵاوکەرەوەی نەشرییات بوون!

(٤٩). بێ سەرەتا نووسراوە! خشتەکەش بە لاتینیی.

(٥٠). دیارە تا ئەم کاتە (شەرلۆك هۆڵمس...) چاپ نەکراوە!

(٥١). بۆ ڕاستیی و مێژوو پـێویسـتە بڵـێم، لـە مـانگی ٤ / ١٩٨٦ داو لەهـەلی خۆتـەقاویت کردنمدا، لە(دەزگەی مەڵبەندی پاراسـتنی بەڵگەنامـەکانی عێراقیـی) لـە بەغـداد دا، کردوکۆشـم کرد بۆ دۆزینەوەی بەڵگەنامەکانی (٣دۆسێی٣بـاس: کوشـتنی ئەحمـەد موختـار جـاف شـاعیر. ڕادیۆناس ڕەفیق چالاك. چاپخانەی مەریوانیی).

دوای ماندوو بوونێکی زۆر، (ژمارەکانی دۆسییەکانی دووەم و سێیەمم دۆزییـەوە) و لـەلای خۆم نووسیمن و لەبەر نەخۆش کەوتنیشم نەم پەرژا دەوریان بکەمەوە. ئەمەم دانا بـۆ هـەلێکی دی و دیدەنییەکی دی بەغداد.

لە مـانگی١٠/١٩٨٩جـارێکی دی هاتمـەوە سـەر بـاس بەتایبـەتیی بـۆ ئەوانـەو کۆکردنـەوەی بەڵگەنامە لەمەڕ ڕادیۆی کوردیی بەغداد کە بەتەمای نووسینی مێژووییم.

ڕێبەری گشتیی دەزگەکە مامۆستا حەمید ئەلعەلوەچیی–دۆستی کورد– جوامێرانە فەرمانیدا بە ژنێکی فەرمانبەری تا بە ئەو دوو ژمارەیەی نووسیومن، دۆسییەکانم بۆ بدۆزێتەوە و بیهێنیَ... دوای ماوەییَ ژنەکە هاتەوەو گوتی: (ئەو ژمارانە دۆسییەیان دیار نییەو نەشخراونەتە سەر مایکرۆفیلم!). لەئەوەش پتر کەدڵشکاوی کردم ئەوەیە کە داوای (پسووڵەکەی خۆمم لیَ کردەوە کە ژمارەکانم لەسەر نووسیی بوو، گوتی: دڕاندم!).

ئەم ژنە نەگریسە هیوا کوێری کردم و بەلاّم هیوام بەخوایە ڕۆژیَ سەر لەنویَ هەلم بۆ هەڵبکەوێتەوە و بیدۆزمەوە!

## سەرچاوەکان – عەرەبیی و کوردیی

{١}. ئەحمەد: کەمال مەزهەر (در)، "خێروبێری ڕاپۆرنووسێکی کورد": ڕەنگین – ژ ٨٨، س١٩٩٦ / بەغداد!

{٢}. ئیبراهیم: زاهیدة– کەششاف ئەلجەرائید وەلموجەللات ئەلعیراقییە. / کشاف الجرائد والمجلات العراقیه. (کویت. س ١٩٧٦)

{٣}. بوز ئارسەلان: محەممەد ئەمین – ژین، جلد: ١، (ئوپسالا– سوید ١٩٨٥).

{٤}. سابیب: مستەفا.. (ژیننامەی دەستنووسی خۆی–بەغداد١٩٧٣/ پارێزراو لەلای من).

{٥}. عەزیز: عەبداللە: (نامەی دەستنووسی ١٩٣٣/٥/٦. کۆیە. /وەرگیراو لە نەژاد عەبدالله عەزیز. هەولێر– ١٩٨٤).

{٦}. فوئاد: کەمال (در)، " لەیادی هەشتاو دوو ساڵەی یێکەمین ڕۆژنامەی کوردییدا – هەواڵێکی خۆش/بلاّوکراوەی گۆڤاری: پرشنگ–ئەڵمانیا.. فۆتۆکۆپیی کراو و وەرگیراو لەخۆی، سلێمانیی ١٩٩٢/٤/٤).

{٧}. نەریمان: مستەفا – بیبلۆگرافیای کتێبی کوردیی. (بەغداد ١٩٧٧).

# ١٢

# ڕۆژنامەی (زبان)ی سلێمانیی

## پێشەکیی

بەلەدییەی سلێمانیی، خاوەندی تاکە چاپخانەی بازێڕەکە: (چاپخانەی بەلەدییە) لە ١٩٣٧/٨/١ بەدوواوە، ئیجازەی بەکرێ دانەوەی چاپخانەکەی بۆ پیرەمێردی خاوەندی ڕۆژنامەی (ژیان) ی سەربەست نوێ نەکردەوە.. تەنانەت هەر بەلەدییە خۆی، ئەم ڕەلەی قۆستەوەو ڕۆژنامەیێکی نیمچە ڕەسمیی، حەوتۆیی بەنێوی (زبان) ەوە داهێناو بڵاوکردەوە!

پیرەمێرد — وێڕای دەست کورتیی — ملی بۆ ئەم بەربەرەکانییە نەداو خانووی خۆی بە بارمتە دانا. لەبەغدادا چاپخانەیێکی گەورەتر — دەستگێڕ — ی کڕیی و هێنایەوە بۆ سلێمانیی و بەنێوی (ژیان) ی ڕۆژنامەوە نێوی ناو لە١٩٣٧/٩/٢٠ شدا سەرلەنوێ (ژیان) ی چاپ و بڵاوکردەوە.

ناحەزانی پیرەمێرد ئەم جارە پیلانێکی گەورەیان چنیی کە بوو بەهۆی داخستن و ڕاگیرانی (ژیان) لە١٩٣٨/٣/١٠ دا.. بەڵام پیرەمێردی سەرسەخت کۆڵی نەدا و لە بەغداد دا ئیجازەی بۆ ڕۆژنامەی (ژین) ی سەربەست و حەوتۆیی وەرگرت و لە ١٩٣٩/١/٢٩ دا دەستی کرد بە چاپ و بڵاوکردنەوەی.

بە ئەم پێیە، لەلایێکەوە (چاپخانەی بەلەدییە)و (ڕۆژنامەی زبان)، لەلایێکی دیەوە (چاپخانەی ژیان) و (ڕۆژنامەی ژین) لە سلێمانییدا کەوتبوونە گەڕ.

ڕۆژنامەی (زبان) چۆن ڕۆژنامەیێ بوو؟ کێ بەڕێگەوەی دەبرد؟ بڵاوکراوەکانی چییان دەنواند؟ هەتا کەنگێ بڕی کرد؟ کەڵکی چیی گرت؟ ئەمانە نیاز و مەبەستن!

## بەشی یێکەم

### ١. شوناسنامەی ڕۆژنامەکە.

* زبان : {لە ڕاست و چەپی ژووروی ڕۆژنامەکەوە و بەژێریانەوە ئەم هەوالانە دەگێڕێتەوە..}

ڕۆژنامەیێکی کوردییە. هەموو یێکشەموانێ دەردەچێ!

* موحەریر : {لەبریی دیار بوونی خاوەند ئیمتیاز و ڕێبەری بەرپرسیار..} سالح قەفتان.

* پەیام : سلێمانیی. بەلەدییە، زبان.

* {ئابوونە} : سالیانە بۆ ناو شار ٢٠٠ فلسە. بۆ دەرەوە ٣٥٠ فلسە.

* ئیعلانات : لە دێڕێکەوە تا شەش ٢٥٠ فلسە. لەوە زیاتر بێ ٥٠٠ فلسە. ستوونێك ٧٥٠ فلسە. یێکی بە ٤ فلسە.

* {زبان} : سالێ: ١. ژمارە: ١، یێکشەممە ١٢ ئەیلوول٧/١٩٣٧ ڕەجەب ١٣٥٦

### ٢. پێداچوونەوەی.

- جۆری قاقەز: بۆر.

- بارستی: ٢٧X٣٨ سم ی ٦ لاپەڕەیی و هەر لاپەڕەیێ ٣ ستوون و ٢ خانە. هەر خانەیێکی تەواو

٣٨ X ٢٧سم. {ژمارەی لاپەڕەکانی تا سەر چون یێك نیین.. بۆ وێنە ژ–١–٩، شەش لاپەڕەیە.

ژ١٢، ژ١٩ هەشت لاپەڕە. ژ١٣ دە لاپەڕە، دوایی چوار لاپەڕە، بۆ وێنە ژ–٣٦–٦١بە ئەو جۆرەو ژ–٦٢شەش لاپەڕەو دوایی ژ–٦٣–٧٠ چوار لاپەڕە} !

تبینیی: ڕۆژنامەکە لەسەردەمی قەفتاندا وەك ڕۆژنامەیێکی حەوتۆیی دەرچووە، بەڵام لەئەو ماوەیەدا "حەوتۆییێك" دەرنەچووەو دەبوو ژمارە — ١٢ لە٢٩/١١/ ١٩٣٧ دا دەربچووایە، کەچیی لە١٢/١٢/١٩٣٧ دا دەرچووە.

دوای قەفتان — لەسەردەمیدا یێکشەمووان دەرچووە — وادەی دەرچوون نارێك دێتە بەرچاو... بۆ وێنە، ژ— ٦٢ی ٣١/١٢/١٩٣٨ لە "شەممە" دا، ژ— ٦٥ی ١٢/١/١٩٣٩ لە "سێشەممە"دا، ژ—٦٦ی ١٢/٢/١٩٣٩و ژ—٦٧ی ٢٦/٢/١٩٣٩ لە"یێکشەممە" دا، ژ٦٨ ی ٩/٣/١٩٣٩ لە"پێنجشەممە"دا، ژ—٦٩ی ٢٥/٣/١٩٣٩و، ژ—٧٠ی ٢٩/٤/١٩٣٩ لە "شەممە"دا، هەروەها تاکە(ژمارەی تایبەتیی— بەبۆنەی مردنی غازیی پاشای عێراقەوە) لە دووشەممە دا:١٠/٤/١٩٣٩ دا دەرچوون!

دیارە باری دەرچوونەکەی هەر نارێك بووە، بۆییێکا ژ—٩٢ی ٢١/٩/١٩٤٠ لە (شەممە) دا، ژ—٩٣ی ٢٨/١٢/١٩٤٠ لە(شەممە)دا، ژ—٩٤ی ١٨/١/١٩٤١ لە (شەممە) دا دەرچوون.

— شێوەی گشتیی: ئەکەرچیی بارستایی (زبان) لە ئاستی (ژیان)ی سەربەستیدا بەهێندێ سانتیمەتر جودایی هەیە کە ئەو ٣٠ X ٤٤ سم بەرامبەر ٣ خانەی ٢٦ ٧ سم، ئەوە دێرا (زبان) زۆر بەشێوەی (ژیان)ی پیرەمێرد دەچێ کە لە١٤/٨/١٩٣٤دا" وەك ڕۆژنامەیێکی سەربەست هەڵکەوت!

ڕاستییەکەیشی تا ئەو مێژووە، واتە لەیێکەم ڕۆژنامەی سلێمانییەوە، (پێشکەوتن — سلێمانیی: س١٩٢٠) مکێتی هەموو ڕۆژنامەکان ئاسایی بوونو هیچ گۆڕینو دەستکارییەکی هونەرانەیان بەسەردا نەهاتووە، بەڵام لەساڵی ١٩٣٤ بەدواوە— ڕەنگیش بێ بەهۆی هاتنی حوزنیی موکریانەوە بێ بۆ سلێمانیی و تێکەڵیی لەگەڵ پیرەمێرد— هێندێ گۆڕینی هونەرانە ڕووی داوە، چ لەدانانی هەواڵەکانی ڕۆژنامەکەو ڕاگەیاندنەکانی لە سێ خانەی پچکۆلانەی تەوێڵی لاپەڕەی یێکەمدا، چ لە دابەش کردنی هەر لاپەڕەیێ بەسەر سێ ستووندا کە لاپەڕەکانی هەموو ڕۆژنامەکانی ڕابووردوو، دوو ستوونیی بوون!

جێگەی گوتنە هەتا قەفتان نووسەری ڕۆژنامەکە بووە، لاپەڕەکان شێوەیان زۆر ناقۆلا نەبووە، بەڵام دوواتر بەهۆی جاڕدانەوە باری گران بووە کە بۆ وێنە (ژ-١٢) چوار لاپەڕەو نیوی جاڕە! شایانی باسە، چەند بەراووردی (ژیان)و (زبان) بکریچت، دیارە کەئەمەی دوایی بۆ لاپەڕە پڕکردنەوە، تیپی گەورەتری بەکاربردووە، یان شاشیی لە دێڕەکانی لاپەڕەکاندا هەیە!

- ڕێنووسی:بەشداربوونی کۆمەڵێ نووسەرو شاعیرو نەبوونی ڕێنووسێکی یێکگرتوو، کارێکی کردووە ڕۆژنامەکە ڕێنووسی جۆربەجۆر بنوێنێ، هەربۆییێکا ئەو ڕێنووسانە لەچاو ئەمڕۆدا-کەبەناتەواوی دەزانم - دواکەوتووە، تەنانەت ئەوکاتە لەنێو نووسەراندا، هەروەها لەچاپخانەکاندا (دەنگەکانی کوردیی)و چۆنییەتیی نووسینیان -وەك ئەمڕۆ- یێکلایی نەکرابوونەوە. بۆ وێنەش لەئەم ڕۆژنامەیەدا، (ڕ، ۆ، ێ، ڵ، وو) بەشێوەی (ر، رر، و، ی، ل:.، و) نووسراون. لەلاییێکی دیەوە تیپی (ئە)ی سەرکردار لەبریی (دە) بەکاربراوە!

جێگەی ڕوون بوونەوەیە، ساڵح قەفتان لە (زبان- س ،ژ ٢، یێکشەممە١٩/٩/١٩٣٧)دا و دانەری ئەلف و بێی کوردیی، " ئەحمەدی عەزیز ئاغا " لە (زبان-س١، ژ ٩، یێکشەممە ١٩٣٧/١١/١٤) دا لەسەر نووسین‌و ڕێنووسی کوردیی گوتاریان بڵاوەو قەفتان پیشنیازی بەکاربردنی (رر، وو، ـە) بۆ وشەکانی (کردی = کوردی، بحر = بەحر، کریار = کرریار، خو = خوو) و هاوتایان دەکات.

هەروەها ئەحمەدی عەزیز ئاغاش (ئیشارەت، حەرفێ بۆ ڕێی گەورە) پەسەند دەکات کە دووجار (رر) ی پچووك بنووسرێت. جێگەی گوتنە، ئەم جۆرە بیروڕایە شتێکی نوێ نین و لە ڕۆژنامەکاندا، لەزووەکەوە خراونەتە ڕوو!

## ٣. شێوازی پەخشانی ڕۆژنامەنووسیی

گــوتارەکانی ســالّح قەفتــان بەگــشتیی ڕۆژنامــەنووسیی کارگێڕیی–عەمەلیی– ن و ئاسان و ڕەوانن.

گوتارەکانی ئەحمەد شوکرییش وەك ڕەوانن، بەڵام چەشنی گوتارەکانی قەفتان ڕۆژنامەنووسیی نین و وەك گوتارە ئیمزانەکراوەکانی (ئەحمەد عەزیز ئاغا) تەڕو بەپێز نین! تێکڕا هەموو گوتارەکان وێنەی باری ڕۆشنبیریی سەردەمەکەن.

## ٤. نووسەران و بابەتیان!

لەئەو کۆمەڵە ژمارەیەی(زبان)دا کە تا ژ–٧٠ی لەبەردەستمە، کۆمەڵی نووسەرو شاعیرو کۆمەڵێ بابەتی هەمەجۆر دێنە بەرچاو..ئەو بابـەتـانەش بەگــشتیی، گوتار، هەواڵی نێوبازێری سلێمانیی و هەواڵەکانی عێراق و هەندەران، ڕیپۆرتاژ، گوتەی بەجێی گەورەپیاوانی دنیا، پرسەو ماتەمینیی، بابەتی ئەدەبیی وەك شیعری کوردیی، فارسیی وەرگێڕدراو، چیرۆکی ڕۆشنبیریی، کۆمەڵایێتی، تەندروستیی، نیمچە لێك دانەوەی ڕووداوە سیاسیەکانی وڵاتان، هەروەها جاڕی ڕەسمییانە.

لەئەو ماوەیەی ســالّـح قەفتـاندا– کــە زۆر دیارە خۆی ئەرکی گەورەی نووسینی ڕاپەڕاندووە – هەموو گوتار و کردارەکانی ئیمزایان لێنەدراوە، بەڵام بەهۆش و بیر و زمان و شێواز و بابەت هەڵبژاردندا – وێڕای دیاربوونی شوێنی لە ڕۆژنامەکەدا– ڕوونە کە نووسراوەکان بەری قەڵەمی ئەون! وێنەی ئەوانە:

(١. نووسینیی کوردیی،٢. شەڕی ژاپۆن و چین، ٣. ئەسپانیا: ژ – ٢ی١٩/٩/ ١٩٣٧) و (١. خوێندن و نووسینیی کوردیی، ٢.شەڕی ژاپۆن وچین،٣. ئەمە لای ئێمە عاجبایتیە، ٤. گرویّیی: ژ ٣ی ١٩٣٧/٩/٢٦)و(١.بیعسە،٢.فەلەستین،٣.ماسیی دڕندەی ناو بەحران: ژ–٤ی ١٩٣٧/١٠/٢)و (١. خراپەی کەمتەرخەمیی: ژ–٩)و(١.دیسانەوە کۆمەڵایێتی، ٢.

لەمیسردا: ژ—١٢)، (١. خوا بکا لە بەدبەختیمانەوە نەبێ: ژ—١٣ی ١٩٣٧/١٢/١٩)و (١.خولّقوپیشە،٢.چینو ژاپۆن،٣.سینئولزوببان:ژ—١٩ی٣٠/١/ ١٩٣٨).

ئەحمەد شوکریش —بۆ وێنە— زۆربەی گۆڤارەکانی کۆمەلایێتینو ئەو چەندەی لەبەردەستمدان، ئیمزایان لێ دراوە، وەك: (١. نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ کەبابچی!!.. ژ—٦٢،٢.موساعەدەیخۆکردن!..ژ—٦٥و٦٦یڕۆژانی٥و١٢/٢/١٩٣٩،(٣).لە وەحشەتەوە نەبێ لەچییەوەیە؟..ژ—٧٠).جێگەی یادە، شێخ محەممەدی خالّ بەر لەئەوو لـــە(ژ—٣٨ ی١٩/٦/١٩٣٨)دا گـوتـاری"تــەمــەددونو وەحـشـەتـگـەریـی!!"لـەمـەڕ داربـڕینەوە، بلاّوکردووەتەوە و ئەحمەد شوکریش هەروەها.

ئەحمەد عەزیز ئاغاش—چ گوتاریّ ئیمزای ڕاستی ئەوی پێوە نییە!— بەبڕوای من ئەم گوتارانەی نووسیوە: چۆن بنووسین؟: دانەری ئەلفا بێی کوردیی! /ژ—٩ی ١٤/١١/ ١٩٣٧،٢.جەسارەتیمەدەنییە!"بێ ئیمزا"./ ژ—٣٦ی ٥/٦/١٩٣٨، توتون!" بێ ئیمزا" /ژ—٧٠ی٢٩/٤/١٩٣٩).

م. ڕواندزییش، پەخشانی هونەرانەی "شیرین"ی لە (ژ—٣و٤)دا بلاّوکردووەتەوە کە لەژمارەی دیدا "!!" درێژەی هەبوو!

جاڤ هەژاریش گوتاری "وتەی بێ درۆ "، ئەحمەد ڕەفیق— لەئەمریکاوە— گوتـاری "بەرزترین قەومی سەرزەمین"و سالّح سەعید—وەرگێڕانی—گوتاری "ئەویی دینی ئیسلام بۆ ژنی کردووە؟ی لە(ژ — ١٣) دا بلاّوکردووەتەوە!

ئەحمەد بەشیریش "گوتەی بەجێ"ی لە (ژ — ١٢) دا و، ع. ر. ك لەمەڕ ژینی خەلّکی ئینگلتەرە و فرەنسە گوتاری " بەراوردێکی ڕابواردن " ی بۆ (ژ — ٦٢) وەرگێڕاوە!

محەممەد عەبدوڕەحمانیش، ڕۆمانێکی (جێمس موولەر)ی نووسەری ئینگلیزی — ڕەنگبێ لەعەرەبییەوە — کردووە بە کوردیی بەنێوی (حاجیی بابای ئەسفەهانی) یەوە کە لە (ژ —٦٧،٦٦،٦٩،٦٨)دا بەش بەش بلاّوبووەتەوە.. بەلاّم لە (ژ — ٧٠) دا درێژەی

پێ نەدراوە – لەبەر دیارنەبوونی ژمارەکانی دیش – لێم ڕوون نییە داخۆ بڵاوکردنەوەی ڕاگیراوە یان لە ژمارەکانی دواتردا درێژەی پێ دراوە.

ئەحمەد شوکریی لە(ژ–١٩)، ئە. بێ. هەوریی لە(ژ–٢،٩) دا، بەنگینە لە (ژ–٦٢)دا، جاف هەژار لە (ژ–٩،٤)دا، عوسمان حەمدیی‌و نووریی فەتاح لە(ژ–٩)دا هەریێکە شیعری بڵاوکردووەتەوە.

وێڕای ئەم بابەتانە، ڕۆژنامەکە خۆیشی مردنی هێندێ پیاوی ناسراوی کوردی بۆ مێژوو بەسەر کردووەتەوە، بۆ وێنە لە(ژ–٦٢)دا بەشێوەی هەواڵ‌و بەشیعرێکی (بەنگینەش) باسی کۆچی حاجیی مەلا سەعید کەرکووکیی نوێنەری سلێمانیی لە ئەنجوومەنی مەبعووسانی عوسمانیی – س ١٩٠٨، کردووە.

هەروەها لە هەفتەی بڵاوکردنەوەی (ژ–٣٧ی١٢/٥/١٩٣٨)و (ژ– ٦٢) دا باسی مردنی بولبولی کوردستان مەلا کەریمی گۆرانیبێژ و شاعیر و زانای ناسراو مەلا عەبداللەی مەریوانیی کراوە.

هەڵبەت ئەوانەی ڕابوردن وەك وێنەی نووسەرو بابەتەکانی کۆمەڵە ژمارەییێکی ڕۆژنامەکەن و ڕەنگبێ نووسەر و بابەتی دیش، لە ژمارە ونەکاندا هەبن.

هەرچۆنێ بێ بەهۆی ئەم وێنانەوە توانای خوێندنەوە و ناسینەوەی گەلێ مانای ڕۆژنامەکە ئاسانەو هەیە!

## ٥. کلێشەی ڕۆژنامەکە:

جەمال خەزنەدار –دوای ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردیی–لەساڵی ١٩٧٩ دا قسەی لە ئەحمەد شوکریی شاعیر وەرگرتووەو لە (ڕۆژی کوردستان – ژ ٥٦ ی تەشرینی دووەمی ١٩٧٩)دا بڵاوی کردووەتەوە و بەنێویەوە نووسیوییێتی: (ئەحمەد شوکریی دەڵێت: من یێکێك بووم لە کارگەرانی ڕۆژنامەی "زبان". لەکاتی خۆیدا ناکۆکیی هەبوو لەنێوان

کاربەدەستانی بەلەدییەی سلێمانیی و خاوەنی ڕۆژنامەی "ژیان" پیرەمێرد.. وابوو ئەو چاپخانەیە: کەڕۆژنامەی "ژیان"ی پێ چاپ دەکرد لەپیرەمێردیان سەندەوە و ڕۆژنامەی "ژیان"ی پیرەمێرد پەکی کەوت.. ئێمە هاتین دەستمان کرد بە دەرکردنی ڕۆژنامەیێك – بڕیار درا کە ڕۆژنامەکەمان بەنێوی "ژیان"بێ.. دوو ژمارەمان لێدەرکرد – ئەحمەد شوکریی لای منی نووسەر گوتی یێك ژمارەو ڕاستەکەیش هەر وەیە/ کەمال – پیرەمێرد کردی بەهەراو هاتینە سەر بڕیار کە نێوەکەی بگۆڕین، دڵی پیرەمێرد نەڕەنجێنین.. وا بوو کلێشە ڕۆژنامەی "ژیان"مان هێنا: دوو نوختەی سەر تیپی "ژ"و نوختەیێکی ژێر تیپی "ی"مان قرتاندو "ژیان"مان کرد بە "زبان"/ تەواو).

وەکسەرنجیشم داوە دەست بەجێ لە(ژ–٢)ە،خۆشنووس (عەبدوللەتیف/عبداللطیف –شێخ لەتیفی دانسان) کلێشەی نوێی (زبان) ی نووسیوە و نێوی خۆیشی لەنێو خانەی تیپی "ن" و لەنێو"نوختە" کەدا جوان و دیار هەڵکەندووە و ئەم کلێشەیەش تا سەر بێدەستکاریی و گۆڕین ماوەتەوە!

---

## بەشی دووهەم

### ١. ڕیشەی نێولێنانی؟

وێڕای ئەو باسەی ئەحمەد شوکریی لەمەڕ نێوی ڕۆژنامەکە، ڕاستییەکەی لەلای من ڕیشەی نێولێنانەکەی کۆنترەو باسو هەواڵی هەیەو دەڵێم:ئەگەر ڕۆژنامەکانی سلێمانیی: (ژیانەوە – س١٩٢٥) بەڕۆشنایی باری نوێی سلێمانیی دوای ڕووداوەکانی ١٩٢٢– ١٩٢٥ و گۆیا ژیانەوەی خەڵکیی و ڕۆژنامەی (ژیان)یش گۆیا بەخۆشەویستیی ژیانەوەو ئاسوودەیی ژینی خەڵکیی(!!) دەرچووبن، ئەوە لە ئەو ڕۆژگارانەدا و بەهۆی هەڵکەوتن و بەگوڕ بوونەوەی بزاڤی ڕۆژنامەنووسیی و خوێندەواریی ساڵانی١٩٢٥–١٩٣٤ و ڕەنگ دانەوەی (ژیانەوە، ژیان، زاری کرمانجی، دیاریی کوردستان) و دامەزراندنی (کۆمەڵی زانستیی کوردان) لەسلێمانییو کەرکوکو ئاڵتوون کۆپرییداو[1] برەودان بەکردنەوەی قوتابخانەی هاوچەرخ و پیێخوێندنی کوڕ و کیژان و بەکاربردنی زمانی کوردیی لە دەزگەکانی کوردستاندا، ئەمانە هەموو کارێکیان گێڕاوە کە خۆشەویستیی (زمانی کوردیی) بەکاربراوو چاپ کراو، کاریگەر بێو هانی خەڵکانێ بدا کەوەك (مۆرێ) لەتەوێڵی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی بدرێ.. دیارە ئەمەش لە دووەهەم سەردەمی دەسەڵاتی موتەسەڕڕیف ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگدا، وەك پێشنیازێ خراوەتە ڕوو تا نێوی (ژیان) بگۆڕدرێ بۆ (زبان)!

پیرەمێرد خۆی لە(ژیان–س١٠، ژ ٤٢٦، شەممە ١٢ ی کانوونی دووهەم ١٩٣٥) دا بە گوتارۆچکەیێکی دلگرانەوە، ناڕازییە بۆ گۆڕینیی نێوی (ژیان) ی سەربەستی و دەڵێت: (پەلپ و بیانوومان پیێمەگرن!). بەڵام کاتێ کەئەحمەد بەگ ڕاگواستراوەتەوە بۆ بازێڕی هەولێرو بەر لەدەرکردنی گۆڤاری (ڕووناکیی:١٩٣٥/١١/٤)،هەر پیرەمێرد خۆی، لە سلێمانییەوەو بەڕۆژنامەی: (ژیان–س١٠، ژ٤٤٨، شەممە١٣ی تەمووزی ١٩٣٥)ەوە پێشنیازەکەی جارانی پێ یادکردووەتەوە کە گوتوویەتی: (لە هەولێریش ئەحمەد بەگ

کە ئەم "ژیان"ە ئەو ناوی ناوەو زۆر ڕەنجی بۆ داوە، لەوێش—لەهەولێردا— ڕۆژنامەیێکی "زبان"دێنێتە مەیدان!).

کەواتە نێو داکەوتنی (زبان)ی ڕۆژنـامــە، مــێژووی کــۆنترەو دەگــەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژگارانە!

**٢. سنووری دەرچوونی؟**

سەرچاوەکــان، عــەبدوجەبـبار جەبباریی لەمەڕ ئەم ڕۆژنامەیە دەڵێت: (هەتا مانگی کانوونی دووهەمی ١٩٣٩ هەر لە کۆششدا بوو!!).[٢]

جەمال خەزنەدار دەڵێت: (لە دوو ساڵ زیاتر بەردەوام بوو!!).[٣]

در.کەمال مەزهەر ئەحمەد دەڵێت: (دەوروبەری دوو ساڵ ژیاوە!!).[٤]

زاهیدە ئیبراهیم دەڵێت: (تا ساڵی ١٩٣٩ ی خایاند!!).[٥]

بەڕۆشناییشیان ڕوونە، کەسیان دوا ژمارەو مێژووی ڕاگرتنی نازانن و وێکڕا تا (ساڵی ١٩٣٩) یان بردووە!!

ڕاستییەکەی ئەگەر من یان جەمال خەزنەدار بۆمان لوابێ تا (ژ—٧٠ی١٩٣٩/٤/٢٩)ی ببینین،ئەوە من لەڕۆژنامەی (ئاسۆ —س١٩٨٩)دا بڵاوم کردەوە کەبەڕۆشنایی دوو باسی بڵاوکراوەی (ژین)ی پیرەمێرد، (زبان)پتر ژیاوە.. بەڵگەش ئەمەیە:

١. ژین —س١٤، زژ ٥٧٢، پێنجشەممە ١٩٣٩/٦/٢٩ دەڵێت: (ئەم جارە "زبان" دەرچوو بوو. بەنگینە—شاگردی زانستیی—نوسخەیێکی بۆ هێناین.. هتد).

٢. ژین—س١٤،زژ٥٨٨، پێنجشەممە ١٩٤٠/١/٤ دەڵێت:(غەزەتەی"زبان"بۆ بەیانی خۆشئامەدیی ستاییشی بۆ ڕەئیسی سیحە سەیید جەمال کردووە.. هتد).

لەبەهاری ١٩٧٧دا— لەماڵی خۆمدا— بەدوو کەسی ناسیاوم ڕاگەیاند کە گەنجینەی تاپۆی سلێمانیی —بەهۆی جاڕی خانوو و بەرەو بڵاوکراوەی ڕۆژنامەکانەوە — کۆمەڵێ ڕۆژنامەی کۆنی تێدا هــەیــە..سەرئەنجام ئــەوان کــۆمــەڵــێ ڕۆژنامەی (ژیان،زبان) یان

دەستگیر کردبوو. بەتایبەتیش -وەك هەموویان فۆتۆکۆپیی کردبوو- سێ ژمارەی ڕۆژنامەی(زبان) یان برد بوو بۆ خۆیان‌و-دۆستی بەڕێزم نووسەر عومەر مارف بەرزنجیی لێی وەرگرتن بۆم - ئەو ژمارانەش کە (زبان - س۳، ژ۲۱،۹۲ئەیلوول ۱۹٤۰، زبان - س۳، ژ ۹۳، ۲۸ی کانوون۱، س۱۹٤۰، زبان-س۳، ژ۹٤،۱۸ کانوون۲، س۱۹٤۱)ن، دیارە تەمەنی ڕۆژنامەکەیان بۆ سەرەتای ساڵی۱۹٤۱ درێژ کردووەتەوە، لە ئێرەش بەدواوە سنووری مێژوویی دەرچوونی ڕۆژنامەکە دیارنییە، بەڵام بە ڕۆشنایی تەنگانەکانی یێکەم جەنگی گێتیی‌و جودابوونەوەی ئەحمەد شوکریی لە ڕۆژنامەکە لەساڵی۱۹٤۱ دا، زۆر وێ دەچێ کە ڕۆژنامەکە هەتا ساڵی۱۹٤۱ژیابێت‌و بەتایبەتیی بەهۆی گۆڕینی باری سیاسیی عێراقەوە کە لەمایسی۱۹٤۱دا (بزووتنەوەی ڕەشید عالیی گەیلانیی) ڕووی دا!

### ۳. کارگێڕەکانی

ڕۆژنامەکانی(ژیانەوە،ژیان) هەتا ئابی۱۹۳٤-چونکە ڕەسمیی‌و نیمچە ڕەسمیی بوون - هەرگیز نێوی خاوەندو بەرپرسیار یان کارگێڕێکی خۆیان بە تەوێڵی یێکەم لاپەڕەوە نەناوە!بەڵێ لە پەناوە نێوی ڕێبەرەکانیی چاپخانەکە هاتووە، بەڵام ئەمە یێك لە (زبان) نێوی نووسەر - ڕۆژنامەوانێ- بخرێتەڕوو[٦]، بەتایبەتیی یێکێکی وەك ساڵح قەفتانی کۆنە مامۆستای لە وەزیفە دەرکراو!!

دەی ئەگەر ئەو بەتەنێ نووسەرێ بووبێ، داخۆ کێ خاوەند ئیمتیاز و بەرپرسیاری ڕۆژنامەکە بووبێ؟

ئایا وەك (دانەری ئەلیفبای کوردیی/ئەحمەد عەزیز ئاغا) لە گوتارێکی (زبان) دا لێی گوتووە، (خاوەندی زبان)ە بەڕاست خاوەندە؟ لە وەڵامدا دەڵێم: بەر لە هەر شتێ وەك نێونیشانی ڕۆژنامەکە بەتەوێڵیەوە دیارە، نووسراوە: (سلێمانیی-بەلەدییە، زبان) ئەوە خاوەند و بەرپرسیاری ڕۆژنامەکە بێگومان دەزگەی بەلەدییەی نیمچە ڕەسمییە!

لەلاییێکیدیەوە، سالّح قەفتان —ئەو کاتە— ڕێبەری قوتابخانەی زانستییبووە کە مووچەی ئەوو مامۆستاکانی دی، بەلەدییە بۆیی برِیونەتەوە و ئیدی قەفتان نە سەرۆکی بەلەدییەو نەخاوەندو بەرپرسیارە، بەتایبەتیی کەبەتەنیێ وەك(موحەریر—نووسەر) دیارە و چیی دی نا! نێو دەرکەوتنیشی بەئەو شێوەیە لەلاییێکەوە ماف خۆییێتیو لەلاییێکی دیەوە بۆ ڕەواج پیێدانی ڕۆژنامەکەیە!

ئەوجا کە ڕۆژنامەکە هی بەلەدییە بیێ — ئەگەر ئیجازەی ڕۆژنامەکەش لەلاییێن موتەسەڕریفی نوێنەری وەزیری نێوخۆوە درابیێ کەئەوە چاوەنۆڕ دەکەم—ئەوە بێگومان هەر سەرۆکی بەلەدییە خاوەندو بەرپرسیارە! لەئەم بارەشدا ناسینەوەی ژیننامەی سەرۆکی بەلەدییە پێویستە کە —بەورد بوونەوەم— دەرکەوتووە لە ئالّۆزیی باری پیرەمێرددا دەوری هەبووە! جێگەی گوتنە چ نووسینیێ بەئیمزای ئەوەوە لەئەم ڕۆژنامەیەدا دەرنەکەوتووە. ڕەنگبیێ یێکیێ سەرنج بداتو بلّێت (سیێ ڕیپۆرتاژی ژمارەکانی:٦٧و٦٩، ژمارەی تایبەتیی) کە یێکەم بەبۆنەی هاتنی موتەسەڕریفی نویێ و ئەوانی دی لەمەڕ لە دایك بوون و مردنی غازیی پاشای عێراقە، بە قەلەمی ئەو بزانریێ کە زمان و شێوازێکی کۆن و ستاییشکارانەی تایبەتیان پێوە دیارە...

هەروەها ڕەنگبیێ پرسیار لەبارەی نووسەری گوتار و ڕیپۆرتاژی (ژ —٩٢،٩٣،٩٤)یش بکرێت کە نێوی کەسیان لێنەدراوەو گومان لە شوناسنامەی نووسەرەکەی دەکرێت.. ڕاستییەکەی چەند وردبوومەتەوە، هەست دەکەم کەئەو گوتارانەش — با هێندیێ بەشێوەی ئەحمەد شوکریی بچن — ڕەنگبیێ بەری قەلّەمی سەرۆکی مەحموود میرزا بن!

جێگەییێتی بشلّێم شوکریی خۆی لەلای من ڕایگەیاندووە —دووای قەفتان— سەرپەرشتی ڕۆژنامەکە و چاپخانەکە بووە و تا درەنگیێ دەستی لیێ هەلگرتووە. {٧}

کەسێکی دی کە زۆر ویێ دەچیێ —درەنگیێ— پێوەندیی لەگەلّ ئەم ڕۆژنامەیە هەبوویێ، ئەحمەدی عەزیز ئاغای فەرمانبەری موتەسەڕڕیفیەتی سلێمانییە! لەمەڕ ئەم

زاتەش، نەژادی کوڕی لە١٩٩٣/٩/٢٥دا باسیبۆ کردمو گوتی: (بابم لە ڕۆژنامەی "زبان" دا کاری کردووە و گوتاری زۆری بۆ نووسیوە و خۆیشی بەڕاستیی — لە ئەو هەلانەدا — لەگەڵ پیرەمێرد ناکۆك بووە!).{٨}

ڕاستییەکەی وەك گوتم لەنێو ئەو کۆمەڵە ژمارەیەی بەردەستمدا، هەرگیز نێوی ئاشکرای (ئەحمەد عەزیز ئاغا) دەرنەکەوتووە، بەڵام وەك وردبوومەتەوە لەسەردەمی (ساڵح قەفتان)دا هەر یێکجار بەئیمزای (دانەری ئەلیفو بێی کوردی)یەوە خۆی نواندووە. ئەمەیشی لە١٩٣٧/١١/١٤دا بووە کە لە گوتارەکەیشیدا گفتی داوە کە (وردە وردە هەر جارە لەکەلینێکەوە لەنووسینی کوردیی بدوێ!) و بنووسێ.. کەچیی جارێکی دی نەهاتووەتەوە سەر نووسین و گفتەکەی بەجێ نەهێناوە!! من باوەڕم هەیە، هەتا قەفتان لەکاردا بووبێ، توخنی نەکەوتووەتەوە و دوای ئەویش — بەتایبەتیی بە هان دانی موتەسەڕڕیف مەجید یەعقووبیی ناحەزی پیرەمێرد — هێندێ تێکەڵ بووە. دەڵێم هێندێ چونکە هیچ گوتارێکی ئیمزا نەکردووە و ئەمەش بەڵگەیە کە لە (زبان) دا ئەو دەسەڵاتەی یان ئەو ئەرکەی ساڵح قەفتانی بەرنەکەوتووە. ڕەنگبێ پرسیار بکرێ، ئایا هەر لەبەر ئەوەی نەژادی کوڕی لێی گوتووە کە بەشداری ئەو ڕۆژنامەیە بووە! ئیدی باوەڕ بە تێکەڵییەکەی کرا؟ ڕاستییەکەی وێڕای ئاخاوتنی کوڕەکەی، چەند گوتارێ کە زمان و شێواز و بیری تایبەتیی لەنێو گوتارەکاندا دەنوێنن، من دڵنیا دەکەن کە نووسراوی ئەون... بۆ وێنە (زبان — س١، ژ٣٦، یێکشەممە: ١٩٣٨/٥/٥/ گوتاری، جەسارەتی مەدەنییە) دواییەکەی بە ئەم شیعرە فارسییە براوەتەوە:

**من انجه شرط صلاحت با تو می کویم**
**تو خواه از سخنم یندکیر و خواه ملال**{٩}

کەچیی هەر ئەم شیعرە بە دوایی گوتارێکی (ژیان— س١، ژ٨، پێنجشەممە ٣/١١/ ١٩٢٦/گوتاری: تەبەقەی خەواس و عەوام — ئەحمەد عەزیز ئاغا) وە هەیە و چەند زمان

و شێوازو بیری نزیکی هەردوو گوتاریش وێك دەچن، هێندەش بیانکێشیت پتر دڵنیا دەبیت کـــەهـــەردوو گوتـــار نووسراوی (یێك قەڵەمە!). خـــۆ ئەگەر هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەکەش بەدەستەوە بوونایە، ئەوە دەتوانرا پتر قسەی لێ بکرێ. هەرچۆنێ بێ، جێگەی خۆیەتی بڵێم: داخۆ در. کەمال مەزهەر ئـــەحمـــەد چـــۆن و بە چ بەڵگەییێکەوە، ئەحمەدی عەزیز ئاغای هێناوەتە ڕیز و گوتوویەتی: (ساڵح قەفتان و ئەحمەد شوکریی و ئەحمەدیعەزیزئاغا!: لەهەمووان زیاترنووسینیان لە"زبان"دا بڵاوکردووەتەوە!؟). [١٠]

دیسان نازانم هەر ئەو نووسەرە، لەکوێوە قسەی هێناوەو گوتوویەتی، (شایانی باسە مـەجـیـد یـەعـقـووبیـی بـۆ خـۆی ڕەقـیبی وتـارەکـانـی " زبان "بوو. جـاروبـار ڕێگەی بڵاوبوونەوەی وتارە مێژووییەکانی ساڵح قەفتانی نەدەدا!!). [١١] ڕاستییەکەیشی — وێڕای دیـارنەبوونی ســەرچـــاوەی ئاخـــاوتنی ئـــەو نـــووســـەرە — من باوەڕم هەیە کە موتەسەڕڕیف مەجید یەعقووبیی کوردییزان شتی ئەوتۆی لە دەست هاتبێ بەتایبەتی کە هێندێ هۆ لەئارادا بوون و لە ئێرەدا و لە شوێنی خۆیدا ئاماژەیان بۆ دەکرێ.

هەرچۆنێ بێ، ناسینەوەی سەرۆکی بەلەدییە — کە بەشداری ئاڵۆزییەکەی پیرەمێردە — و ئەو کارگێڕە دیارانە، پێویست دەبینم و ئەمەش باسیانە:

١. مەحموود میرزا[١٢]، (سەرۆکی بەلەدییە) کوڕی قادر ئاغایە. ساڵی ١٨٨٨ ز لە گەڕەکی گۆیژەی سلێمانییدا لەدایك بووە.

کۆچ کردوو ئەنوەری کوڕی —لەوەڵامی نامەییێکمدا— بۆ منی نووسیوە، لە فێرگەکانی ئایینپەروەراندا خوێندەواریی دەستگیر بووە. هەر کوڕەکەی پتر دەڵێت: ساڵی ١٩١٤ ز بەنێوی یاریدەری نووسەری داد—عدل—ەوە یێکەم وەزیفەی لە سلێمانییدا بەرکەوتووە. دوایی لە قەزاکانی بازیان، هەڵەبجەدا بووە بە یاریدەری قسە وەرگر— موستەنتیق. ئەوجا بووە بە نووسەری دادگەی سلێمانیی، دواتر کاتب زەبت، ئەوجا سەرنووسەر لە دیوانی موتوسەڕڕیف. دواجار سەرنووسەر — میرزا — لە بەلەدییەی سلێمانییدا. ئەم دوا

هەواڵەش لە (پێشکەوتن–سلێمانیی) دا [١٣] ساغ دەبێتەوە کە ڕۆژی ١٩٢١/١/٦ – لەسەردەمی ئینگلیزی داگیرکەردا – هەڵبژێردراوە بە سەرۆکی بەلەدییەی سلێمانیی و تاکۆتایی دووهەم سووڕی حوکمڕانیی کوردستان (٣ی مارتی١٣٣٩ر = ١٩٢٣ ز) درێژەی کێشاوە، بگرە تا ڕۆژی ١٦/٧/ ١٩٢٣ ی ڕێکەوتی (ڕۆیشتنە عومومییەکەی سلێمانیی) کە ئەویش تێکەڵی بووە و چووەتە کەرکووك[١٤]. دیارە لەگەڵ دامەزراندنی دەسەڵاتی مەملەکەتی عێراق لە١٩٢٤/٧/٢٨ لەسلێمانییدا، بەهەمان وەزیفەی جارانەوە دەرکەوتووەتەوە بۆیێکا نێویشی دەرکەوتووە[١٥]. لە ئەو هەلەوە تا ساڵی ١٩٣١ ز هەر لە سلێمانییدا ئەو وەزیفەی هەبووە[١٦]. جارێکی دی لە ساڵی ١٩٣٥ ز بەدواوە تا ساڵی ١٩٤٤ ز بەهەمان وەزیفەوە لە سلێمانییدا بووە[١٧].

کوڕی خۆی دەڵێت: لەئەوهەلە بەدواوە تاساڵی١٩٥٠ ئەندامی پارلەمانی عێراق بووە. من چ سەرچاوەییێکی ڕەسمیم نەدیتووە کەبیسەلمێنیێ. مەحموود میرزا، ئەندامێکی دەستەی دامەزرێنەری (جەمعییەتی مودافەعەی وەتەن –سلێمانیی:١٤/٢/ ١٩٢٥)[١٨] و ئەندامی دووەم دەستەی ڕێبەری (جەمعییەتی زانستیی کوردان–سلێمانیی: س ١٩٢٦) بووە[١٩].

کوڕی خۆی دەڵێت، کوردیی، تورکیی، فارسیی، عەرەبیی زانیوە. دەستی شیعری هەبووە. (من نەشیعرێکی نەگوتارێکیم لە چ ڕۆژنامە و گۆڤارێکدا نەدیتووە!). لەساڵی ١٩٢٠ز.دا ژنیشی هێناوە و ئێستە – لە ٥ کوڕ و کیژێ – بەتەنێ کوڕێکی لە سلێمانییدا و کوڕانی ئەنوەر بە ژیانەوەن.

مەحموود میرزای سەرۆکی بەلەدییە لە ساڵی ١٩٦٠ دا بەنەخۆشییەوە مردووە و هەر لە سلێمانییدا ئەسپاردەی خاك بووە![٢٠]

٢. ساڵح قەفتان: (بنۆڕە ئێرە و بابەتی: یێکەم گۆڤاری سلێمانیی!)

٣. ئەحمەد شوکریی: ئەحمەدکوڕیمحەممەد کوڕی عەبدولسەمەد.دایکی حەلیمەی فەتحاللەیە. خەڵکی گوندی (ئاویێ هەنگی) ی سەر بە باژێڕۆکی مەریوانە. لەساڵی١٩٠٨دا لە هەڵەبجەدا هاتووەتە دنیاوە[٢١] !خوێندنی لەحوجرەوە دەست پیێکردووەو بەدەمییەوە ڕۆییشتووە! لەهەڵەبجە و سلێمانییدا — لەلای مەلا حەسەن و خواجە عەزیز — هەتا لە کفرییدا خوێندوویێتیو سەرئەنجام لەساڵی١٩٢٢[٢٢] بەدواوە و بۆ سیێ ساڵی ئیمامی مزگەوت بووە. ماوەییێکیش لە (خانەقی)دا بووەو ئەوجا هاتووەتەوە بۆ سلێمانیی! لەساڵی١٩٣١دا لایەن تایێر بەهجەت مەریوانیی ئاشنایەوە داخوازیی بۆ هاتووەو لەگەڵ دوو کەسی دی[٢٣] چووە بۆ بەغدادو فێربوونی تیپچنین لە (چاپخانەی کەرخ)ی مەلا عەببوودی کەرخیی و ئەو جیێگیر بووە و فێری پیشەی ڕۆژنامەگەرییەکە بووەوچووەتە پاڵ (چاپخانەی نەجاح)و لەپڕۆژەی چاپ کراوەکانی(کوردیی— مەریوانیی /نەشرییاتی ٚکوردیی و مەریوانیی)دا کاری کردووە، تەنانەت چەند چاپ کراویێ نێوی ئەوی لیێدراوە[٢٤].

بە ئەم جۆرە هەتا ساڵی ١٩٣٥لەبەغداد دا ماوەتەوەو ئیدی گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانیی و وەك تیپچن لە (چاپخانەی ژیان) ی بەلەدییە و بەکریێ گیراوی پیرەمێردی خاوەند ڕۆژنامەدا کاری کردووە. دواتر هەروەك تیپچن لە پاڵ (زبان) و تا سەرەتای ساڵی ١٩٤١ ماوەتەوە. لە ئەم هەلە بەدواوە ڕووی کردووەتە بەغداد بۆ بەشدار بوون لە کۆڕی فێرگەییێکی برینپیێچی کە هەتا ساڵی ١٩٤٣ ی خایاندوە. لە ئەم هەلە بەدواوە تا ساڵی ١٩٧٣ برینپیێچو دواتر خانەنشین بووە. لەساڵی ١٩٤٧دا کابانی خۆی لەسلێمانییدا هەڵبژاردووەو حەوت منداڵیان بووە کە کوڕی پیێگەییشتوویان هەیە. زمانەکانی کوردیی، فارسیی، عەرەبیی زانیوە. شیعرەکانی حافز و سەعدی شیرازیی کاریان لە هۆش و بیر و شیعری کردووەو ڕەنگیان بە شیعر و گوتاریەوە هەیە! ئەحمەد شوکریی لەساڵی ١٩٣٨ بەدواوە خولیای شیعر بووە، بەڵام تا درەنگیێ شیعری خۆی بڵاوکردووەتەوە. لەدوای

ساڵی١٩٥٨ـەوە کەوتووەتە چاپ کـردنیان و لـەسـاڵی١٩٧٠دا پتر ناسرا. شیعرەکانی غەزەل و جوانپەرستی و نیشتمانپەروەرانەیە. زمانیشی شیرین و شێوەی دەم و دووی گەلی هەیە. زۆریش بە قسە خۆش ناسرا بوو. دوای ساڵی١٩٧٠ بوو بە ئەندامی یێکەتیی نووسەرانی کوردو هەندێ کەس ناسنێوی (دکتۆر شۆ)یان بەسەردا دابڕی و خۆیشی شانازیی پێوە دەکرد. شوکریی، پیاوێکی پاك، ژیر و قسەی لەڕوو، ڕووناکبین و دەم بە پێکەنیین لەدوا ساڵانی ژینیدا تووشی نەخۆشیی — پرۆستات، شەکرە، تەنگەنەفەسیی — بوو تا ڕۆژی چوارشەممە٢٤/٥/ ١٩٨٩ لە سلێمانییدا کۆچی ماڵئاوایی کرد و بەگردی سەیوان ئەسپاردە بوو! [٢٥]

ئەم بەرهەمە چاپ کراوانەیشی هەیە:

(وێڕای ئەوەی جاروبارە گوتاری لە ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکردەوە گۆیا بە هەزاران بەیتە شیعری داناوە، ئەمانەی بەر چاپ کەوتوون!).

١. شەڕی پشیلەو مشك — س ١٩٥٨ (لە فارسییەوە بە شیعر هەڵیبەستووە!).

٢. ئامۆژگاریی — س ١٩٥٨ (کۆمەڵێ شیعری خۆی!).

٣. مژدە —س ١٩٥٩ (قەسیدەیێکی خۆی!).

٤. پیَبکەنە —س ١٩٥٩ (کورتە باسی گاڵتە جارییە و بە شیعر هەڵیبەستووە!).

٥. هەمە جۆر — س ١٩٦١ (کۆمەڵێ شیعری خۆی!).

٦. پێنجینەی شۆڕش — س ١٩٧٠.

٧. دڵدارمیی — س ١٩٧٧ (شیعر!).

٨. تێکەڵاوە — س ١٩٧٨ (شیعر!).

٩. ئامۆژگاریی— بەرگی دووهەم — س ١٩٧٨(دیوانی شیعر).

٤. ئەحـــمـــەد عـەزیـز ئـاغـا: (ئەحمەدی حەمدیی)[٢٦] کوڕی عەزیز ئاغا کوڕی عەبدوالله کوڕی تەها ئاغا ساڵی١٨٩٤ز لـــەســـلێمانییدا هـــاتووەتـــە دنیاوە. خوێندنی قوتابخانەی ســـەرەتاییو ئامـــادەیی مـــوڵکیی هـــەر لەئەوێدا تەواو کردووە، بەڵام لەبەر هەڵگیرسانی جەنگی گێتیی دووهەم لەخوێندندا نەچووەتە پێشەوە[٢٧]و بۆ ماوەییّ تێکەڵی جەنگ بووە!

ڕۆژنامەی (پێشکەوتن—سلێمانیی:١٩٢١/٣/٣٠) نیشانی داوە کە نووسەری سوارییی — کاتیب سوارییی بووە.[٢٨] ویّ دەچــێ مـــاوەی دواتـــری ســـاڵانی ١٩٢١—١٩٢٢بووبیّ بە مـامـۆسـتـای قـوتـابـخـانـەی سـەرەتـایـی نـموونەی سەعادەت![٢٩] لە دووهەم سووڕی حـوکـمـڕانیی کـوردستان —تەشرینی دووهەمی١٩٢٢ دا نێوی بەمـامـۆسـتـای یـێکـەمـی قوتابخانەی سەرەتایی لەتیفییە دەرکەوتووە![٣٠]

ویّدەچیّ لەڕۆییشتنەگشتییەکەی١٩٢٣/٦/١٧دا ئەویش تێکەڵ بووبیّو ڕۆیشتبیّ[٣١] دۆستیّ بۆ منی گێڕایەوە کە لە ئەو دەوروبەرەدا مامۆستا بووە لە نێوچەی (لەیلان—کفریی)دا.[٣٢] دیـارە دواتـر هـاتـووەتـەوە بۆ سـلـێـمـانـیـیو بۆییّکا لـەگـەڵ هەڵکەوتنی (ژیانەوە—س١٩٢٤— ١٩٢٥) بەنێوی ئاشکراوە چەندین گوتاری بڵاوە. دیاریشە لەهەمان کاتدا نووسەری نووسینگە — کاتیب تەحریراتی موتەسەرڕیفییەتی سلێمانیی بووە بۆییّکا لە ئەیلوولی ١٩٢٦ دا بە ئەو وەزیفەیەوە نێوی دەرکەوتووە![٣٣] ساڵی ١٩٢٧ نێونیشانی بە مەئمووری ئەوراق لە سلێمانییدا دەرکەوتووە و تا ساڵی ١٩٣٧[٣٤]یش هەرلەئەو بازێڕەدا بەجموجووڵی ڕۆشنبیرییونووسینەوە لەڕۆژنامەدا نێوی دەرکەوتووە. ڕەنگبیّ تا نیوەی ساڵانی چلەکان لە ئەو بازێڕەدا مابێتەوە بۆییّکا دواتر لە ساڵی ١٩٤٩ دا گوتاری هەفتانەی لە ڕادیۆی کوردیی — بەغداد دا هەبووە.[٣٥]

ئەحمەدی عـەزیـز ئـاغـا، لـەڕووی کـۆمـەڵایـەتـیـیـەوە دوو ژنـی هـێـنـاوەو نـەوەی پێگـەیشتووی لـــەسـلێمانییو بەغـدادا دەژیـن.[٣٦] ئـەحـمـەد حـەمـدیـی عەزیز ئاغا

ۆشنبیرێکی چالاکو ناسراوو زمانو ڕوو خۆش بووه. ڕۆژنامەکانی (پێشکەوتن-
ـلێمانیی)و (بانگ کوردستان) و (ژیانەوە) و (ژیان) و (زبان) گوتاری ئەویان هەڵگرتووە
. باوەڕێکیشم هەیە کە لە سەرەتای (ژیانەوە) دا، ئەو ماوەییَ سەرپەرشتی بوویێ،
ەنانەت بە هەڵسەنگاندنی بارودۆخی ڕۆژگارەکان و تێکەڵیی لە ڕۆژنامەنووسیدا کارێکم
ێ دەکەن باوەڕ بکەم کە ئەویش وەك ڕۆژنامەوان دەناسریێ! لە مەیدانی سیاسەتدا،
ەندامی دەستەی دامەزرێنەری (کۆمەڵی پشتیوان-بەغداد١٠/٧/ ١٩٢٧) بووە.[٣٧]
ەوەکانی خۆی بۆ منیان گێڕاوەتەوە کە وێڕای کوردیی، تورکیی، فارسیی، عەرەبیی و
ێندیێ ئینگلیزیی زانیوە و هێندیێ نووسینی کوردیی و وەرگێڕدراوی (کلیلە و دمنە) ی
ە دوا بەجیێماوە، بەڵام لەدەست چوون![٣٨] هەرە کردەوەی ژیری ئەوەیە، وێڕای
ەوەی لە ساڵی ١٩٢٢ ـەوە خەمخۆری زمان و نووسینی کوردیی بووە، لە ساڵی ١٩٢٦
ا نامیلکەییێکی ئەلفبای کوردیی بۆ قوتابخانەکان داناوەو لەساڵی ١٩٢٩دا چاپو
ڵاوکـراوەتەوە![٣٩] ئـەم کـارەی بۆ ئـەو ڕۆژگـارە زۆر بەفەڕ بووە کـە ڕێنووسی نوێی
اهێندراوی تۆفیق وەهبی بەکار بردووە![٤٠]

---

## بەشی سێهەم

### ١. باری دەرچوون و ئاوابوونی؟

لە ١٩٣٧/٨/٢ بەدواوە — لەماوەی فەرمانی جێگری موتەسەڕیف ناجیی هورموزیی، ١٩٣٦/٧/٢٥ ــ ١٩٣٧/٩/٣٠دا — بەلەدییەی سلێمانیی چاپخانەکەی بەکرێ نەدایەوە بە ڕۆژنامەنووسی ناسراو و خاوەندی ڕۆژنامەی (ژیان) و بوو بەهۆی پەکخستنی! هەر بەلەدییەش خۆی لە ١٩٣٧/٩/١٢ دا ئەم ڕۆژنامە حەوتوویییە، (زبان) ی دەرکرد. دیارە هەڵکەوتنی ڕۆژنامەکەش بە فەرمانێکی ئیداریی جێگری موتەسەڕیفەوە بووە، بۆیێکا ئەوها خێرا، بەتەنیش بە تێکەڵیی نووسەرێکی وەك ساڵح قەفتان — دەرکراو لە وەزیفە — مامۆستای قوتابخانەی زانستیی، دەرچووە. هەڵبەت دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیە بە کارێکی چاك دێتە پێش چاو، بەڵام ئەوەی وێنەکە لێڵ دەکات ئەمەیە کە ڕووداوەکە لەسنووری ڕۆژگاری تەنگانەیێکی بزاڤی ڕۆشنبیریی سلێمانییدا هەڵکەوتووە کە بەلەدییە خۆی لایەنێکی وورووژێن و بەشداری تەنگانەکەیە!

هەرچەندە پیرەمێردی خاوەندی (ژیان) کۆڵی نەداوە و دەست بەجێ لە١٩٣٧/٩/٢٠ دا چاپخانەییێکی گەورەتری بەتیپی نوێوە کڕیوەو لە ژمارە "٥٣٩"وە درێژەی داوە [٤١] بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکەی و بەشێکی کێشەکەی دەمکوت کردووە، ئەوە وێ دەچێ کە کێشەکە ڕووی لە هەڵچوون کردبێ کە لەلاییێکەوە بە (زبان) و قەڵەمەکەی قەفتانەوە دیارە کە لە — سەردەمی مەتەسەڕیف مەجید یەعقووبیی: ١٩٣٧/١٠/١– ١٩٣٩/٢/١٧ ژمارە ١٩٣٧/١٢/١٩ دا، سەرگوتارێکی نووسیوە و دەڵێت، (خوا بکات لە بەدبەختیمانەوە نەبێ.. لە شارێکی بیست و پێنج هەزار کەسی وەك سلێمانیی، دوو ڕۆژ موەززیعی ڕۆژنامە بگەڕێ کەچیی هەموو حەوت نوسخەی بۆ بفرۆشێت!!).

لەلاییێکی دیەوە، پیلان لە پیرەمێرد گەورەتر بووە، بەڕادەیێ لە١٩٣٨/٣/١٠ دا ڕۆژنامەی (ژیان) قەدەغەکراوە و داخراوە. بگرە گۆڤارە خۆییەکەی ساڵح قەفـ

(زانستیی–١٩٣٨/٢/٥) ژمارەییێکی دی لێ دەرنەچووەوە، کە دیارە ئەویش قەدەغە کراوە. تەنانەت سالح قەفتان خۆیشی، ئەوپەڕییەکەی دوای (زبان– ژ٢٣ی٢/٢٧/ ١٩٣٨) پێوەندیی بە ڕۆژنامەکەوە نەماوە، هەر بۆییێکا نێوی بە تەوێلی ڕۆژنامەکەوە نەماوە.[٤٢]

وردبوونەوەش لە ڕەوتی ڕۆژگار و بەسەرهاتەکان ئەوە دەنوێنن کە بەلەدییە و پشتیوانەکانی زۆر کۆششیان کردووە کە بەتەنێ (زبان) تاکە ڕۆژنامەی بازێڕەکە بێ و چ گۆڤار و ڕۆژنامەییێکی دی هەڵنەکەون، هەر بۆییێکا (زبان) ماوەیێ تاقانە بوو.

جێگەی خۆییتی لەمەڕ باری سیاسیی ئەو تەنگانە ڕۆشنبیرییە و هەڵکەوتن و پەک کەوتنی ئەو ڕۆژنامانە و باسەکانی دی هێندی پرسیارێ وردبکرێت! لە کورتیی دەڵێم: دوای ڕاگواستنی – کوردی سلێمانیی – موتەسەڕیف سالح زەکیی ساحێبقڕان لە١٩٣٦/٧/١٢ دا، بۆچیی تا ١٩٣٧/١٠/١و دامەزران و هاتنی موتەسەڕیف مەجید یەعقووبیی، هەر (جێگری موتەسەڕیف) لە سلێمانییدا دەست بەکار بووە؟ هەروەها بۆچیی ئەم موتەسەڕیفە هێندە توند و تیژ بووە بەرامبەر بزاڤی ڕۆشنبیریی و ڕۆشنبیرانی کورد کە داخستنی گۆڤاری (زانستیی) ی قەفتان و (ژیان) ێ پیرەمێرد، هەروەها هەڵوەشاندنەوەی (کۆمەڵی زانستیی کوردان) و لکاندنی قوتابخانەکەیشی بە دەزگەی مەعاریفەوە، هەروەها قەدەغەکردنی ئاهەنگی جەژنی نەورۆز و هتد.. ئەمانە هەموو لەسەردەمەکەیدا بەرکەوتوون؟

ڕاستییەکەی – ئەگەرچیی سەرۆکی بەلەدییە لەگەڵ پیرەمێرد و کۆمەڵی زانستیی ناکۆك بووبێ – من باوەڕیشم هەیە کە مەلامەتی سیاسییش لەپشت پەردەوە هەیە وەك ئەو هەڵگەڕانەوە سەربازییەی بەکر سیدقی سوپا سالار – ڕەگەز کورد – لە ١٩٣٦/١٠/٢٩ دا، ئەوجا کوشتنیشی لە ١٩٣٨/٨/١٢ دا، هەر بۆییێکا لەلاییێکەوە ئەو بارە ئیدارییە لە ئەم بازێڕەدا قەوماوە و ڕەنگی بەسەر ژینی ڕۆشنبیرییشدا ڕژاوە... ئەوەتە

وەزارەتەکەی حیکمەت سلێمانی سەر بە هەڵگەڕانەوەکە - وەك جاران - نەك هەر وەزیرێکی کورد، بەڵکو کەسێکی کوردی بۆ فەرمانی موتەسەڕڕیفی سلێمانیی دانەناوە کە بێگومان ئەم کارە بەفیتی خۆی یان بەفیتی کۆشکی - غازیی - پاشای عێراق بووە. جێگەی گوتنە لە ئەو هەلەدا کۆمەڵەییێکی نهێنیی دەستوەشێن - کە شوناسنامەی ساغ نەبووەتەوە ئایا عەرەبەکان خۆیان بوون یان بەڕاست کورد بوون؟ - بەنێوی (جەمعییەتی ئیسلاحی کوردییەوە) هەڕەشەی کوشتنی لە کاربەدەستە گەورەکان دەکرد. {٤٣}

لەلایێکی دیەوە، دوای کوشتنی بەکر سیدقی و دامەزرانی موتەسەڕڕیف مەجید یەعقووبیی - کە لەکۆنەوە بنەماڵەکەی لەلای کوردان بە دۆستی ئینگلیز ناسرا بوو - کردەوەکانی لەشێوەی جڵەوگیریی سیاسییدا خۆیان نواندووە، وەك مەبەست بوویێ بەری هۆش و بیر و سۆزی کوردان بۆ کوشتنی بەکر سیدقیی بگریێ کە نێوبراو چ شتێکی دیارییشی بۆ کورد نەکرد بوو. وێڕای ئەم باسانەش، من بۆ دوو باسی دی دەچم کە ویێ دەچیێ ترسیان خستبێتە دڵی کاربەدەستانەوە:

١. هەڵکەوتنەوەی نێو و باسی سەرداری کورد، حەفید زادە مەحموود کە لەدوای (شەڕی ئاوباریك -٢٠/٤/١٩٣١)ەوە بەدیل گیرا و لە باژێڕەکانی باشوور و نێوەندی عێراقدا دەستبەسەر دەژیا و لەکاتی هەڵگەڕانەوە و کوشتنەکەی بەکر سیدقیدا لە بەغدادا دەژیا و باسی دەکرا و لە هێندێ ئاهەنگی دیپلۆماسیی و دیمانەی ڕۆژنامەنووسییدا دەبیندرا.

٢. هەڵکەوتنی (کۆمەڵی برایەتیی - سلێمانیی: س ١٩٣٨) بە سەرۆکایێتی شێخ لەتیفی کوڕی حەفید زادە مەحموود {٤٤}. هەروەها سەرهەڵدانی چەند کۆمەڵەییێکی نهێنیی دی وەك (ئازادیی کوردیی) و (دار.کەر) لە ساڵی ١٩٣٨دا. {٤٥}

ئەگەر ڕۆژنامەی (زبان) لە ئەم بارودۆخەدا هەڵکەوتبێ و ژیا بێ، داخۆ باری ئاوابوون و چارەنووسی چۆن و چیی بووبن؟

گومان نییە، وەك هەموو ڕۆژنامەیێ پێویستی بە خاوەندی کارامە و دەستمایە و کارگێڕ و نووسەر و هونەرمەند و بڵاوکەرەوە و هاوتایان هەیە، ئەوە پێویستیی بە ئازادیی کار و نووسین و بڵاوکردنەوە هەیە. دەی ڕۆژنامەی (زبان) زۆری نەبردووە تاکە نووسەرە دیارەکەی (ساڵح قەفتان) ی لەدەست چووە و تیپچنێکی وەك ئەحمەد شوکریی کارمەند بەکرێ، ئەوجا فەرمانبەری موتەسەڕیفییەت ئەحمەد عەزیز ئاغاش بۆی تێکۆشاوە!

لەلاییکی دیەوە هەر زوو (چاپخانە نوێیەکەی پیرەمێرد) و ڕۆژنامەی (ژیان) هاتوونەتە گۆڕێ و دوایی لە۱۹۳۹/۱/۲۹دا ڕۆژنامەی (ژین) ی دیسان سەربەست هەڵکەوتن..

بێگومان ڕۆژنامەییکی وەك (زبان) ی بەلەدییە و (ژیان، ژین) پیرەمێردی ڕۆژنامەنووسی دنیا دیدە و شاعیری بەنێوبانگ، هەروەها هەبوونی دوو ڕۆژنامە لە بازێڕێکی ئەوهادا، بارەکەی (زبان)ی لاسەنگ کردووە بەتایبەتیی کە یێکێکی وەك مەجید یەعقووبیی موتەسەڕیف — لە ژمارە: ٤ ی ۱۹۳۷/۹/۳۰ـەوە هاتووەتە سلێمانیی — گەورەیە و ڕێبەری بازێڕەکەیە و در.کەمال مەزهەر ئەحمەدیش باسی ئەوتۆی لێ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (مەجید یەعقووبیی بۆخۆی ڕەقیبی وتارەکانی زبان بوو. جاروبار ڕێگەی بڵاوبوونەوەی گوتارە مێژووییەکانی ساڵح قەفتانی نەدەدا!) [٤٦]

لەپاڵ ئەو باسانەدا —چۆن دەرکەوت تا سەرەتای ساڵی۱۹٤۰ ژیاوە— قەومانی دووەم جەنگی گێتیی لە۳ی ئەیلوولی ۱۹۳۹ دا و گران بوونی باری سیاسیی و ئابووریی، ئەوجا سەرهەڵدانی کێشەی نەبوونیی قاقەز لەبەردەم بزاڤی ڕۆژنامەنووسیی و چاپەمەنیی وڵاتەکەدا، هەروەها کۆن بوونی چاپخانەکە و تیپەکانی کە لە ساڵی ۱۹۳۳ـەوە شتی

نوێی بۆ نەکرِدراوە، بێگومـان مەلامـەتی لاوازیـی و ئـاوابوونی رِۆژنامەکـەن کـە تەنانـەت ئەحمـەد شـوکریی کـارگێرِ و تیپچنیشـی لەبـەر خولیـای پیشـەییێکی نـوێ و دوا رِۆژێکـی چاکتری ژینی، رِووی لێ وەرگێرِدراوە. مخابن بەڵگە و فەرمانێکی رِەسمیم چنگ نەکەوت تا مێژووی رِاگرتن و ئاوابوونی ییێکلایی بێتەوە!

## ٢. شوێنی لە رِۆژنامەنووسییدا

نووسراوی سەر تەوێڵی رِۆژنامەکە کـە هـەر هێنـدەی نوانـدووە، (زبـان رِۆژنامـەیێکی کوردییە!) تا دەگاتە گوتارەکان بەتایبەتیی و بەشێوەیێکی دیار "ئامانج" و "پەیام"ی رِۆژنامەکە ناگێرِنەوە.. بـەلام بەرِۆشـنایی خوێندنـەوە و لێـك دانـەوەی کۆمەڵـە گوتـار و بابـەتی ئـەم کۆمەڵـە رِۆژنامەیـەی بەردەسـتم، لـێم رِوونـە کـە (زبـان – رِۆژنامـەیێکی رِۆشـنبیریی، ئـەدەبیی کۆمەڵییـە) و وەك رِۆژنامـەکانی دی سـلێمانیی، پێوەنـدیی بـە سیاسەتەوە نییە!

هەتا سالح قەفتانیش نووسەری گوتارەکانی – وەك هێندێ ژمارە بەڵگـەن – ئامـانج ئەوەیە، (بەخوێندەواریی، ئەم میللەتە هەژارە لەم ژیانـە قوربەسـەرییە رِنسـگار بـێ/ژ–١٢). هەروەها بەرِاستیی کـارکردن دەبـێ بەمایـەی (زیندوویـەتیی‌و حالْمـان ئـەگۆرِێ و قەومەکەمان زیندوویەتیی تێ ئەگەرِێ!/ژ –١٩).

ئامانجێکی تـەواو گـرنگیش کـە لـە گوتـارێکی قەفتانـدا هـاتووە ئەوەیـە، (خەڵقەکـە رِۆژنامـەی خـۆ زمانەکـەی خۆیـان – حەفتـە جارێـك بـە چـوار فلـس – بکـرِن تـا بـزانن حەوادیسی دنیا چییە و چ عەلاقەیێکی بە خۆیانەوە هەیە!/ژ–١٣).

وردبوونـەوە لـە نێونیشـان و کاکڵـەی گوتـار و بابـەتیان، ئـەوەش دەنـوێنن کـە خوێنـدەواریی، چـاکیی بـاری کۆمـەلاییتیی، تەندروسـتیی، رِۆشـنبیری و ئـەدەبیی کوردەواریی رِوو لە نەش و نما و پێشکەوتن بێ.

هێنـدەی ئـەم کۆمەڵـە ژمارەیـەش لەبەردەسـتدایە، – ئەگـەر چـیی ڕەخنـەی خوێندەواریی و کۆمەڵایەتیی گیراوە – هـەرگیز تانەوتەشـەری بۆلاییَ یـان کەسـیَ تێدا نییە.

جێگەی باس و بایەخە کە ڕۆژنامەکە – بەتایبەتیی لەسەردەمی قەفتاندا – بایـەخی داوە بەبڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبیی و ڕۆشنبیریی لاوان و قوتابیان. شـیعر و بابەتـە بڵاوکراوەکان ئـەوە دەنـوێنن کـە خاوەنـەکانیان قوتـابین، هـەر لـە خوێنـدنی بـاڵاوە تـا دەگاتە قوتابخانـەی زانسـتیی سـەرەتایی. ئـەم کـارە بەڕاسـتیی شـتێکی نوێیـە لەچـاو ڕۆژنامەکانی دی ڕابردوودا. دیسان هەڵکەوتنی گۆشەی نـوێی وەك (قسـەی حـەکیمان – گوتـەی بـەجیَ) ی پیـاوە ئەقڵـدارەکانی دنیـا و (ئامۆژگـاری) شـتێکی نـوێن لەچـاو ڕۆژنامەییێکی دیدا.

لەلاییێکی دیەوە، شتێکی گرنگ و بووژاوە ئەوەیە کە دوای (پێشکەوتن – سلێمانیی: س ١٩٢١) ئەمـە دووەم ڕۆژنامـەی کوردییـە کـە لـە سـاڵی ١٩٣٩ دا دەسـت بداتـە بڵاوکردنەوەی (ڕۆمانێکی بێگانە) بە کوردیی و بەشێوەی بەش بەش. هەڵبەت هـەر ئـەم بابەتە ئەدەبییە تاقە بابەتیَ نییە کە لە زمانێکی دیەوە کرابیَ بە کوردیی، بەڵکو هێندیَ شیعر و گوتاریش کراون بە کوردیی و ئەمەش نیشانەییێکە بۆ بایەخ دانی بە وەرگێڕان.

وێڕای ئەم کردەوە چاکانەی (زبان) پیَویستە لاییَنی فـەرامۆش کـراوی وەك، بابـەتی مێژووی کورد، بیرەوەریی پیاوە ناسراوەکان، شیعر و بابەتی ئەدەبیی شـاعیر و ئەدیبـە ناسـراوەکان.. هتـد لەبیرنەکـەین کـە مخـابن دەنـگ و ڕەنگیـان نـادیتریَ لـە هەلێکـدا ڕۆژنامەکە – بەتایبەتی دوای قەفتان – چەند جاریَ خۆی بە: (زمان حـاڵی هـەموولاییَ/ ژ–٦٧) ژمـاردووە و بـە (نـاوی هـەموو قـەومی کـورد و میللـەتی سـلێمانییەوە / ژ – تایبەتیی) ئاخاوتووە!

**ئەنجام**

سالّح قەفتانی نووسەر لە ڕاپێڵەی سەرگوتاری (ژ — ٣) دا گوتوویێتی، (پەیابوونەوەی ڕۆژنامەی تازەی بەلەدییە !). ئەم ڕستەیە شایانی تێڕامان و بایەخ پێدانە، چونکە کەم کەس هەیە بزانێ کە هەڕەمەکیی نییە و واتای خۆی هەیە ! ڕاستییەکەی ئەم (چاپخانەی بەلەدییە)، لەدوای بەزۆر سەپاندنی دەسەلاتی مەملەکەتی عێراق بەسەر سلێمانییدا لە (تەمووزی ١٩٢٤) دا، لە حوکمڕانیی ئینگلیزی داگیرکەری سلێمانیی و حوکوومەتی مەلیکی کوردستان ماوەتەوە و ئیدی بوو بە (موڵکی بەلەدییەی سلێمانیی) و ڕۆژنامەکانی (ژیانەوە) و (ژیان) ی نیمچە ڕەسمیش لەنێوان ٩٢٤ —١٩٣٤ دا دیسان سەر بە بەلەدییە و لەژێر چاودێریی موتەسەڕڕیفەکاندا بوون !

لەبەر ئەم ڕۆشناییە و لەسەردەمی جێگرێکی موتەسەڕڕیفدا" ! ! "، دیارە بەلەدییە — چۆن هەلی قۆستووەتەوە بۆ بەرهەڵستی پیرەمێرد و ڕۆژنامەکەی — مەبەستی گێڕانەوەی هەیبەت و دەسەلاتەکەی جارانی بێ کە دوای ساڵی ١٩٣٤ و ڕۆژنامەی (ژیان) ی سەربەستی پیرەمێرد، ڕەنگ و ڕووی گۆڕدراو خەڵکیش فێری هۆش و بیر و ڕۆژنامە و خوێندنەوەی سەربەست و ئازاد بوون ! من گومانم نییە کە کردەوەکەی بەلەدییە لە دڵپاکیی و چاکەی تەواوەوە نییە و غەرەزکار بووە بۆ تەنگ پێهەڵچنینیی چراگێڕی بزاڤی ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسیی بازێڕەکە کە پیرەمێردە، هەروەها بۆ کزکردنی ڕووناکیی ئەو بزاڤەیە.. بەڵام خۆشبەختییە کە کەسێکی ژیر، مامۆستاییێکی زۆرلێکراو، کورد پەروەرێکی پێشکەوتنخوازی وەك (سالّح قەفتان) لە ئەو هەلە دژوار و ناسکەدا لەبەر دەستدا بووە بۆ سەرپەرشتیی ڕۆژنامەکە و ئەویش بەتوانا و زانایی خۆیەوە بەڕاستیی خزمەتی پێکردووە کە تەنانەت — دوای خۆیشی — ئاوێکی ئەوتۆ ڕوونی ڕشتووە کە وێنەی ڕۆژنامەکە هەمیشە جوان و ڕوون بێ. بڕواش دەکەم ڕۆژنامەکە تا سەر هەر ئەوها بووە !.

لە ئەم بارەدا، (زبان) بەچەند کارگێڕێکی کەمەوە، توانیویەتی کە بیر و زمان و بەهرە و بەرهەمی کوردیی بنوێنێ و هێندێ پردی گرنگ لەگەڵ توانای ڕۆشنبیریی و ئەدەبیی خۆ و بێگانە، هەروەها لەگەڵ ڕووداوەکانی گێتیی ببەستێ کە زمانی ئاخاوتنیشی گران و ناقۆڵا نەبووە و لە خەڵکەوە نزیك بووە.. بەڵام مخابن — بە ئەو ڕۆشناییەی کە باری ڕۆشنبیریی باژێڕەکە تەنگ بووە — نەیتوانیوە بگەشێتەوە.. گوتارەکەی ساڵح قەفتان دوای سیانزە هەفتە، (ژ —١٣) کە گلەیی لە نەفرۆشتنی دەکات، بەڵگەی ڕاستییە ! . هەروەها نەیشیتوانیوە کە تاسەر بژیی، چ بەهۆی دەست تێ وەردانی کاربەدەستە گەورەکانەوە یان بەهۆی تەنگانەکانی چاپەمەنیی و ڕۆژنامەنووسیی دوای قەومانی جەنگی گێتیی دووهەمەوە، یان بەهۆی دوورکەوتنەوەی کارگێڕەکانەوە.

ڕاستییەکەیشی ئەگەر (زبان) بە خزمەتگوزارێکی بزاڤی ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسیی بژمێرین — هەروایشی دەژمێرین — ئەوە بەتەمەنی پێنج ساڵەی کورتی "١٩٣٧—١٩٤١"ەوە و خۆڕانەگرتنی، دڵنیا دەبین کە بەڕاستیی بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردیی توانای لە ئامێزگرتنی ڕۆژنامەیێکی ڕەسمیی یان نیمچە ڕەسمیی نەمابوو.. بەپێچەوانەوە فێری بیر و ڕۆژنامەی سەربەست و ئازاد بوو بوو، هەر بۆیێکا بەلەدییە، بەتوانی — پتر لە کەسێ — چاپخانەی تایبەتیی و دارایی خۆیەوە، نەیتوانیوە تاسەر (زبان) بژیێنێ، کەچیی کەسێکی پیرەمێرد و بارگران نەك هەر توانیی چاپخانەی نوێ و گەورەتر دابین بکات و لە دوو باری تەنگدا، هەردوو ڕۆژنامەکانی (ژیان) و (ژین) ی سەربەست بنوێنێ، بەڵکو پیرەمێردانە بەرهەڵستیی زۆر و ستەمی ناحەزان و کاربەدەستانیشی کرد.

بەڵێ (زبان) لەچاو ئاوابوو، بەڵام (ژین) تا دوای مردنی پیرەمێرد هەر ژیا ! هەروەها دوای (زبان) جارێکی دی بەلەدییە چ ڕۆژنامەیێکی دی پێ دەرنەکرا، ئەوە نەبێ — دوای ڕمانی مەملەکەت و چارەکە سەدەیێ پتر — کۆمەڵێ فەرمانبەری بەلەدییەی سلێمانیی،

بە هەستێکی پاکی ڕۆشنبیرانە و کوردەواریانەوە، بڵاوکراوەی (سلێمانیی – س ١، ژ ١، تەمووزی ١٩٦٨) یان دەرکرد کەئەویش تا سەر بڕی نەکرد!! هەروەها بەلەدییە خۆیشی نەیتوانیی ژیرانە (چاپخانە) کەیشی بپارێزێ و بەلایەنی کەمەوە – ئەگەر پەکیشی کەوت بێ!! – بیخاتە موزەخانەوە!

**داوێن**

١. چەند وێنەیێکی گوتار و بەرهەمی کارگێڕەکان! [٤٧]

١/١: سالح قەفتان، (خوا بکا لە بەدبەختیمانەوە نەبێ!). [٤٨]

زانای وڵاتان ئەڵێن، گیانداریی قەومێك و بەهۆش بوونی ئەفرادەکانی بەدەرەجەی سەرف بوونی ڕۆژنامەکەیانا دەرئەکەوێ! بڵێم چیی؟ ئەڵێی ئەم قسە بەرزەیان لەبەر ئێمە گوتووە و یا لە ئێمەدا کەم هەوەسیی موتاڵا و ڕۆژنامە خوندنەوە بینراوە و ئەم قاعیدەیەیان داناوە تا ببێ بە پەندێکی حیکمەت ئامێز بۆ گشت میللەتان، بەڵکو ئەمە بەشتێکی خراپ بزانن و خۆیانی لێ بپارێزن. بەناشکوریی نالێم، دنیا گەڕاوین و ئارەزووی گل خواردنی وڵاتان ناکەین و یا پارەمان نییە تا بە وڵاتانا بسووڕێینەوە و کە هاتینەوە چەند و چۆنی وڵاتان بۆ یێك بگێڕینەوە! لەشارانا هەموو ڕۆژ بەزبانی خۆیان ڕۆژنامە دەرئەچێ و بەهەزاران خەڵق چاوەڕوانی بڵاوبوونەوەی ئەبێ و کە دەرچوو ئەم خەڵقە لە مووەززیعەکان ئەئاڵێن و لێی ئەکڕن. لەبەر ئەوەی میللەتان زۆر مەراقی دەنگ و باسی دنیا و هی ناوخۆیان ئەکەن، هەتا ڕۆژنامە نەخوێننەوە ئارام ناگرن، چونکێ ئیشی دنیا ئیمڕۆ تێك ئاڵاوە، گەیشتووەتە پلەیێکی ئەوتۆ نارەحەتیی جێگایێك کار لە ئاسایشی شوێنێکی تریش ئەکا. ئەڵێی دنیا بووەتە یێك لەشی گیاندار، کە ئازار بە شوێنێکی ئەو گیاندارە گەیشت هەموو ئازاکانیتریش ئەکەونە زریکە و پەل پەل. لە وڵاتان ڕۆژنامە بە ڕووناکیی چاو، تەرجومانی مەسڵەحەتی میللەت ئەژمێرن. ئینجا لە جێیەکا کە ئەحواڵی عالەم وایە، کەچیی لای ئێمە ڕۆژنامەی بە زمانی خۆمان، نرخێکی نییە! قەت بووە لە

شارێكی بیست و پێنج هەزار كەسیی وەك سلێمانییدا دوو ڕۆژ مووەززیع ڕۆژنامە بگێـڕێ كەچیی هەموو حەوت نوسخەی بۆ بفرۆشێ؟!

ئەمە دەلیلی كەم زەوقیی و بێ موتالاّ و بێ هەوەسیی خوێنـدنی ئەهلەكـەمان نییـە، چییە؟ پەكوو لەم بێ باكیی و كەمتەرەخەم بوونی ژیانی ئێمەیە، بۆیە مونەوویرەكانمان هیوایان پێمان نەماوە، ئەڵێن میللەتی ئێمە نابێ بـەهیچ و بەتـەمای ئـەوە نـین ببین بـە قەومێكی پێشكەوتوو! ئەگەر ئەم بێ باكییە جەزای دواڕۆژی لەگەڵا نەبووایـە هـەر باش بوو، بەڵام پێویستە بزانین لەمٚ ڕۆژی پێشكەوتن و دەست درێژیی ئادەمیزادەدا، پاداشت كەمتەرخـەمی و بـێ بـاكیی میللـەتێك لـە كیسـەیا نـامێنێ. ئێمـە مەبـەسمان فـرۆتنی ڕۆژنامەكەمان نییە تا پێی دەوڵەمەند ببین.. ئاواتمان ئەوەیە كە خەڵقەكە ڕۆژنامەی خۆ زمانەكەی خۆیان حەفتەی جارێك بە چوار فلس بكڕن تا بزانن حەوادیسی دنیا چییە و چ عەلاقەیێكی بەخۆیانەوە هەیە؟ خۆ ئەگەر "زبان" بەكاری خوندنەوە ناشێ، با "ژیـان" بكـڕن و بیخوێننـەوە، چـونكی "ژیـان" لـە ڕۆژنامـەكانی بەغدا ئەچـێ! هـیچ نـەبێ با دەركەوێ كە ماریفەت و زانستیی لە شـاری سـلێمانییدا گەیشـتووەتە ئـەو ڕادەیـە تاقـە ڕۆژنامـەیێك بـەتێر و تەسـەلیی ئـەتوانێ بـژیێنێ، چـونكی ڕەواجـی ڕۆژنامـە لـە شـارێكا عەلامەتی گیانداریی ئەهالییەكەیەتیی! (بێ ئیمزا)

"تەواو"

٢/١: **سالح قەفتان**: (شەڕی ژاپۆن و چین! [٤٩]

لەوپەڕی ڕۆژهەڵاتا، یەعنی لە چین و ژاپۆنیادا شەڕ هەتا بێ قایم ئەبێ. ئەم هەفتەی ڕابوردووە، بێ پشوودان لە یێكیان داوە. لە چیندا مەیدانی شەڕ بووەتـە دوو كوتـەوە.. لە جونووبا لای شاری " شانغهای " كە بەقـەدەر هـەموو ئـەهالیی عێراق زیـاتر خـەڵقی تیایە و شارێكی ئیجگار دەوڵەمەند و بەندەرێكی زۆر بە تیجارەتە لە گوێ بـەحری شـەڕ داگیرسـاوە، بووەتـە مەیـدانێك، چـونكی لای ژاپۆنـەكان ئـەویی وەك دڵـی چـین وایـە

ئەیانەوێ چینییەکان بەوێران کردنی ئەم شارە بترسێنن بەڵکو زوو داوای سولّح بکەن و شەرتەکانیان قوبوولّ بکەن.

لەشکری ئامادەی شەڕ و پڕ چەکی چین بەشی زۆری لێرەیە. شەڕی سەرومالّیی ئەکەن لەگەلّ ژاپۆنەکان، پاپۆڕی تۆپ گەورەی ژاپۆنەکان لە بەحرەوە بە ئاگری جهەنددەمی ئەو تۆپانە یارمەتیی لەشکرەکەی خۆیان ئەدەن کە لە وشکانییا لە شەڕان، لەسەر ئەمەشا چینییەکان بە مردن نەبێ بستێك لە ئەرزەکەی خۆیان بەجێ نایێلّن. بە تەحریێ ڕقیان هەلّساوە ئەم خەلّقە مالّ و منالّیان ئەسووتێ و ئەکوژرێ، کەچیی زیندووەکانیان سوێند ئەخۆن ئەلّێن، هەتا دوژمن لە ولآتمان دەرنەکەین ئەمرین، بەلآم دەست لە شەڕ هەلّناگرین و هەرچییەکیان هەیە پێشکەشی حوکومەتی ئەکەن. عاجباتیی ئەوەیە کە ژنە چینیەکانیش تێ ئەکۆشن و خۆیان بە کوشت ئەدەن!

مەیدانەکەی تر کەوتووەتە لای شیمالی چین، لەشکری قورسی هەردوولا لەوێدایە، ژاپۆنەکان گەلێ شاری چینییەکانیان لەوێ داگیر کردووە. لەشکرەکانی چین کە لەوێن، هەموویان ڕێك و پێك نین و هەڕەمەن، لەچاو ژاپۆنەکانا چەکیان ناتەواوە، بۆیە خۆشیان بە کوشت ئەدەن، بەلآم بەرگەشیان ناگرن.

چەند ڕۆژێك لەمەوپێش لە نێرینەی شەڕا وەخت بوو قۆلّە لەشکرێکی "٥٠" هەزار کەسی چین لەلایێن لەشکری ژاپۆنەوە یەخسیر بگیرێت. دواجار چینییەکان بە ئازایی خۆیان ڕزگار کرد، بەلآم چەند شارێکیان بەجێ هێشت،.. شەڕ ئەوەتە لەپالّ شوورە گەورەکەی چینا. هەموو جارێ خولآسەی ئەم حەوادیسانە عەرزی خوێندەوارانمان ئەکەین!

(بێ ئیمزا)

"تەواو"

١/٢: **ئەحمەد شوكری**، (موساعەدەی خۆكردن!)[٥٠]

مەعلووم و ئاشكرایە كە هەموو شەخسێ حەز ئەكات و پێی خۆشە لە نەزەر خەڵقدا موحتەرەم و خۆشەویست بێت. كەوابوو پێویستە بزانین ئەفرادی بەشەر بەچیی ئەتوانێ خۆی لە پێش چاوی خەڵقیی حورمەتدار و خۆشەویست بكات. بەم چەند ماددانەی خوارەوە ئینسان پێی بەحورمەت ئەبێ ئەگەر خۆی لێ بپارێزێ و نەیكات:

١- ئەو شتانەی كە لە نەزەر خەڵقا موستەنكەرە و قەبیحە، وەك لەسەر شتی زۆر بێ ئەهمییەت توورە بوون و زوو لە قسەیێكی بچووك عاجز بوون و لەسەر شتی جوزئیی حیددەت كردن، چونكە حیددەتی بێ جێ لە شێتییەوەیە.. ئیتر وەك ئەنواعی"!!".

٢- ڕەفاقەتی ئەو كەسانەی كە ناویان بە خراپ مەشهوورە، چونكی مەعلوومە هاورێیتیی ئەو نەوعە شەخسانە پاش ٤ - ٥ كەڕەت، خەڵقیی ئەڵێن بەخوا حەیف فلانە كەس چووە خودی فیسارە كەسەوە!

٣- ئیسراف كردن، یەعنی بەگوێرەی بەڕەی خۆی ئینسان ئەبێ پێی ڕاكێشێ!

٤- ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ خەڵقیش بەو نەوعە پێت خۆش بێ! وە ئەوەی بۆ خۆت پێت ناخۆشە بۆ خەڵقیش پێت ناخۆش بێ!

٥- هەمیشە پاك و پوختە و تەمیز بە، چونكی شەخسی تەمیز خۆشەویستە و خەڵقیی حورمەتی ئەگرێ. بەڵام ئینسانی پیس و پۆخڵ با زۆر دەوڵەمەندیش بێ خەڵق بە قەبیح تەماشای ئەكات و هیچ نموویێكی نابێت! كەوا بوو ئینسانی پاك و پوختە كە دەركەوت، خەڵق بەتەبیعەت ئیحتیرامی ئەگرێت و خۆشیان ئەوێت و با زۆر فەقیر حاڵیش بێت!

٦- قەرز كەم كردن، چونكی ئینسان كە زۆر قەرزدار بوو لەنەزەر خەڵقا وەنەبێ زۆر خۆشەویست و بە حورمەت بێ.. تەماشا ئەكەیت ئەو كەسانەی كە قەرزدارن هەمیشە خۆی لەخاوەن قەرزەكە ئەشارێتەوە و خواخوایەتی نەیبینێ و چاوی پێ نەكەوێ!

٧- ئیقتیساد کردن لە ڕابواردن و خواردندا نیوەی مەعیشەتە.

٨- هەروەقتێ فورسەتت بوو بەسەر ئیشی باش و نافیعدا، بیکە و لەسەری ڕامەوەستە!

٩- خۆت تەسلیمی هەموو شەخسێ مەکە! زۆرجار تەجروبەی بکە ئەوجا قسەی خۆتی لەلا بکە، چونکی زۆر دۆست هەیە بەدەم ئینسانەوە پێ ئەکەنێ کەچیی لەپڕ وەك دووپشك ئەدات بە ئینسانەوە!.

مورەتتیب

ئەحمەد شوکریی

"تەواو"

٢/٢: **ئەحمەد شوکریی**: (گیانی "سەعدی")[٥١]

کاتێ نەوشیروان هاتە سەر مردن
هورمزی بانگ کرد بۆ وەسیەت کردن
وتی: ئەم ئامۆژگاریەم بگرە گوێ،
کاری نەکەی خەڵق لێت دلگران بێ
هەڵنەبژێری بۆخۆت ڕەحەتیی
کە مادام تۆ سەرداری میللەتی
کەوا بووی ئیتر فەقیر و هەژار
لە خاکتا هەرگیز ناگرن قەرار
ئینسان ئەوەیە ئەی ڕۆڵەی عاقڵ
کە ڕەعیەت لێی ڕازیی بێ بەدڵ
لە مسکێنانت هات و غافڵ بی
ئەبێ بەتەمای گەورەیی نەبی!

ئەمـــە بـــاش نییـــە لای پیـــاوی دانـــا
شـــوان خـــەوتبێ و گـــورگ لـــەناو ڕانـــا
ببـــەوە پاســـەوان فـــەقیر و هـــەژار
شـــا بەئەهلـــەوە ئـــەبێ بـــە تاجـــدار!
ئـــەهالیی ریشـــە و پاشـــا درەختـــە
داریـــش ئـــەی ڕۆڵـــە بەریشـــە ســـەختە
هـــەتا ئـــەتوانیی کـــەس نـــەڕەنجێنی
بیکـــەی بنچـــینەی خـــۆت لـــە بـــێخ دێـــنی
خراپـــەی کەســـت لاپەســـەند نـــەبێ
ئەگـــەر ئەتـــەوێ مســـکێن ڕەحـــەت بـــێ
لـــە زوڵمەوەیـــە خراپیـــی و بـــەدناویی
خـــۆت بـــەدناو ناکـــەی ئەگـــەر پیـــاوی
لەترســـی جـــەورت ئـــەهالیی هـــەڵات
ئـــیتر جـــارێتر نایەتـــەوە لات
ئـــەمجا وڵاتـــت نـــابینی ئـــاوا..
مەگـــەر ببیـــنی جـــار جـــار لەخـــەوا
ئـــاوات مـــەخوازە بـــەو ســـەردارانە
کـــە ڕەعیـــەتیان لـــێ دڵگرانـــە
مـــەکوژە مســـکێنان تـــۆ بـــەبێ تـــاوان
چـــونکی پەنایـــە بـــۆ وەخـــتی ســـوڵتان
تۆوچـــیی نـــان بگـــرە موراعاتیـــان
تـــا دڵ خۆشـــتر بـــێ ئیشـــکەرە ســـەپان!

لەڕاستیی کەسیَ کە چاکەت لیَ دی
پیاوەتیی نییە لەگەڵیا بەدیی
ڕۆڵە من ئەوا ئەڕۆم لەلاتان
ئەم ئامۆژگاریەم ڕاگرە بەگیان.

مورەتتیب

ئەحمەد شوکریی .

"تەواو"

**٣/١: ئەحمەد عەزیز ئاغا**، (چۆن بنووسین؟)[٥٢]

ئەم پرسیارە لە ژمارەییَکی (زبان) ا خاوەنی زبان بلاّوی کردبووەوە، لەبەرئەوەی خۆم بەبەشدار ئەزانم لە مەرامی ئەم پرسیارەدا بە پیَویستم زانیی کە وردە وردە هەر جارە لە کەلیَنیَکەوە لە نووسینی کوردیی بدووم.

(بەکارهیَنانی حەرف ڕیَ "ر"، بەپیَی فەننی فیَرکردن "ئەلف و بیَ" پیَویستە چەشنە پیتیَك —حروفیَك— بەکاربهیَنین کە هەتا ئەتوانریَ سادەبیَ، لەنووسینا ئاسان و بەزوویی بنووسریَ.

"ڕیَ " لە کوردییدا دوو چەشنە: ییَکیَکیان ڕیَی گەورە وەك لە کەلیمەی — کەڕ — کە مانای بیَ گویَیە، ئەویتریان "ڕیَی" پچووکە و وەك لە کەلیمەی — کەر— دا، کە مانای گویَدریَژە.

ئینجا بۆئەوەی ئەم دوو "ڕیَ" یە لەنووسیندا لەییَکتر جیا بکریَتەوە چەن ڕیَگەییَك کە دەتوانین بیگرین کە ئەوانیش:

١. دانانی ئیشارەت بۆ "ڕیَ" ی گەورە
٢. دانانی حەرفیَکی جیاواز بۆ "ڕیَ"ی گەورە.

٣. لەبریتیی "ڕێ" ی گەورە دووجار نووسینی "ری"ی بچووك.

بۆئەوەی شەرتەکانی فەننی فێرکردنی ئەلیف و بێ بپارێزین، ناتوانین ئیشارەت کە لە ئەووەڵ ڕێگەدا وترا بوو، قوبووڵ بکەین، هەروەها خاوەندەکانی (دەستووری زبانی کوردیی{٥٣}، سەڕف و نەحووی کوردیی{٥٤}، ئەلیفبای کوردیی{٥٥}). وتوویانە ئەبێت نوختەیێك لەژێر "ری"ی بچووك دابنرێت تاوەك بە "ڕێ"ی گەورە بخوێنرێتەوە، چونکە ئەزانن بۆئەوەی یێکێ لەم ئیشارەتە بێژراوانەی سەرەوە بنووسین، ئەبێ لە دێرێك نووسییندا ئەگەر ١٠ "ڕێ" ی گەورەی تێدابێ، ١٠ جار دەس هەلگرین. یەعنی ١٠ جار خەریکی شەددە دانان و ئیشارەت بین بۆئەوەی " ڕێ " ی گەورە بنووسین کە ئەمەیش کەلکێکی ئەوتۆی نییە، چونکە ئیشارەت دانان ئەبێتە هۆی وەخت لەکیس دانی نووسەر و زوو هیلاك بوونی. بێینەوە سەر ڕێگەی دووەم کە دانانی حەرفێکی جیاوازە بۆ"ڕێ"ی گەورە. دانانی حەرفێکی تایبەتیی مانای ئەوەیە کە حەرفێك زیاد ئەکەین لەسەر ژمارەی ئەلیف و بێ، ئەمەیش مانای ئەوەیە کە وەخت زیاتر پێ ویست ئەبێ بۆ فێربوونی ئەلیف و بێ، چونکە ئەلیف و بێ تا ژمارەی پیتەکانی کەمتر بێ ئەوەندە زووتر و ئاسانتر منالّ فێر ئەبێ. !.

دانەی ئەلیف و بێی کوردیی

"تەواو"

٢. چەند وێنەیێکی گوتار و شیعریێ بەشداران{٥٦}

٢/١: **م. ڕواندزیی**، (شیرین){٥٧}

شیرین، لەبەرئەوەی من هێشتا تامی ژیانی خۆشییم نەچەشتووە و تامی شیر لە دەمم دەرنەچووە، دانی حەوت ساڵەگییم نەکەوتووە، خوێنی پیاوەتیی لە لەشما گڕی نەخواردووە، دڵی ڕەنگینم ئازاری نەدیوە و ئێشی پێ نەگەییوە، فرمێسکی خوێنینی خەمۆشیی لەچاوما ئەدرەوشێتەوە و بە شەوق و شادیی چاوەنواڕی پاشەڕۆژ ئەکەم و

بەخووێیکی هاویشتنی هەنگاوی پێشکەوتن و خۆ بەدیارخستنم و بەیادی سەربەستیی ژیان، مێشکی پیٚ نەگەییوم خستووەتە کارەوە و دەستەکانم وەك باڵی فڕندە بڵاوکردووەتەوە و بەدەم تامی خۆشیی ژیانم هەڵگرتووە. تۆش دوور لە ئێستە کە جاران کچێکی گەنجی چواردە ساڵەگیی بوویت و ڕووی گەشت وەك مانگی چواردە شەوە ئەدرەوشایەوە، ڕۆییشتنەکەت و لەنجە و لارەکەت بە هەزاران لاوی دلێر و شێرانی خستووتە کەمین، بیٚ کەس و هەژاران بەچاوپیٚکەوتنی تۆ، دڵی زامداریان ئەحەسانەوە، فەقیر و لیٚ قەوماوان لەپەنای تۆدا بەخۆشیی دەژیان، کەس و کارەکانت هەموو بە وێنەی تۆ، بەسەربەرزیی ئەژیان و ناوی جەنگ ئاوەڕیسان لەسەر زەمینا ئەلەرییەوە و لەهەموو کۆمەڵێك و جیٚ و شوێنێکا ناوی تۆ ئەدرەوشایەوە... تۆش بەبەزم و لەنجە و لار، بەناز و فیز و تاجی شادیی لەسەر کردن لەنێو چەقی مەیدانا هات و چۆت دەکرد و بە زەردەخەنەی لێوی ئاڵت گیان لەبەرانت ژێر دەست و مل کەچ ئەکرد، شیرین منم کە بە هەزاران چاوی شادییم تیٚ پەڕاوە، چاوەڕوانی پیٚ گەییشتنم ئەکەن تاکوو کارم لیٚ بکەن، منیش بەیادی بینینی شیرین بەگورج و گۆڵیی، بەهێز و تین و دڵ خۆشیی، چاوەنواڕی پاشەڕۆژ ئەکەم و ڕوو بەرەو پیرکارکردن ئەڕۆم.

تۆش بەم شەنگ و شۆخیەی خۆت و ئاوازی دڵت بەرەو پیر هەژاریی و بیٚکەسیی ئەڕۆیشتیت لەجیاتیی خۆشیی، هەرچەندە خۆشەویستەکانت فریاد و هاواریان کرد کەڵکی نەبوو، لاوانی دوور وڵاتان چاوی تیژیان بڕیی بووە تۆ، داوای مارەکردنیان لە کەس و کارەکەت کرد، ئەوانیش دووریی تۆیان پیٚخۆش نەبوو، لەبەرئەوە نەویستنی باوکت بوو بە فەوتان و ژیانی و وێڵیی دەستی دوور وڵات و ناخۆشیت. تۆش بەرگی زەربینت پۆشیی و سەرت لەقوڕ گرت و کوڕی شیوەنت دامەزراند و هەنگاوی پاشکەوتنت هاویشت .."ماویە"[58]

### ٢/٢: **شێخ محەممەدی خاڵ** (تەمەددون و وەحشەتگەری)[٥٩]

لە وڵاتانی موتەمەددینەی خوا پێ داودا هەمیشە خەریکی دار و درەخت ناشتن و ئاواکردنەوەی زەوین بەهەر جۆرێ کە لە دەستیان بێ بستێك لە زەمینیان بە بەیاریی نەماوەتەوە، هیچ جێگاییکیان نییە بێگوڵ و گوڵزار و لالەزار بێ و هیچ چەمێکیان بێ چیمەن و ئاو نییە. لەبەر ئەمانە وڵاتیان هەمیشە سەوز و ڕەنگا و ڕەنگ و فێنك و دڵگیر و قەشەنگە، بەهەرلاییکا ئەڕوانیی سێبەرە، بەهەر کەنارێکا ئەڕۆی میوەهات و باغاتی پڕ بەر، جگە لەمە کە خۆیان لەهەموو شتێکی بەهرەمەند ئەبن، بە سەد هەزاران تەن میوەهاتی ڕەنگا و ڕەنگ لە قوتووە سندووقی لۆك کراوی دەست نەزەدەدا ئەینێرن بەهەموو لاییکا. لەجیاتیی ئەوانە بە ملیۆن دینار و لیرە وەرئەگرنەوە بۆ خۆیان، بە واریداتی ئاو و ئەرازییان پارە و پوولیان لە دەست عالەم بریی و هەموویان ڕاکێشا بۆ وڵاتی خۆیان!

کوردستانی ئێمەش کە کەوتووەتە مەنتیقەی موعتەدیلەوە و بەتەبیعەتی حاڵ شاخ و داخە نەرمان و دەشتە، کانیی و کارێزە، تاڤگە و سەرقەڵبەزە، کەچیی ئەمە چەن هەزار ساڵە نە دارێك و نە درەختێك، نە ڕەزێك، نە باخێك، نە چەمەنێك نە سێبەرێکیان بۆ فەراهەم نەهێناون کە لە شت بچێ! بەڵام لەسایەی دیانەتی ئیسلامییەوە (کە ئەمر ئەکا بە دار و درەخت ناژتن لەسەر قەبران) بەلای هەر قەبرێکا بڕۆی ئەبینی داری سەوزی باڵابەرز ئەلەرێتەوە و لقەکانی بەدەم شنەی نەسیمەوە ئەشنێتەوە. لەهەموویان جوانتر و بەڕەنگ و بۆتر و بەکەڵکتر ئەرخەوانەکانی گردی سەیوانە کە لە بەهارانا وەك تارای سوور ئەبریسکێنەوە، لە هاوینانا لەبەر سەوزیی خۆی وەك گیا ڕەشی بەهار ئەدرەوشێتەوە. هیچ ڕۆژێ نییە لە قرچەی نیوەڕۆدا دوان و سیان نەمرێ و قەڵەباڵغ لە سەد کەسەوە تا ٥٠٠ کەس لەگەڵیانا بچن بۆ سەرقەبران، بە ئیستراحەت ئەم عالەمە لەبن ئەو درەختانەدا و لەژێر ئەو سێبەرانەدا ئەحەسێنەوە. حەتا ئەمەندەم پێ جوان

بوون، هەموو بەهارێك ئێواران خۆم و چەن کەسێك بەتەشوێ و تەورداسەوە ئەچووین بۆ هەڵپاچینیان، وشکەڵ و گەندەڵێکی ئەگەر ببوایە لەبنا ئەمانبڕیی بۆ ئەمەی کە گەورە بن، بەڵام داخی بەجەرگم هەموو ساڵێ لە پووشپەڕا نەزان ئاگر لە پووشەکەی سەرقەبران بەرئەدەن و تەڕو وشك پێکەوە ئەسووتێنن. ئەو نەمامە جوانانە و ئەو ئەرخەوانە سەوزانە کە هەر پیرێژنێك بە چەن زەحمەت لەسەر قەبری ئازیزیان ناشتوویانە، هەموو ئەسووتێن و وشك ئەبن! مینجوملە لەم ئێوارانەدا، ئێوارەیێکیان لە بانگی مەغریبا لەسێ چوار لاوە ئاگریان تێ بەردا.

تا ئێستا چەن جار لە ڕۆژنامەکانا نووسراوە، دەستی پاڕانەوە و نزا ئەبرایە بەردەمی ئەم قەومە کە دەور و پشتی شار و شاخی گۆیژە بنێژن بەدرەخت! کەچیی بیلعەکس ئەچن ئەو درەختانەی کە پیرێژنان ناشتوویانە لە گردی سەیوان بۆ ئیستراحەتی موسڵمانان ئەیانسوتێنن. زۆر جێگایەتی بەو نەفامانە بڵێن: (مرا بخیر تو امید نیست، شر مرسان!).[٦٠] یەعنی گۆیژەشمان بۆ تەشجیر مەکەن و دار و درەختەکانی سەر قەبرانیشمان بۆ مەسووتێنن!

پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" فەرموویە، (من الله لا من رسوله لمن قالع السدر!). یەعنی لە خواوەیە نەك لە پێغەمبەریەوەیە ئەو کەسەی کە داری (مورد) ئەبڕێ مەلعوون و بێ بەهرەیە لە مەرحەمەت و میهرەبانی خوا، چونکی لە بڕینیا زیانێکی زۆر گەورە هەیە بۆ ئەوانەی کە لەبەرەکەی ئەخۆن، یا لەبەر سێبەرکەیا دائەنیشن، هەر بەو جۆرە هەموو درەختێکی باش! ئەمڕۆ لە مەمالیکی موتەمەددینەدا ماددەی قانوونی زۆر بەشیددەت هەیە و تەتبیق ئەکرێ لەسەر ئەو کەسانەی کە دار و درەختی سەوز ئەسووتێنن، یا ئەیبڕن و یا ئەیشکێنن و لەنەزەر ئەورووپایی و ئەمریکاییدا زیان بە دار و درەخت گەیاندن تۆزێ لە خوار زیان گەیاندنە بە حەیوانات و گیان لەبەر. هەروەك زیان گەیاندن بە گیان لەبەر تۆزێ لە خوار زیان گەیاندنەوەیە بە ئادەمیزاد.

کەوابو قاعیدەیێك کە موقەرشەرە لەنەزەر هەموو عولەما و فەیلەسووفێکا کە ئەفەرموون دەفعی زەرەر لەپێش واجیبە، لەسەر کاربەدەستانی سلێمانیی لەپێش ئەمەدا کە دار و درەختی تر بنێژن، موحافەزەی ئەو دار و درەختانە بکەن کە حاڵی حازر گەورەن و پیێ گەیشتوون. هیچ مەعقوول نییە هەر لە ئێستاکەوە خزمەتی نەمامێك بکەن تا ١٥ ساڵی تر ببێ بە دار، کەچیی دارێك کە حاڵی حازر گەورەیە و پیێ گەییشتووە، گوێی نەدەنێ، هەرکە خزمەتی ناکەن دەفعی زەرەر و زیانی ئەو ئینسانانەی لێ بکەن کە لە جانەوەر دڕندەترن!. / تەواو.

٢/٣: **جاف – هەژار** (بۆ لاوان – هەمڕازیی لەگەڵ ئەستێرەی بەیان!)[٦١]

**ئەی ئەستێرەکەی بەری بەیانیی**
**خاوەندی عیشوە و جیلوە و جوانیی**
**تۆ چیت کە سەحەر لە نەسیمی تۆ**
**ئەگەشێنەوە وەنەوشەو شەوبۆ؟**
**پێم بڵێ توخوا لە کامین نووری؟**
**لەلێوی سوبحا هێندە مەسرووری؟**
**سەر لە ئێوارە شوێنت لە کوێیە؟**
**عالەم بۆ شوعلەت گشت چاوەڕێیە**
**جوابم بدەرەوە شیرینی بەیان**
**نەشئەی زەمین و چرای تابمان**
**من سوێنت ئەدەم بە یەزدانی پاك**
**بەکزەی هەتیو بەبەختی ڕووناك**
**پێم بڵێ توخوا بۆچیی پەنهانی**
**کوا پرشە پرشی بەری بەیانیی**

جواب

بـــەزبانی حـــالێ بەســـووریی ڕەنگـــی
جـــوابی دامـــەوە زۆر بـــەبێ دەنگیـــی
بۆچـــیی نـــازانی حـــەزرەتی یـــەزدان
سوێنی خـوارد بـە مـن بـە ئایـەی (قـرآن)
وەخـتێ کـە هەڵـدێم سـەحەر لەسـەر کـەل
مـــنم سەرچـــاوگەی ئومێـــد و ئەمـــەل
تـــاریکیی شـــەوان، لـــە مـــن بێـــزارە
سۆزەی مـن شـوعلەی دەشـت و کۆسـارە
مـــن ســـەر هـــەم ئـــەنێم بەســـەر دلآنـــا
شـــەونم ئـــەتکێنم وە ڕووی گولآنـــا
بێـــدار کـــەرەوەی کاروانچـــییم لەخـــەو
من بیدارییەکەم بۆ سوێسکە و پۆڕ و کەو!
هۆشـــیار کـــەرەوەی شـــوان و ســـاپانم
خەفـــەت لابـــەری مـــیر و ســـولتانم
ســـروەی نەســـیمم کـــەدێ بـــەیانیان
دواکـــەوتوویی منـــە کۆمـــەڵی شـــاهان
هەڵئەســـن لەخـــەو پـــۆلی نـــازداران
لـــە مەســـتیی خـــەوی ســـەر لـــە ئێـــواران
تـــۆ خـــۆت عـــاقڵیی لـــە خـــوانی ژیـــان
دەپرســـیی حـــاڵی هەســـێرەی بـــەیان .

جاف — هەژار

" تەواو"

٢/٤: **بێ ئیمزا**!(خۆشنوودی قەوم موقابیل بە جەژنی مەولوودی جەلالـەتی مـەلیکی گەورە و خۆشەویستمان)... {٦٢}

بەموناسەبەتی موبارەکی مەولوودی جەلالـەتی مـەلیکی گەورەمانـەوە هـەر لـە ڕۆژی ٢٠ی مانگـەوە، لـە مـەقامی موتەسـەڕڕیفی قیمەتـدار و موبارەکمانـەوە، بـۆ عومـووم دەوائیری حوکوومەت تەبلیغات و ئیجرا کرا کە ڕۆژی ٢١ مارت کە عیبارەتـە لـە رشـۆژی مـەولوودی موبـارەك و عومـوومی دەوائـیری حوکوومـەت تەعتیلـە و دووبـارە مەنهـەجی زیارەتی مەقامی موتەسەڕڕیفی تەبلیغ عوموووم کرا!

بەڵێ لە ڕۆژی ٢١ ی مارت ئاسمانیش ئیشتیراکی سورروور و شادومانیی قەمی کـورد، یەعنی سەر لە بەیانیی خێر و بەرەکەتی بارانی بەسەر ئەرزدا ڕشت و ئەم بەرەکەتە یێك دوو سەعات دەوامی کرد کە عادەتا ڕەونەقێکی بەباغ و بەهار دابوو!

وە تەمام لە سەعات ٩ ی پێش نیـوەڕۆی زەوالییـدا سـەعادەتی موسـەڕڕیف بـەپێی مەنهەجی تایبەتیی تەشریفی فەرمووە، سەرا و حەرەسی شەرەفی شورتە لەبەر دەرگـای سەرادا تەحییەی مەخسووسەیان ئەدا کرد و لە سەعات ٩,٣٠ هەتا ١١,٣٠ پـێش نیـوەڕۆ بەپێی مەنهەج عومووومی ئومەراو زابتانی جەیش و سادات و عولەما و ئەشـراف و توجـار و موتەحییزانی مەملەکەت لەگەڵ ڕوئەسـای مەحتـەرەمی دەوائـیر بـۆ ئـەدای وەجیبـەی تەبریکات لە میعادی موعەییەنـەدا لـە مـەقامی مەتەسـەڕڕیفییەتدا زیـارەتی سـەعادەتی موتەسەڕڕیفیان ئەداکرد و سەعادەتی موتەسەڕڕیفی قیمەتدار لەگەڵ هەر تەبەقـەیێك بـە تەبەسسـومێکی مـەعهوودە و پـاك و بـێ غـەش خـۆی زائیریـنی قوبـوول ئەفـەرموو و گفتوگۆی شیرینی لەگەڵ ئەکردن و لـەپاش خیتـامی زیـارات ئینجا سـەعادەتی موشـار و ئیلێه لەگەڵ بەعزێ ڕوئەسـای دەوائـیر تەشـریفی فـەرموووە نـادیی عەسـکەریی و لـەوێ، ئامیر حامیە و زوبباتی جەیشی مـەحبووبی، موقابەلەتـەن زیـارەتی فـەرموو. لـە عـەینی

ڕۆژدا لە تەرەف بەلەدییەوە، بە موناسەبەتی ئەم ڕۆژە موبارەکەوە، زیافەتێکی چایی موتەنتەن لە نادی عەسکەرییەدا تەرتیب دراو لە سەعات "٥"ی پاش نیوەڕۆی زەوالیی، سەعادەتی موتەسەڕڕیف و عوموومی ئومەرا و زوبباتی جەیش و ڕوئەسای موحتەرەمی دەوائیر و سادات و عولەما و ئەشراف و موتەحەییزانی مەملەکەت کە جەمعەن عیبارەت ئەبوون لە "١٥٠"زات، لە میعادی موعەییەنەدا تەشریفیان فەرمووە نادیی عەسکەریی و ئەم زەواتانە لەم ڕۆژی جەژنی موبارەك و موقەددەسەدا هەموویان ئیزهاری پیرۆزیی و شادومانییان بۆ یێکتریی ئەدا و تەقدیم ئەکرد. هەموو لێوێك پڕ خەندە و هەموو چەهرەیێك پڕ نەشئە و سورروور بوو.

ئینجا هەموو بە جارێك بۆ سیحەت و ئیدامەی حەیاتی جەلالەتی مەلیکی مەحبووب تەمەننایان بۆ بارەگاهی یەزدان بەرز ئەکردەوە و هەموو لایێك بە ئیخلاسێکی بێ مانەند و مەربووتییەتێکی لانەهاییەوە تەمەننای سەعادەت و ڕەفاهی قەومی نەجیبی عێراقیان تیکرار ئەکردەوە. وە لە حازیروون سەیید حاجیی تۆفیق (پیرەمێرد) مودیری ڕۆژنامەی "ژین" بەم ڕوباعییە شیرین و جوانە عەرزی تەبریکاتی ئەم ڕۆژە موبارەکەی ئەدا و تەمەننای عەرزی تەبریکاتی ئەم ڕۆژە موبارەکەی ئەدا و تەمەننای سیحەت و دەوامی حەیاتی مەلیکی مەحبووب و ڕەفاه و سەعادەتی قەومی عێراقی لەژێر سێبەری جەلالەتمەئابدا تیکرار کرد:

یاخوا سەروەرمان شای غازیی بێ

بەشمان بەغازیی سەرفرازیی بێ

ئەو نەسڵی پاك و ئێمە قەومی چاك

پێکەوە بژین لە عالەم بێ باك! {٦٣}

دووبارە سەیید زەکیی ئەمین مودیری مەدرەسەی موتەوەسسیتە بە خوتبەیێکی ئیرتیجالیی و بەلیغ دوعای دەوامی سیحەت و عافیەتی جەلالەتی مەحبووب و

سەعادەتی قەومی عێراقی کرئەدا کرد و لە ئەسنای دانیشتندا سەعادەتی موتەسەڕڕیفی پاك و موقەددەسمان لە هەموو زائیرینی زیارەتی فەرموو، لەگەڵ هەموو دەستە و تەبەقەیێك بە ئەڵتاف مەعهوودەی خۆی، جەماعەتی نەوازش فەرموو! بەم نەوعە، ئیخلاسی مەربووتییەتی ئەم قەومە بەرابەر جەلالەتی ملیکی مەحبووب و عەرشی موفەددا، عادەتا لە ناوچاوانی کوللی فەردێکی ئەم قەومە موخلیسەدا زاهیر و نومایان بوو و لە سەعات ٦ دا هەموو لایێك بەتەواویی کەیف و سورروور و دوعای دەوامی سیححەت و عافیەتی جەلالەتی مەلیکی خۆشەویست و نەمەننای مووەفەقییەتی سەعادەتی موتەسەڕڕیفی قیمەتدار لە یێکتریی ویداعیان کرد و بیلئاخیرە ئەو جگەرە و چوقولاتە و پرتەقاڵە و کێك و سائیرەیە کە مابووەوە، بە موناسەبەتی ئەم ڕۆژە موبارەکەوە نێررا بۆ حەپسەکانی حەپسخانە کە ئەوانیش لە قودسییەت و موبارەکیی ئەم ڕۆژە جەژنە پڕ سورروور و حیسسەمەند و بەهرەوەر بوون!

ئیتر هەر بژی جەلالەتی مەلیکی مەحبووب و موعەززەم و هەر بژی قەومی نەجیبی عێراق و هەر بژی سەعادەتی موتەسەڕڕیفی موبارەك و ساحێبی حوسنی نییەتمان!

(بێ ئیمزا)

"تەواو"

٢/٥: **بێ ئیمزا!** (تەربییەی منال!) {٦٤}

زۆر دەمێکە ئەمانەوێ فەسلێ دروست بکەین لە ڕۆژنامەدا، بیخەینە پێش چاوی خەڵقیی بۆ پێ گەیاندن و تەربییەی منال کە لەو ڕۆژەوە لە دایك ئەبێ تاکوو ئەو وەختەی کە خزمەتی باری گەل و نیشتیمانی ئەچێتە سەرشان و بەڕێك و پێکیی بینووسین و بیخەینە بەرچاوی هۆز و تیرە، تاکوو دەرسی لێ وەربگرن و ڕۆڵەی خۆشەویستی ولات بەو جۆرەی کە لە ولاتانی پێ گەییشتووایە پێ بگەیەنن و دەرسی دابدەن کە لە پاشە ڕۆژدا بۆخۆی و دایك و باوك و نیشتیمان و هاونیشتیمانی بەکار بێت، نەك ببێتە بارێکی گران و برینێکی تیراوێ بۆ هاوکۆمەڵی خۆی.

بۆ ئەم غایەیە کە بتوانین بە وێنەیێکی فەننی بەیان و درێژەی پێ بدەین، زۆر دەمێکە بۆ ئەم تەربییەیە داوامان لەیێکێ لە دوختۆرەکانی ناو خۆمانمان کردووە، بەڵام داخی بەجەرگم لەبەر زۆریی (نەخۆشمان)[٦٥] هێشتا نەیپەرژاوە کە وێنەیێکی زۆر جوان بۆمان (بنووسێ!)[٦٦]

دیسانەوە هیوامان وایە کە هەروەختێ پەرژا، فەسڵێکی بەقیمەت و جوانمان لە تەربییە و ئامۆژگاریی منالێ بۆ ڕۆژنامەکەمان بڕازێێتەوە تاکوو ئێمەش بیخەینە پێش چاوی خۆ وڵاتیی و ئەوانیش جگەر گۆشەیان وا تەربییەت بدەن! ئینجا ئومێد ئەکەین ئەو نووسراوە بۆ ڕۆڵەی نیشتیمان قازانجێکی زۆری ببێ و هەتاکوو بتوانین ئێمەش لە بابەت تەربییە و پەندی ئەخلاقییەوە، یەعنی ئامۆژگاریی خوو و ڕەوشتی چاکەوە کۆتاهیی ناکەین و هەموو جارێ بە ڕۆژنامە ئەیخەینە بەر چاوی هاووڵاتیە خۆشەویستەکانی نیشتیمان و ڕجاشی لەگەڵا ئەکەین کە ئەوانیش پەیڕەوی بکەن و کەڵکی لێ وەربگرن. اە جوملەی تەربییەی منالانی ئینگلیز، چیرۆکێك کە لە زمانی یێکێك لە پیاوە گەورەکانی وڵاتی خۆمانە بیستوومانە کە ئەویش بەچاوی خۆی دیویەتیی و بەگوێی خۆی بیستوویەتی، بە پێویستمان زانی کە لێرەدا لە ڕۆژنامەی (زبان) دا بیخەینە پێش چاوی خۆوڵاتیەکان و خۆشەویستانمان بەڵکو پەیڕەوی بکەن...

ئەم پیاوە گەورەیە گێڕایەوە کە موددەتێك لەمەوپێش بە وەزیفەیێکی گەورە لە ێیکێك لە لیواکانی جونووب بووە و لەو لیوایەدا موفەتتیشێکی ئیداریی ئینگلیز لەوێ مەوجوود بووە، ئەمیش بە میوانی چووەتە لایان و کابرای ئینگلیز لەوێ منالێکی دوو سێ سالانی هەبووە، لەکاتی دانیشتنی هەموو لایێکدا وا ڕێك ئەکەوێ، منالەکە لەو وەختەدا تینووی ئەبێت و لە خزمەتکارەکەیان داوای ئاوی کردووە و خزمەتکارەکەش چووە ئاوی بۆ هێناوە و منالەکە ئاوەکەی لە دەست خزمەتکارەکەیان وەرگرتووە کە بیخواتەوە. لەپاش خواردنەوەیا باوك و دایکی منالەکە بە منالەکە ئەڵێن پێویستە تۆ بە

خزمەتکارەکە بلێیت (سەنکیو) یەعنی تەشەککورت ئەکەم! منالەکە ئەمەی نەوتووە! ئینجا لەسەر ئەمە باوك و دایك ئەمریان کردووە کە خزمەتکارەکە ئاوەکەی لێ وەربگرێتەوە، کابراش بە گورجیی پەرداخەکە لە دەست کوڕە ئەسێنێ و باوك ئەڵێ: هەتا نەڵێیت تەشەککورت ئەکەم نابێ بییەڵم تۆ ئەو ئاوە بخۆیتەوە! منالەکە ئینکار ئەبێت و لەسەر ئینکاریی خۆی دەوامی کردووە و نەی وتووە (سەنکیو) تەشەککورت ئەکەم. زاتەن باوکیشی ئینگلیزە و لەسەر عینادیی خۆی ڕۆییشتووە و نەیهێشتوە ئاوەکەی بدرێتێ و بیخواتەوە.. بەڵام لە نەتیجەی ئەم ئینکاریی و عینادیەدا، دایکی کوڕە ئەکەوێتە بەینەوە و منالی ئیقناع ئەکا تەشەککوری خزمەتچییەکەی پێ ئەکات، ئینجا ئاوی ئەدرێتێ و ئەیخواتەوە!

تەماشا ئەکەن، تێرەی پێ گەییوان، منالیان وا تەربییە ئەدەن، پێی ئەگەیەنن، پەروەردەی ئەکەن!! ئینجا ئەگەر ئەوە ئەولادی ئێمە بووایە توخوا چۆن ئەبوو؟ واللە اعلەم. .

(بێ ئیمزا)

"تەواو"

## پەراوێز – تەماشاکراو

{١}. هیـوا – ژ ٧ "بزووتنـەوەی کـورد –بەڵگەنامـە– وەرگێـڕان لـە ئینگلیزییـەوە، نەزەندبەگی خانیی، پاییز ١٩٩٠، ئینستیوتی کورد – پاریس، ل ١٧١ – ١٨٤

{٢}. عەبدوجـەببار محەممـەد جـەباریی – مێـژووی ڕۆژنامەگـەریی کـوردیی، چـاپخانەی شارەوانیی کەرکووك و ژینی سلێمانیی – س ١٩٧٠. ل ٩٤.

{٣}. جەمال خەزنەدار – ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردیی، چاپخانەی جـەمهووریی، بەغـداد ١٩٧٣

{٤}. در. کەمال مەزهەر ئەحمەد – تێ کەییشتنی ڕاستیی و شوێنی لـە ڕۆژنامـە نووسـیی کوردییدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغداد ١٩٧٨، ل ٢٢٢

{٥}. زاهیـدە ئیـبراهیم – دەلیـل الجەرائیـد وەلمەجـەللات ئەلعیراقییـە / دلیـل الجرائـد والمجـلات العراقیـة " ١٩٦٩ – ١٩٧٨ " چ ٢، دارولنەشـر وەلمـەتبووعات ئەلکوێتییـە، کوێـت، ل١٢٢

{٦}. ژیان – ژ٩

{٧}. بنۆڕە ئێرە و قسە و باسەکانی لەمەڕ گۆڤاری (زانستیی)

{٨}. گوتن و دیمانەی دووقۆلیی لە٢٥/٩/ ١٩٩٣ لە هەولێردا.

{٩}. واتە، من چیی چاکە بێ ئەدەم پێ گوتی و ئەتۆش هێندێ جار پەندی لێ وەربگرە و هێندێ جاریش گوێی مەدەرێ.

{١٠}. در. کـەمال مەزهـەر ئەحمـەد – مێـژوو، مـەتابیع دارولئافـاق ئەلعەرەبییـە، بەغـداد ١٩٨٢، ل ١٥٠

{١١}. هەمان سەرچاوە، ل ١٥٠

{١٢}. لە ڕۆژنامەکانی ساڵانی١٩٢٠–١٩٣٥ی سلێمانییدا. هەر بە ئەو نێوەوە دیتوومانە!

{١٣}. پێشکەوتن – سلێمانیی، س ١، ژ٣٧، پێنجشەممە ٦ ی جەنیوەری ١٩٢١.

{١٤} . واتە لەگەڵ چۆڵ کردنی سلێمانیی لەلایێن ئینگلیزەکانەوە کە پتر لە دوو هەزار کەسی دۆست و لایەنگیر و بێ کارەیان لەگەڵ ڕۆیشت!

{١٥} . بۆ وێنە بنۆڕە نێوی لە لیستی یارمەتیی دانی مەکتەبی سلێمانییدا، ژیانەوە —س١، ژ ٩، جومعە ٢٤ / ١١ / ١٩٢٤.

{١٦} . نەوەی خۆی.

{١٧} . نەوەی خۆی.

{١٨} . ژیانەوە — س ١، ژ١٦، ١٩٢٥/٢/١٩.

{١٩} . ژیان — س ٢، ژ ٣٨، ١٩٢٦/١٠/٢١.

{٢٠} . نەوەی خۆی! (کۆچ کردوو ئەنوەر لە ١٩٨٤ دا — دوای نامە ناردنم — بە نامەیێ وەڵامی داومەتەوە و وێنەی بابی بۆ ناردووم!). من یێکەم کەسم ژیننامەی بنووسمەوە و بیخەمە ڕوو!

{٢١} . خۆی بۆ منی گێڕاوەتەوە، بەڵام لە دەفتەری نوفووسەکەیدا مێژووی ١٩/١١/ ١٩١٠ نووسراوە و خۆی ئەمە پەسەند ناکات.

{٢٢} . لە دیمانەیێکی خۆم و خۆی، ١٩٨٨/٢/٢١دا. جێگەی گوتنە — وەك خۆی پێی گوتم — ساڵی ١٩٤١ خوێندنی قوتابخانەی نێوەندیی بە شێوەیێکی لاوەکیانە بڕیوە و شەهادەتنامەی وەرگرتووە.

{٢٣} . خۆی چەند جارێ بۆ منی گێڕاوەتەوە گۆیا ساڵی ١٩٣١ چووە بۆ بەغداد و لەگەڵ محەممەد ئەمنی ئاوەڵزاوای و باوکی ئەم نووسەرە (کەمال ڕەئووف مەلا محەممەدی مۆرهەڵکەند) کەئەوانی دی زوو ورەیان بەرداوە و هەر خۆی لە بەغداددا ماوەتەوە.

{٢٤} . وەك: خورشیدی خاوەر —س ١٩٣٣

{٢٥} . ئەم ژیننامەیەم بەتایبەتیی بۆ ئێرە نووسیوەتەوە.

{٢٦} . ئەم ناسنێوەم لە کۆچ کردوو مێژوونووس ئەحمەد خواجە نەوەی خۆی و ڕۆژنامەکانی (پێشکەوتن —سلێمانیی: س ١، ژ ٤٥ ی ١٩٢١/٣/٣) و (بانگی کوردستان — س١، ژ٥ی ١٩٢٢/٩/٤) و (ڕۆژی کوردستان— س١، ژ ١٣ ی١٩٢٢/١١/٣) و (ژیان—س٢،ژ ٧٧).. بەڵام

لە ڕۆژنامەکانی (ژیانەوە، ژیان) و (ڕادیۆیی کوردیی بەغداد) دا پـتر بـە ئەحمـەدی عـەزیز ئاغا دەرکـەوتووە! جێگـەی گوتنـە نووسـەر جـەمال محەممـەد ئـەمین لـە بڵاوکردنـەوەی (دیـوانی حەمـدیی/ ئەحمـەد بـەگی سـاحێبقڕان) دا (ئەحمـەد حەمـدیی) و وت و وێرەکـەی (بـانگ کوردستان)ی بە ئەحمەد بەگی ساحێبقڕان زانیوە.. من لە (ئاسۆ – س ۱۹۹۰) دا ئەم هەڵەیـەم بۆ ئەو و خوێندەواران ڕوون کردووەتەوە!

{۲۷}. بۆ ساڵی لە دایك بوونی سروەی کیژی بۆمی ڕوون کردەوە. بۆ خوێندنی و نەچوونە پێشەوەیی و تێکەڵیی لە جەنگدا، کۆچ کردوو ئەحمەد خواجە ئاگاداری کردم.

{۲۸}. پێشکەوتن – سلێمانیی: ژ – ٤٥

{۲۹}. بەرۆشنایی وێنەیێکی فۆتۆگراف قوتابیانی نموونەی سەعادەت – ۱۹۲۰

{۳۰}. رۆژی کوردستان – ژ ۱۳.

{۳۱}. بـە ئـەو ڕۆشـناییەی نێـو و نووسـینی لـە ڕۆژنامـە و لـە ڕیـزی فەرمانبـەران و لـە کۆڕەکاندا دەرنەکەوتووەتەوە!

{۳۲}. دۆستم چالاك حەسیب لە دانیشتنێکی دوو قۆڵییدا ئەم باسەی بۆ کردم (س۱۹۹۱/ سلێمانیی).

{۳۳}. ژیان – س ۱، ژ ٥، ۱۹۲٦/۲/۱۸.

{۳٤}. زبان – ژ ۹.

{۳٥}. گۆڤاری: هونا بەغداد/هنا بغداد = ژ ٥۹، حوزەیران ۱۹٤۹ " ئەلمەنهەج ئـەلکوردی/ المنهج الکردی).

{۳٦}. در. ماجید کوڕی و سامیەی کیژی لە بەغدادا و سروەی کیژی –کۆچکردووی– لـە سلێمانییدا!

{۳۷}. ئەحمەد خواجە – چیم دی، ج ۳، ل۳۰.

{۳۸}. در. ماجید لە ساڵی ۱۹۸۸ دا بۆی باس کردم!

{۳۹}. الفبای کوردی – چاپخانەی فورات، بەغداد ۱۹۲۹ " ٤۱ لاپەڕە! ".

{٤٠}. ژیان – س ٥، ژ ٢٤١، پێنجشەممە ١٩٣٠/٥/٢٩ (لەسەمای مەعاریفا ئەستێرەیێکی گەش!).

* من یێکەم کەسم کە ژیننامەی بنووسمەوە و بیخەمەڕوو!

{٤١}. ژین – س ٢٠، زژ ٨١٩، شەممە ٨ / ٢ / ١٩٤٦.

{٤٢}. ئەم باسە بە ئەم جۆرە ڕوون دەکەمەوە و دەڵێم: قەفتان لە گوتاری (لە وڵاتە پێشکەوتووەکانا حیزبایەتی/زانستیی –س١، ژ ١، ١٩٣٨/٢/٢٥) دا گوتوویەتی: " ئەوانەی مەراقی باسی کۆمەڵایەتییان هەیە، نووسراوەکانی پێشووی ڕۆژنامەی زبان یان خوندووەتەوە کەوا تەئریخچەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی ئینسانمان تیا نووسیی بوو! ".. ئا ئەم گوتنەی لە ئەو مێژووەدا، تەواو نزیکمان دەخاتەوە لە سنووری دەست بەردانی لە (زبان) گەر بێت و بەراووردیٚ بکەین و بڵێین: ئەگەر (ژ –١٩ لە١٩٣٨/١/٣٠دا دەرچوویٚ) دیارە (ژ–٢٠ لە یێکشەممەی ٢/٦) و (ژ – ٢١ لەیێکشەممەی ٢/١٣) و (ژ – ٢٢ لە یێکشەممەی ١٩٣٨/٢/٢٠ دا دەرچووە کە گوتنەکەی لەمەڕ تەئریخەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی دەگێڕێتەوە!) و دوای ٢/٢٠ لە٢/٢٥ دا گۆڤاری زانستیی دەرچووە! بە ئەم ڕۆشناییە ئەوپەڕییەکەی لەدوای (ژ–٢٣ی ١٩٣٨/٢/٢٧) ەوە ئەو پێوەندییەی تەواو بووە!.

{٤٣}. عەبدولڕەززاق ئەلحەسەنی – تەئریخ ئەلوەزارات ئەلعیراقییە/تأريخ الوزارات العراقية، ج ٤، ئەلئەبجەدییە لیلتیباعە وەلنەشر / الأبجدية للطباعة والنشر، بەیروت ١٩٨٣، ل ٣١٧ و دواتر (بۆ باسەکانی بەکر سیدقی!).

{٤٤}. در. عەبدولستار تایەر شەریف – ئەلجەمعییات وەلمونەززەمات وەلئەحزاب ئەلکوردیە فیی نیسف قەڕن / الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن – دار ئەلحوڕڕیە لیلتیباعە وەلنەشر – بەغداد ١٩٨٩، ل ٩٢

{٤٥}. هەمان سەرچاوە – ل ٩٣

{٤٦}. در. کەمال مەزهەر ئەحمەد – مێژوو، ل ١٥١.

{٤٧}. ڕینووسیان دەستکاریی کرا بۆ شێوەی باوی ئەمڕۆ.

{٤٨}. زبان – ژ ١٣.

{٤٩}. زبان – ژ ٢.

{٥٠}. زبا – ژ ٦٦.

{٥١}. زبان – ژ ١٩.

{٥٢}. زبان – ژ ٩.

{٥٣}. مەبەست: تۆفیق وەهبی – دەستووری زمانی کوردیی، دارولتیباعە ئەلحەدیسە، بەغداد ١٩٢٨.

{٥٤}. مەبەست: سەعید سدقی " کابان " – موختەسەر سەرف و نەحووی کوردیی " مختصر صرف ونحوی کوردي "، چاپخانەی نەجاح، بەغداد ١٩٢٨.

{٥٥}. مەبەست ئەلیفباکەی خۆییێتی!

{٥٦}. ڕێنووسیان دەستکاریی کرا بۆ شێوەی باوی ئەمڕۆ.

{٥٧}. زبان – ژ ٣، ژ ٤. (پێم وەیە ئەو ئیمزا خواستراوە، ئیمزای مامۆستا مەحموود ئەحمەدی مامۆستاو ئەدیبو چیرۆکنووسە!

{٥٨}. تەواوی ئەم پەخشانەم لا ڕوون نییە لە چ ژمارەیێکی دیدا بڵاوکراوەتەوە!

{٥٩}. زبان – ژ ٣٨.

{٦٠}. زبان – ژ ٣.

{٦١}. زبان – ژ ٦٩، شەممە ٢٥ / ٣ / ١٩٣٩.

{٦٢}. لە ئەم کۆمەڵە ژمارەیەی ڕۆژنامەی (زبان) دا، هەربەتەنیَ ئەم چوارینەی پیرەمێردم بەرچاو کەوتووە. ڕەنگبیَ هەرگیز شتێکی بۆ نەنووسیبیَ!

{٦٣}. زبان – ژ ٩٤.

{٦٤}. خۆی وشەکەی بە (هەرمال) نووسیوە کە هەڵەی چاپە.

{٦٥}. خۆی وشەکەی نەنووسیوە!

# ١٣

## یێکەم گۆڤاری سلێمانیی [١]

### پێشەکیی

ئەگەر مێژووی ڕۆژنامەنووسیی، (بانگی کورد/ بانگ کرد: بەغداد – س ١٩١٣) و (دیاریی کوردستان: بەغداد –س١٩٢٥) و (زار کرمانجیی: ڕواندز –س١٩٢٦) و (پەیژە: بەغداد – س ١٩٢٧) و (ڕووناکیی: هەولێر–س١٩٣٥) ی بە یێکەم چەپکە گۆڤاری کوردیی کوردستانی باشوورو عێراق ئاشنا کردبێ [٢]، دیارە لە ڕاییڵەی ئەو سالانەدا "گۆڤارێکی سلێمانیی ! !" نادیترێ کە لای خۆی بووە، ئەم بازێڕە مەڵبەندێکی گەورەی خوێندەواریی و ڕۆژنامەنووسیی بووە و لە نێوان سالانی١٩٢٠–١٩٣٥دا "حەوت" ڕۆژنامەیشی بەخۆوە دیتووە ! . [٣]

ئایا لە ئەو ماوەیەدا هەرگیز نیازی گۆڤار دەرکردنی تێدا نەبووە؟ هەروەها داخۆ کەی یێکەم گۆڤاریشی بەخۆوە دیتوە؟ درەنگیێ، واتە سالی ١٩٥٢ دا بۆ یێکەم جار مامۆستا عەلائەددین سەججادیی یێکەم هەوالی ڕاگەیاندووە کە دەلێت: (زانستیی، گۆڤارێکی نیو مانگیی ئەدەبیی و یێکەم ژمارەی لە ٥ ی شوباتی ١٩٣٨ لە سلێمانییدا لەلایێن خاوەنەکەیەوە سالح قەفتان دەرچوو، لام وایە هەر یێك ژمارەی لێ دەرچوو! !) [٤]

دووای ئەو، هەر سەرچاوەیێکی دی هاتبێتە پێشەوە، هەر هەمان هەوالی وشکی گێڕاوەتەوە [٥]... بەلام بۆ یێکەم جار و لە سالی ١٩٨٢ دا، در. عیززەددین مستەفا ڕەسوولێ – لەگەلێ گوتارێ – وێنەی (یێکەم لاپەڕەی گۆڤاری: زانستیی) ی بلاوکردووەتەوە دەلێت، (لە کتێبخانەی دەزگەی خۆرهەلاتو ئەفریکاناسیی سەر بە زانستەگەی لەندەن دیومە و هەر لەوێ وێنەم گرت!) هەروەها دەلێت، (دیارە هەر ئەو

ژمارەیـە بـووە و ئـەو ئەسـتێرەیە کوژاوەتـەوە، دیـارە هـەر ئـەو ژمارەیـە نـەماوە و نەبینراوە !)[٦].

کەواتە، وێ دەچێ ئەو گۆڤارە— بێ لـە ئـەو وێنەلاپەڕەیـە — وەکـو لـە نیشـتیماندا دەسـت ناکـەوێ، شـێوەی گشـتیی بابەتـەکانی هـەموو لاپـەڕەکانی بەتـەواوەتیی لـە ڕۆژنامەنووسیی کوردیی، لە خوێندەوارانیش ونن کە ئەمـە کەلێنـە و گـرتنی پێویسـتە ! ڕاسـتییەکەی مـن لـە سـاڵی ١٩٧٥ بـەدوواوە، بـەهۆی چـەند هـەواڵێکی گرنگـی ڕۆژنامەنووسیی کۆنەوە،[٧] تەواو خولیای بـووم و هەواڵە بەنرخەکـەی سـاڵی ١٩٨٢ ش پـتر سـەرگەرمی کـردم، تـا پـتر کتێبخانـەکانی دەوڵـەت و کەسـانی بـۆ گـەڕام[٨] و سەرئەنجام لە سـەرەتای ١٩٨٤ دا (وێنـەیێکی فۆتۆکـۆپیی کـراو) ی گشـت لاپـەڕەکانی گۆڤارەکەم لە کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانییدا دەستگیر بوو. لـە ئەمـەش خۆشـتر، پـاش یێکدگیربوون لەگەڵ نەوەی خاوەند گۆڤار لە سـلێمانییدا، (دانـەیێکی ڕاسـتەقینە) م بـە بەرگ و نووسینی گۆڤارەکە خۆیەوە دەست کەوت و بەیێکجاریی دڵنیا بووم.

هەڵبەتـە لـە ئـەم هەلەشـدا، ئـەرکی ئاشـنا کردنـەوە و لـێ کۆڵینـەوەی گۆڤارەکـە و ڕۆژگاریشـی، هـەروەها ڕێزگـرتن و ناسـینی تـەواوەتیی خاوەنەکەیشـیمان دێتـە ڕێگـە.. ساخوا بکات بەچاکیی و بە پاکیی ئەم ئەرکەم بەجێ هێنا بێ!

---

## بەشی یێکەم

(یێکەم گۆڤاری سلێمانیی، لە بەرگێکی تەنکی قاقەز پەمبەیی "٢٠X٢٢سم"دا بەتیپی – بۆنت – گەورە و ١٦ دا، ئەوها خۆی نواندووە: مەجەللەی زانستیی نرخی " ٤ " فلسە)

### ١. شوناسنامەی گۆڤارەکە

* زانستی مەجەللەیێکی عیلمیی، ئەدەبیی، فەننیی، تەئریخیی، ئیقتیسادیی، مانگی دووجار دەردەچیٚ.

ئەم مەجەللەیە ئەساسەن ١٦ لاپەڕەی بەرگدارە. ئەم جارە بەپەلەپەل ٨ لاپەڕەی دەرچوو.

ژمارە: ١ پێنجشەممە ٢٥ شوبات ١٩٣٨، ٢٦ زیلحیججە ١٣٥٦

* خاوەند و مودیر مەسئوول: ساڵح قەفتان

* پەیام: سلێمانیی، چاپخانەی " ژیان "

* ئابوونەی ساڵیانە: ٢٥٠ فلس

* ئیعلانات: لە دێرێکەوە تا شەش، ٢٥٠ لەو زیاتر٥٠٠ فلسە. ستوونی تەواو تابیع موقەوەلەیە.

### ٢. پێداچوونەوەی شێوەی

- جۆری قاقەز: بۆر.
- بارست و لاپەڕەی: ٣٠ X٢٢,٥سم/٨ لاپەڕە.
- ژمارەی ستوونی لاپەڕیٚ: ٣
- ژمارەی دێڕ لەستوونێکدا:ستوونێکی تەواو٢٥,٥X٤سم بەتیپی "١٤":٢٨ دێڕە.
- جۆری چاپ: دەست چن.
- جۆری تیپ: ١٤، ١٦، بۆنت.

- جۆری کلێشەی نێونیشان: مۆرێکی ڕەشی هەڵکەندراو (بێ ئاشکرابوونی نێوی مۆر هەڵکەند).
- جۆری نووسینی نێونیشانەکان: بۆنتی ڕەش (نەك خۆشنووسیی).
- ئاگاداریی: نییە ! (بێ لە ئاگاداری خۆی).
- وێنە، نەخش: نییە !
- ماکێتی لاپەڕەکان: لاپەڕەی یێکەم: وەکو ٣ ستوونە، ژووروەکەی دابەشە بەسەر ٣ خانەدا.. خانەی ڕاست، ستوونی یێکەم: "٨ X ٨,٥ سم " بۆ نێوی خاوەند و نێونیشان و دەرچوونی.. خانەی نێوەند – ستوونی دووەم: "٨X٧ سم"بۆ مۆری نێوی گۆڤارەکەو نرخی ژمارەیێك و نێوی گۆڤارەکە بە تیپی لاتینیی... خانەی چەپ – ستوونی سێیەم "٨X٧ سم " بۆ هەواڵی ئابوونە و نرخی چاپ کردنی ئاگاداریی، (لەژێر سێ خانەکەدا بە بارستی "٣٠X٢ سم" و لە دوو دێڕدا نێوی ژمارە و ڕۆژ و نێوی مانگ و ژمارەی ساڵ و دروشمی گۆڤارەکە و لەمەڕ قەوارەی ڕاستەقینەی و هۆی بڵاوکردنەوەی–ئەم جارەی–بەهەشت لاپەڕە) پاشماوەی لاپەڕەکەش – لەسێ ستووندا – تەرخان کراوە بۆ سەرگوتار.

لاپەڕەکانی دی، لە ژووروی سێ ستوونەکەدا، لەڕاستەوە بۆ چەپ، ژمارەی لاپەڕە، نێوی مەجەللەی زانستیی، ژمارە –١– ی گۆڤارەکە نووسراون. لاپەڕەکانیش لە ئەو سێ ستوونەدا بۆ گوتارەکان دانراوە.

### ٣. زمان و ڕێنووسی

زمان: کوردییەکەی تەواو پەتیی نییە، بەڵام لەچاو زمانی گۆڤار و ڕۆژنامە یێکەمەکاندا–بێ لە شێوازی تایبەتیی ڕۆژنامەی پێشکەوتن: س١٩٢٠– پتر بەلای کوردیی پەتییدا کشاوە. ڕاستە وەکو زمانی ڕۆشنبیریی ئەو ڕۆژگارانە وشەی زۆری زمانی عەرەبیی (قران) ی پیرۆزی تێدا هەیە بەڵام بەدەگمەن وشەیێکی تورکیی و

بەتەنیَ هەر چەند وشەییێکی فارسیی — بێگانە — ی تێدا هەیە، وەکو وشەکانی (خود، سایەبان، نگابان، بزرگ..).

لەلاییێکی دیەوە لەبەکابردنی وشەی عەرەبییدا دوو شێوازی بۆ نووسین گرتووە و کەرەتیَ وەکو رێنووسی عەرەبیی خۆی، بەوێنەی (مجله، علمی، اقتصادی، مطبوعات، قسط، اشراف، طمع، معلوم، حرمتاً، في الحقيقة). کەرەتیَ دەستکاریی کردووە و بەلای کوردییدا دایتاشیوە. بەوێنە: (إزنی، حازر، تاقم، رازیی، نوسخە، خاتر، وزەرا، ایمبەراتورەکان.. هتد)، بەلاّم بەپێچەوانەی نووسینەکانی ڕۆژنامەی (زبان)ەوە کە سەردەمیَ قەفتان خۆی نووسەری بووە و زۆرجار (أ) ی بەشێوەی (ئە) نووسیوە، ئەوا لە ئەم گۆڤارەدا هەتا سەر ئەم ئەتوارەی نەنوواندووە. تێکڕاش تیپە عەرەبییەکانی (أ. إ. ذ. ث. ط. ص. ض) ی وەك خۆیان بەکاربردووە. لەرووی دەنگە کوردییەکانەوە، وەك دەنگی (یَ، وو) هیچیان دیاریی نەکراون و بەشێوەی (ی. و. و) نووسراون بۆ (یی) درێژیش، هێندیَ جار بە دوو (ی=یی) نیشان دراون. بەلاّم بۆ (و) ی سەرەتای وشە هێندیَ جار بەشێوەی دوو (و = وو) دەرکەوتووە وە لە وشەی (ووتە) و (ووت) دا!

وێنە دەنگی (ڕ) هەتا سەر لە سەرەتا و نێو وشەدا بەشێوەی دوو (رر) دەرکەوتووە وەك لە (رروزنامە. کررین) دا، بەلاّم هێندیَ جاریش ئەو دەستوورەش فەرامۆش کراوە و بە یێك (ر) دەرکەوتووە.

وێنە دەنگی (ڵ) هەتا سەر بە سیَ خاڵەوە (.·.) دەرکەوتووە وەك لە وشەی (پلاو، لەگەلا، بەلام هەلساوە) دا. هێندیَ جاریش ئەوەش فەرامۆش کراوە. بۆ وێنە دەنگی (د) هێندیَ جار لە وشەدا مامەڵەی (د) ی کلۆری ئاخاوتنی شێوەی سلێمانیی لەگەڵ کراوە وەك لە وشەکانی (لەگەلاّ. پەیا، لە دووایيا. یەت)، بەلاّم هێندیَ جار وەك پاشکۆی (دا) بەڕاستیی دەرخراوە، وشەکانی (لەوێدا، ساتەدا، لەکوێدا، پادشادا) بەڵگەن!

واوی عەتف (و) بەزۆریی لێکندراوە بە وشەکەوە وەکو لە (اشرافو، ابێتو، چەکو، برسیو، روتو.. هتد) دا.

شایانی سەرنجە، تیپی (أ/ئە) ی سەرکردار بەزۆریی لەبریی (دە) بەکاربراوە وەکو لە وشەکانی (أچو، أکەن، أترساند، أبی.. هتد) دت، بەڵام جاروبارەش بەشێوەی (دە) ش دەرکەوتووەو وەکو لە وشەکانی، (نەدەگەیشت، نەدەبوو، نەدەگوت) دا. بێگومان لەڕووی زمانەوە – ڕێنووسی گوتارەکان لەچاو ئەمڕۆدا دەشێ پەسەند بن یان ناپەسەند. سا بۆ کەڵکی زمانەوانانیش ئەم وێنە وشە ڕاست و هەڵانەیشیان دەخەمە ڕوو: (لێی، بەپێی، پێیان، بلێێن، لێبێنن، لێنادرێ. پلەیێك، نەم توانی، نەی توانی، ڕرێگاییکی، أبێ، أبێو، بت پەرستییەکە، نەژاد پەرستیە، کۆمەڵایەتی یان، دەوڵەمەندییان، یاننا... هتد).

جێگەی گوتنە، ئەم کێشەیەی ڕێنووس، هەروەها بە ڕۆژنامەی (زبان) یشەوە دیارە و قەفتان لە ئەوێوە بە گوتارەوە لەسەر (نووسینی کوردیی) خۆی خەریك کردووە.. ئەوەتە وێڕای ڕاست گوتن کە دەبێژێت: (من زۆر شارەزای لوغەت و سەرف و نەحوو و شتی وانیم)[٩] بیری خۆی ئاشنا دەکات و دەڵێت: (ئەو کەلیمانەی بە بنەچە عەرەبیی و یا زبانێکی ترن و بەڵام لە کوردیا بەکار دێنرێن، هەتا بگونجێ مەسڵەحەت وایە بەپێی ئیملا"!!" بنووسرێن، چونکی ئەگینا زەحمەتەکەمان بەسەرەوە هەر ئەمێنێتەوە!).[١٠]

ڕاستییەکەی نهێنیی ئەم بیروکۆششە کە بێگومان کەڵکی ڕۆژگاری خۆی و ئێستەیشی گرتووە، هەمووی مایەی بەرزیی بیریەتی کە لێمان دیارە و (ناتەواوی جیهازی خوێندن و نووسینی کوردیی بە ناتەواوییەکی قەومیی)[١١] زانیوە!

**٤. شێوازی پەخشانی.**

ڕۆژنامەنووسیی —عەمەلیی— بێ گرێ و ئاسانە. جوان و بەهێزە. نەرمیی و ڕەوانیی گوتارەکانیش لە هەر گوتارێکی دی ڕۆژنامەنووسیی ئەو ڕۆژگارە، پتر نزیکترە لەشێوازی ڕۆژنامەی (ژیان) ی سەردەمی پیرەمێردی بەهرەمەند!

**٥. بابەتەکان:**

ل ١:

**یێکەم:** سەرگوتاری (مەجەللەی زانستیی) لەمەڕ ڕێ و نیاز و چۆنیەتیی دەرکردنی گۆڤارەکە. {٢ ستوون—پاشماوەکەیشی٣چارەکە ستوونێکی لاپەڕەی هەشتەمە}. نێوی نووسەری پێوە نییە!!

ل ٢:

**یێکەم:** لێك دانەوەییێکی ئابووریی سیاسیی بەنێونیشانی {وتەی تەئریخیی—تیجارەت}ەوە {٣ستوونەو پاشماوەکەیشی لەستوونێکی لاپەڕەی سێیەمدایە!} نێوی نووسەری پێوە نییە!

ل ٣:

**یێکەم:** پاشماوەی لاپەڕەی پێشوو!

**دووەم:** گوتارێ بۆ ئاشناکردنی (کۆلۆنێل لۆرانس[١٢]) ی پیاوی سیاسیی بەنێوبانگی بێگانە: {٢ ستوون} و نێوی نووسەری پێوە نییە!

ل ٤:

**یێکەم:** لێك دانەوەییێکی ئابووریی سیاسییە، (لەبەحری سپیی ناوەڕاستدا — بەریتانیاو ئیتالیا). {٣ ستوون—پاشماوەکەیشی سێ چارەکە ستوون کەمترە لەل "٥"دا} و نێوی نووسەری پێوە نییە!

ل ٥:

**یێکەم:** هەواڵێکی عێراقیی و عەرەبیی، (دیاریی پادشاکانی عەرەب بۆ جەلالەتی مەلیك فارووق!). {ستوون‌و چارەکیّ—چاپ کراو بە تیپی ١٤}و نێوی نووسەری پێوە نییە!

**دووەم:** شیعرێکی ڕۆمانتیکی (گەر ڕاستە جەژنە). {١ ستوون و بە تیپی ١٤}.

نووسەر: **هەروریی**

ل ٦:

**یێکەم:** لیّ کۆڵینەوەیێکی ئەنتروپۆلۆژیی – کۆمەڵایەتیی، (ژین و عاداتی ژاپۆنەکان). {٣ستوون— نیو ستوونی لەل٧دا—بە تیپی ١٤}و نێوی نووسەری پێوە نییە!

ل ٧:

**یێکەم:** پاشماوەی گوتاری لاپەڕەی پێشوو.

**دووەم:** هەواڵێکی مێژوویی گاڵتەجاڕی، (بەچیی کوژران؟). {٤ستوون کەمتر}و نێوی نووسەر و سەرچاوەی لیّ وەرگرتنی پێوە نییە!!.

**سێیەم:** هەواڵێکی عێراقیی، (خورما بۆ عەسکەر!). {٣ چارەکە ستوون!} و نێوی نووسەر—سەرچاوەی هەواڵی پێوە نییە!

ل ٨:

**یێکەم:** پاشماوەی سەرگوتار!

**دووەم:** لێك دانەوەیێکی سیاسیی (لە وڵاتە پێشکەوتووەکانا حیزبایەتیی!)، {٢ ستوون‌و نیو—ناتەواوەو "ماوەیە"ی لەبن دوا دێڕدا نووسراوە}و نێوی نووسەری پێوە نییە!

### ٦. شێوەی گشتیی

یێکەم گۆڤاری سلێمانیی، لەبەرامبەر یێکەم چەپکە گۆڤاری کوردیی کوردستانی باشوور و عێراقدا، خۆی ئەوها دەنوێنێت: بارستەکەی (٢٢,٥ X ٣٠سم) بەرامبەر (دیاریی کوردستان: ٢٤X١٦سم)و (زار کرمانجیی:٣٠X٢٨ سم)و (پەیژە:١٨X١٢سم) و (ڕووناکیی: ٢٠ X ٢٨ سم) دا.

ئەو گۆڤارانە —زۆربەیان— پێ ڕستیان بۆ بابەتەکانیان داناوە، یان لەسەر بەرگدا یان لە یێکەم لاپەڕەدا، یان لەدووا لاپەڕەدا.. بەڵام ئەم گۆڤارە لە پێ ڕست بێ بەشە.

لەڕووی ڕازاندنەوە و خۆشنووسیی و نەخش و نیگار و وێنەوە، هەروەها لەڕووی ماکێتو دابەش کردنی ستوونەوە— زۆربەیان دوو ستوونین — ئەم گۆڤارە جودایە.. بەڵام لەنێو هەموویاندا زۆر نزیکە لە بارست و ماکێت و ستوونی گۆڤاری (ڕووناکیی: هەولێر —س١٩٣٥)ەوە. بۆ وێنە: بە"٢سم"ێ لە بارستدا جودایە، بەڵام لەڕووی ماکێتەوە —بەگشتیی— وەك گۆڤارەکەیە و دابەشە بەسەر "٣" ستووندا کە خانەی ژووروو بەلای ڕاستدا بۆ نێوی خاوەندە.. هتد. هەروەها خانەی نێوەندیش بۆ نێونیشانی گۆڤارەکەیە بە تیپی عەرەبیی و لاتینیی. خانەی چەپیش بۆ ئاگاداریی خۆی و نرخی ئابوونەیە. هەروەها بێ لە نووسینی ژمارەی گۆڤارەکە لەلای (ڕووناکیی) وەك ئەوە بۆ دانانی ژمارەی لاپەڕە، نێوی گۆڤار لە ژوورووی لاپەڕەکانی دیدا. دەشتوانم بڵێم لەڕووی ئامانجی سەرگوتاریشەوە، هەردووکیان لە یێکەوە نزیکن!

لەلاییێکی دیەوە، ئەگەر بەراووردی شێوەی بکەین لەگەڵ ڕۆژنامەی (زبان —١٢ ئەیلوول ١٩٢٧) ی هەشت لاپەڕەیی، ئەوە لەڕووی ماکێت و دابەش بوونی ستوونەوە، هەروەها لەڕووی شێوەی زمان نووسینەوە، جودایییەکی ئەوتۆی نییە! چۆن لە هەمان ڕووەوە لەگەڵ ڕۆژنامەی (ژیان) ی بەردەستی پیرەمێرد لە ساڵانی ١٩٢٤و١٩٣٥و ١٩٣٦ دا، جودایی ئەوتۆ نییە! بەڵام ئەم گۆڤارە لەڕووی بارستو ماکێتو ستوونو قاقەزیشەوە، هەروەها — هەتا ڕادەیێ — لەڕووی دروشمەوە، بە تەواویی ناچێتەوە سەر

ڕۆژنامەییەکەمەکانی وەکو (پێشکەوتن)، (بانگ کوردستان)، هەتا (ژیانەوە) و (ژیان) ی سالّی دەرچوونی خۆیشی!

### ٧. ئامانجی

وێڕای دروشمی ڕووناکی گۆڤارەکە خۆی، سەرگوتارەکەی دوو ئامانجی ناسکی هەیە:

لەڕووی خزمەت کردنی ڕۆشنبیرییەوە دەڵێت، (مورادمان ئەوەیە کە ئەهالیە مەحتەرەمەکەمان وەك خەڵقی شارانیتر بەزبانی خۆیان شت بخوێننەوە و بە ئاسانیی لە حاڵی دنیا بگەن و باس و هەواڵی ئەم جیهانە پێشکەوتووە وەرگرن!).

لەڕووی ڕۆژنامەنووسییەوە دەڵێت، (چلۆن مەتبووعاتی شاران چاو ساغیی ئەهلەکەی خۆیان ئەکەن، بەڵکو ئێمەش بتوانن خزمەتێکی وەها بکەین بۆ وەتەنەکە خۆمان و بناغەی چاپ کردن و بڵاوبوونەوەی ئەسباب دابنێین لە ناو وڵاتەکەمانا!). بە ئەوپەڕی دڵسۆزیشەوە دەڵێت: (ئاواتم ئەوەیە خزمەتی مەتبووعاتی وڵاتەکەم بکەم. بە نانەزگییش بێ لێی ڕاناکەم!).

## بەشی دووەم: مەتنی بابەتەکان[١٣]

### ١. مەجەللەی زانستیی (ل:١، ٨)

زۆر دەمێکە وەزارەتی داخیلییە ئیزنی لە چاپ دا و بڵاوکردنەوەی (مەجەللەی زانستی) ی داومێ. چونکە مەتبەعەیێکی خودی خۆمم نەبوو، هەتا ئێستا نەم توانیی نوسخەیێکی بڵاوبکەمەوە، بەڵام لەبەرئەوەی موددەتی قانوونیی بڵاوکردنەوەکەی لەم حەفتەیەدا بەسەر ئەچوو، ناچار بە پەلەپەل و ناتەواویی وا نوسخەی یێکەمینم بڵاو کردەوە، خوا ڕەوای بینیی شوکر! دوو چاپخانە هەیە لە شارەکەمانا، لە تەنگانەدا پیاو دانامێنێ.

هەرچەندە ڕەفیقی خۆم، مەتبەعەکەی بەلەدییە بوو، بەڵام چونکە ناتوانێ لە حەفتەیێکا ڕۆژنامەی (زبان) و مەجەللەکەی منیش لە چاپ بدا، بام دایەوە لای چاپخانەی دووەم، چوومە خزمەت (پیرەمێرد) ی موحتەرەم جەنابی حاجیی تۆفیق ئەفەندیی. خوا حەقە بەڕووی خۆشەوە تەکلیفەکەی قوبوول کردم و بێ ئەوەی ئەرکێك و یا مەسرەفێك بخاتە سەرم بۆی لە چاپ دام. لەبەرئەوە منەتباری چاکەیانم و زۆر تەشەککوری ئەکەم.

ئەگەر من، ئەگەر کەسێکی تر لە بڵاوکردنەوەی مەجەللە و ڕۆژنامەدا مورادمان ئەوەیە کە ئەهالیە موحتەرەمەکەمان وەك خەڵقی شارانیتر بە زبانی خۆیان شت بخوێننەوە و بە ئاسانیی لە حاڵی دنیا بگەن و باس و هەواڵی ئەم جیهانە پێشکەوتووە وەرگرن تاکو چلۆن مەتبووعاتی شاران چاوساغیی ئەهلەکەی خۆیان ئەکەن، بەڵکو ئێمەش بتوانین خزمەتێکی وەها بکەین بۆ وەتەنەکەی خۆمان و بناغەی چاپ کردن و بڵاوبوونەوەی ئاسار دانێین لەناو وڵاتەکەمانا!

هەرچیی منی ناسیوە و دیومی و قسەی لەگەڵا کردووم بۆ ئەم فەرمانە تەشویقیان کردووم، بەڵام ئەبێ هەموومان بیزانین بە تەنها دەستێك چەپڵە لێ نادرێ، ئەگەر

خوندەوارانمان مەتبووعاتەکەمان نەگرنە پەنای خۆیان و یارمەتیی بڵاوبوونەوەی نەدەن و نوسخەکانی نەکڕن، هەرگیز ئەم ئاواتەمان بەجێ نابێ. لەدواییا هەر ئەوەمان بۆ ئەمێنێتەوە بڵێین ئەگەر ببوایە بە عادەت، پەشیمانداران شاخیان لێ ئەڕوا.

ئاواتم ئەوەیە خزمەتی مەتبووعاتی وڵاتەکەم بکەم، بە نانەزگیش بێ لێی ڕاناکەم، بەڵام چیی بکەم؟ بەبەرمەوە نییە سەرەڕای هیچ دەست نەکەوتن لەڕێی ئەم خزمەتەدا لە کیسەی خۆم خەرج بکەم!.

"تەواو"

**٢. وتەی تەئریخیی – تیجارەت** (ل:٢، ٣)

"بەکڕین و فرۆتن و ئاڵوگۆڕی بەینی ئینسانان وتراوە، تیجارەت".

وا ئەزانم کەس نییە ئەمە نەزانێ! وەختێ کە ئەم ناوە بۆ ئەم مەسلەکە پێشینیان دایانهێنا، کڕین و فرۆتن لەبەینی ئادەمیزادا هێشتا وانەبوو کە شایانی ئەهمییەت بێ وەك ئێستا هەیە. ئەوسا لەناو میللەتانا تاقمی ئەشراف پێیان عەیب بوو تیجارەت بکەن.

هەموو ئەیزانین ئەشراف و ماقووڵی ئەم شارە بە توجارەکانیان ئەووت تاقمی (پەڕۆ) بەسەر. زۆر لەمەوپێش کە هێشتا مەدنییەتی ئیمڕۆ پێ نەگەییشت بوو و مەعاریف و زانستی نەگەیی بووە پلەیێك کە تەقدیری ئوموووری کۆمەڵایەتی بکرێ، لە ئەورووپاشا تیجارەت ئاوەها بێ قەدر بوو! کەی بە کەی، بەسایەی خوێندەوارییەوە کە دەرکەوت ئاساییش و سەعادەتی ئەقوام هەر بە بوون و ماڵدارییەوە مومکین ئەبێ و ئەویی زۆر بەجێ بێ بۆ ماڵ پەیا کردنیش ڕێگای تیجارەتە، ئینجا حوکوومەتان بوونە پشتیوانی توجار و تیجارەت. حوکوومەتەکانی ئەورووپا نەبوونایە بە سایەبانی توجارەکانی، هەرگیز ئیمڕۆ ئەم دەست و هێزەیان نەدەبوو، وە دەوڵەمەند نەدەگەییشتە ئەم ڕادەیە. ئەوانەی مەراقی خوێندنەوەی تەئریخیان کردووە، ئەبینن زۆربەی شەڕ و هەرای بەینی ئەقوامی ئەورووپا لەڕێی ڕەواج پێ دانی تیجارەتا کراوە. شەڕی گەورەی ڕابوردوو کە

۳، ٤٠ ملیۆن ئینسانی تیا کوژرا و شەل و سەقەت بوو، لەبەرئەوە داگیرسا کە چونکی ئینگلیزەکان تیجارەتیان زۆر بوو وە بازاڕیان لەهەموو لایێکی سەر زەمینا گەرم بوو وە ئەڵمانەکانیش ویستیان بیانگەنێ و مامیلەکانیان لێ داگیر بکەن. ڕقە بەریەکەیان بووە بە سەبەبی ئەوەی ئەم دوو دەوڵەتە بە چنگە، دوو کۆمەڵی ناحەز لە دەوڵەتان دروست بکەن و پارەی زۆر بدەن بە چەك و بە سیلاح بۆ شەڕ هەتا بەهانەیێکی پچووك بوو سەبەبی ئەو شەڕە گەورەیە. حاڵی حازر دەوڵەتەکان لەگەرمەی خۆ حازر کردنان بۆ شەڕێکی تازە کە شەڕی پێشو گەمەی منالان بێ لە چاویان، سەبەبی هەرە گەورە بۆ ئەم شەڕەش دیسان تیجارەت و بازاڕی ئالۆوێر داگیرکردنە، چونکی هەموومان ئەیزانین تەمەعی ئینسان دوایی نییە و ڕابواردنی چاك و خۆشیی دنیا بە سایەی پارەوەیە. هەتا ئینسانان زۆریان مست بکەوێ داوایان زۆر ئەبێ و ئەو حەلە حوکوومەتەکەیشیان پێی دەوڵەمەند ئەبێ، ولات ئاوا ئەبێ و ئەڕازێتەوە، نیشتیمان و کۆمەڵ هێز ئەسێنێ.

ئینجا مست کەوتن و قازانج کردن بەسایەی تیجارەتەوە مومکین ئەبێ. بۆیە ئەورووپاییەکان دەوڵەمەند بوون و ڕزقیان زۆرە بە پشتیوانی حوکوومەتەکانیان ماميل و بازاڕی ولاتان داگیر ئەکەن، ماڵ ئەهێنن و پارەی زۆر ئەبەنەوە، وە لەم بازاڕانەدا لەیێك ئەکەون و ماڵی یێك ئەشکێنن و دەنگیان ئەچێتەوە ناو میللەتەکانی خۆیان و دووکەڵی حەسادەتیان بەرز ئەبێتەوە تا ئەبێ لە مەیدانی ڕقەبەرییدا پشت بکەنەوە و بازاڕەکان بۆ ناحەزەکانیان بەجێ بهێڵن و وەك ئێمە ئیختیاری ژێرکەوتن برسیی و ڕووت و قووتیی بگرنە ئەستۆی خۆیان وەیا لە ڕەقە بەرییەکەدا خۆ ئەگرن و چاوقایمیی ئەکەن و تەدبیری بالادەستیی ئەدۆزنەوە.

ئینجا ئەورووپاییەکان تەنەززول ناکەن لە مەیدان ڕابکەن، لەسەر حسابی قەومە دوواکەوتووەکان کە ئێمەش یێکێکین لەوان، هەتا مومکین بێ لەناو خۆیانا ڕێك ئەکەون.

"تەواو"

## ٣. کۆلۆنێل لۆرانس (ل:٣)

لە ڕۆژهەڵاتی نزیکا، یەعنی لە وڵاتی ئێمەدا، کەس نییە بە ناوەکەیا کۆلۆنێل لۆرانس نەناسێ، چونکی ئەم پیاوە لە عەرەبستانا زۆر ژیاوە و لەگەڵ عەرەبەکانا زۆر هەڵساوە و دانیشتووە و زۆر دەخڵی هەیە بەسەر تەئریخی موقەددەراتی تازەی عەرەبەوە، ئینجا بەو بۆنەیەوە ناوبانگی هەتا لای ئێمەش هاتووە و ئەیناسین!

لە شەڕی جیهاندا لۆرانس شتی موهیممی کردووە لە عەرەبستان و بەتایبەتیی لە دەوری " حیجاز " دا و ڕەنگە ئێستا لە سلێمانییدا گەلێك هەبێ ئەو حەلە چاوی بە لۆرانس کەوت بێ لەوێ، چونکی وەك ئەرکانی حەربی لەشکری عەرەب وا بووە لەوێدا کەوا بۆ سەندنی سەربەخۆیی لەگەڵ لەشکری تورکانا شەڕیان ئەکرد.

ئەم جارە دائیر بە کردەوەکانی لۆرانس نووسراوێك بڵاوکراوەتەوە، تیا نووسراوە ئەڵێ: لە ١٨ مانگدا ئەم کابرایە ٧٩ جار قیتاری بەینی " مەدینە و دیمەشق " ی وەرگێڕاوە. هات و چۆکەرانی بەینی ئەم دوو شارەی وا ترساند بوو نەیانئەویست سواری شەمەنوفەر بین، حەزیان ئەکرد بە وڵاخ بڕۆن نەك تووشی داوی لۆرانس بین لە قیتارا و هەموویان بە کوشت بچن، چونکی لۆرانس بێ سرپە و زۆر بە عاقڵیی دینامێتی ئەخستە ژێر ئاسنی ڕێگای شەمەندوفەرەکەوە و بە تەلێك ئەیبەست و ئەیبردە دوور و خۆی لە بۆسە ئەدا. کە قیتارەکە ئەهات، دەستی ئەنا بە پیلی ئەلەکتریتا و قیتارەکەی بەر هەوا ئەکرد.

لوورانی ئەم هەموو گەرمای جەهەننەمی عەرەبستان و چۆڵ پەرستییەی بۆ خاتری بەرزبوونەوە و سەرکەوتنی بەریتانیای گەورە ئیختیار ئەکرد. کەچیی کە حوکوومەتەکەی بەخشیشی زۆری نەدایە و پایەی بڵندی نەکرد، نەیئەویست و حەزی نەئەکرد خەڵقیی چەپڵەی بۆ لێ دەن و تەقدیری بکەن!.

"تەواو"

### ٤. لەبەحری سپیی ناوەڕاستدا (ل:٤، ٥)

بریتانیا و ئیتالیا

یێك دوو ساڵە بەریتانیا و ئیتالیا لە بەحری سپیی ناوەڕاستدا، بەئاشکرا کەوتوونە
قەبەریی و ناحەزیی یێکتریی. ئەم بەحرە گەلێ قەومی خاوەن حوکم و دەستەڵاتداری
ەسەرە و ئەیانەوێ پیا بگەڕێن، کەسیان لێ نەکەوێ.

تەئریخ ئەڵێ: مەدەنییەت قەومەکانی سەر بەحری سپیی دایانهێناوە، بۆیە هەموو
ەختێ ئەم بەحرە لای میللەتان موهیم بووە و ئێستا موهیمترە، ڕێی کورت بۆ
یندوستان و موستەعمەرەکانی ئاسیای ئینگلیز بەم بەحرەدا ئەڕوا. ئەوەتەی ئینگلیز
ووەتە حاکمی سەر هەموو بەحران، لەم بەحرەشا هیچ قەومێك نەیتوانیوە بە ئینگلیز
ڵێ، بەری چاووت کلی پێوەیە و ئەشیانەوێ ئەم دەسەڵاتەیان هەر وا بمێنێ، چونکێ
کە قەومی تر لێرەدا لەو قەویتر نەبوو، هەموو وەختێ ئەتوانێ نەیێلێ ئینگلیزەکان
ەوێدا بڕۆن، ئەو حەلە ئەبێ ئینگلیزەکان بە ڕێگایێکی سێ ئەوەندەی ئێستا دوورترا
چن بۆ ئەو وڵاتانەیان کەوا لای سەرەوە باسمان کردن، ئەوەش مەعنای نابووت بوونی
یجارەتی مام ئینگلیزە و لە دەسەڵات کەوتنیایە. ئینجا ئینگلیزەکان هەتا بەشەڕ
ەشکێن چلۆن ئەمە قوبوولێ ئەکەن؟ چونکێ یێکی لەو مەنفەعەتانەی کە ئەبێ وازی لێ
ێنن، نەوتەکەی عێراقە، بەڵکو ئەمە سەد یێکی زەرەرەکانیانە!

ئینجا بابێینەوە سەر وەزعییەتی ئیتالیا، هەتا ئەم چەندانە، ئیتالیا دەوڵەتێکی
بەهێز نەبوو. لەشەڕی گەورەدا بەتەمای بەشی زۆر، دایە کۆمەگی ئینگلیز و فرانسزەکان
ـ بە ملیۆن لێی کوژرا و قوربانی دا. کەچیی لەدوای شەڕ، هەرچیی تالانییەکیان دەست
کەوت، ئینگلیز و فرانسزەکان، بردیان بۆ خۆیان و هەر وا چەن پارچە ناحیەیێکی بە
گێچەڵیان لە سنووری دەوڵەتی (نەمسە) دا بە ئیتالیا. لەسەر ئەمە ئیتالیاییەکان زۆر
عاجز بوون. لە ڕقا کەوتنە گردەواریی خۆیان. لەم ٢٠ ساڵەی ئاخریەدا زۆر پێشکەوتن.

لەشکری بەحریی و بەرِێی و هەوائییان وای لێ هاتووە بەڕاستیی هەموو میللەتێ لێیان بترسێ. ئیتالیاییەکان نەتەوەی میللەتی ڕۆمای قەدیمن کەوا لە (قران) ناوی براوە، ئەو حەلە میللەتی ڕۆم هەر چوار دەوری بەحری سپییان داگیر کردبوو. دەوڵەتێکی زۆر گەورە و بەهێزیان هەبوو، وەك ئینگلیزەکانی ئێستا یێکەم دەوڵەتی سەرزەمین بوون ئەو حەلە!

ئیتالیاییەکان کردوویانەتە هەرا، ئەڵێن: ئێمە میراتگری ڕۆمای پێشووین. ئەبێ ببینەوە بە حاکمی بەحری سپیی کە ئەو حەلە (بەحری ڕۆم) یان ناو نابوو. جێ و ڕێی ئیتالیا لە بەحری سپییدا زۆر باش هەڵکەوتووە، بەحرەکەی کردووە بە دوو کەرتەوە و هەتا نزیك قیتعەی ئەفەریقا چووەتە ناو بەحرەوە و بووەتە حاکم بەسەر هەردوو دیویا و هەرچیی پاپۆڕێك بیەوێ بەوێدا بڕوا، ئەبێ بەحرە تەسکەکەی جونووبی ئیتالیا ببڕێ ئەوسا تێ پەڕێ کە پۆلی تەیارە و تەحتەلبەحرەکانی ئیتالیا حاکمە بەسەریا. ئینجا ئەگەر لەبەینی ئینگلیز و ئیتالیادا شەڕ داگیرسێ، پاپۆڕەکانی ئینگلیز یا ئەبێ واز لەم ڕێگایە بێنن و لە میسر و فەلەستین و وڵاتەکانی تری ڕۆژهەڵاتیان ببوورن کە ئەمە فەلاکەتە بۆ بەریتانیای گەورە و یا ئەبێ ئیتالیا بێ دەست بکەن تا ببنەوە بە حاکمی بەحرە تەسکەکەی جونووبی ئیتالیا کە ئەمەش موحاسەرەری بەحریی ئیتالیا و بە وەختێکی زۆر نەبێ بۆ بەریتانیا جێ بە جێ نابێ!

ئینجا بزانین بەریتانیا ئەم پلە سەختە چلۆن ئەبڕێ و ئەنجامیش مەعلووم نییە چلۆن ئەبێ!!.

"تەواو"

**٥. دیاریی پادشاکانی عەرەب بۆ جەلالەتی مەلیك فارووق.** ( ل: ٥ )

دیاریی عێراق:

نووسی بوومان کە جەلالەتی مەلیکی خۆشەویستمان شیرێکی مورەسسەع بەدیاریی ئەنێرێ بۆ جەلالەتی مەلیك فاروقی بوزورگی میسر کە چونکێ ژنی هێناوە، فیلحەقیقە سوببیە سەنعەتکارەکانی بەغداد وەختە تەواوی بکەن. کە تەواو بوو ئەینێرن بۆ سەیید عەبدولقادری گێلانیی کە موفەووەزی عێراقە لە میسر تا پێشکەشی بکا.

دیاریی مەلیك ئیبن سعوود:

پادشای حیجاز و نەجد، جەلالەتی ئیبن سعوودیش بەناوی جیازییەوە، چەند ئەسپ و مایینی جنسی ناردووە بەدیاریی. لەشاری " جەددە " دراوە بە موفەووەزی میسر و ئەویش بە " سوێس " دا ناردوویەتی و گەییشتووەتە قاهیرە.

دیاریی ئیمام یەحیا:

پادشای یەمەن، جەلالەتی ئیمام یەحیا " ٤٠٠ " کیلۆ قاوەییێکی زۆر نایابی بەدیاریی ناردووە بۆ شایی مەلیکی موحتەرەمی میسر!

دیاریی ئەمیر عەبداللە:

ئەمیری شەرقی ئوردون ئەمیر عەبدوللەش، مایین و ئەسپێکی ئێجگار جوان و جنسی بەدیاریی پێشکەش کردوە.

"تەواو"

**٦. گەر ڕاستە جەژنە** ( ل: ٥ )

گەر ڕاستە جەژنە من بۆ پەشێوم؟

من بۆ کەساسم بۆ بار بە لێوم؟

بـــۆ وا عـــاجزم؟ بـــۆ وا غـــەمگینم؟
بـــۆ وا گـــیرۆدەی گریـــان و شـــینم؟
بـــۆ وا دەربـــەدەر کووچـــەی شـــارانم؟
بـــۆ وا بـــێ بەشـــی لەنجـــەی یـــارانم؟
بـــۆ وا زەبـــوونم ســـزایە بـــەرگم؟
بـــۆ وا کـــەم هێـــز و کـــون کونـــە جـــەرگم؟
بـــۆ هـــەر مـــن واریســـی تـــەختی مـــەجنوون بم؟
تاکـــەی ئەســـیری چـــەپگەردی دوون بم؟
تاکـــەی فـــەرهادی ڕێگـــەی شـــیرین بم؟
تاکـــەی خورشـــیدی ناســـکۆڵەی چـــین بم؟
تاکـــەی یـــەعقووبی یووســـفی دڵ بم؟
تاکـــەی وەك بولبـــول چـــاوەڕێی گـــوڵ بم؟
گـــەردوون گـــەر ساتێ، تـــۆ لـــە جێـــی مـــن بـــی،
گـــەردت نـــامێنێ کێـــوی بێســـتوون بـــی!
بۆیـــە گـــەر بێـــت و لـــە جێـــی پـــدەر بـــی،
دایکـــی خۆشەویســـت یـــاخود پســـەربی،
ئەگـــەر هـــەتیو بم، حاتـــەمی تـــەی بـــی،
یـــا مـــن ســـەرخۆش و تـــۆش عـــوود و نـــەی بـــی،
گـــەردوون گەرەکمـــە شـــەل و کـــوێر و کـــەڕ
گردەنشـــین بـــی تـــا ڕۆژی مەحشـــەر!

بەغدا: هەوری

"تەواو"

## ٧. ئایین و عاداتی ژاپۆنەکان. (ل: ٦، ٧)

ژاپۆنەکان قەومێکی زۆر پێشکەوتوون. لە سەنعەت و تیجارەت و عیلم و فەنندا، لە میللەتە بەرزەکانی ئەوروپا کەمتر نین. لە ٢٠ تا ٧٠ ملیۆن خزاوەتە چەند جەزیرەیێکی ئەوتۆ کە هەموویان بکەونە سەریێك، لەسەرزەمینی عێراق گەورەتر نین. ئەم لێشاوە کەسانە، گشتی خوندوویەتی، لەسەر ئەم عیلم و زانینە بەهێزەشا ئەم میللەتە هێشتا بڕوای بەشتی کۆنی خۆی ماوە و هەندێ خولق و عاداتیان هەیە کە لە بنچینەوە بۆیان ماوەتەوە و بەجێی ئەهێنن. هیچ میللەتێکی پڕ عیلم و پێشکەوتووی تر نایکا، چونکە ئەم خولقانە لەگەڵ عیلم و زانینا پێکەوە نانووسێ!

ژاپۆنەکان وەك ئێمە خواپەرست نین، لەسەر ئایینی "بوودا "و "قۆنفۆچیۆس"ن کە بابەتە بت پەرستییەکە و جگە لەمانە ئایینێکی تریان هەیە (شینتۆ) ی پێ ئەڵێن و لە ئایینەکانی تر لەپێشترە لایان کە ئەمانەش نەژاد پەرستییە! هەر خێزانە ئەچێتەوە سەر چ نەژادێك، ئەوە ئەپەرستێ. لە ماڵا جێگا و هەیکەلیان بۆ کردوون، چرایان بۆ ئەسووتێنن و لەوەختی تایبەتیا نوێژیان بۆ ئەکەن، لایان وایە پادشاکانیان خوازادەن. یێکەم پادشایان ناوی (میکادو جیمۆرا) بووە، حەوتسەد ساڵ پێش مەسیح پەیا بووە، لایان وایە لەو کاتەدا (خوا هاتووەتە سەر زەمین!). ئەڵێن خوای گەورە ئەمری بە دوو خوای لەخۆی پچووکتر کرد کەوا لەسەر ئەو جەزیرانەی سەر ئاوی بەحران کەوتوون، لەسەر زەمین دەوڵەتێکی بەهێز بهێنێتە مەیدان، ئەوانیش هاتوون و لە ژاپۆنیادا جێ گیر بوون..

ئەڵێن ئیمپەراتۆرەکانمان (پادشا) لەم دوو خوایە کەوتوونەتەوە و بەم تەرحە هۆزی پادشاکانیان گەیاندووەتە پلەی (خوایەتی). ئینجا لە ساڵی ١٠٠٥ ی مەسیحا مزگەوتێکی زۆر گەورەیان بۆ ئەم دوو خوایە دروست کردووە، ئاوێنەیێکی گەورە و شیرێك و چراییێکی عاجباتیی تیا دانراوە. ئەڵێن دوو خواکە بۆ نەتەوەکانی خۆیان بەمیرات

بەجێیان هێشتووە و کردوویانە بە عەلامەتی پادشایەتیی بۆیان. ئەم مزگەوتە و ئەم میراتانە لای ژاپۆنەکان زۆر موقەددەسە و ٢٦٠٠ ساڵە پاراستوویانە و دوعا و خوندنە ئاییننیەکانیان نەگۆڕیوە.

ئەویی زۆر عاجباتییە ئەوەیە کە ئەم ژاپۆنانە پادشاکانیان کە خۆیان (میکادۆ) ی پێ ئەڵێن، ئەپەرستن و هەرچییەك ئەو بیلێ و بیکا لایان موبارەکە و بێ قزە سەری بۆ ئەنەوێنن و ئەوە بە بزورگیی و عەلامەتی پیاوچاکیی ئەژمێرن بۆ خۆیان. لای ئەم قەومە زیرەك و وریایە وایە ئەوانەی لەڕێی فەرماییشی پادشادا ئەمرێ و یا خۆی ئەکوژێ، ئەوانە لە هەموو کەسێ بزورگتر و دڵسۆزترن. لە شەڕی ژاپۆن و ڕووسی ڕابوردوودا سەردارەکانی ژاپۆن لەشەڕا کە سەرئەکەوتن هەر ئەو حەلە هاواریان ئەکرد، ئەیانوت: میکادۆ سەردارمانە بۆیە وا سەرکەوتووین. ئەمانەیان بە دوو دڵیی و ڕیاوە نەدەگوت بەڵکو لە کانگای دڵیانەوە دەرئەچوو! سەردارێکی بەناوبانگیان هەبوو، قەڵای (پۆرت ئارتوری) گرت بوو لە ڕووسەکان و ناوی " نوژی " بوو، لەدوای ئەوە کە شەڕ نەما وا ڕێکەوت میکادۆکەیان مرد، ئەوسا ئەم سەردارە وتی: مادام پادشا (موتسوهیتو) مرد، ئیتر ژیان کەڵکی نەماوە بۆ من. ئەمەی وت و چووە سەر قەبرەکەی و خۆی کوشت و لە ئەوە عاجبایەتیی تر ژنەکەشی چوو، ئەویش خۆی کوشت..

ئینجا ئەم سەرگوزەشتانە پەندە بۆ قەومی ژیر!

"تەواو"

**٨. بەچیی کوژران؟**

لەدوا ی شەڕی گەورە، مارشاڵ ژوفەر ناو، سەرداری هەرە بەناوبانگی فڕانسز بۆ ڕابواردن چووتە ویلایەتی موتتەحیدەی ئەمەریکا، لە شاری نیویۆرقدا حورمەتەن حەفلەیان بۆی کردووە و بانگیان کردووە. لەوێدا کچە ئەمریکاییەکی شۆخ و شەن ئەچێتە لای، ئەڵێ:

- گەورەی خۆم، لەشەڕ لە ئەڵمانەکان گەلێکت کوشتووە یان نا؟

ژۆڤەر بە زەردەخەنەیێکەوە یەتە جواب، ئەڵێ:

- بەڵێ زۆر زۆرم لێ کوشتوون!

- بەکام دەست کوشتوونت؟

- بەدەستی ڕاستم!

ئەو حەلە کچەکە دەستی ماریشاڵ ئەگرێ و خێرا خێرا ماچی ئەکا.

لەتەنیشت مارشاڵەوە لەو ساتەدا زابتێکی ئینگلیزی لاوچاك وەستاوە. کە کچەکە ئەبینێ بەتیری جوانییەکەی گرفتار ئەبێ. نزیکی ئەکەوێتەوە و ئەڵێ:

- خانمەکەم منیش لەشەڕا ئێجگار زۆرم لە ئەڵمانەکان کوشتووە!

- چلۆنت کوشتن؟

- بەو ئەمرەی کە لە دەمم دەرچووە!

ئەو حەلە کچەکە لە تەریقیا سوور هەڵئەگەڕێ، بەڵام هەروەکو دەستی ماریشاڵی ماچ کردبوو، بەناچاریی ئەچێ دەمی زابتە جوانەکەش ماچ ئەکا!

"تەواو"

**٩. خورما بۆ عەسکەر!( ل: ٧ )**

مووددەتێ لەمەوپێش هەندێ لە خاوەن خورما زۆرەکانی بەسرە هاتوونە بەغداد چوونە خزمەت ڕەئیسی ئەرکانی جەیشی عێراقیی سەعادەتی حسێن فەوزیی پاشا و عەرزیان کردووە کەوا بازاڕی خورمای ئەم ساڵیان زۆر خراپە و ئەگەر موساعەدە بفەرمووێ بۆ جەیشی عێراق خورمایان لێ بکڕن. لەباتیی پێ خۆر بیاندەنێ زۆر یارمەتیی ئەبێ بۆیان. ڕەئیس قسەکەی قوبووڵ کردوون و قەولی داونەتێ کە تەماشای ئەم پێویستەیان بکا!

"تەواو"

**١٠. کۆمەڵایەتیی، لە وڵاتە پێشکەوتووەکانا حیزبایەتیی ( ل: ٨ )**

ئەوانەی مەراقی باسی کۆمەڵایەتییان هەیە، نووسراوەکانی پێشووی ڕۆژنامەی (زبان) یان خوندووەتەوە کەوا تەئریخچەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی ئینسانمان تیا نووسیی بوو، وت بوومان ئینسانان لە مەدەنییەت و زانستییدا هەتا پێش کەوتبن. بە حاڵی قەدیمیان ڕازی نەبوون و چوونە سەر ئەو شکڵە تازەیە کەوا بۆخۆیان و بە موناسیبیان زانیوە، وەکو لەبابەت ئیدارەی وڵاتەوە سنووریان داناوە بۆ دەسەڵاتی حوکوومەت و حوکمدارانیان بۆئەوەی ئەو حاڵە تێک نەچێتەوە، هەندێ نیزام و تەرتیبیشان لەناو کۆمەڵا پێکەوە ناوە و کردوویانە بە نیگابانی ئەو ئیجرائاتانەیان. ئێمە چونکە ئەم حاڵاتەمان ڕانەبواردووە ناتوانین لە ناوخۆمانا میسال بهێنینەوە بۆ ئەم قسانە. ئەبێ با بدەینەوە و تەئریخی قەومە مەدەنییەکان بخوێنینەوە هەتا تێ بگەین کە دنیا لە چییەوە چووەتە سەر چیی و ئێمەش هێشتا لە کوێداین؟

ئەورووپاییەکان کە سنووریان بۆ حوکوومەت و حوکمدارەکانیان دان و تەعریفی کۆمەڵایەتیی خۆشیان هێنایە قەڵەم. هەموویان کرد بە نووسراوێك ناویان نا (قانوونی ئەساسیی) و کردیان بە دەستوور و لەعەمەل کە بەپێی ئەوە وڵات ئیدارە بکرێ! ئینجا بۆ پاراستنی ئەم دەستوورە بەرەهبەری عەقڵ و مەنتیق، هێنایان حیزبایەتییان داهێنا.

لە ئەورووپادا لەناو قەومەکانا حیزبایەتیی، ئیمڕۆ ساغ بووەتەوە. لەناو ئێمە، یەعنی لە ڕۆژهەڵاتا شتی وا دروست نابێ. حوکوومەتەکانی ئەورووپای ئیمڕۆ سەر بۆ حیزبەکانیان دائەنەوێنن. مەجلیسی وزەرا لەوان دروست ئەبن و بەپێی مەبادیی ئەو حیزبە و یا حیزبەکان حوکوومەتەکە ئەبەن بەڕێوە. " ماویە "

"تەواو"

# بەشی سێیەم

## نووسەرانی گۆڤارەکە

هەرچەندە بەتەنێ نێوی (سالح قەفتان)ی خاوەن گۆڤارو شیعر نووس، (هەوری) ی بەسەر لاپەڕەکانی گۆڤارەکەوەن، ئەوە بەڕۆشنایی هەڵبژاردنی بابەت و لێك دانەوەی نیازیان، هەروەها بەڕۆشنایی زمان و شێوەی پەخشان و جۆری ڕێنووسیان، دڵنیام کە هەموویان وێنەیێکی یێکگرتوون و بیرو بەهرەو قەڵەمی (سالح قەفتان) ی خاوەند گۆڤار دەنوێنن و دەسەلمێنن!

## خاوەند گۆڤار

### ١. سالح قەفتان.

سالح قەفتان[١٤]، کوڕی عەبدوڕڕحمان ئاغای سوار ئاغایە. ساڵی١٣٠٠ ك/١٨٨٤ ز لە سلێمانییدا هاتووەتە دنیاوە. قوتابخانەی ڕوشدییەی سەربازیی لە سلێمانییدا[١٥] و ئامادەیی سەربازیی لە بەغدادا و فێرگەی جەنگاوەریی – حەربیی – لە ئەستەنبووڵدا تەواو کردووە و لە١٤ی مایسی ١٩٠٦دا هەتا٣٠مارتی ١٩١١ز لە ئەستەنبووڵدا ئەفسەرێکی –یێك ئەستێرەی– عوسمانیی بووە[١٦]. ئەوها ماوەتەوە تا لە تەمووزی ١٩١٤ز.دا بووە بە ئەفسەری دوو ئەستێرە[١٧]. لە ئەم هەلەوە لەبەر نەخۆشیی دڵ[١٨] هەتا تەمووزی ١٩١٧ز ڕاگواستراوەتەوە بۆ ڕیزی مامۆستایی لە قوتابخانەی ئامادەیی – موڵکیی – سلێمانیی کە تێیدا وانەکانی مێژوو، جوگرافیای گوتووەتەوە[١٩].

لەساڵی ١٩٢١ز.دا – لەسەردەمی داگیربوونی سلێمانیی لەلایێن ئینگلیزەوە – لەنێو ٣١ کەسی ناسراوی سلێمانییدا خۆی هەڵبژاردووە بۆ ئەندامیەتیی نێو ئەنجوومەنی بازێڕ و سەرنەکەوتووە[٢٠]. لە٢١ ی تەمووزی ١٩٢٢ز.دا، لە کۆبوونەوەیێکی میللیی و ئاشکرادا –هەر لەهەمان سەردەمدا– لەگەڵ ١٢ کەسی ناسراوی بازێڕەکە هەڵبژێردراوە

بە ئەندامێکی یێکەم کۆمەڵی کوردیی ڕۆشنبیریی نیمچە سیاسیی و ئاشکرای سلێمانیی، (جەمعییەت کوردستان).[٢١]

لەسەردەمی مەملەکەتی عێراقدا، لە٤ی ئەیلوولی ١٩٢٣ دا[٢٢] تا ٧ی ئەیلوولی ١٩٢٥ مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە بووە. لە ئەو دوا هەلەوە ڕاگواستراوەتەوە بۆ فەرمانی ڕێبەری قوتابخانەی یێکەمی سەرەتایی سلێمانیی. لە١ی ئەیلوولی ١٩٢٨ ز. دا ڕاگواستراوە بۆ ڕێبەری قوتابخانەی نێوەندیی سلێمانیی. دواتر لە٦/١٠/١٩٢٩ دا تا ١ تەشرینی یێکەمی ١٩٣٢ بووە بە مامۆستاییێکی ئەو نێوەندییە و لە دووا مێژووشدا لە ڕیزی فەرمانی مامۆستای نێوەندییەوە خراوەتە نێو ڕیزی مامۆستای سەرەتایی قوتابخانە — دووەم — ی سلێمانیی و هەتا لە ١٩٣٦/٣/٨ دا بە دەسەڵاتی (قانوونی زەیلی قانوونی تەقاعودی مەدەنیی — ژ٤٦ی ساڵی ١٩٢٥) لە وەزیفە دەرکراوە.[٢٣] دوای ئەم ڕووداوە هەتا مردنی، بە دەستمایەی چەند دوکان و خانوویێکی میراتیی ژیاوە و[٢٤] جاروبارەش ئەندامێکی لیژنەی تەماشاکردنی — خەملاندن —ی تووتنی سلێمانیی بووە ![٢٥]

ساڵح قەفتان لە یێکەم کۆمەڵی ڕۆشنبیریی عێراقیی ئاشکرا و خاوەند بەرنامە، (کۆمەڵی زانستیی کوردان)ی سلێمانیی لە ١٢ی تەشرینی یێکەمی ١٩٢٦دا هەڵبژێردراوە بە ئەندامێکی دەستەی ڕێبەری نوێ و[٢٦] خزمەتگوزاری بووە بەتایبەتیی کە دوای دەرکردنی لە وەزیفە، لە حوزەیرانی ١٩٣٦ دا و بەزۆری—موتەسەڕڕیف— ساڵح زەکیی ساحێبقڕان و پیرەمێردی سەرۆکی کۆمەڵی زانستیی، قاییل بووە کە ئەرکی ڕێبەریی کردنی (قوتابخانەی زانستیی) بگرێتە ئەستۆی خۆی و ئەوهاش ماوەتەوە هەتا دەمە و کۆتایی ساڵی ١٩٣٨و داخستنی (کۆمەڵەکە بەیێکجاریی و لکاندنی قوتابخانەکەیشی بە دەزگەی ڕەسمیی خوێندەواریی—مەعاریفی—دەوڵەتەوە !).

شـایانی گوتنــە چ سەرچـاوەیێکی مێـژوویی و سیاسـیی نێویـان نـەهێناوە کـە پێوەندییەکی بە کۆمەڵ و دەستەییێکی سیاسیەوە هەبێ و بەتەنێ ڕۆژنامەی (زبان) یـش لێی گوتووە کە کەسێکی سەربەستە.[٢٧]

بۆ پێوەندییشی بە ڕۆژنامەنووسییەوە، ئەوە هەر لـە ڕۆژنامـەی یێکـەمی سلێمانیی: (پێشـکەوتن—سـلێمانیی: س١٩٢٠)ەوە بـەنێوی ئاشـکرا یـان ناسـنێوێکی نادیـارەوە، گوتاری نییە.[٢٨] بەڵام یێکەمین گوتاری خۆی بەنێوی (فوئاد[٢٩] — خاوەن ئیمزاوە) لە گۆڤاری (ڕووناکیی—س١٩٣٦)ی هەولێردا بڵاوکردووەتەوە. دواتر لە ڕۆژنامەی (ژیان—س ١٩٣٦)ی سـلێمانییدا، شـایانی باسـە سـەرگوتاری ئـەم گۆڤـارەی دەیسـەلمێنێت کـە (لەمێژەوە) نیازی دەرکردنی گۆڤاری هەبووە و پەرۆشـی ڕۆژنامەنووسـیی بـووە بۆییێکـا دوای تێپەڕ بوونی ساڵ و نێوێ بەسەر دەرکردنـی لـە وەزیفـەدا، دانـراوە بـە نووسـەری دیاری ڕۆژنامەی هەفتانەی بەلەدییەی سـلێمانیی (زبـان — س ١، ژ ١، یێکشـەممە ١٢ ی ئەیلوولی ١٩٢٧) کە هەتا (سـەرەتای مـارتی ١٩٣٨) کـارگێڕی بـووە و ئیـدی پێوەنـدیی دابڕاوە و نێویشی لەسەر تەوێڵی ڕۆژنامەکەدا هەڵگیراوە.

لەدووای ئەم ڕووداوە و ئاوابوونی گۆڤاری (زانسـتیی) یشـی، هـیچ پێوەندییـەکی بـە ڕۆژنامەنووسـیی کوردییـەوە دیـار نییـە تـا لـە سـاڵانی١٩٤٠—١٩٤٣دا چـەند گوتـارێکی مێژوویی لە گۆڤـاری (گەلاویـژ) دا بڵاوکردووەتـەوە، لـە ئـەوە بـەدوواوە هـەتا مردنـی چ پێوەندییەکی نەماوە کە دەشبێ لە پێناوی پرۆژە مێژووییەکەیدا بووبێ کە خۆی بۆ دانا و دەڵێت: (لە ترسی غەڵەت کردن، زۆر بە شـێنەیی، ئـەم چـەند وەختـە خـەریك بـووم و دووەم شەڕی جیهان و حاڵەتی خووی خۆم و مەترسیی دەستدرێژیی دەوری بائید زۆری دواخستم، بەڵام نەبـەزیم و لـە تەقـەلادان دووا نەکـەوتم هـەتا ئـاواتم بـەجێ هـات و ئـەم نووسراوەم بەرهەم هێناوە و بە ناوی مێژووی نەتەوەی کوردەوە ناوم نا).[٣٠]

قەفتان زمانەکانی کوردیی، فارسیی، تورکیی، عەرەبیی زانیوە و پتر کەڵکیشی لە عەرەبیی وەرگرتووە. چ هەواڵی بەدەستەوە نییە داخۆ دەستی لە شێوەیێکی هونەر و جۆرێکی ئەدەبییاتدا هەبووبێ.

لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، دوو ژنی هێناوە کە لە دووەمیان نەوەی بەژیانەوەیە.[٣١]

قەفتان – بەقسەی نەوەی خۆی– بەر لەمردنی نەخۆش کەوتووە تا لە ڕۆژی٣٠ی ئابی ١٩٦٨دا هەر لەسلێمانییدا کۆچی ماڵئاوایی کردووەو لە گردی سەیواندا نێژراوە.[٣٢]

***نووسراوە چاپ کراوەکانی**

١. گوتار لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا.

١/١. گۆڤاری (ڕووناکیی – هەولێر).

١/١/١: خاسییەتێك لە خەواسی ڕۆحداران (س١، ژ٩، شەممە١١نیسان ١٩٣٦).

١/١/٢: چەند کەلیمەیێك لە مێژووی وریابوونەوەی ئەڵمان (س ١، ژ ١٠، شەممە ٢٥ نیسان ١٩٣٦).

١/٢. ڕۆژنامەی (ژیان – سلێمانیی)

١/٢/١: قسەی تەئریخیی، {باسی بیر و کردەوەی مارشاڵ بلیسودسکی سەرفەرماندەی پۆڵۆنیا کە دووای جەنگی گێتیی یێکەم پۆڵۆنیای دامەزراند}. (س ١١، ژ ٤٧٨، شەموو ٩ مایس ١٩٣٦).

١/٢/٢: قسەی تەئریخیی، {قسەکانی هیتلەر لە دادگەدا. هەروەها باسی لودندرۆڤی سەر ئەرکانی لەشکری ئەڵەمانیا لەیێکەم جەنگی گێتییدا!} (س ١١، ژ ٤٧٩، شەموو مایس ١٩٣٦).

١/٢/٣: {پاشماوەی بابەتی پێشوو}، (س ١١، ژ ٤٨٠، شەموو ٢٣ مایس ١٩٣٦).

١/٢/٤: {کۆتایی بابەتی پێشوو}، (س ١١، ژ ٤٨١، شەموو ٣ مایس ١٩٣٦).

١/٢/٥: قسەی تەئریخی: تەئسیری پروپاغەندە لەسەر بیری کۆمەڵ. (س ١١، ژ ٤٨٢، شەموو ٦ حوزەیران ١٩٣٦).

١/٢/٦: {پاشماوەی بابەتی پێشوو}، (س ١١، ژ ٤٨٣، شەموو ١٣ حوزەیران ١٩٣٦).

١/٢/٧: قسەی تەئریخی {بێ نێونیشان باسی پێوەندیی هەردوو دەوڵەتی ئەسپانیا و پۆرتیکنز}، (س ١١، ژ ٤٨٥، شەموو ٢٠ حوزەیران ١٩٣٦).

١/٢/٨: {پاشماوەی بابەتی پێشوو}، (س ١١، ژ ٢٨٥، شەموو ٢٧ حوزەیران ١٩٣٦).

١/٣: ڕۆژنامەی (زبان — سلێمانیی)، {گوتارە گرنگەکان}.

١/٣/١: نووسینیی کوردیی (س ١، ژ ٢، یێکشەممە ١٩ ئەیلوول ١٩٣٧).

١/٣/٢: بیعسە {لەسەر ناردنی قوتابیی بۆ خوێندن لە هەندەراندا}، (س ١، ژ ٤، یێکشممە ٤ تەشرینی یێکەم ١٩٣٧).

١/٣/٣: خوا بکا لە بەدبەختیمانەوە نەبێ. {لەسەر نرخ گرتنی ڕۆژنامە لەلای خوێندەوارانی سلێمانیی}، (س ١، ژ ١٣، یێکشەممە ١٩ کانوون یێکەم ١٩٣٧).

١/٣/٤: باس و هەواڵی ولاتانی — چین و ژاپۆن. (س ١، ژ ١٩، یێکشەممە ٣٠ کانوون دووەم ١٩٣٨).

١/٤: گۆڤاری گەلاوێژ — بەغداد.

١/٤/١: قسەی تەئریخیی — سەرچاوەی تەئریخی. ئەقوام ڕووناك نییە! (س ١، ژ ٣، شوبات ١٩٤٠).

١/٤/٢: کۆچ و ڕەوی ئەقوامی کۆن تەئریخی هێناوەتە کایەوە. (س ٢، ژ ١، ٢ کانوونی دووەم و شوبات ١٩٤١).

١/٤/٣: نەزەرييەى پەيدابوونى ئەقوامى هيند و ئوروپايى. (س ٣، ژ ٥، ٦ مايس و حوزەيران ١٩٤٢).

١/٤/٤: لەبابەت پەيابوونى نەتەوەى قەفقاسى و ئارييەوە. (س ٣، ژ ١١، ١٢، تەشرينى دووەم و كانوون يێكەم ١٩٤٢)

١/٤/٥: پەيدا بوونى ئايينى ئيسلام، بۆچ كەيانى ئاريى كۆن رووخا. (س ٤، ژ ٥، مايس ١٩٤٣).

٢. كتێب و ناميلكە.

٢/١: بەراووردێكى تەئريخيى و ئەهمييەتى زبان –س١٩٣٦. چاپخانەى سلێمانيى {ئامادەكراوە!}.

٢/٢: پەندى تەئريخيى – چەند پەرەيێك لە شۆرشى فرانسە، س ١٩٣٧. چاپخانەى نەجاح – بەغداد {وەرگێردراو لە عەرەبييەوە بە پێشەكيى و دووايى نووسراوى خۆيەوە!}

٢/٣: نەتەوەى كورد توركمان نين – س ١٩٥٩، چاپخانەى كامەران. سلێمانيى

٢/٤: مێژووى نەتەوەى كورد – س ١٩٦٩، چاپخانەى سەلمان ئەلئەعزەميى. بەغداد.

٢/٥: لە ولاتى گولێ زەنبەقى سپييدا " فەنلەندە " – س ١٩٧٠، چاپخانەى سەلمان ئەلئەعزەميى، بەغداد {دانراو بە رووسى و وەرگێردراو لە عەرەبييەوە. / لەمەر تێ كۆشانى گەلى فەنلەندە و دامەزراندنى بنچينەى دووا رۆژ و ئازاديى}.

٢. **هەوريى**

ئە. بێ.هەوريى، ئەبووبەكر جەلال، (١٩١٥ ز. گوندى چناران – دەربەنديخان – ١٩٧٩/٤/٨. بەغداد/ سلێمانيى): خوێندنى سەرەتايى و ناوەنديى لە سلێمانيى و فێرگەى مامۆستايانى لە بەغداد دا تەواو كردووە. (لە هەلى بلاوكردنەوەدا، قوتابيى

فێرگەی مامۆستایان بووە !). دوواتر مامۆستا و ڕێبەری چەند قوتابخانەیێکی سەرتایی سلێمانیی. شاعیر، درامانووس، نووسەر بە کوردیی و عەرەبیی و کۆمەڵێ بەرهەمی- بەهەندێ بابەتی مێژوویشەوە -چاپو بڵاوکردووەتەوە.. لەنێویاندا (دیوانی ئازار و ئاوات-س ١٩٥٦) و دراماکانی، (بووکی ژێر دەواری ڕەش- س١٩٦١) و (دڵداریی و پەیمانپەروەریی- س١٩٤٣و١٩٧١). ژنی هێناوە و نەوەی نییە. یاداشتی ژینی دەستنووسە و چاپ نەکراوە و لەلای کابانیەتی ! ! [٢٢]

---

## بەشی چوارەم:

### لێکۆڵینەوە.

### ١. نرخی ڕۆژنامەنووسیی و ڕۆشنبیریی بابەتەکان

لە (کوردستان) ی یێکەم ڕۆژنامەی کوردییەوە، پەیامی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی سەربەست، وریابوونەوە – اقاظ –ی[٢٤] خوێندەوار بووە لەپێناویی ژیریی و پێشکەوتنذا.. لە ئەو ڕۆژنامەیەشەوە بایەخ بە ڕووداوی سیاسیی نێوجیهان و خۆیش دراوە چ بەشێوەی هەواڵێکی کورت چ بە ڕاپۆرتێکی درێژکۆلە، تەنانەت ڕۆژنامەی نێوبراو دەستپێشخەریی کردووە بۆ نووسینی (لێك دانەوە) ی سیاسیی و گرنگ وەك ئەو گوتارەی بە سەر نێوی (کوردستانێدە ئەساسەن نیفاقی)[٢٥] کە تێیدا سیاسەت و پیلانی دەوڵەتی فرانسای ساڵی ١٩٠٢ ی بەرامبەر بە کوردستان و ناردنی ڕەبەنەکانی، بۆ جەماوەری خوێندەوار ڕوون کردووەتەوە!

ئەم خاڵەی سەر ڕووی ئەو ڕۆژنامەیە، دەمانبات بۆ تەماشاکردنی باری بڵاوکردنەوەی (ڕۆشنبیریی، سیاسیی، ئابووریی) لە ڕۆژنامەنووسیی کوردییدا کە مخابن بە شێوەیێکی چڕ و پڕ بایەخی پیٚ نەبڕاوە. ڕاستە هەروەك یێکەم ڕۆژنامەکە، جاروبار گوتارێکی سیاسیی لە ئەم گۆڤار و ئەو ڕۆژنامەدا هەڵکەوتووە، وەکو کردەوەی دووەم ڕۆژنامەی سلێمانیی، (بانگی کوردستان – س ١٩٢٢) کە جارێك خۆی خەریك کردووە بە وەڵام دانەوەی پرسیارێکی گرنگی وەك، "ئینگلیز سلێمانیی بۆچیی دەویٚ؟"[٢٦] و ویستنە ناڕەواو گڵاوەکەیشی لە ئەڵقەی سیاسەتی تەماعکارانەی ئینگلیز لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست و دووردا لەپێناوی ڕێگای بازرگانیی و زەوت کردنی کانە نەوتەکاندا ڕوون کردووەتەوە.. ڕاستیشە بڵاوکراوەی ڕۆژنامەنووسیی، بابەتی هۆشیار بوونەوەی لە چوارچێوەی گوتاری مێژوویی و کۆمەڵایەتییدا بڵاوکردووەتەوە وەك گوتارە مێژوویییە کوردەوارییەکانی حوزنی موکریانیی خاوەند گۆڤاری (زار کرمانجیی–س١٩٢٦).. بەڵام

تێکڕا ڕۆژنامەنووسیی کوردیی بایەخی نەداوە بە تەماشاکردن و (لێك دانەوە) ی قەوماوە سیاسییو ئابوورییەکانی جیهانو زۆران گرتنی وڵاتە زلەکان-لەسەر کەلاکی وڵاتە پچووکەکان - کە ئەم بابەتە پێوەندیی خۆڕاستی بە وڵاتان و گەلانی ئەم نێوچەیە و خۆمانەوە هەیە!

ئەگەر بە ئەم هۆش و بیرەوە لەتەواوی بابەتەکانی ئەم گۆڤارە وردببینەوە - کە مۆری سیاسەتیشی بەئاشکرا بەسەرەوە نییە، دەبینین کە گشت گوتارەکانی، کەلێنی ڕۆشنبیرییان پڕکردووەتەوە و لە ئەڵقەی (ڕۆشنبیریی - سیاسیی - ئابووریی) دا، بە دوو گوتارۆچکە گاڵتە جاڕە هەواڵ بەخشەکەشەوە، پریشکی هۆشیاریی دەبەخشێت و - وەك لە سەر گوتاری خۆیدا دەڵێت - بەڕاستیی دەخوازێت کە خوێندەواری ئێمە، (بەئاسانیی لە حاڵی دنیا بگەن و باس و هەواڵی ئەم جیهانە پێشکەوتووە وەرگرن!) و لەپێناوی ئەو ئامانجەشدا کە هەرخۆی نیشانەی کردووە و لێی گوتووە، (لە تەجرەبەی کۆن بۆ حاڵی حازر کەڵك وەرکیرێت و بۆ وریایی و قایمکاریی پاشەڕۆژ خۆ حازر بکرێت و ئەمەش لەسەر بناغەیێکی زانیاریی و وردبوونەوەیێکی هونەروەریی مێژوویی، بنیات بنرێت!)[٢٧] بە ئەو ڕۆشنایییە، دیارە قەفتان لە پێش ئەم گۆڤارەدا و هەتا دووا کردەوەی بیر و قەڵەمی، خۆی بۆ سێ بابەت دانابوو:

١. بابەتی مێژووی کۆنی گەلان و ئاشنا بوونیان و پەند لێ وەرگرتن.

٢. بابەتی مێژووی نوێی گەلان و ناسینی پێوەندیی نێودەوڵەتان و تێ گەییشتنی جم و جووڵی سیاسیی و ئابوورییان و کاریان لە ئێمەدا.

٣. کۆشش بۆ تێ گەییشتنی مێژووی خۆمان بە بیرێکی زانستانەوە!

بە ئەم پێیە، بەر لە ئەم گۆڤارەی ساڵی ١٩٣٨، قەفتان لە گۆڤاری (ڕووناکیی - س ١٩٣٦) دا یێکەم گوتاری بەسەر نێوی "چەند کەلیمەیێك لە مێژووی وریا بوونەوەی

ئەڵەمان"[٣٨] بڵاوکردووەتەوە کە بەستوویە بەباری زمان و هەڵس و کەوتی دواکەوتووی کوردەوارییەوە !

جێگەی بیرخستنەوەیە، هەر لە ئەو ساڵەدا، ئەو بابەتەی بەشێوەی نامێلکەیێ چاپ و بڵاوکردووەتەوە. دیسان هەر ئەو ساڵە لە ڕۆژنامەی (ژیان) و بە سەرنێوی (قسەی تەئریخیی) یەوە هەمان نیاز و ڕێبازی گرتووە. هەروەها وەك دیارە بەهەمان هەستەوە لە ساڵی ١٩٣٧ دا، شۆڕشی فرانسە — وەك پەندێ — ئاشنای خوێندەواری کورد کردووە. دیسان لە ڕۆژنامەی (زبان)ی سەرپەرشتیی کراوی خۆیدا، هەواڵەکانی ڕۆژگاری لێك داوەتەوە وەك باسەکانی پێوەندیی (چین و ژاپۆن). دوواتریش، یان هەر لە ئەو هەلەدا لە ئەم (زانستیی) یەدا پێوەندیی بریتانیاو ئیتالیاو ئەڵەمانیاو جم و جووڵی سیاسیی ئابووریيان و پلان و ئامانجی دوور ڕەویانی لە دەریای سپیی نێوەڕاستەوە تا ئەوپەڕی خۆرهەڵات، ڕوون کردووەتەوە. لە ئەمەش گرنگتر هێندە ژیر و زیرەك و وردبین بووە، لە٢٥ی شوباتی١٩٣٨دا (پێشبینیی قەومانی دووەم جەنگی گێتیی) ی کردووە کە پێشبینییەکەی بەڕاست گەڕاوە و جەنگەکە لە ٣ ی ئەیلوولی ١٩٣٩ دا قەوما !

ڕاستییەکەی ئەگەر بابەت و گوتار و لێك دانەوەکانی سیاسیی و ئابووریی زانستانەی قەفتان لە ڕۆژنامەنووسیی و کۆڕی ڕۆشنبیریی کورددا بکێشرێن، ئەوە بە چەند و جۆرەوە، کردەوەکانی —بەکوردیی— لە ئەم مەیدانەدا دەکەونە ڕیزی پێشەوە و ڕێزیان پێ دەبرێت !

**٢. باری دەرچوون و چارەنووسی؟**

لەبەر دەرگەی ئەم باسەدا، پێویستە نرخی دوو سەرچاوە بگرین:

**یێکەم**: سەرگوتاری گۆڤارەکە دەڵێت و (زۆر دەمێکە وەزارەتی داخیلییە ئیزنی لە چاپ دان و بڵاوکردنەوەی مەجەللەی زانستیی داومیێ، چونکە مەتبەعەیێکی خودی خۆمم نەبوو، هەتا ئێستا نەم توانیی نوسخەیێکی بڵاوبکەمەوە.. لەبەرئەوەی موددەتی

ـانوونیی بڵاوكردنەوەی لەم حەفتەیەدا بەسەر ئەچوو، ناچار بە پەلەپەل و ناتـەواویی وا
ـوسخەی یێکـەمینم بڵاوكـردەوە. دوو چاپخانە هەیـە لـە شـارەكەماندا، ڕەفیقـی خـۆم
ـەتبەعەكـەی بەلەدییـە، بـەڵام چـونكی نـاتوانیێ لـە حەفتەیێكـدا ڕۆژنامـەی "زبـان"و
"مەجەللە"كەی منیش لە چاپ بدا، بام دایەوە لای چاپخانەی دووەم، چـوومە خزمـەت
ـیرەمێردی موحتـەرەم جەنابی حاجیی تۆفیق ئەفەندیی، بەڕووی خۆشەوە تەكلیفەكـەی
ـوبووڵ كردم بیێ ئەوەی ئەركێك وە یا مەسرەفێك بخاتە سەرم، بۆی لە چاپ دام!).

**دووەم:** ئەحمەد شوكریی —لەسەر داخوازیم— باسی بۆ من گێڕایەوە و گوتی، (دووای
ڕابواردنی نزیكەی پێنج ساڵیێ لە چاپخانەی نـەجاح و لـەلای مـەلا عـەببوودی كـەرخیی و
ـایەر بەهجەت مەریوانیی و فێربوونی تیپچنین و چاپ كردن، لە ساڵی ١٩٣٥ دا هاتمـەوە
ـۆ سلێمانیی. لە ئەو ساڵانەدا مەحموود ئەفەندیی ڕەئیسی بەلەدییە بوو، لەگەڵ حاجیی
ـۆفیق بەگ – پیرەمێرد – ی خاوەندی ڕۆژنامەی " ژیان " كە كرێگرتەی چاپخانەكەی
ـەلەدییە بوو، ناكۆك بـوو. ئیجـازەی بـەكریێ دانـەوەی چـاپخانەكەی بـۆ پیرەمێـرد نـویێ
ـەكردەوە و مەحموود ئەفەنـدیی بـە مـنی گـوت كـە ئـەركی بـەڕێوەبردنی چـاپخانەكە و
ڕۆژنامەییێ بگرمە خۆم و من گوتم ئەمە بە من هەڵناسۆڕیێ!!

دووای ئەوە بەنێوی "زبان"ەوە، بەلەدییە خۆی، ڕۆژنامەی دەركـردو سـاڵح قـەفتان
بوو بە موحەڕیری و منیش تیپچن و سەرپەرشتی چاپ كردنی و بە نووسـینیش بەشـدار.
تەنانەت لەسەرەتادا من كلێشە كۆنەكەی ڕۆژنامەی "ژیان"م كڕاند و دوو خاڵم لـیێ لابـرد
و نێوەكە بوو بە"زبان". ساڵح ئەفەندییش مووچەی مانگانەی هەبوو، بەڵام مـن بـەنێوی
موراقیبییەوە – لە بەلەدییەدا – مووچەم وەردەگرت!

لەكاتی ڕۆژنامەی "زبان"دا، ساڵح ئەفەنـدیی، هـەر خـۆی نوسـخەیێكی "مەجەللـەی
زانستی"ی دەركردو نووسینەكانی هی خۆی بوون. مەجەللەكەیشی لە چاپخانە تازەكەی
پیرەمێـردد‌ا چـاپ كـرد و وەك دێتـەوە یـادم "٧١٠" دانـەی لـیێ بڵاوكـردەوە. هـەر ئـەو

ژمارەیەیشی لێ دەرچوو، بەڵام نایەتەوە یادم هۆی نەمانی چیی بوو؟! ئەویی بزانم سالح ئەفەندیی دەخڵی بەسەر ڕۆژنامەی "زیان"ەوە نەماو بەتەنێ مامەوە و گوتارم دەنووسیی و خەڵکی دیش هەروەها.

من تا توانیم ڕۆژنامەکەم ڕایی کرد، ئیدی کە هاتمە سەر ئەوەی بچمە دەورەی "برینپێچیی" دەخڵم بە ڕۆژنامەکە و بەلەدییەوە نەماو وابزانم زۆری نەبرد ئەویش لەکار کەوت و داخرا./ تەواو).{٣٩}

لەگەڵ نرخ گرتنی ئەم هەواڵانە، پێویستە گەڕان بۆ ڕاستیی لە ئەوەوە دەست پێ بکات بڵێین، ئەگەر ڕۆژنامەنووسیی چەرخێکی بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی بێت، پێویستە (ئەم گۆڤارە) ئاشکرایە لە ئەڵقەی بزاڤی ڕۆشنبیریی بازێڕی سلێمانییدا ڕابگرین و لەتای تەرازووی ئەودا بیکێشین و نرخی بزانین!

بە ئەو ڕۆشناییەش – چۆن لەپێشەکییدا پرسیم– سەرلەنوێ دەبێت بپرسینەوە، ئایا بەر لە ئەم گۆڤارە، لە ئەم بازێڕەدا نیازی دەرکردنی گۆڤارێ هەڵنەکەوتووە؟

ڕاستییەکەی هەرچەندە –هەتا ئێستە– هیچ لێ کۆڵینێکی ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسیی کوردیی و عێراقیی بە وەڵام دانەوەی پرسیارێکی ئەوتۆوە خەریك نەبوون، بەڵام وەڵامی ڕاست و ڕەوان و باوەڕ پێ کراو – فەرامۆش کراو – لەبەر چاوانە کە دەیسەلمێنێت، نەك هەر نیاز هەبووە، بەڵکو ڕەزامەندیی دەوڵەتیشی بۆ وەرگیراوە، تەنانەت بەنێوی گۆڤاری (زانستی) یشەوە!

ڕۆژنامەی سلێمانیی: (ژیان–س٢، ژ٥٧، پێنجشەممە١٠مارت١٩٢٧) بەڵگەیەو هەواڵی یێکەم دەگێڕێتەوە دەڵێت: (ئەم جارە ئیجازەنامەی دەرهێنانی مەجمووعەی – کۆمەڵە، گۆڤار / کەمال– زانستیی لە مودیری مەتبووعاتەوە بە سکرتێری جەمعییەتی زانستیی گەییشت.{٤٠} ئەم مەجمووعەیە وەك خەیاڵی لێ کراوە لە حەجمی شانزدە و یا بیست و چوار پەڕەییدا ئەبێ و هەر بە پانزدە ڕۆژ جارێك دەرئەهێنرێ. وا بە هیوایین کە بەم

نزیکانە بە مەقالاتی موفیدەی زانستیی و کۆمەڵایەتیی و ئەخلاقییەوە بخرێتە پێش چاوی خۆشەویستانی زانست و ئەدەب! /تەواو).

دووای ئەم هەواڵەی ساڵی١٩٢٧–بێ چاوکردنەوەی پڕۆژە گۆڤارەکە – جارێکی دی هەواڵ و بەڵگەی نوێ لە (ژیان–س٨، ژ ٣٦٢، پێنجشەممە٢٧نیسان١٩٣٣) دا سەر هەڵ دەداتەوە کە پیرەمێردی ڕۆژنامەنووس بەنێوی (زانست) ەوە سەرگوتارێکی بڵاوکردووەتەوە و تێیدا مژدە دەدا و دەڵێت: (ئێستا لەسایەی خواوە جارێ "ژیان" مان هەیە بە زمانی خۆمان. وا ئەم جارەش ئاوەڵێکی کاکیی بۆ پەیدا بوو.. کۆمەڵی زانستیی خۆمان کە لەمەوپێش دەستووری "ڕۆژنامەی زانست"ی وەرگرت بوو، چاوەڕێی هەڵکەوت بوو، وا خوا بۆی ڕێکخست کە بەم نزیکانە ئەیهێنێتە دەرەوە و ئەیبەشێتەوە... "ژیان" هەر ناوێکە ناوی ئاوایە و چونکە ناوێکی دیوانیی لەسەرە سەربەخۆ نابێ و نیوەی ڕاستیشی ئەبێ بە هاوار و بانگ و جارچییەتیی بڕوات.. بەڵام "زانست" سناعیی، زراعیی، تەئریخیی، تەنها لە سیاسەت نادوێ.. لە نەوجوانەکانمان زۆر کەس دێنێتە سەر سەودای شتی جوان نووسین.. ئەمە لاوکێکە بۆ لاوان. ئینجا کورگەل یتانبینم وەرنە مەیدان، بیکەنە گاڵەی زانستیی، هەرییێکە پەندێکی جوان بنووسێ، جارێ پەسەند نەبێ جارێکی تر، بەڵام لەوە تووڕە مەبن کە ئەوەی نووسیوتانە کوتوپڕ لە "زانست" دا چاپ نەکراوە.. پیری زانستیی–پیرەمێرد/ کەمال – بۆتان ئەنووسێتەو کە کوێی خراپ بووە، ئێوەش پینەی ئەکەنەوە یا هەڵیئەوەشێننەوە، سەرئەنجامی هەروای لێ دێ کە ڕێ بە دێیێ بکا... هتد).

دووای ساڵێ و بۆ سێیەم جار، دیسان هەواڵ و بەڵگە دێتە پێشەوە کە هەمان ڕۆژنامە، (ژیان–س٩، ژ ٤٠٧، شەممو ١٦ ئاغستۆس ١٩٣٤) دەڵێت: (مەجەللەی زانست کە مەجەللەیێکە عیلمیی، ئەدەبیی، ئیقتیسادیی. دەست بە نەشر بوونی دەکرێ! /تەواو).

کەواتە وەك دڵنیا بووین لە نیازی کۆنی بازێڕی سلێمانیی و پێشڕەویی (کۆمەڵی زانستیی) بۆ هێنانە دی پڕۆژە گۆڤار — ڕۆژنامەیێ، دڵنیاش دەبین کە کۆمەڵەکە لەماوەی هەشت ساڵدا: (١٩٢٧—١٩٣٤) پڕۆژەکەی بەدەستەو هەبووە و وێڕای بڕکردنی ڕەزامەندییەکەی دەوڵەت، پڕۆژەکەی پێ جێبەجێ نەکراوە ! !

ئایا دووای هەواڵەکەی ساڵی١٩٣٤جێبەجێ کرا؟ ڕاستییەکەی هەتا دەرچوونی گۆڤارەکەی ساڵح قەفتان، چ سەرچاوەییێکی ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسیی — بە ڕۆژنامەی "ژیان" یشەوە هەرگیز توخنی باس کردنەوەی نەکەوتوون و نیازی دەرکردنی گۆڤارێکی دی هەڵنەکەوتووە و هێندەی هەیە لە(٢٠ ئەیلوول١٩٣٧) دا "بەنگینە"ی شاگردی قوتابخانەی زانستیی، بەدەم بەخێرهاتنی پارێزەر ئیبراهیم ئەحمەدەوە بۆ سلێمانیی، دەڵێت: (بیستوومانە خەریکە مەجەللەی کوردیی لە چاپخانەی تازە — پیرەمێرد —دەردەهێنرێ!)[٤١]، بەڵام ئەم هەواڵەش هەرگیز بەڕاست نەگەڕاوە.

کەواتە ئەم بێ دەنگییە بەرامبەر پڕۆژەی باس لێ کراو، واتەی سەرنەگرتنی و هەڵنەکەوتنیەتیو گۆڤارەکەی (زانستیی)ی ساڵح قەفتانیش کۆتایی بە باسەکە هێناوە !

بۆچیی پڕۆژە گۆڤار — ڕۆژنامەی کۆمەڵی نێوبراو سەری نەگرتووە؟

ڕاستییەکەی ئەمە مەبەستی گەورەم نییە و من باسێکی دی گرنگتر پێ ویست دەبینم لێی بدوێم کە ئەوەیە، ئەم گۆڤارەی ساڵح قەفتان چ جۆرە پێوەندییەکی بە (مەجموعەی زانستیی) و (ڕۆژنامە و مەجەللەی زانست) ی هەردووك دنیا نەدیدەوە هەیە کە بە نێو و قەبارە و دروشم و ئامانجەوە — بەئاشکرا— نزیکیی دیارە؟ ئەمەش لە هەلێکدا کە قەفتان دەڵێت، (زۆر دەمێکە) ڕەزامەندیی وەرگرتووە و پیرەمێردی ڕۆژنامەنووس و خاوەند چاپخانەش (ئەرك و مەسرەفێك) ی نەخستووەتە سەر شان و بەڕووی خۆشەوە بۆی چاپ کردووە؟

بۆ نەبوونی پێوەندییێ، ئەم بەڵگانە دێنە زمان:

١. گۆڤارەکە خۆی، لەژێر سێبەری قانوونی چاپەمەنیی ژمارە "٥٧"ی ساڵی ١٩٣٣ی دەستکاریی کراو بە قانوونی چاپەمەنیی ژمارە "٣٣"ی ساڵی ١٩٣٤ هەڵکەوتووە و ئەگەر سەر بە کۆمەڵی نێوبراو بووایە، دەبوو بەڕۆشنایی ئەو، هەواڵی پێوەندیی خۆی بنووسیایە. بەڵام وێنەی گۆڤارەکە و سەرگوتارەکەیشی دەیسەلمێنن کە خۆی خاوەند و بەرپرسیاریەتی و ئەمەش بەندی "٦"ی ماددە دووی ئەو قانوونە ئەم مافەی داوەتێ.[٤٢]

٢. گوتارەکانی گۆڤارەکە، هەرگیز توخنی نێوی کۆمەڵی باس کراو و پڕۆژەکانی نەکەوتوون، چۆن لە هەواڵەکانی پڕۆژەکانی ساڵانی ١٩٢٧و١٩٣٣و١٩٣٤ی کۆمەڵەکەشدا، (نێوی قەفتان) هەرگیز دەرنەکەوتووە، هەروەها لە هیچ گوتارێکی (ژیان) دا!

٣. نووسینەکانی گۆڤارەکە بەرهەمی بیر و قەڵەمی ساڵح قەفتان خۆین و کەسێکی دی ناسراوی کۆمەڵەکە –وەك پیرەمێرد– هاریکاریی گوتار و نووسینی نەکردووە!

٤. سەربەستیی قەفتان و گۆڤارەکەی بە ڕادەییکە هەتا ئەوەی بلێت، (بەنانەزکییش بێ لێی ڕاناکەم، بەڵام چیی بکەم بەبەرمەوە نییە لە کیسەی خۆم خەرج بکەم!!).

٥. گوتەکانی ئەحمەد شوکریی– لای من – دەیسەلمێنێت کە خۆی دەریکردووە!

لە ئێرەدا پرسیار سەرهەڵدەدات، ئەی ئەم وێکچوونە چییە و ئەو ڕستە ناتەواوەی قەفتانیش (لەمێژەوە!!) چیی دەگرێتەوە؟ بێ درێژکردنەوەی قسەوباس – چونکە بەڵگەنامەی ڕەسمییانەی کۆمەڵی زانستیی و ڕۆژنامەنووسیشمان چنگ نەکەوتووە!! – بیروبڕوای من بەرامبەر بە ئەو وێکچوونە بە ئەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١. قەفتان – وەك باسی کرا – لە دوو ڕۆژگاری جوێدا پێوەندیی خۆوڕاستانی بە (کۆمەڵی زانستی) یەوە هەبووە.. جاری یێکەم لە تەشرینی یێکەمی ١٩٢٦ دا و حەوت

مانگێ دووای هەڵبژاردنی خۆی و دەستە نوێیەکەی کۆمەڵەکە، هەواڵی پرۆژە گۆڤار: (مەجمووعەی زانستی) ی هەڵکەوتووە.

جاری دووەم لەدووای دەرکردنی لە حوزەیرانی ١٩٣٦ دا کە ڕێبەری کردنی قوتابخانەکەی (زانستیی) پەسەند کردووە!

٢.پیرەمێرد – لە ڕۆژنامەکەیدا – کە هەواڵی قابیل بوونی بڵاوکردووەتەوە، دەڵێت، (ئیقناعمان کرد!!). هەروەها دەڵێت، (وەك سەعادەتی موتەسەرریف بۆی نووسیوە!!)[٤٣] ڕەنگبێ ئەم وشە وردانەش ئەوە بگرێتەوە – ئەوێکی بێ وەزیفەی حوکوومەتیی – بەڕەزامەندیی پیرەمێردی سەرۆکی (زانستیی) ئەوکاتە و خاوەندی ڕۆژنامەی (ژیان) و بەلایێن گرتنی کۆنە ڕۆژنامەنووس – موتەسەرریفی سلێمانیی، پرۆژە کۆنەکەی زانستیی (بەنێوی خۆیەوە ببووژێتەوە!) و ڕەنگبێ لە ئەو هەلەوە کە دوو ساڵێ دەبێت، بەهۆی ئەو موتەسەرریفەوە (داخوازیی بۆ ئەم گۆڤارە) پەسەند کرابێ و ڕستەی (لەمێژەوە) هەر ئەو ماوەیە بگرێتەوە.

ئەگەر یێکێ گومان بکات و بلێت، ڕستەی (لەمێژەوە!!) زووتر دەگرێتەوە، ئەوە من دەپرسم، ئایا زووتر ساڵانی١٩٢٣،١٩٢٧،١٩٣٤و بەرەو ژووتر دەگرێتەوە؟ ئەگەر وابێ ئەوە لەلایێکەوە دەستەی ڕێبەریی کۆمەڵی زانستیی، هەموو ساڵێ بە هەڵبژاردن گۆڕینی بەخۆوە دیتووە. بۆ وێنە لە ٢٣ ی مایسی١٩٣٠دا[٤٤] چ پیرەمێرد، چ ساڵح قەفتان لە دەستەی ڕێبەرییدا نەماون کە ئەمە وێنەی دابڕانی هەموو پێوەندییەکی ڕەسمییانەیە! هەروەها ئەگەر ئەو ماوە باس کراوەش بگرێتەوە – واتە لەنێوان ١٩٢٦ – ١٩٣٤ کە مامۆستاو فەرمانبەر بووە، ئەوە بەپێی بەندی: ٥ی ماددەی دووەمی قانوونی نێوبراو بۆی نییە ڕێبەر و بەرپرسیاری چاپەمەنیی بێ![٤٥]

٣. دووا هەواڵی بڵاوکراوەی ١٦ ی ئابی ١٩٤٣ لەمەڕ دەست دانە دەرکردنی (مەجەللەی زانست) کە بێ گومان دەبێت دووای وەرگرتنی ڕەزامەندیی قانوونیی

هەڵکەوتبێ و گۆڤارەکەیش هەر دەرنەچووە، چ پێوەندییەکی ڕەسمییانەی نییە بە ڕەزامەندییە ڕەسمییانەکەی گۆڤارەکەی قەفتانەوە، چونکە ئەگەر هەیبووایە هەر ئەوکاتەی پیرەمێردی سەرۆکی زانستیی لە ١٤ ی ئابی ١٩٣٤ دا چاپخانەکەی بەلەدییەی بەکرێ گرت و ماف دەرکردنی ڕۆژنامەی (ژیان) ی بەلەدییەی هێنایە سەرخۆی[٤٦] بەهەر جۆرێ ببووایە گۆڤارەکەی دەردەکرد!

٤. پەرۆشیی و هاریکاریی پیرەمێردی سەرۆکی زانستیی ئەوکاتە، بۆ چاپ کردنی گۆڤارەکەی قەفتان بە چاپخانەکەی خۆی و (بەبێ ئەرك و مەسرەف!) مایەی پێوەندییەکی قانوونیی نییە بە گۆڤارەکەی قەفتانەوە، بەڵکو مایەی پەرۆشییەتی بۆ پرۆژە سەرنەگرتووەکەی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی و (کۆمەڵی زانستیی) بەربەرەکانیی کراو. هەروەها بەڵگە و وێنەی دۆستییە لەگەڵ قەفتان، ئەگەرچیی هەر لە ئەو هەلەدا، قەفتان نووسەری ڕۆژنامەی (زبان)ی بەلەدییەش بووە! کەواتە نزیکیی گۆڤارەکەی قەفتان و پرۆژە گۆڤار و ڕۆژنامەی (کۆمەڵی زانستیی سلێمانیی) نیزیکییەکی گیانیی گیانییە نەك ماددی و قانوونیی!

ئێستە وادەی ئەوەیە بپرسین: ئایا گۆڤارەکە لە کەشێکی ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسیی خۆش و ڕۆژگارێکی ئاساییدا هەڵکەوت؟ ئایا پەلپ و بیانووی براندنەوەی ماوەی ئیجازەی گۆڤارەکە — ئەویی لەمێژەوە وەرگیراوە — لەنیازێکی خراپەوە سەری هەڵنەداوە؟ ئایا قەفتان لەبەرنەبوونی چاپخانەیێکی تایبەتیی، تەنیا باڵیی و بێ دەرامەتیی، هەروەها لەبەر پێوەندییەکەی بە (زبان) ەوە دەستی لە ئەو گۆڤارە بەنرخە هەڵگرتووە؟

ئەم پرسیارانە وەك ڕەوا و پەسەندن، مخابن لە ڕوویاندا بەڵگەنامەیێکی ڕەسمییانە بەردەست ناکەوێ تا باری وەڵام زوو و ئاسان بێت؟ بۆیێکا ناچار، بە دەورکردنەوەی

باری ڕۆشنبیریی سلێمانیی ساڵی ١٩٣٨، چەند بتوانم لە نهێنیەکانی ئاوابوونی ئەم گۆڤارە بێکەمە دەگەڕێم!

باری ڕۆشنبیریی ئەم بازێڕە، هەر لە ساڵی ١٩٢٠ بەدواوە، شایانی گەلێ لێ کۆڵینەو وردبوونەوەیە، چونکە گەلێ قەوماوی سیاسیی گرنگ، هەڵس و کەوتی خۆش و ناخۆش، تاریك و ڕوونی لێ قەوماوە. ئەگەر زانستانەش بنۆڕین، ئەوە دوای کارەساتی ٦ ی ئەیلوولی ١٩٣٠[٤٧] ناسکترین و سەختترین ڕۆژگاری ڕۆشنبیریی ئەم بازێڕە لەنێوەندی ساڵی ١٩٣٦ ەوە تا سەرەتای ساڵی ١٩٣٩ دەخایێنێ، بەتایبەتیی لەگەڵ هاتنی موتەسەڕڕیفی نوێی سەرسەخت – دووای ساڵح زەکیی ساحیبقڕان[٤٨] – کە لە١/١٠/ ١٩٣٧دا هاتە سلێمانیی!

جارێ لەسەرەتای ساڵی ١٩٣٦ دا، تا مانگی ئابی ئەو ساڵە: (بەلەدییە) ی سلێمانیی مووچەی مانگانەی مامۆستاکانی قوتابخانەی زانستیی بڕیی کە هەشت ساڵ بوو مانگی سەد ڕوپییەی بۆ دانا بوون[٤٩] هەر (بەلەدییە) لە٢ی ئابی١٩٣٧دا– دوای ساڵح زەکیی ساحێبقڕان – ئیجازەی بەکرێ دانەوەی چاپخانەی (ژیان) ی بەلەدییەی بۆ (پیرەمێرد) نوێ نەکردەوە و کۆسپی خستە بەردەم ڕۆژنامەی (ژیان) ی ئەو ڕۆژنامەنووسە دڵسۆزە کەناچار بوو پەلەپەل چاپخانەیێکی گەورەی بکڕێ و تا چرای (ژیان)ی نەکوژێتەوە.[٥٠]

جێگەی گوتنە، سەرۆکی بەلەدییە هەر ئەو مەحموود ئەفەندیە[٥١] باس کراوەی ئەحمەد شوکریە کە گۆیا لەگەڵ پیرەمێرد ناکۆك بووە. بەهاتنی موتەسەڕڕیفی نوێش، کێشەی ڕۆشنبیریی گەورەتر بووە کە شایەدی حاڵ، ڕووداوەکان باس دەکەن..

پیرەمێرد خۆی دەڵێت: (لە زەمانی مەجید یەعقووبیدا لە خانووەکەی زانستییدا، دەریان کردین! مستەفا سایب بوو کە لە مەعاشی خۆی لە گەڕەکی دەرگەزێن خانووی بەکرێ گرت!.)[٥٢] هەروەها پتر دەڵێت، (دەستەی.. چوونە لای موتەسەڕڕیفی ئەوسایە کە مەجید یەعقووبی بوو، شکاتیان کرد. چەرمەسەرییەکی زۆریان داین و

قوتابیی زانستیی حەپس کران و غەزەتەکەیان داخستم. کەس نەیئەوێرا بێ بەلاما !). {٥٣}

سەرچاوەیێکی ئاگەداریش وردتر باس ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت، (لە١٠ی مارت١٩٣٨دا کە ژمارەی "ژیان" گەییشتە ٥٥٣، بەهۆی ئەوەوە کە جارجار – پیرەمێرد – بەلاتینیی ئەینووسیی و بەکردنەوەی ئاگری نەورۆز، خیرخوا و دوژمن لێی نەگەڕان و وتیان پیرەمێرد ئەیەوێ کورد بکا بە گاوور، ڕۆژنامەکەی داخست !). {٥٤}

سەرچاوەکە پتر دەڵێت، (مەجید یەعقووبیی نەك تەنها ڕۆژنامەی " ژیان " ی داخست، لام وایە پیرەمێردیشی بە ڕەنگی تەنگەتاو کرد، شاری سلێمانیی کە مەڵبەند و نیشتیمانی بوو و ئەستەموولی بۆ بەجێ هێشت بوو، بەجێی هێشت و ڕووی کردە بەغداد ! !). {٥٥}

ئەحمەد شوکرییش لە گوتارێکی سەردەمی کێشەکەدا دەڵێت، (قوتابخانەی زانستیی هەرچەندە موددەتێك لەمەوپێش بێ خاوەن و چاودێریی مابووەوە، ئەمە موددەتێکە دراوەتە دەست مەعاریف... ئەم مەکتەبە مەعاریف سەرپەرشتی ئەکا !). {٥٦}

کەواتە، هەنگاو بە هەنگاو، مووچەی مانگانەی مامۆستاکانی زانستیی ماوەیێ بڕا. دواتر (کۆمەڵی زانستیی) لە خانووەکەی – بەلەدییە – دەرکرا. هەروەها ئاهەنگ گێڕانی نەورۆز قەدەغە کرا. قوتابییەکانی زانستیی بەند کران. پیرەمێردی هاونیشتیمان و سەرۆکی کۆمەڵی زانستیی بەدەم داخستنی ڕۆژنامەکەیەوە تەنگەتاو و ناچار کرا ڕوو بکاتە بەغداد و لە ئەم لایەشەوە قوتابخانەی زانستیی خراوەتەوە پاڵ دەزگەی مەعاریفی ڕەسمییەوە !

بەکورتیی (کۆمەڵی زانستیی کوردان) هەڵوەشێندرایەوە و پیرەمێرد ئەوەی بۆ ماوەتەوە تا زۆر درەنگ هەر بڵێ: (ئەویی زانستیی شێواند، خوا بیشێوێنێ !). {٥٧}

لە کلاوڕۆژنەی ئەم کێشە گەورەیەی ڕۆشنبیریی باژێڕەکەوە ئەگەر ورد تەماشا بکەین، دەبینین کە مێژووی دەرچوونی (گۆڤاری زانستیی) سالّح قەفتان کە ٢٥ی شوباتی١٩٣٨ـە ڕێکەوتی گەرمەی کێشەکەیە، بەڵکو "١٣" ڕۆژ بەر لەداخستنی ڕۆژنامەی (ژیان)ی پیرەمێرد کەوتووە. ئەمە لە هەلێکدا قەفتان لەلایێکەوە ڕێبەری قوتابخانەی زانستیی بووە و لەلایێکی دیەوە نووسەری ڕۆژنامەی (زبان)ی بەلەدییە بووە و گۆڤارەکەیشی، (زانستیی) بە چاپخانەی (ژیان)ی پیرەمێرد و هاریکاریی ئەو چاپ و بلاوبۆتەوە.

کەواتە وێڕای کەشی فێنکی سەرگوتاری گۆڤارەکە، ڕاستییەکە ئەوەیە، گۆڤارەکە لە بارێکی تەنگ و ناسکدا هەڵکەوتووە و بێ گومان تووشی شالاوی کێشەکەش بووە بۆییکا:

١. دووای ئەو ژمارە تاقانەیە، چ بەڵگەیێ دیار نییە کە ژمارەی دی لێ دەرچووبێ.

٢. دووای ئەو ژمارە تاقانەیە، پێوەندیی قەفتان بە ڕۆژنامەی (زبان) ی بەلەدییەوە نەماوە و نێوی لەسەر هەڵگیراوە و هەتا دووا ژمارەیشی هەرگیز نووسینێکی ئەوی تێدا نییە.[٥٨]

وێڕای ئەوە، مەنتیق دەڵێت، کە قوتابخانەی زانستیی خرابێتە پاڵ دەزگەی مەعاریف —دەرکردی— دیارە پێوەندیی بە ئەو قوتابخانەیەشەوە نەماوە!

بە ئەم شێوەیە، چارەنووسی گۆڤارەکە ئەوها خۆی دەنوێنێ کە: بە هەر بیانوویێکی "ئیداریی/ڕێبەریی "نەك" داوەریی/قەزائیی"، بە فەرمانی نوێنەری وەزیری نێوخۆ کە موتەسەڕیفە، گۆڤارەکە ڕاگیراوە، یان ئیجازەکەی هەڵوەشێندراوە[٥٩]. ڕاستییەکەیشی بابەت و گوتارەکانی، هەروەك نێو و نیشان و دیاربوونی خاوەندەکەی، لە ئاستی

انوونی چاپەمەنیی باس کراودا، چ سەرپیچییەکان تێدا نییە تا ببێتە مایەی
ڕژاندنەوەی کە موخابن بۆ بەرەو دوا چرای کوژایەوە!
جێگەی گوتنیشە، هێندەی کرد و کۆشم کردووە و سەرنجم داوە، ڕۆژنامەی (زبان)
بەلەدییە و (ژین)ی[٦٠] پیرەمێردیش کە جێگەی (ژیان) ی گرتەوە، هەرگیز توخنی
سەرهاتی گۆڤارەکە نەکەوتوون و قسەیێکیان لێ نەنووسیوە. لە ئەوەش گرنگتر
ەرگیز بەلگەیێکم نەهاتە ڕێ، دلێ بۆ دەرچوونی ژمارەیێکی دی داخورپێنێ!

**ئەنجام**

ئەم گۆڤارە یێکەمەی سلێمانیی — بە ئەو مۆمە تاقانەیەوە — هەرچەندە لە ئاسۆی
ڕۆشنبیریی و ڕۆژنامەنووسیی کوردیی ئەو بازێڕە ناسراوەدا درەنگێ هەلکەوتووە، سێ
ڕۆشنایی زێڕینی هەیە:

١. خۆی وێنەی ئاشکرای پێویستییەکەی ڕۆشنبیریی کورد و کۆمەلانی ڕۆشنبیرە
رامە و دلسۆزەکانە!

٢. خۆی وێنەی گرانبەهای گۆڤارێکی سەربەست و زانستپەروەرە.

٣. خۆی وێنەی ئیرادە و ورە و کۆششی ئینسان و ڕۆژنامەوانی دلسۆزە.

ڕۆشنایی یێکەمین چاومان ڕۆشن دەکاتەوە بۆ جوانبینیی تێ کۆشانی ڕۆشنبیریی
ەوەم کۆمەلی ڕۆشنبیریی ئاشکرای سلێمانیی، (کۆمەلی زانستیی کوردان)، بەتایبەتیی
ـ و کردەوەی چاك و بڕیاری زێری بۆ داهێنانی پرۆژە (گۆڤارێکی زانستیی) و (کڕینی
اپخانەیێ) کیش[٦١] تا زمان و ئەدەبیاتی کوردیی بێ ناز و بە چاپ نەگەییشتوو
ووژێتەوە و ڕۆشنبیریی پێ بخاتە دەروازەی پێشکەوتنەوە کە موخابن چاوی پیسی
ڕۆژگار و بەربەرەکانی ناحەزانی زانست و ڕۆشنبیریی و پێشکەوتن ڕوو بە ڕووی
ەبوونەوە و ئەویش لەگەلێ هەر هەلس و کەوتنێ بڕیاری ورەی دووپات دەکردەوە و
ەستی لێ هەلنەدەگرت، هەتا لە ڕۆژگارێکی ناسك و تەنگی خۆی و ڕۆشنبیریی

بازێڕەکەدا، بە کۆشش و نێوی تاقە کەسێکی وەك قەفتانیشەوە بووبێ، هەر بەرهەڵستی نواندووە و بیر و نێوی (گۆڤاری زانستی) یشی لەدوای دوانزە ساڵ، بەسەر ڕۆژگاردا سەپاندووە و تەجرەبەیێکی سەختی ڕۆژنامەنووسییشی لە مێژووماندا تۆمار کرد.

هەڵکەوتنی ئەم گۆڤارە تەجرەبەیەش، نهێنیی پرسیاری دواکەوتنی ڕۆشنبیریی کوردیشی ڕوون کردەوە بە ئەوە ئەگەر پڕۆژەی کۆمەڵی نێوبراو — بە گۆڤار و چاپخانەوە — ئاسوودە بووایە و سەری بگرتایە، ئەوە ساڵانی تەمەنی بزاڤی ڕۆشنبیریی (١٩٢٧—١٩٣٨) ی بازێڕەکە، تەنانەت دوواتریش، خێرێکی زۆری بۆ ڕۆشنبریی و ڕۆژنامەنووسیی ئەمڕۆ و دوا ڕۆژ دەدایەوە و قۆناخی ئێستەش جۆرێکی پێشکەوتوو دەبوو!

دیسان هەڵکەوتنی ئەم گۆڤارە، ستەمی کاربەدەستانی قانوون شکێن دەنوێنێ کە چۆن گوێ ڕایەڵی ناحەزان بوون و بەربەرەکانی ڕۆشنبیریی و ڕۆشنبیرانی کوردیان کردووە!

هەرچۆنێ بێ، ئەم گۆڤارە یێکەمە و کردەوەی مێژوویی ساڵح قەفتان و هاریکاریی پیری ڕۆژنامەنووسان پیرەمێرد، لاپەڕەیێکی پیرۆزی ڕۆژنامەنووسیی کوردییە و پەندێکی گەورەیە بۆ ئەقڵی کورد و ڕۆژنامەوانی ڕاستەقینە!

**<u>پەراوێز — تەماشاکراو.</u>**

{١}. بەسەرنێوی، (ساڵح قەفتان و یێکەم گۆڤاری سلێمانیی) یەوە، لە گۆڤاری: کاروان -- س ٧، ژ ٧٨، ئاب ١٩٨٩ دا بڵاوە.

هەروەها لە ساڵڕۆژی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی، لە٢٢/٤/١٩٨٩ دا وەك موحازەرەیێ لە هەولێردا پێشکەشم کرد. (ئەمە دووا پێداچوونەوەمە!).

جێگەی تۆمارکردنی ئەم ڕاستییەشە کە من بەسەرنێوی (یێکەم گۆڤاری سلێمانیی) یەوە بۆ گۆڤاری (کاروان)م نارد، کەچیی هەندێ لە دەسەڵاتدارەکانی ئەو گۆڤارە — بێ ئاگاداریم --

ئەو سەرنێوەیان لێ نابوو. دوای بڵاوبوونەوەیشی ڕەخنەم لێ گرتن کە ئەوە کردەوەی من نییە و ئەو سەرنێوە، در. عیززەددین مستەفا بەکاربردووە. کەچیی یێکێ لە ڕاوێژکارانی گۆڤارەکە — حەمە پێنجوێنی — پێی گوتم، کارگێڕەکانی گۆڤارەکە ئەو سەرنێوەیان پەسەند بوو! !

ڕاستییەکەی گۆڤاری نێوبراو کە خۆمم بۆ خزمەت کردنی دانا، بەهۆی کەسانێکی خۆپەرستی وەك جێگری سەرنووسەرەکەیەوە — حسێن عارف — کەوتنە بەرهەڵستیم و ئەم جۆرە کردەوانەشیان هەر بۆ دڵتەنگ کردن و ورووژاندنم بوو کە بەرە بەرە ناچاریان کردم لەگۆڤارەکە دووربکەومەوە !( لەساڵی ١٩٧٠دا منی سەرپەرشتی ڕۆژنامەی هاوکاریی حسێن عارفمم مانگی بە بیست دینار دامەزراند)

{٢}. خاوەندەکانیان بەڕێز: جەمالوددین بابان، ساڵح زەکیی ساحیبقڕان، حسێن حوزنی موکریانیی، مستەفا شەوقی ڕەمەزان، شیت مستەفا و حسێن حوزنیی.

{٣}. ڕۆژنامەکان: (پێشکەوتن—سلێمانیی:س١٩٢٠)، (بانگی کوردستان— س١٩٢٢)، (ڕۆژی کوردستان— س١٩٢٢و١٩٢٣)، (بانگی حەق—س ١٩٢٣)، (ئومید ئیستیقلال — س ١٩٢٣ و ١٩٢٤) و (ژیانەوە — س ١٩٢٤) و (ژیان — س ١٩٢٦).

{٤}. عەلائەددین سەججادیی — مێژووی ئەدەبی کوردیی، بەغداد ١٩٥٢. چاپخانەی مەعاریف، ل ٥٥٥.

{٥}. بەوێنە: جەمال خەزنەدار — ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردیی. بەغداد ١٩٧٣، هەروەها فایەق عومەر تۆفیق — ڕۆژنامەی. هاوکاریی، دووشەممە ١٨/٩/ ١٩٧٨.

{٦}. در. عیززەددین مستەفا ڕەسووڵ (ساڵح قەفتان و زانستیی و زبان)، هاوکاریی— ٢٢/٤/ ١٩٨٢.

{٧}. لەنیوەی ساڵی١٩٧٥دا لە ڕادیۆوە ڕاگواسترامەوە بۆ مووزەخانەی سلێمانیی. لە کتێبخانەی ئەوێدا هەلێکی زۆرم بۆ هەڵکەوت و ئەو هەواڵە گرنگانەم بۆ هەلێکی وەك ئێستە قۆستەوە.

{٨}. وەك کتێبخانەی موزەخانەی سلێمانیی. کتێبخانەی گشتیی سلێمانیی. کتێبخانەی زانکۆی سەلاحوددین. کتێبخانەی مەڵبەندی بەغداد. کتێبخانەی خۆیی محەممەدی خاڵ.

{٩}. بنۆڕە: زبان–س ١،ژ ٢، یێکشەممە ١٩ ئەیلوول ١٩٣٨.

{١٠}. هەمان سەرچاوە.

{١١}. بنـۆڕە: محەممـەد خـاڵ – فەرهـەنگی خـاڵ – ج ٣، چـاپخانەی کامـەرانیی، سلێمانیی١٩٧٦/ نامەیێکی پیرۆزبایی ساڵح قەفتان بۆ محەممەدی خاڵ.

{١٢}. تۆمـاس ئێـدوارد لـۆرێنس (١٨٨٨ ز–١٩٣٥ ز): کەسـێکی سەرچـل، سـەرباز، لـێ کۆڵێکی بەریتانیایی. لەزانکۆی ئۆکسـفۆردا خوێندوویـەتی. لەسـاڵی ١٩١١ ز. دا چـووەتە پـاڵ دەستەیێکی پشکنەری ئەنتیکە لە عێراقـدا. هـەتا سـاڵی١٩١٤ لـە وڵاتـەکانی عەرەبدا و زمـانی عەرەبییش فێربووە. لەگەڵ قەومانی یێکەم جەنگی گێتیی، چووەتە پاڵ دەزگـەی خەبـەرداریی لەشکری بەریتانیایی لە میسردا. لە ساڵی ١٩١٦دا چووەتە پاڵ لەشکری عەرەبیی کە فەیسەڵی کـوڕی حسـێن – یێکـەم– سـەرکردەی بـوو، کـە مەشـخەڵی شۆڕشـی دژی حـوکمڕانیی عوسمانییـەکان داگیرسـاند. لـۆرێنس هێنـدە تێکـەڵی عـەرەب ببـوو. نێـوێکی بـە (لۆرێنسـی عەرەبیی) دەرکردبوو. چەند دانراوێکی ناسراو و چاپ کراوی هەیە وەك یاداشـتی خـۆی بـەنێوی (شۆڕشیێ لە بیاباندا) کە ساڵی١٩٣٧ چاپ کراوە.

بنۆڕە: محەممەد شەفیق غربال – ئەلمەوسووعە ئەلعەرەبییە ئەلمییەسسـەرە / الموسوعة العربية الميسرة: س ١٩٨٠. لبنان، دار نەهزەت لوبنان / دار نهضة لبنان، ل ١٥٧٤.

{١٣}. هەرچیی ڕێنووسـی بابەتـەکانی ئـەم گۆڤـارە و هـەر بەشـە باسـێکی وەرگـیراو لـە سەرچاوەیێکی دیەوە، هەموویانم گۆڕیوە بۆ ڕێنووسی باوی ئەم ڕۆژگارە و پەیڕەوکراوم!

{١٤}. دەفتـەری وەزیفـەی، مـۆرکراوی (مـەعاریف لیوائـ ئەلسـلێمانییە / معـارف لـواء السليمانية: ١٤/٧/١٩٣٤) و دەستنووس و ئیمزای خـۆی پـڕی کردووەتـەوە و خـۆی بـە (ساڵح سدقی) یەوە نیشان داوە کە (سدقی) لە هیچ سەرچاوەیێکی دیدا بەرچـاو نەکـەوتووە تەنانـەت لـە (دەفتـەری نوفووسـی: ژ ٢٨،١٥٣٨٨/١/١٩٦٢ی مـۆرکراوی مودیرییـەت نوفـووس لیوائـ ئەلسلێمانییە / مديرية لواء السليمانية. شـایانی باسـە وشـەی (قـەپتان، قـەفتان) هـەر وشـەی (خـەفتان) ە کـە لـە سـەردەمی عوسمانییـدا شـاڵێکی پاشـاکان بـووە و دروسـتکەرەکەی بـە (خەفتانچی) بانگ کراوە.

{١٥}. دیارە دوای خوێندنی لە حوجرەییێکی ئایینیی و بڕینی خوێندنی ڕوشدییەی سەرەتایی مولکیی.

{١٦}. هەرچەندە پارەی ئەو سەردەمە " غرووش " بووە، بەلام قەفتان لە دەفتەرەکەیدا مووچەکەی بە (٨,٤٠٠) فلسی عێراقیی نیشان داوە.

{١٧}. بە مووچەی ٩,٣٠٠ فلس.

{١٨}. بەعەرەبیی نووسیوییێتی: (نقلت الی سلك التدريس لمرض في القلب. / لەبەر نەخۆشیی دڵ ڕاگواستراومەتەوە بۆ ڕیزی پێ خوێندن!) جێگەی گوتنە، چ سەرچاوەیێ سەرنجی ئەم لایێنەیان نەداوە کە لە دەفتەری وەزیفەیدا نووسراوە.

{١٩}. هەمان دەفتەری ڕوونی نەکردووەتەوە دووای ساڵی ١٩١٧ و بڕاندنەوەی یێکەم جەنگی گێتیی و داگیربوونی سلێمانیی لەلایێن ئینگلیزەوە لەنێوان ١٩١٨ – ١٩٢٠ دا چ کارە بووە. نەوەی خۆی – گوزیدەی کیژی – بۆ منی گێڕایەوە گۆیا ئەفسەری عوسمانیی بووە و خانەنشین بووە!! بەلام دەفتەرەکەی چ دەنگێکی ئەوتۆی تێدا نییە. ڕاستییەکەی من بۆ ئەوە دەچم کە قوتابخانەی ئامادەیی – ئەعدادیی مولکیی عوسمانیی لە سلێمانییدا تا تەمووزی ١٩١٧ هەر مابوویێ و دوواتر لەبەر جەنگ یان نەخۆشییەکەی ئەم خۆی خانەنشین کردبێ!.

{٢٠}. پێشکەوتن –سلێمانیی: س ٢، ژ ٧٨، پێنجشەممە ٢٠/١٠/ ١٩٢١.

{٢١}. بانگی کوردستان–س ١، ژ ١، چوارشەممە ٢ ئاغستۆس ١٩٢٢.. ڕەفیق حیلمیی – یاداشت، ج ٥، ل ٧٠ دەگێڕێتەوە: کە قەفتان لە بازرگانەکانی سلێمانیی بووە.

{٢٢}. ساڵح قەفتان لە سەردەمەکانی حوکمڕانیی حەفیدزادە مەحموودا، بەتەنێ لە ساڵی ١٩٢٣ ز. دا بە مامۆستای قوتابخانەی ئامادەیی مەحموودیی دەرکەوتووە.

بنۆڕە: ڕۆژی کوردستان –س ١، ژ ١٢، شەممە ١٠ شوبات ١٣٣٨ "ڕۆمیی"/١٩٢٣ ز. ل ٢.

{٢٣}. دەفتەری وەزیفەی بە ئیمزای (مودیر مەنتیقە مەعاریف کەرکووك / مدير منطقة معارف كركوك) ئەو هەواڵەی گێڕاوەتەوە.

جێگەی ڕوون بوونەوەیە، ماددەی یێکەمی قانوونەکە دەڵێت: (بە پێشنیاری وەزیری تایبەتی، یان سەروەزیران، بۆ ئەنجوومەنی وەزیران هەیە، هەر فەرمانبەرێ خانەنشین بکات کە

بیست ساڵ خزمەتی هەبێ یان تەمەنی پەنجا ساڵی تەواو کردبێ، ئەگەر دەرکەوت توانای ڕایی کردنی ئەرکی نییە چ بەهۆی بەرگەی تەندروستییەوە یان ناتەواویی چالاکییەوە، یان بەهۆی ناپەسەندیی ڕەوشتەوە. هەروەها بۆیشی هەیە لە وەزیفەی دەربکات بێ گوێ دانە ماوەی خزمەت یان تەمەنی باس کراو! / لمجلس الوزراء بناء على إقتراح الوزير المختص أو رئيس الوزراء ان يحيل على التقاعد الموظف الذي يتحقق انه غير قادر على أداء واجباته من حيث كفائته الشخصية أو قابليته البدنيه أو غير صالح للخدمة من الوجه الأخلاقيه إذا أكمل ذلك الموظف عشرين سنة خدمة تقاعدية أو بلغ خمسين سنة من العمر، له ان يفصل ذلك الموظف وإن لم يكمل حدة الخدمة أو يبلغ السن المذكورين.

بنۆڕە: وەزارەتولعەدلییە — مەجمووعەت ئەلقەوانین وەلئەنزیمە لیسەنەت ١٩٣٥/وزارة العدلية — مجموعة القوانين والانظمة لسنة ١٩٣٥، مطبعة الحكومة، بغداد ١٩٣٦.

جێگەی ڕوون بوونیشە، مێژوونووسی عێراق عەبدوڕڕەزاق ئەلحەسەنیی — تەئریخ ئەلوەزارات ئەلعیراقیە، ج ٤، ل١٥٤ دەگێڕێتەوە: (ئاشکرایە بەپێی ئەم قانوونە، دەستەیێ لە فەرمانبەران دەردەکرێن کە هەیانە بە وەزارەتی ئێستە قاییل نین!). بە ئەم پێیە وێ دەچێ بە هەر بیانوویێ لە بیانووەکانی قانوونی نێوبراو، ساڵح قەفتانیش دەرکرابێ.

من پتر لە باسەکەم پرسیوەتەوە و هەیە دەڵێت: لەسەر ناڕێکیی بووە لەگەڵ ڕێبەری مەعاریف. چاپکەری کتێبی (مێژووی گەلی کورد—ساڵح قەفتان)یش لەسەر بەرگەکەی نووسیوە گۆیا، (لەسەر کوردایەتیی تەقاویت کراوە ! !).

{٢٤}. باس کراوی خۆی لەدەفتەری وەزیفەیدا.

{٢٥}. عەلائەددین سەججادیی — ڕشتەی مرواریی، ج ٧، چاپخانەی مەعاریف، بەغداد ١٩٨٠.

{٢٦}. ژیان — س ١، ژ ٣٨، پێنجشەممە ٢١/١٠/ ١ژ٩٢٦.

{٢٧}. زیان — س ١، ژ ١٩، س١٩٣٨.

{٢٨}. وەك سەرنجی ١١٧ ژمارەیم داوە.

{٢٩}. فوئاد، نێوی کوڕە گەورەی ساڵح قەفتانە کە لە١٩١٢ دا لەدایك بووە (دەفتەری وەزیفەی قەفتان).

{٣٠}. سالّح قەفتان – مێژووی گەلی کورد!

{٣١}. کابانی یێکەمی جەمیلەی کاکە مین بووە و کۆچی کردووە. دووەمیش سەبرییەی ڕەفعەت مەحموود کە ئەویش کۆچی کردووەو لە ئەمیشیان کوڕە کۆچ کردووەکان: فوئاد، سەلاح و ڕەئووف و کیژەکانیان: فاتمە و مونیرە و نازەنین و گوزیدە و نەوبەهار بوو.

{٣٢}. بە قسەی گوزیدەی کیژی، تووشی نەخۆشیی پرۆستات بووە و عەمەلیات کراوە و دوایی تووشی دەمارگرژیی بووە.

{٣٣}. لە چەند سەرچاوەیێکی جۆربەجۆرە.. بۆ یاداشتەکانیشی کە لای کابانیەتی لە سلێمانییدا، خۆم چووم بۆ دیدەنیی و تەماشام کرد، نیازم بوو پێیدا بچمەوە و وێنەی بگرم و لە هەلێکدا بلاوی بکەمەوە، بەلام کابانی زوو لێی سەندمەوە و نەم پەرژا هیچی لێ بکەم. یاداشتەکانی زۆر بەهێز نییە!

{٣٤}. بنۆڕە (ژمارە:١و٢ی کوردستان) و دروشمە تورکییەکەیشی "کردلری ایقاظ و تحصیل صنایعە تشویق ایچون شمدلیك" کە وشەی " ئیقاز "ی بەکاربردووە.

{٣٥}. بنۆڕە: کوردستان – س ٤، ژ ٣٠، ١ مارت ١٣١٨ (رومیی)/١٩٢٠ ز.

{٣٦}. بنۆڕە: بانگی کوردستان – س ١، ژ ١٠، یێکشەممە ١٩٢٢/١٠/١٥.

{٣٧}. سالّح قەفتان – مێژووی گەلی کورد، ل ٥.

{٣٨}. بنۆڕە: ڕووناکیی – س ١، ژ ١٠، ١٩٣٦/٤/٢٥. جێگەی باسە لەسەر بەرگی گۆڤارەکە لەمەڕ نووسەر (بە قەلّەمی خاوەند ئیمزا) نیشان دراوە. هەرچۆنێ بێ ئەم گۆتارە "١٠" لاپەڕەیێکی ئەو نامیلکەیەی خۆییێتی کە بە نێوی (بەراوردێکی تەئریخیی و ئەهمییەتی زبان) ەوە بلاوی کردووەتەوە کە هێندێ جودایی هەیە لە زمان و ڕێنووس و داڕشتنی وشەکانی گوتارەکەی ئەم گۆڤارەدا. بەڕۆشنایی ئەم وێکچوونەی گوتارە ناتەواوەکەی پارچەیێکی نامیلکەکە، ئەوا نێوی فوئادی نووسەری گوتاری (خاسییەتێك لە خەواسی ڕۆحداران، ڕووناکیی– ژ ٩) هەر سالّح قەفتانە! جێگەی گوتنە چ کەسێ سەرنجی ئەم باسەی نەداوە!

{٣٩}. ئاخاوتنەکان لە ڕۆژانی ١٩٨٧/٤/١٢ و ١٩٨٨/٥/٢٥ دا وەگیراون کە خۆیشی نەخۆش بوو... من هەموویانم بێژاوەو بە ئەو شێوەیەم پوختە کرد!

{٤٠}. کۆمەڵی زانستیی کوردان، بەڕۆشنایی قانوونی کۆمەڵەکان –قانون الجمعیات– ی عێراقیی ساڵی ١٩٢٢ و بەپێی قابیل بوونی وەزارەتی نێوخۆ: ژمارە و ٢٥٧١ ی ٢٤/ ٢/١٩٢٦ بڕیاری دامەزراندنی دراوە.

بۆ دەنگ و باسەکان بنۆڕە: ژیان – س ١، ژ ١١، پێنجشەممە ١٠/٤/١٩٢٦.

{٤١}. بنۆڕە: ژیان – س ١٢، ژ ٥٣٨، دووشەموو ٣٠/٨/١٩٣٧.

{٤٢}. وەزارەت ئەلعەدلییە – مەجمووعەت ئەلقەوانین وەلئەنزیمە لیسەنەت ١٩٣٣ / وزارة العدلية – مجموعة القوانين والانظمة لسنة ١٩٣٣، قانون المطبوعات رقم ٥٧ لسنة ١٩٣٣.

هەروەها، قانوون تەعدیل قانوون ئەلمەتبووعات ڕەقم ٣٣ لیسەنەت ١٩٣٤/ قانون تعديل قانون المطبوعات رقم ٣٣ لسنة ١٩٣٤، مطبعة الحكومة. بغداد ١٩٣٤.

{٤٣}. پیرەمێرد تەواوی هەواڵەکەی ئەوها گێڕاوەتەوە: (عەرەب دەڵێت: مەسائیبە قیسمین عیندە قیسمین فەوائید / مصائب قسم عند قسم فوائد، لە مودیرانی بەکار و ناوداری مەعاریف ساڵح قەفتانچی کە بەر بای " زەیل " کەوت بوو، ئیقناعمان کرد بۆ مودیریەتیی تەدریسی زانستیی. وەك سەعادەتی موتەسەڕریف بۆی نووسیی بوو، هیوامان پێیەتی کە زانستیی ڕەونەقێکی تازە و زیادە بە عیلم و فەزڵی ئەوەوە پەیدا بکا! / تەواو... بنۆڕە: ژیان– س١١، ژ٤٨٣، شەموو١٣/٥/١٩٣٦.

{٤٤}. بنۆڕە: ژیان – س٥، ژ ٢٤١، پێنجشەممە ٢٩/٥/١٩٣٠.

{٤٥}. بنۆڕە: سەرچاوەی پەراوێزی ئێرە: ٤٢.

{٤٦}. بنۆڕە: گەلاوێژ – س ٤، ژ ٨، ئاغستۆس ١٩٤٣.

{٤٧}. دوای ئەم ڕووداوە، وەك لەچەند شوێندا پیرەمێرد باسی کردووە، زانستیی داخراوە و قوتابیانی گیراون.. هتد.

جێگەی گوتنە، وەك سەرنجم داوە، لەسەرەتای ١٩٣٢دا نێو و دەنگ و باسی نوێی زانستیی هەڵکەوتووەتەوەو لە ڕۆژنامەی (ژیان) دا باسی کەوتووەتەوە نێوەندەکانەوە.

{٤٨}. ساڵح زەکیی ساحێبقڕان لە١/٥/١٩٢٥–١٢/٧/١٩٣٦موتەسەڕیفی سلێمانیی بووە.

{٤٩}. بنۆڕە: ژیان – س ١١، ژ ٤٩٢، شەموو ١٥/٨/١٩٣٦.

{٥٠}. بنۆڕە: ژین – ز ژ ٨١٩ (تایبەتی)، پێنجشەموو ١٩٤٦/٢/٨.

{٥١}. مەحموود ئەفەندی قادر (١٨٨٨ز–١٩٦٠ز) کە ئەندامی دەستەی ڕێبەری کۆمەڵی زانستیی ساڵی ١٩٢٦ بوو لەگەڵ پیرەمێرد و ساڵح قەفتان، لە ئەو ساڵانەدا کە لە ١٩٢٩ ەوە پیرەمێرد پێوەندیی بە کۆمەڵەکەوە نەمابوو، ناکۆکیی هەر لەسەر کۆمەڵی نێوبراو بووە، بەتایبەتیی لە ئەوەوە کە پیرەمێرد لە (ژیان – س ٧، ژ ٣٤٣ دووشەممە ١٩٣٢/١٠/٢٤) بەدوواوە داوای پارەکانی زانستیی لە بەلەدییە دەکات و داواش لە موتەسەرڕیف ساڵح زەکیی دەکات تا دەستەیێ بۆ لێ پرسینەوە لە ئەو پارانە پێك بهێنێ. پارەکانیش لە ١٩٣٠ دا بەنێوی کڕینی چاپخانە و بەنێوی یارمەتی دانی قوتابخانە و خوێندنەوە بۆ کۆمەڵی نێوبراو گرد کرابوونەوە. بۆ ئەوەیش دەچم کە مەحموود ئەفەندیی چ توانا و کردەوەییێکی ئەدەبیی و ڕۆشنبیریی نەبووە و کەچیی خزێنرابووە کۆمەڵەکەوە ! !

{٥٢}. بنۆڕە: ژین– س ٢١، زژ ٨٨٠، پێنجشەموو ١٩٤٧/٧/٢٤.

{٥٣}. بنۆڕە: ژین– س ١٧، زژ ٧٣٧، پێنجشەموو ١٩٤٤/٢/٢٨.

{٥٤}. بنۆڕە: ژین– س ٢٠، زژ ٨١٩، (تایبەتیی) پێنجشەموو ١٩٤٧/٢/٧.

{٥٥}. هەمان سەرچاوە.

{٥٦}. بنۆڕە: زبان – س ٢، ژ ٦٢، شەممە ١٩٣٨/١٢/٢١.

{٥٧}. بنۆڕە: ژین – س ١٩، ژ ٧٧٩، پێنجشەموو ١٩٤٥/٣/٢٢.

{٥٨}. کە دەڵێین: (تا دووا ژمارە) ی مەبەستمان (ژ–٩٤) یە کە دیتوومانە. لەلاییێکی دیەوە باسی دابڕینی پێوەندیی بە (زبان) ەوە بە ئەم جۆرە ڕوون دەکەینەوە و دەڵێین: (ساڵح قەفتان لە گوتاری "لە ولاتە پێشکەوتووەکانا حیزبایەتی" دا کە دوا گوتاری گۆڤارەکەیەتی دەڵێت: (ئەوانەی مەراقی باسی کۆمەڵایەتییان هەیە، نووسراوەکانی پێشووی ڕۆژنامەی "زبان" یان خوندووەتەوە کەوا تەئریخچەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی ئینسانمان تیا نووسیی بوو..). ئا ئەم گوتانەی لە ٢٥ی شوباتی ١٩٣٨دا تەواو نزیکمان دەخاتەوە لە (سنووری دەست بەردان لە ڕۆژنامەی: زبان) ئەویش بەهۆی ئەم بەراووردەوە.

ئەگەر ژمارە "١٩"ی لە یێکشەممەی ٣٠ی کانوونی دووهەمی ١٩٣٨دا دەرچوو بێ کە دیتوومانە، دیارە (ژمارە "٢٠"ی ڕێکەوتی٦ی شوباتە کە گوتاری لەمەڕ تەئریخچەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی) دەیگرێتەوە کەدووای٢٠ی شوبات، لە٢٥ی شوباتدا، (ئەم گۆڤارە دەرچووە!).

بە ئەم ڕۆشنایییە، ئەوپەڕییەکەی لە دوای ژمارە: ٢٣ی ڕێکەوتی ٢٧ی شوباتەوە، (پێوەندیی بە ڕۆژنامەی زیانەوە نەماوە!). هیوام هەیە ئەم لێك دانەوەیەم– کەبەهۆی بەردەست نەکەوتنی تەواوی ژمارەکانەوەیە – ڕاست یان نزیك بێ لە ڕاستییەوە.

{٥٩}. بەپێی بەندەکانی " د، ه " ی مادده شەشی قانوونی (ژ ٣٣)ی ساڵی ١٩٣٤ی دەستکاریکەری قانوونی چاپەمەنیی (ژ ٥٧) ی ساڵی ١٩٣٣.

{٦٠}. لە ٢٩ ی کانوونی دووەمی ١٩٣٩ بەدواوە، پیرەمێرد ڕۆژنامەی (ژین) ی دەرکرد و بەیادی (ژیان) ەوە زنجیرە ژمارەی ئەوی لەسەر (ژین) دانا کە یێکەمین ژمارەی بوو بە (٥٥٤). لە ڕۆژی هەینیی ١٩٣٠/٦/١٣دا، کۆمەڵی زانستیی لە خانووەکەی خۆیدا و بە چاودێریی موتەسەڕڕیف تۆفیق وەهبیی ئاهەنگی سازکرد لەپێناوی کڕینی چاپخانەدا بۆ کۆمەڵی نێوبراو و لە ئەنجامدا هەر لە ئەو کۆبوونەوەیەدا (٣١٦٥) ڕوپییە کۆکرایەوە.. بنۆڕە (ژیان – س ٥، ژ ٢٤٥، دووشەممە ١٩٣٠/٥/١٦). جێگەی باسە، ڕەفیق حیلمیی مامۆستای قوتابخانەی ئامادەیی سلێمانیی چووشەتە بەغداد بۆ کڕینی چاپخانەکە، بەڵام دیارە کۆسپی هاتووەتە ڕێ.. بنۆڕە: ژیان –س٥، ژ٤٩، دووشەممە١٩٣٠/٧/٧.

**تێبینیی**

١. مونیرە، گوزیدەی کیژانی ساڵح قەفتان هاریکاریان کردم بۆ دەستگیرکردنی دەفتەری نوفووس، دەفتەری وەزیفە، وێنەی فۆتۆگرافی بابیان.

٢. وەرگرتنو وەرگێڕانی –بۆ زمانێکی دی– بەبێ پرسم بۆ کەس نییە!

— · —

# ١٤

## یۆبیلی زێرینیی ڕادیۆیی کوردیی – عێراق [١]

**" ڤ. ئە. لەنین دەڵێت: ڕادیۆ ڕۆژنامەییێکی بێ سنوورە!**

**.. منیش دەڵێم: ییێکەم ڕادیۆیی کوردیی –عێراق– خێراو کاریگەرترین ڕۆژنامەی کوردیی بووە بۆ شکاندنی سنوورە داتاشراوەکان!**

### پێشەکیی

ڕادیۆی کوردیی–عێراق... ییێکەمی بێ وێنە، لە کاروانی ڕۆشنبیریی کوردو عێراقی عەرەبدا شوێنێکی بەنرخ و بێ هاوتای هەیە. لەلاییێکەوە ڕۆشنبیریی کوردیی‌و لەلاییێکی دیەوە گیانی عێراقپەروەریی"!!" بڵاوکردەوە.

وێڕاش، مخابن هەتا ئەمڕۆ چ کەسێ – بە ئەو ڕۆشنبیرانەشەوە کە تێکەڵی بوون و لێیان خواردووە – نەهاتوونەتە پێشەوە بۆ لێ کۆڵینەوەی کاریگەریی ئەم ڕادیۆیە و نرخاندنی. تەنانەت ئاگایشیان لە ئەوە نییە کە ماوەییێکە (مێژووییێکی ناتەواو بۆ ڕۆژی هەڵکەوتنی دانراوە)و دامو دەزگەکانی ڕاگەیاندنیش –بەڕادیۆکە خۆیشیەوە– ئاهەنگی پێ دەگێڕن!

من، هەرچەندە لەنێوان سالانی ١٩٧٨–١٩٨٣دا ڕۆژی هەڵکەوتنیم بۆ گوێگرەکان و خوێندەواران گەیاندە جێ، بەڵام هێندی هاوپیشەی جارانم لە ئەو ڕادیۆیەدا کە وێڕای ئەوەی – وەك من خەریکی مێژووی ئەم ڕادیۆیە نین و من لە ئەوان کۆنتر بووم تا خانەنشینییم – ئەم هەڵەیەیان ڕاست نەکردووەتەوە، دیسان چ بەڵگەییێکی ڕەسمییش لە فایلەکانی ڕادیۆدا نەماوە و لە دەست چوون!

بە ئەم پێیە، من نازانم لەسەر چ بنچینەیێ پەیڕەوی ئەم لافە دەکەن گۆیا لە (٢٩ ی کانوونی دووەمی ١٩٣٩) دا هاتووەتە دنیاوە!

من، بە ئەو ڕۆشنابییە و بـە هەسـتێکی ڕاسـتیی نـاس و بەرپرسـیارەوە – لەڕاپێلـەی پـرۆژە کتێبێکـی مێـژوویی و لـێ کـۆڵینێکی تـەواو نـەکراودا کـەمخابن لەبـەر ناڵـەباریی تەندروتیم پـێم وەیـە ناچێتە سـەر–پـێم خۆشـە ئـەم بەڵگـە بەهێزانـە بخەمـە بەرچـاوو ڕاستیی بخەمە جێگە و خانەی تەواوی خۆیەوە !

**یێکەم**

کۆچ کردوو کامیل کاکە ئەمین، یێکەم چاودێر و قسەزان – موزیع – کە یێکەم کەس بـووە بـە ڕسـتەی کـوردیی (ئێـرە بەغدایـە/هنـا بغـداد) زمـانی گـۆ بکـات، لەچـەند بیرەوەرییەکی –عەرەبیی– خۆیدا کە بەهان دانی زۆری من نووسییەوە و لـە (کـاروان – ژ ١١، ئابی ١٩٨٣) دا بڵاومـان کـردەوە، هـەروەها لـە گفتوگۆییێکی درێـژ و تۆمـارکراوی نێوانمان – هێشتا بڵاوم نەکردووەتەوە– دەڵێت: (ڕادیـۆی کـوردیی عێـراق، ڕۆژی ١٩ ی تەشرینی دووەمی ١٩٣٩ و لە ڕاپێلەی ڕادیۆی عەرەبیی بەغدادا و لەسەر هەمان شەپۆل دامــەزرا و بڵاوکردنــەوەی نوانــد و دەنــگ و باســێ و دوایــی گــۆرانییێ یــان دووانــی بڵاودەکردەوە.. ئەم بارەش ساڵێکی خایاند !)

**دووەم**

کۆچ کردوو عەبدولقادر قـەززاز، دوای کامیـل کاکـە ئـەمین هـاتووە و وەك قسـەزان و وەرگێڕی دەنگ دەنگ و باس – لەپاڵ کامیلدا – کاری کردووە، ئەویش لایێنگری هەمان مێژووە و نامەی نووسراوەی بۆ من لە ئارشیفدا هەڵگیراوە و بەڵگەیە !

**سێیەم**

کـاك محەممـەد عـەلی کـەریم قسـەزانی بەشـی عـەرەبیی، ڕادیـۆی بەغـداد، لـەنێو بیرەوەریـی خـۆی و بڵاوکـراوی ڕۆژنامـەی (عێـراق،٢/١٢/١٩٨٧/ بەعـەرەبیی)، ئـەویش لایەنگری بیروڕاکانی پێشووە کـە دەڵێـت: (سـاڵی ١٩٤١ چـوومە سەرئیشـی ڕادیـۆیی... ڕادیۆی کوردیی بەتەنێ یێك دەنگ و باسی پێشکەش دەکرد و دوایی گۆرانییەکی بەدوادا

دەهات.. هەلّکەوتنی ئەم دەنگ و باسەش – ئەم ماددە کوردییە / نووسەر – ڕیّکەوتی مانگە یێکەمەکانی دووەم جەنگی گیّتیی بوو کە یێکجار پێویست زانرا. مامۆستا کامیل ئەمین یێکەم قسەزانی کورد بوو کە دەنگ و باسەکەی دەخوێندەوە.. هتد).

## چوارهەم

ڕۆژنامەنووس و شاعیری ناسراو حاجیی تۆفیق – پیرەمێرد، لە (ژین–زژ٥٥٧، پێنجشەمووو٢٣ی شوباتی١٩٣٩) دا نامەییێکی نووسیوە بۆ دامەزراندنی و دەلّیّت: (بۆ مودیری ئیزاعەی ڕادیۆ – تەختگای عێراق کە حەوالیی و حەواشیی بە ئەقوام و عەناسیری موختەلیفە و موتەخالیفە ڕازاوەتەوە، ئەم دیبای زەربەفتی ڕەنگا و ڕەنە، وەسلّە وەسلّە بە دەستێکی فەسلّ و وەسلّی فەیسەلّیی[٢] – بەیادی مەلیك فەیسەلّی یێکەمەوە/ نووسەر–ڕێکخرا، بە ڕشتەی ڕەگی دلّ تەریب دراوە، بەیداخێکی ڕەنگینی دلّ نشینی لیّ هەلّدراوە، ڕەونەق و شەوق و بەرقی لە ئافاقی ویفاقی عێراقەوە بە چوار لادا لائەکاتەوە. لە خوامان ئەویّ ئەو لالە عەباسە[٣]، پێشڕەوی لالە عەباس بیّ.[٤]

خۆزگە وەك ڕەنگمان یێکە، دەنگیشمان یێك ئەکەوت، قەتاری[٥] " ڕەشۆلّ " یشمان[٦] لەڕادیۆی عێراقدا ئەبیست، ئەوسا ئاهەنگی یێك ئاهەنگیمان دەکرد ! /تەواو).

## پێنجەم

شاعیری میللی، (بەنگینە– حاجیی باقیی) کارمەندێکی ڕۆژنامەکەی پیرەمێرد، (ژین – زژ ٥٩٠، ٢٢ ی شوباتی١٩٤٠) بەنێوی "هەلّبەستی بەنگینە" وە، مژدەی دامەزراندنی ڕادیۆی کوردیی ڕاگەیاندووە. دەلّیّت:

مـــــژدەبیّ کورگـــــەلّ وا ناومـــــان نـــــرا
ڕادیـــــۆ زبـــــانی کـــــوردیی تـــــیّ خـــــرا
خالّـــــە پیرەمێـــــرد خاوەنـــــدی ژیـــــان

گەوهـــەر فرۆشـــی دوکانچـــەی کـــوردان
مـــن ئـــەم شـــەو ســـەرم گەییـــە ئاسمـــان
رادیـــۆ بـــە گـــورەی کـــوردیی ئەینەڕانـــد
تـــۆ و ئـــەمین زەکیـــی زەکاتـــان نووانـــد
ئاساری کوردان ئێوە تۆ...ن چاند.. هتد).

**شەشەم**

هۆی گەورەی هەڵکەوتنی پتر ئەو مێژووە بەهێز دەکات کە مەبەستمانە. ئەوەتە، کەوتنەوەی ئاگری دووەم جەنگی — بریتانیا و ئەڵمانیا لە٣ ی ئەیلوولی١٩٣٩ دا و بڕینی پێوەندییەکانی دیپلۆماسیی عێراق و ئەڵەمانیا لە ٥ی ئەیلوولی ١٩٣٩دا و عێراقیش بە پەیمانی٣٠ی حوزەیرانی١٩٣٠ هاوپەیمانی بریتانیایە — گێتیی، بێگومان کاری گەورەی لە دەسەڵاتی حوکوومەتی عێراق کردووە تا بەری ڕاگەیاندنی فاشیزم بگرێت و لەلایێکی دیەوە بایەخ بدات بە دڵنیایی و بڵاوکردنەوەی دەنگ و باسی جەنگ و هاوپەیمانەکان، (بۆیێکا وەك پێویستییێ، ماوەیێکی بەرنامەی کوردیی لە ڕاییڵەی ڕادیۆی بەغداد داناوە) کە ئەم باسەش لەگەڵ قسەکانی قسەزانی ڕادیۆی عەرەبیی دەق بگرێت!

**ئەنجام**

بەراورد کردن و کێشانی ئەو بەڵگە هەوالانە، بەڕاستیی ئەو (مێژووە هەڵەیە!) پاکۆ دەدەن، چونکە وێڕای سووربوونی کارگێڕە بێکەمەکانی ڕادیۆکە، نامەکەی (شوباتی ١٩٣٩) دەیسەلمێنێت کە لە (٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٣٩ دانەمەزراوە!)، کێ دەبێت باوەڕ بکات — لە ئەو مێژووەدا — دامەزرابێ و کەچیی (دوای مانگێ) نامەیێکی ڕۆژنامەیێ داوای دامەزراندنی بکات؟

لەلایێکی دیەوە، هەڵبەستەکەی شوباتی١٩٤٠(ساڵی دوای ئەو نامەیە و سێ مانگ دوای دامەزراندنی–١٩ی تەشرینی دووهەمی ١٩٣٩ – مژدەکەی بەخشیوە) و ئاشکراش دووریی و نزیکیی دامەزراندنەکەش ڕوون دەکاتەوە. پوختەی لێك دانەوەش ئەوەیە: دوو مانگ و نیوێ دووای ڕوودانی دووەم جەنگی گێتیی لە٣ی ئەیلوولی ١٩٣٩دا – نەك هەشت مانگ بەر لەجەنگەکە: ٢٩ی کانوونی دووەمی١٩٣٩– ماوە کوردییەکە لە ڕاپێڵەی ڕادیۆی عەرەبیی بەغداد دانراوە. بە ئەم ڕۆشناییانەش پێ ویستی دەبیینم کە ڕاستیی بخرێتە شوێنی تەواوەتیی خۆی و (ڕۆژی یێکشەممە١٩ی تەشرینی دووەهەمی ١٩٣٩) بە ڕۆژی ڕاستیی (هاتنە دنیای ڕادیۆی کوردیی – عێراق) بژمێردرێ!

**پاشکۆ – ١**

بەڕۆشنایی لێ کۆڵینەوەی ڕادیۆیی– ڕۆژنامەوانییم و وەرگرتنی دەنگ و باس لە کارمەندە یێکەمەکانی ڕادیۆ، بۆم دەرکەوتووە کە دوو پیاوی ناسراوی گەلی کوردو عێراق، محەممەد ئەمین زەکیی وەزیر (مێژووناس) و وەزیر تۆفیق وەهبیی (زماننـاس)، هەرە لایێنگر و یێکەم بوون بۆ هان دانی دامەزراندنو ژیانی و پێشخستنی لەپێناوی یێکیەتیی نیشتیمان و خزمەت کردنی ڕۆشنبیریی و زمانی کوردییدا.

جێگەی باسە، لە(هەلی دامەزراندن) یدا، هەرچیی سەرچاوەی ڕۆشنبیریی کوردیی هەیە، هات بووە سەر هەردوو ڕۆژنامە حەوتۆییەکەی سلێمانیی (ژین) ی سەربەخۆ و (زبان) ی بەلەدییەی نیمچە ڕەسمیی کە دووەمیان لە لەساڵی ١٩٤١ز.دا، ئاوابووە. یێکەمەکەش کە کێشەی دەرامەت و پێشەیی هەبوو – بەتایبەتیی لەڕووی قاقەزەوە – بەورەی بەرزی خاوەندەکەی و دوایی بە کۆششی خزمان و میرات گر و دۆستەکانیی، خۆی پێ ڕاگیراو ژیا!

## پاشکۆ – ٢

بەڕۆشنایی وردبوونەوە و لێ کۆڵینەوەم، بۆم دەرکەوتووە کە گۆڕینەکانی باری دووەم جەنگی کێتییو کار و زەبری جەنگی ڕاگەیاندن لەلایێکەوە، هەروەها گڕسەندنی ڕقی گەلی عێراق –بەعەرەبو کوردەوە– لە بریتانیا، بەتایبەتیی دوای شۆڕشی مایسی نیشـتیمانی و دامەزرانـدنی حوکوومـەتی بـەرگریی نیشـتیمانیی ١ی مایسـی١٩٤١– حوکوومەتی بریتانیا ناچار بووە کە (ڕادیۆی عەرەبیی شەرقولئەدنا – یافا) دابمەزرێنێ و ماوەییێکی کوردیی بەنێوی (ڕادیـۆی کوردسـتان) هوە لەهـەمان شـوێندا بکاتـەوە کـە لـەنێوان هـەردوو ئـەیلوولی ١٩٤٢– ١٩٤٥دا هەڵکـەوتو بەرنامـەی ڕۆژانـەی–بـەیانیان و ئێواران – یێك سەعات بخایێنێ. لە ئەم ڕادیۆیەشدا سێ هـاووڵاتی کـورد – عێراقیـی – کارگێڕ بوون[٧]، (ڕەمزی قەززاز، ڕەفیق چالاك تۆفیق، عەبدوالله سلێمان " گۆران"ی شاعیر).

هەروەها لەهەمان قۆناخدا ماوەییێکی ڕادیۆی کوردیی لە (لوبنان/بەیرووت)دا دانرا بۆ بڵاوکردنەوەی بەرنامەی کوردیی ئێواران و بەچاودێریی کۆچ کردوو (کامەران بـەدرخان). ئاشـکراش بـووە کـە(ڕادیـۆی کوردسـتان) ی بـاس کـراو، بەڕاوێـژی –یـان پێشـنیاری– ڕاوێژکاری وەزارەتی نێوخۆی عێراقیی، ئەفسەری ئینگلیزی و شارەزای کاروبـاری کـورد و زمـانزانی (س. ج. ئەدمۆنـدن) دامـەزراوە کـە دوای جـەنگ و دووای هەڵوەشـاندنەوەی ڕادیـۆ بـاس کراوەکـە، بەئاشـکرا ددانـی بەڕاسـتییدا نـاوە و گوتوویـەتی: (ڕادیـۆییێکی تـاکتیکیی سیاسـیی بـووە و چـیی دی نـا!)[٨]. لەبـەر ڕۆشـنایی نێـوی بردنـی ڕادیـۆی تاکتیکیشـەوە، پێویسـتە ئامـاژەی ئـەوەش بکـرێ کـە لـەحوزەیرانی ١٩٥٤ دا، بنکـەی سوپای بەریتانیا لەباژێرۆکی "حەببانییە"ی عێراقدا، لەسەر شـەپۆلێکی "٢٠٠" مـەتریی و ڕووە و کوردستان–باژێڕەکانی باکووری عێراق–(ڕادیۆییێکی کوردیی) داناوە و بەتـەنێ

ڕژانـی دوو شـەمموان و سـەعات ٤,٣٥ دەقیقـە دەنـگ و بـاس و گـۆرانیی کـوردیی ڵاوکردووەتەوە.[٩]

هەرچەندە هەواڵی زۆرتر و چارەنووسی ئەم ڕادیۆیەشمان لێ روون نییە، بەڵام بڕوام ەیە (بەبێ ڕەزامەندیی ڕەسمییانەی عێراق) دامەزراوە و تەمەن درێژ نەبووە!

**پاشکۆ — ٣**

کاریگەریی ڕادیۆی کوردیی — عێراق لەبیر و هۆشی گوێگرەکانی دەرەوەی عێراق ،لایێك و گۆڕینەکانی باری سیاسیی نێوچەی خۆرهەڵات بەتایبەتیی لەدوای هەڵکەوتنی پەیمانی بەغداد / سەنتو: شوباتی ١٩٥٥"، هێندێ وڵات ناچار بوون کە (ڕادیۆی وردیی) لە نێکەم چارەکی پەنجاکاندا دابمەزرێنن کە هێندێکیان لەسەر شەپۆلی کورت هێندێکی دیان — دواتر — لەسەر شەپۆلی نێونجیی بەرنامەیان بڵاوکردەوە.. یارترینیشیان ئەمەن:

١. ڕادیۆی کوردیی " یەریڤان "، ئەرمینیای سۆڤیەتی: س ١٩٥٥ {١,٥ سەعات لە ڕژێکدا}.[١٠]

٢. ڕادیۆی کوردیی " قاهیرە "، میسر: س ١٩٥٦ — ١٩٦٣.

٣. ڕادیۆی کوردیی " سنە "، ئێران!![١١]

٤. ڕادیۆی کوردیی " مەهاباد "، ئێران!!

٥. ڕادیۆی کوردیی " تەورێز "، ئێران!![١٢]

٦. ڕادیۆی کوردیی " کرماشان " ئێران!!

ئەم ڕادیۆیە لە شەستەکاندا لەسەر شەپۆلی نێونجیی بەرنامەی بڵاودەکردەوە و سالی ١٩٧٩ درێژەی کێشا.[١٣]

**پەراوێز — تەماشاکراو**

{١}. ئەم لێ کۆڵینەوەیە بەعەرەبیی‌و کوردیی بڵاوکردووەتـەوە، بنـۆڕە: ئاسـۆ —س١،ژ١، شەممە ١٩٨٩/١٠/٢٨ و العراق — ع ٤١٩٧، الاحد ١٩٨٩ /١٠/٢٩.

{٢}. مەبەست پاشا فەیسەڵی یێکەمی پاشای عێراقە.

{٣}. مەبەست گوڵی لالە عەباسە!

{٤}. مەبەست دەوڵەتی ئیسلامیی عەبباسییە کە پێتەختییەغداد بووە!

{٥}. قەتار: مەقامێکی کوردییە!

{٦}. مەبەست مەقامبێژ، ڕەشۆڵ عەبدوڵڵەیە کە لەسەر قەوان‌و ڕادیۆ دا گۆرانیبێژ بووە!

{٧}. لە گۆڤاری (گەلاوێژ) و (یاداشتی ڕەفیق چالاک) ەوە.

{٨}. بنـۆڕە: عەلائـەددین سـەجاددیی — ڕشـتـەی مرواریـی، ج ٦، چـاپخانەی مـەعاریف، بەغداد ١٩٧٩.

{٩}. پەیام — ژ ٢٤٨، ب ٦، دووشەممە ١٩٥٤/٦/٢٧.

{١٠}. هەمان ڕادیۆ و گوفتوگۆیێکی کارمەندێکی — لەساڵی ١٩٩٣ دا.

{١١}. پەیام — ژ ٣٢٧، ب ٧، دووشەممە ١٩٥٦/١/٢.

{١٢}. هەمان سەرچاوە.

{١٣}. سەرنجی خۆم!

# ١٥

# یێکەم ڕۆژنامەی هەولێر

## پێشەکیی

هەموو سەرچاوەکانی ڕۆژنامەنووسیی کورد و عێراقی وەکو: (مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیی-س١٩٧٠)[١] و (دەلیلوسەحافە ئەلعێراقییە-س١٩٧٠)[٢] و (ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردیی-س١٩٧٣)[٣] و (ئەلمەوسووعەلسوحوفییە-س١٩٧٦)[٤] و پاشکۆی (تێ گەییشتنی ڕاستیی و شوێنی لەڕۆژنامەنووسیی کوردییدا-س١٩٧٨)[٥] کە باسی نوخشەی ڕۆژنامەنووسییی نێو بازێڕی (هەولێر) یان کردووە، نێوی دوو گۆڤاریان هێناوە، گۆڤاری (ڕووناکیی-س١٩٣٥- ١٩٣٦)[٦] و (هەتاو-س١٩٥٤ -١٩٦٠)[٧] کە یێکەم حەوتۆی و دووەم پازدە ڕۆژیی بووە!

بۆ (ڕۆژنامەیێك) ی نۆبەرەیش کە نێوی دیاربێت، ئەو-تاکە- هەواڵە دووبارە کراوەتەوە کە دەڵێت، (کۆمەڵێ مامۆستای هەولێر لە١١ی کانوونی یێکەمی١٩٥٠ دا هەتا نزیکەی سێ ساڵێ ڕۆژنامەیێکیان بەنێوی (هەولێر)ەوە بە عەرەبیی و کوردیی بڵاوکردووەتەوە.)![٨]

ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانیش-بێ لەڕۆژنامەی ژین -هەتا ساڵی١٩٨٥چ هەواڵێکیان تێدا نییە سەبارەت بە هەڵکەوتنی (ڕۆژنامەیێکی کوردیی) تەواو کە پێش (هەولێر، هەتاو) لە هەولێردا دەرچووبێ!!

گەڕان و پشکنینم بۆ پەڕەونەکانی گەنجینەی پرش و بڵاوی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی، هەوری ئەم هیوا بڕاویەی ڕەواندەوە کاتێ کە وێنە و نێو و نیشان و مێژووی (یێکەم ڕۆژنامەی حەوتۆیی هەولێر) م دەستگیر بوو.. خورپەی ئەو خۆشییە سڕی نەکردم و بە درێژایی دوو ساڵێ، ١٩٨٥-١٩٨٦ عەوداڵی پرس کردن و گوێ هەڵخستن

بووم بۆ دەستگیر کردنی هەواڵی دی ئەو ڕۆژنامەیە، بەڵام مخابن ڕەنجم بێ هوودە بوو، بەتایبەتیی کە هێندێ ڕۆشنبیریی ناسراوی هەولێر و هاوڕۆژگاری (ڕۆژنامەکە) و (خاوەند)ەکەیشی. لەسەرسامیی پتر چ ڕەنگ و ڕوویێکی دییان نەبوو[٩]. بە ئەم پێیە ناچار بووم پەردەی بێ دەنگیی لابدەم و ڕوو بکەمە ناساندن و لێ کۆڵینەوەی سەر و بەری ئەو (تاکە ژمارە)یەی ڕۆژنامەکە و هۆشیار کردنەوەی ڕۆژنامەوانان و خوێندەواران لە باسەکانی.

من لە هەلێکدا کە بۆ یێکەم جار ئەم ڕۆژنامەیە ئاشنا دەکەم. پێ ویستی دەبینم ئەوپەڕی سوپاس و دڵسۆزیم بنوێنم بۆ زانای گەورەی کورد خوالێ خۆش بوو (محەممەدی خاڵ) کە لە ژینی پڕ لە خێر و بێریدا، هەڵی زۆری پێ بەخشیم دەوری کتێبخانە نایابەکەی بکەمەوەو لەڕایەڵەیشیدا ئەم ڕۆژنامە دانسقەو (ون)ە بدۆزمەوە ![١٠]

---

## بەشی یێکەم

### ١. شوناسنامەی ڕۆژنامەکە

* هەتاو: ڕۆژنامەیێکی کوردیی و ئەدەبیی و کۆمەڵییە.

سالی ١: ژمارە ١، ٨ ی ناوجەژنان ١٣٦٧، شەموو ١١ ئەیلوول ١٩٤٨.

* خاوەندی: ئەمین (ڕواندزیی).
* مودیری مەسئوولی: مەحامیی ناجیی.
* پەیام: ئەربیل (هەتاو)

هەرچی بنووسرێ و نەنووسرێ نادرێتەوە.

* ئابوونەی ساڵانە:

| | فلس | دینار |
|---|---|---|
| بۆ ناو شار | ٠٠٠٠ | ١ |
| بۆ دەرەوە | ٢٥٠ | ١ |

* ئیعلانات: بۆ لاپەڕەی دوایی گرێ بە دوو سەد فلسە.

### ٢. پێداچوونەوەی شێوەی

- جۆری قاقەز: مۆر.
- بارست و لاپەڕەی: ٤ لاپەرە، ٤٢ X ٣٠.
- ژمارەی ستوونی لە لاپەڕەیێکدا: ٤ ، ٢٥ X ٧ سم.
- نێوی چاپخانە: نییە.
- جۆری تیپ: ١٦، ٢٠، بۆنت.
- نێونیشان: (خۆشنووسییە، خۆشنووس ئەمین. نێوی دیارە و وێ دەچێ ئەمین یومنیی خۆشنووسی نیشتەجێی بەغداد بێ!).

- مانشێت، نێونیشانێکی دیار: نییە!
- دەنگ و باس: نییە!
- وێنەی فۆتۆگرافیی یان ڕوون کەرەوە: نییە!
- تێ بینیی دی: لە لاپەڕەکاندا نێوی ڕۆژنامەکە، ژمارە، ژمارەی لاپەڕە نووسراون.

### ٣. ڕێنووسی

یێکگرتوو نییە. تیپە بزوێنەکانی کوردیی، بەگشتیی نیشانەیان لەسەر نییە! ڕێنووسی وشەی عەرەبیی نەگۆڕاوە. بێ جیاوازیی "ئە" و "دە" بەکردارەوەیە. تیپی (ئا) بەشێوەی ڕێنووسی (ا)ی عەرەبییە! تیپە – دەنگە کوردییەکانی وەك (ڵ) و (گ) چەند جارێ سێ خاڵ "∴"یان لەسەرە گوتاری لاپەڕەی چوارەم چەند جارێ – بەتەنێ – لە نووسیندا "وو"ی درێژ و "ی ی" درێژی بەکار بردووە.

### ٤. شێوازی پەخشانی.

جوان و ڕەوان و خۆش.

### ٥. بابەتەکان.

ل١:

**یێکەم:** سەرەتا (گوتارێکی سێ ستوون و چارەکە و نێوی نووسەری لەسەر نییە!!).

**دووەم:** ڕەوشت و ئامانجی غەزەتەکەمان (گوتارێکی سێ چارەکە ستوونە!).

ل٢:

**یێکەم:** ئامۆژگاریی ئایینیی (هەڵبەستە پەندە دوو ستوونە!).

**دووەم:** ڕەبەن – ئەحەی جاو (گوتارێکی ئەو نووسەرەیە. دوو ستوونە).

ل٣:

**یێکەم:** پاشماوەی – گوتاری – ڕەبەن. (ستوون و نیویێ!).

**دووەم:** نالیی. (قەسیدەییێکی نالیی شاعیرە. ستوونێکە!).

**سێهەم:** لە هەولێر کۆنتر – پیرەمێرد (گوتارێکی پیرەمێردی خاوەنی ڕۆژنامەی ژین.
وون و نیویێ!)

ل٤:

**یێکەم:** لاپەڕەیێك لە تەئریخی ئەدەبی کوردیی:

" مەلا مستەفا بێسارانیی. پایەی لە شیعر و ئەدەبا "

(گوتارێکی نرخاندنی ئەدەبییە. پاشماوەی هەیە، بەڵام بەر ژمارەی– دەرنەچوو–ی
اتوو نەکەوتووە:

نێوی نووسەری لەسەر نییە، بەڵام گوتاری " سەرەتا " بە نووسراوی " گۆران " ی
عیری ژماردووە. چوار ستوونە!).

**٦. شێوەی گشتیی**

وەکو یێکەم ڕۆژنامەی بازێڕی هەولێرە، شێوەی گشتیی –بەقەبارەی ٣سم کەمت –
سایی کردنەوەییێکی زۆری ڕۆژنامەی (ژین) ی سلێمانیی پیرەمێردی هاوڕۆژگاری
ییێتی.

ماکێتی لاپەڕەی یێکەمی، خانەی نێونیشان و ئاگادارییەکانی خۆی،٣٠ X ٧ بەرامبەر
٧,٥ X ی ڕۆژنامەی (ژین)ە. دانانی مێژوو، ژمارە، نێوی خاوەند و هتد...

لەڕاستەوە بۆ چەپ وەکو یێکە. دانانی باسی ئابوونە و ئیعلان لە دەستە چەپدا وەك
کە. دروشمی (ڕۆژنامەیێکی کوردیی و ئەدەبیی کۆمەڵییە!) هاوبەشە و لەلای ئەم بە
پی گەورە – بۆنت نووسراوە و لە لای (ژین) بەخۆشنووسیی.

دانانی نێونیشانی هەردوو ڕۆژنامەکەش لە نێوەڕاستی خانەدا، دیسان وەك یێکە، ئەگەرچیی کلێشەی (ئەم) لە (ژین) پچووکترە!

جۆری قاقەز لەلای هەردووك –بۆر– وەکو یێکە چەشنی جۆری تیپەکان. دابەش کردنی ستوونەکان کە چوارە بەسەر باسەکاندا، بەگشتیی چون یێکی تێدا هەیە! گوتار لە یێکەم لاپەڕەدا. یێکەم ستوونی دووەم لاپەڕەش بۆ ستوونی (هەڵبەست پەند).

شیعریش لەنێوەڕاستی لاپەڕەی سێیەمدا. پەخشانە گوتاریش– بیێ لاپەڕەی چوارەم– لەڕووی ڕەوانیی و زمان شیرینیی و ئاسانیی داڕشتنەوە وەك یێکە. جیاوازییێ کە هەبێ لەڕووی دانانی نووسینی نرخ و هەواڵی دەرچوونەوە، ئەوەیە: لەلای (ئەم) لەسەر ستوونی دووەم و سێیەمدا دانراون و لەلای (ژین) لەسەر نێوەندی ستوونی یێکەم و دووەمدایە. ئەگەر لەڕووی نرخەوە چوون یێك بن، بەڵام جیاوازیی هەرە دیار لەڕووی بڵاوکردنەوەی "ئیعلان" ە کە لەلای (ئەم) گرێی بە دوو سەد فلسە و لەلای (ژین) بە سەد و پەنجا فلسە.

بەکورتیی، بتەوێت، نەتەوێت، هەست دەکەیت کە تاقیمانەی (هەتاو) لاسایی کردنەوەییێکی (ژین)ە، تەنانەت لە بابەت هەڵبژاردندا.

### ٧. ئامانجی

تەواوی لاپەڕەی یێکەم بەگوتارەکانی "سەرەتا" و "ڕەوشت و ئامانجی غەزەتەکەمان"ەوە کە زاراوەی غەزەتەی فەڕەنگی و جەریدە یان لەبریی ڕۆژنامە بەکاربردووە، بەڕوواڵەت دەیسەلمێنن کە ڕۆژنامەکە، ئەدەبیی و کۆمەڵایەتییە و دوورە لە سیاسەت. خۆی بە ئاشکرا دەڵێت: (چونکە ئیجازەی سیاسەتمان نییە و لە سیاسەت دووانیشمان لەبارا نییە، ناتوانین مەقالاتی سیاسیی بخەینە غەزەتەکەمانەوە!).

وێڕا بەیادی نیاز و زەبری کۆنی تورکیای عوسمانییەوە، مەبەستی خۆی لە عێراقدا بە دڵسۆزیی ئاشکرا کردووە کە دەبێژێت، (خدمەتکار و تەرەفداری یێکیەتیی و یێك ئاییینیی و برایەتیی گەلین!).

ڕۆژنامەکە چۆن (خوێندن و بەکارهێنانی جەوهەری عیلم) بەکلیلی مەبەست و بە ڕێگەدا ڕۆیشتن و ژیان دەزانێت و بایەخ دان بە شیعر و ئەدەبیاتی کوردیی و بووژاندنەوەیان بە ئامانجی دەژمێرێت، هیوای بە (زانست) ە بۆییێکا دەڵێت: (زۆرتر ئێمە ئیتیاجمانبە مەسائیلی ئیجتیماعیی و ئیقتیسادیی هەیە، چونکە وەجهی گوزەرانمان لە ڕەفاهدا نەبیّ، شیعر و ئەدەبییات بە زگی برسیی ناخوێنرێتەوە!).

هەر لە ئەم ڕووانگەیەشەوە- گۆیا لە سیاسەت نادوێت!!- گرێی باسێکی ناسکی کردووەتەوە کە موعەمما، کێشەی دەغڵ و دان زۆریی هەولێر و (گرانیی!!) هێناوەتەوە و داوا لە خاوەند بیر و پسپۆران دەکات تا چارەسەریّ بدۆزنەوە. ڕۆژنامەکە بەڕۆشنایی دروشمەکەیشی، (ڕۆژنامەییێکی کوردیی ئەدەبیی و کۆمەڵییە!) بەگشتیی ڕاست گۆیانە جووڵاوەتەوە و بابەتەکانیشی شایەتیی بۆ دەدەن کە دوورە لە توانج و گێرە شێوێنی و هیوای بە نووسەرانە بۆ پێشکەوتن!

---

# بەشی دووهەم
## مەتنی بابەتەکان[11]

### ١. سەرەتا

ئێمە کوردینو دڵپاك. دەست بدەینە هەر کارێکی گران و مەزن، ئەبێ پەنا بەرینە بەر خودای فریادڕەسی و پێغەممەری خەلعەت پۆشی (لولاك!).

بە مەقالەیێکی کە "گۆران"[12] بۆی نووسیوین و بێسارانیی و[13] مەولەویی[14] خستووینەتە یاد، سەڵاوات و درووودێکی مەولەویمان کەوتەوە یاد. سەرەتای ئەم کارە خێرە کە ئێمە هەموو هیوایێکی چاکەی بۆ گەل و نیشتیمان لێ دەکەین، بەو سروودەوە دەست پێ ئەکەین و مەولەویی دیارە وەك ئەشعاری دلگیرە شیعاری نالەی مەعنەوییات و هیممەتیشی بە تەئسیرە.

با لە پێشەوە، بە دەروونێکی ساف و پاکی کوردییەوە سەڵەواتەکەی ئەو بدەین.. فەرموویە:

هەورەکەی ڕەحمەت ڕووی سەمای کەرەم
سەڵات و سەلام کەی کەم ئێستا کەم
ببرێ و برێژێ و بدا وەهمدا
وەسەر مەزرەعەی ڕووحی خاتەمدا
جەو مەزرەعەی نوور جۆشدا سەرە ژوور
(کوردستان) پڕکا جە تۆفانی نوور

ئەمجا بێینە سەر مەرام.. ئێمە دەمێکە غەزەتەیێکمان ئەویست دەربیێنین. لەوساوە کە ئەمدیی لە لیواکانی عێراقی خۆشەویستدا بەلای کەمییەوە یێك دوو غەزەتەی تیایە، کوێرایی بەچاوما دەهات. بۆچ غەزەتەیێك لە هەولێردا نەبینم؟ سا هەرچۆنێ بوو، تەکانم دایە خۆم، خوا کاری پیاوە پیاوەکانمان ڕاست بێنێ، یارییەیان دا و غەزەتەیێکمان پێکەوە نا. جارێ ئەو ئاواتەمان هاتەدی، کەوا ناومان کەوتە ناو (سەحافەدارانی

سەقافەدار)، ئەوە زیانمان کرایەوە، هەر کار شوناسیی و مەسڵەحەتی بە نیك ئەتوانێ نیك و بەد، حاڵ و ئیحتیاجاتی ئیجتیماعیی قەوم و میللەتەکەی خۆی بگەیێنێتە شوێن خۆی و ناتەواویی و کەم و کوڕیی وڵات بە دڵ و دەروونێکی پاك و زیهن و فیکرێکی ڕووناکەوە، بخاتە لاپەڕەی غەزەتەکەوە، هەموو کاربەدەستێ ببینێ و بۆ شانی ئیشگوزاریی و زامداریی خۆی جێ بە جێ بی بکا، هەم عوموومی لێ مەمنوون ئەبێ، هەم ناوی چاکی خۆی ئەخاتە سەحیفەی ڕوزگارەوە.

بەڵێ هەر قەومێ جەریدەیێکی نەبێ، زیانی نییە. کە بەستە زیان بوو، هاواری نەکرد، دیارە هەر بەش خووراو و نان بڕاو ئەبێ!

وا خوا ڕەوای بینیی غەزەتەمان بۆ بوو. غەزەتەکەیشی تەفرەقە جۆ نییە تەفریق بکا، لە جامیعی جامیعەدا سەلا ئەکا. چونکو خۆمان بەچاوی خۆمان مەئال و نیکالی تورکیەمان دی، خیدمەتکار و تەڕەفداری یێکیەتیی و یێك ئاییینیی و براییێتی گەلێن کە هەموو لایێك پێکەوە دڵمان خۆش بێ، ئەوە لە هەموو چشتێ خۆشترە و لە ئێستاوە تکا لە ئەربابی فیکر و قەڵەم و خێرخواهانی وڵات ئەکەین لە ئاسار و ئەشعار و ئەفکاری قیمەتدار، غەزەتەکەمان بێ بەش نەکەن. زۆرتر ئێمە ئیحتیاجمان بە مەسائیلی ئیجتیماعی ئیقتیسادیی هەیە، چونکو ئەگەر وەجهی گوزەرانمان لە ڕەفا نەبێ، شیعر و ئەدەبییات بەزگی برسیی ناخوێنرێتەوە، وە موشکیلێکمان هەیە ئەمانەوێ ئەربابی فیکر و ئیختیساس ئەوەمان بۆ حەل بکەن.. لەهەموو عێراقدا تا ئێستا دەغڵ و دانی لیوای هەولێر بەناوبانگ بووە و ئەم ساڵیش فەیز و بەرەکەت لە هەموو ساڵێ زیاتر بووە و بە کەمالی وسووق و ئیتمیئنانەوە زانرا کە نانی سێ ساڵ لە لیوای هەولێر دا دەغڵ و دان هەیە، کەچیی بەهەموو مەعنایێکەوە گرانییە. ئەم موعەممایەمان بۆ حەل بکەن و چارەی چییە؟ لەهەموو لایێکەوە بۆمان بنووسن! / تەواو

**٢. رەوشت و ئامانجی غەزەتەکەمان.**

لەپێش هەموو چشتێکدا نەزاهەتی فیکر و قەڵەم لە غەرەزی شەخسیی نەدوێ و چونکو ئیجازەی سیاسەتمان نییە و لە سیاسەت دووانیشمان لەبارا نییە، ناتوانین مەقالاتی سیاسیی بخەینە غەزەتەکەمانەوە، بەلام بۆ جستو جووی چارەی بەرێدا رۆیین و بەرێوەچوون، چاوەرێی مەقالە ئەکەین و کلیلی ئەم گەنجینەی مورادە لەرێوە و لە جێوە، خوێندن و بەکارهێنانی جەوهەری عیلمە. خۆزگە یێکێکیش مەنشەئو موددەتی حەیات و رێ و شوێن و تەرجەمەی حاڵی شاعیر و ئەدیبەکانمانی کۆئەکردەوە و تا ئێستا سالم و کوردیی و نالیی و زۆر شاعیری ناودارمان نازانین چین و کوێندەرین و چەند ژیاون!! / تەواو

**٣. ئامۆژگاری ئایینیی.**

ئەویی کە ژێرە مەرگی لەبیرە
سەلاح بەعیلمە نەك بەشیرە
زۆرانێ لەگەڵ نەفستا بگرە
کە نەتخست ئەتخا، کەواتە بمرە!
زۆرزانیی لەرووی کتێب کەڵك ناگرێ
خوو، کردەوەی چاك قەلاتت بۆ ئەگرێ
چاوت لە چاکەی دوژمنت نەبێ
لەزستان شەبێ لەپیران تەبێ
خەیاڵ مەدەرە سەر عەیبی خەڵکیی
عەیبی خۆت زانیی، بزانە بەکەڵکی
لە گفتوگۆدا زۆر هەڵمەدەرێ
دیارە زۆر بڵێی ئەتکەنە دەرێ

دوو برین لە لەش بێ دەرمان ئەکرێ
بڕینی زبان جەرگت ئەبڕێ
زبانت بێڵێ سەر ڕەحەتە
بەد زبان لەناو قەوما نەگبەتە
دوو گوێ و زبانی داوە بە تۆ
وو ببیە و یێکێ بڵێ لەسەرخۆ
هەر لە ئێوارە تا بەیانیی
شوغل و نوێژ بکەی هەتا ئەتوانیی
سبەینێ حەقی ناست کەوتە سەر
نوێژی شەوانت ئەڕوا بەهەدەر
چونکو حەقوالله خوا لێی ئەبوورێ
خەڵك واز نایێنێ لەسەر تۆزێ
تازە پیاکەوتوو قەرزی لێ مەکە
ئەتگێڕێتەوە لە ڕێگەی مەککە
ئەمرۆ کە هەڵسای لەخەو بڕوانە
ئەویی دوێنێ دیت خەوە، ئەفسانە
کەوابوو پیشەی دەوری دەورانە
عومرت بە خەوو خەیاڵ بزانە
بۆ دوو ڕۆژ ئەویش کە وای لە دەردا
ئەولا لە کیسی خۆت مەدە نامەردا
شەریعەت کەشتیی دەریای حەقیقەت
ناخودای لای خوای پیری تەریقەت

کـە بـە ڕێیـی ڕاسـتا ڕۆییـت گـوم نـابی
ئەگەیتـــە مـــەنزڵێ هەرچـــەند تـــەنیایی
چـەند خۆشـە بـاری شـانت قـورس نـەبێ
مـادام هــەر دەڕۆی مـاڵ بــەجێ دێڵـی
ئـەم زەویــەی ئەمــەل بـۆ کـێ دەکێڵـی
بــۆ مێــردی ژینــت خۆیشــت نـاموراد
میقرۆبـــی شـــڕە مـــیرات بـــۆ ئـــەولاد
تـــا مـــاوی بیـــدە لـــەڕێیی خـــودادا
هــەر خێــرە ڕەنجـت نـادا بـە بـادا!

"تەواو"

## ٤. ڕەبەن

**ئەحەی جاو**

دۆسـتێکمان هەیـە، تـاقی جوانیـەتیی تـێ پـەڕیوە و چـڵەی بردووەتـە سـەر و سەروگوێلاکی وەك ئاشەوان لەتۆزی ئارددا بـۆز هەڵگـەڕاوە و چـونکە مـەیلی مـێ بـازیی نییە و خۆی قیت ناکاتەوە، گەلێ لە ساڵی ژیانی بەپیرتر ئەبینرێ!

پێرێ بە ڕێکەوت هاتە لام، کڵاوەکەی داگرت، سەری دەرکەوت. پیرێکی وشکە پـیر، نـەك تـەڕپیر. بـەزەویم پیاهـات، مـەوقیعێکی بـاش و گـوزەرانێکی ڕێـك و پێـك و مـاڵ و ئاشچی و فەرش و فرووش و ئوتومبێل و تەلەفوون و ڕادیۆیشی هەیە. بەتوانجـەوە پـێم گوت: بێ پیر، وا پیر بووی، بۆچ ژنێ نایێنی؟ ئەمڕۆ لـە حـەیاتی بەشـەردا دەرکـەوتووە یێکێ کە کەوتە ساڵەوە و هۆی کەوتە ئەوەی خیدمەتی بکرێ، هیچ کەسێ نابێ بە ژنێك کە جێ و مەکانێکی پاك و تەمیز و لە نەخۆشییەکدا دڵسۆزانە بە ژوور سەریەوە دانیشێ

و چاوی لە ماڵ و زەخیرەی بێ بە فیڕۆ نەڕواو لـە خۆشـییا هـاودەمی بـێ و لـە خەفـەتا هاوغەم! خۆ لە ئەساسەوە بیگری، ئێمە کە ئیسلامین و لە ئایینەکەمانا (تناکحو) هەیـە و (لا رهبانیـة في الاسـلام / لا ڕەهبانییـە فیلئیسـلام) مـان بـێ بێـژراوە. ئەڵبەتـە ئـەم گوزەرانی تەنهاییـە بـاش نییـە و خیانەتێکـە بـۆ قـەوم کـە ئەساسـی بـەقای کائینـات و قەومییەت بە ژن هێنان و منداڵ پێ گەیاندنە و غایە لەمەیش کـە خـوا ڕێیـی موسـەننا و سەلاس و روباعی داوین، هەر بۆ نەسل و نەتەوە و ئەولادە. تۆ بەخۆتەوە نەدیوە ئەولاد چەند شیرینە کە بە منـداڵیی بـە خلـە خـل، بەبـەردەمی بـاوك و دایکـا دێـت و بـە زبانـە نەپوشکوتووەکەی ئەڵێ (تەتە).. چەند خۆشە، نەخوازەڵا وەجاخ کـوێر بەشـی هـەر دڵ تەنگیی و بەرچاو تـەنگیی و چـرووکیی و کـەم دەسـتییە، کـە مـردیش لـە جیهانـا نـاوی گومە، وەجاخی کوێر ئەبێتەوە.

توخوا هیچ بە دڵتا نایە کە لـە کـۆڵان گـەڕیی و ئاموشـۆی مـاڵانی دۆسـت یـا بێگانـە مانـدوو بوویـت و ڕووت کـردە مـاڵی خـۆت، دەرگـات لـێ کرایـەوە، راییحـە و هـەواییکی بەختیاریی و مەسەڕڕەتێکی هامسـەریی و هاوحـەیاتیی بـە سـیمای ڕوونـی ڕەفیقـەییکی گیانی گیانییەوە، بێت بەپیرتەوە؟ خۆ ئەگـەر خـوا بیـدا بەخرنگـەی پاوانـەوە، بێچـووە فرشتەییك بە بابە بابە، خۆی هەڵدا، دەست بکاتە ملت، بیگوشی بە سنگتەوە، هەرچیی خەم و خەفەتی جیهانیت هەیە لە دڵتی دەرکا.. چی لەوە خۆشترە؟ هەروا بەم خەیاڵاتە خۆشانە گەنم گردیی دامگرت تا زنجیرەی دڵخۆشـیی و تامـە تامـەم بڕایـەوە. ئـەو دایـە قاقای پێکەنین و وتی: ئۆخ، تا ئێستا نەم زانیوە شاعیرێکی خەیاڵپەروەر و تـەفرەدەری وای..؟ منیش زۆرجار ئەمانـەم هـاتووە بەخـەیاڵا، سـەعاتێ، دوو سـەعاتم ڕابـواردووە.. دوایی لەپڕێکدا ئەو پـەردە زەربەفتـە لاچـووە، پـەردەیێکی ڕەشـی چڵکنی سـەفالەت و بەدبەختیی گێڕڕاوە، مانـدوو و مـردوو کـە هاتوومـە ماڵـەوە، لـەڕێوە ژنەکـەم تەماشـای دەستی کردووم، هیچم پـێ نـەبووە، ڕووییێکـی گـرژ و چـاوێکی مـۆن، کـە منداڵەکـەمان

هاتووە بەلامەوە، دایکەکەی ڕایکێشاوە، چەمۆڵەیێکی لیێ ناوە(تۆ لاچۆ.. واتزانیی باوکت قوماشی بۆ هێناوی لەشی ڕووتی پیێ داپۆشم.. یا گۆشت و برنج و ڕۆنی بۆ ناردووینەتەوە، ئێوارە چێشتان بۆ لیێ بنیێم؟). ئیتر ئەوە توانج و بۆڵە بۆڵ بووە تا عەباکەی کێشاوە بەسەریا، بۆی دەرچووە، منداڵ بە شوێنیا گریاوە، گریاوە و من بە ژانی زامی دڵەوە ئەم سەرە و سەرم کردووە و تلاومەتەوە، منداڵم بۆ ژێر نەبووەتەوە. ئافرەتەکەی ماڵمان بەخێری خۆی بردوویەتە کۆڵان و خانمیش چووەتە قوبووڵی ماڵان.

جاریێ ئەمە پەردەیێکی سینەمای حەیاتی ژن و مێردیی، خۆ ئەگەر پەردەیێکی تری تەماشا بکەی، منداڵی گەورەترت ببیێ، ئەوا دانیشتووی، لەپڕ ئەبینی هاواریان بۆ هێنای، (های، هیتلەری کوڕت گیرا، بردیان بۆ حەپسخانە و برینداریشە، موزاهەرەیان کردووە و چوون بەگژ پۆلیسدا، گرتیان. کچەکەیشت لەگەڵ پۆلی ژناندا وان لەبەر دەرکی سەرا، بەردە فڕکێیانە !). ئەمە خوێی چێشتە ؟

من لە دەورێکا بووم، ئافرەت نالێم لە ماڵا حەپس بوون، چوویشنە دەرەوە، بەلام کراسیان تا سەر پانیبەرزیان بووە و ئاوەڵکراسیش درێژتر.. ئێستا سنگ و لنگ ڕووت، دەستنوێژ نەماوە تا بڵێم بە تۆقە دەستنوێژ ئەشکێنن، بە نامی من و کامی دیگەران، لەمانە نەتەوە بخەنەوە ؟! نە،نە !

"تەواو"

### ٥. نالیی[١٥]

ئەحوەلی تەفریقە نەزەر تەقویەتی سەبەب دەکا
عارفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب ئەکا
بەندە ئەزەل بەختەتی خۆی قابیلی قیسمەتی بووە
ئێستە بە ئیقتیزای عەمەل جێگەی خۆی تەڵەب ئەکا

**داری ئیراك و داری هیند هەردوو کە عوودە ئیسمیان**
**هەمدەمی سوننەتە ئەو مەیلی ئەبوو لەهەب دەکا**
**سەهم و نەسیبی ئەسڵییە، بەحسی گیا و گوڵ نییە**
**تووتنە خەرجی سووتنە، موودەنە ماچی لەب دەکا**
**لۆمەی زبان ئەکا کە بۆچ خواریی و ڕاستیی دەڵێ،**
**غافڵە دەستی ڕاستی، خۆی خدمەتی دەستی چەپ دەکا.**
**تووتیی تۆ لەحیرسی بەندی قەفەس دەکاتە مل**
**بولبولی من لە عەشقی گوڵ تەغەنیی و تەڕەب دەکا.**
**"نالیی" حەریفی کەس نییە، ئەلفی ئەلیفی کەس نییە**
**بەیتی ڕەدیفی کەس نییە، هەرزە نویسە گەپ دەکا.[١٦]**

"تەواو"

### ٦. لە هەولێر کۆنتر

پیرەمێرد

دیارە هەولێر لەهەموو شوێنێك کۆنترە، کەچیی من لە هەولێر کۆنترم. بۆ ئەمەی درۆی تیا نەبێ، ئەبێ بڵێم لە هەولێری خوارەوە کۆنترم!

بەڵێ کاتێ من ئاموشۆی هەولێرم ئەکرد، تەنها هەولێری ناو قەڵا و ئەم هەولێرەی ئێستە کە سەرا و قشڵە و بازاڕ و نادیی و باغ و باغچەی تیایە، شانی نەبوو. تەنها لە خوارەوە هاوینان چەند کەپرێکیان لێ ئەبەست، قاوەخانە و میوەفرۆشی لەژێردا دائەنیشت. ڕێبوار کە لەم لاوە ئەچوون بۆ مووسڵ یا لەو لاوە ئەهاتنەوە و ئیشیان بەناو شار و قەڵا نەبوو، لەوێ ئەحەسانەوە.

لەم دوواییەدا کە ئێمە کەوتینە بەر ویلایەتی مووسڵ و ئەچووین بۆ ویلایەت، قۆناغمان هەولێر بوو. شەو لەوێ ئەماینەوە، بە میوانییش ئاشووبێکمان خستە ناو پیاوە پیاوەکانی ئەوێوە. میوانی مەرحوومی (مەلا ئەفەندیی)[١٧] ئەبووین، ئەوانیتر بە

هام چەشمییەوە لایان گران بوو کە بۆچ لەماڵی ئەوان دانەبەزیوین؟ جارێکیان بە ئیشێکی زۆر موهیم لە خیدمەت (شێخ مستەفای نەقیب)[۱۸] دا ئەچووین بۆ مووسلّ، بەرەو دووا میوانی (مەلا ئەفەندیی) ئەبووین. (مەلا ئەورەحمان دۆغرەمەچیی) بەزۆر شەو و ڕۆژێکی گل داینەوە تا میوانداریی کردین. زۆریش بووین.. های لەو کەڵە پیاوانە کە لە هەولێرمدا ئەدین و ئەوەتیی ئێمە و هەولێر یێکتریمان ناسیوە، هەمیشە بە پیاوەتیی و میوانداریی و ئەوان زیادیان بەسەر ئێمەوە بووە و سەرەڕێمان بوو لە یێکیەتیی و تیّ گیرانی حوکوومەتیشدا پشتیان بەرنەداوین. منداڵەکانی مەکتەبمان بە سەفرە چووبوونە کەرکووك، لەویّ شەڕیان بوو بوو، کوڕ گەلی هەولێر لەسەریان کردنەوە!

هەولێر کۆن ئەبیّ، پیرەمێرد کۆن ئەبیّ، چاکە کۆن نابیّ!. لەبیرمە ساڵێك کە (ئەحمەد بەگ)[۱۹]ی ئێمە لەویّ موتەسەڕڕیف بوو، سەراپا، هەرچیی مەئموور هەیە تا دەگاتە مەئمووری غاباتیی کە (هادیی) ئێمە بوو[۲۰]، تەنانەت قۆڵچیەکەیشی لە ئێمە بوو، نەیانگوت، نانمان ئەفرێنن! ئێمە بووینایە؟

وا بە غەزەتەکەیان تا ماوم پیاوەتییان بە یاد ئەکەم!

"تەواو"

## ٧. لاپەڕەییێك لە تەئریخی ئەدەبی کوردیی

## مەلا مستەفای بێسارانیی، پایەی لە شیعر و ئەدەبا.

**گۆران**

شاعیری گەورەی شیوەن و موناجات، مەلا عەبدوڕڕەحیمی مەعدوومیی، کە زیاتر بە (مەولەویی) ناوبانگی دەرکردووە، دووایی هەڵبەستێکی موناجاتی خۆی وەها هێناوە:

**هەورامی**

**موتریـــب بـــەو بـــە داد دڵگیرمـــەوە**

**پـــیری، هـــا، ئامـــا وە پیریمـــەوە**

**نـــەوات وێرانـــەی دڵ کـــەرۆ ئـــاوا**

**چـەنی بەسـتەی فـەرد بێسـاران مـاوا**

**ئینـە گـرد جـە وەخـت نـادانیم بیبـەن**

**فەسـڵی سەرمەسـتیی و جـوانیم بییـەن**

**ئیسـتە هـا جـە گـرد پەشـیمانیم بـەرد**

**تۆبـــەی پیریمـــەن، یـــاوانم تۆبـــە**

**تۆبـــەی تۆبەمـــەن کرمـــەدار تۆبـــە**

**کوردیی**

**موتریـــب بـــێ بـــەداد دڵگیریمـــەوە**

**(پیریـــی) هـــا وا هـــات بەپیریمـــەوە**

**نـــەوات وێرانـــەی دڵ بکـــا ئـــاوا**

**بەسـۆزی بەسـتەی (بێسـاران، مـەئوا)**

**.. ئەمە گشت، کـــاتی نەزانیم ڕوویدا**

**کـــاتی بەرگـــەرمیی جـــوانیم ڕوویدا**

**ئێسـتا وا لـە گشـت دڵ پەشـیمان بـووم**

**نۆرەی پیریمە، جوانیی لـە دەست چووم**

**وادەی پیریمـــە، گەییشـــتمە تۆبـــە**

**تۆبـــەی تۆبەمـــە، کرمـــەدار تۆبـــە!**

لە جێگاییێکی ترا بۆ خاڵۆی کۆماسیی[٢١] (ئەحمەد بەگ) ناوی شاعیر ئەنووسێ:

**هەورامیانە**

**تەشـریف بـاوەرە جەرگـەمان جـەم بـۆ**

**بەل وەی (جەم) خەمی جە لامـان کـەم بۆ**

**(بێسـارانی) یـەن نـە تـۆی فـەردی مـن**

**خـەم چـەنی خـەمان زوومـە بـۆ سـاکین**

**کوردیی**

**تەشـریف بێنـە بـا کۆمـەڵمان جـەم بـیٚ**

**بـەڵکو بـە جـەمی خـەم سـەنگی کـەم بیٚ**

**(بێســارانیی) یــە نیـوەی بـەیتی مـــن**

**خــەم لەگــەڵ خــەما زوو ئــەبیٚ ســاکین**

ئەم بێسارانییە کێیە کە ئەوەندە بەرزبووە، مەولـەویی لـەڕێگای تـیٚ هەڵکێشـەوە — تەزمین — ئەیکات بە تەرجومانی سۆزی دەروون و جۆشی لێك دانەوەی خۆی؟

هەر بەوەشەوە ناوەستیٚ، بڕوانن لە شوێنێکی ترا بەرامبەر بـەم شـاعیرە چ زبـانێکی ستاییش ئەخاتە کار:

**هەورامیانە**

**هەی ڕەحمەت ئەو قـەور سـەودایی کامـڵ**

**سەرمەشـقی مەینـەت (بێسـاران) مـەنزڵ**

**یانـــە وێرانیـــی هـــەر بـــە مـــن یـــاوان**

**مـــەتاو و گرتـــەی کـــەس وتـــر دامـــان**

**کوردیی**

هەی ڕەحمەت لە گۆڕ سەودایی کامڵ
سەرمەشقی مەینەت (بێساران) مەنزڵ
کڵۆڵیی تەنیا بە من فێرە و بەس
لەمن بەو لاوە ناوێرێ بە کەس!

شاعیرێك، مەولەویی بەسەر مەشقی مەینەت و سەودایی کامڵ بزانێ، هیچ گومان نییە شاعیرێکی بەنرخ و نایابە، بەکەڵکی ئەوە دێت بدۆزرێتەوە و بناسرێ و بخرێتە بەرچاو، بەتایبەتیی بۆ نەتەوەی ئێستای کورد کە نەك دوو چاو، چوار چاوی تاسەو ئارەزو و بۆ میراتی ئەدەبیی پێشینانی ئەگێڕێ.... بەڵام دەستووری بەگەل ناسین و پێش چاو خستنی شاعیرێك وەك هیچی تر نییە. لەپێش هەموو شتێکا بڵاوکردنەوەی دیوانەکەی پێویستە. لەبەرئەوە دڵ ئەخوازێ ئەو لایەنانەی کە چاپی ئاساری پێشینانیان کرتووەتە ئەستۆ، پەلە بکەن، بەڵکو ڕۆژێ زووتر، دیوانی ئەم شاعیرە پێشکەشی خوێندەواران بێ، بەجۆرێك کە دیوانی (مەولەویی) لەلایێن پیرەمێردەوە پێشکەش بوو.

دیوانی (بێسارانیی)، وا ئەزانم ڕۆژی بڵاوبوونەوە و ڕۆژی لای ژرورگرتنی ناوبانگی مەعینێکی — چەندانی نابێ، بۆ سەلماندنی ئەمە، بەڵگە بە ڕووەوە هەیە.

لەهەموو سەردەم و وڵاتێکا خوێندەوارانی ئەدەب و شیعر، لەبارەی خوێندەواریی و سەقافەتەوە لە دوو چین ئەساس زیاتر نەبوون، چینی بەرز، چینی بۆرە پیاو. هەروەکو لە تەئریخی ئەدەبا بەرچاو ئەکەوێ بۆ شاعیرێك، تەختی ناوبانگی ڕاستەقینە، هەمیشە بە دەستیاوی ئەم دوو چینە دانراوە. هەرچیی شاعیرە، خۆراکی گیانی بە چ ئەندازەییێك پێشکەشی هەردوو لایان کردبێ، بەو ئەندازەیە دەستیان داوەتە دەستی یێکتری، بۆ ژیاندن و جاویدان کردنی ناوی. لە خوێندەوارەکانی شیعری " گۆرانی " هەورامیانەدا سەرکردەی چینی بەرز دیارە، بەبێ ترس لێ گرتن، مەولەویی هەڵ ئەبژێرن.

لای ژوورەوە، دیمان (مەولەویی) بە چ چاوێکی ئاشنایی و حورمەت، تەماشای (بێسارانی) کردووە، چەن فەرد (بەیت) ێکیشمان بەرچاوکەوت کە هی بێسارانییە و تێ هەڵکێشی شیعرەکانی خۆی کردووە.

هەر لەم بابەتەدا، تەماشای فەردەکانی دوایی هەڵبەستی (مەولەویی) ش بکەن.

**هەورامیانە**

**غەریب بیەم چ نیم کەرەم نەمانا**

**دە سەد قات بەریم خەدەنگی شا**

(ماویەتی)

"تەواو"

# بەشی سێهەم

## دەستەی ڕۆژنامەکە

### ١. خاوەند ڕۆژنامەکە : ئەمین ڕواندزیی

ئەمین-یان- محەممەد ئەمین کوڕی مەلا حەسەنی ڕەواندزییە و بنەچەیان ناسراوی ڕواندزە. دایکی خەدیجەی نێوبووە. ساڵی ١٨٩٨ ز لەهەمان باژێڕۆکدا دنیای دیتووە و تاقانەی باب و دایکی بووە. خوشکێکی هەر بە منداڵیی مردووە. خوێندنی سەرەتایی لە یێکەم فێرگەی ڕوشدییەی مولکیی[٢٢] ڕواندزی سەردەمی عوسمانیدا دەستگیر بووە، دوایی چووەتە ئامادەیی سەربازیی، ئەوجا لە مەکتەبی جەنگاوەریی ئەستانبووڵدا خوێندوویەتی و - بەپلەی مولازمی دووەم-بووە بەئەفسەر[٢٣]. دیاریشە لە یێکەم جەنگی گێتییدا بەشدار بووە. دوای ئاگربەست گەڕاوەتەوە بۆ عێراق و لە٢٥/١١/١٩٢٢دا لە ڕیزی سوپای عێراقدا - بەهەمان پلەی باس کراوەوە - دامەزراوە[٢٤]، بەڵام لە٢٥/٥/١٩٢٢ دا لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی دی کورد لە بەغدادەوە هاتووە بۆ سلێمانیی و تێکەڵی - بزووتنەوەی کورد- حوکمڕانیی دووەم جاری حەفیدزادە شێخ مەحموود[٢٥] بووە و هەتا ساڵی ١٩٢٣ ز لەگەڵی بووە[٢٦]. دوای ئەم تێکەڵییە و جارێکی دی بەپلەی -نزمتر- مولازمەوە لە سوپای عێراقدا دامەزراوەتەوە و ساڵی ١٩٢٦ز، دوای مووسڵ لە هەڵەبجەدا لەڕیزی ئەو سوپایەدا بووە.[٢٧] لەساڵی ١٩٢٧دا- بەپلەی مولازمی یێکەمەوە - هەر لە ئەوێدا بووە. لەساڵی ١٩٤١ز.دا بەپلەی ڕەئیسەوە لە باژێڕی هەولێردا فەرماندەی فەوجی سوپا بووە. لە١٦/٧/١٩٤٦ز.دا بەپلەی موقەددەمەوە خانەنشین کراوە. دوای ماوەیێ بووە بە ڕێبەری بەلەدییەی ڕواندز و خزمەتگوزاری ئاوەدانیی بووە.[٢٨]

لە ساڵی١٩٥٠ز بەدواوە هەر بە خانەنشینیەوە لە هەولێردا ژیاوە، بەڵام - بەقسەی نەوەی خۆی- ناچار بووە ڕوو بکاتە بەغدادو تا سەر نیشتەنیی بێ. لە١٦/١١/١٩٥٥ دا بە نەخۆشییەکی گرانەوە هەر لەئەوێدا کۆچی ماڵئاوایی کردووە و لە گۆڕستان

"بابولموعـەززەم" دا ئەسـپاردەی خـاك بـووە و نەوەیشـی بـۆ نـەلوواوە لەسـەر دوا ڕاسپاردەی خۆی لە چیاییکی ڕواندزی خۆشەویستیدا بنێژرێت.[٢٩]

لـەڕووی کۆمەڵایەتییـەوە – لەمووسـڵدا– ژنـی هێنـاوە و نـەوەی پـێ گەیشـتووی هەیە.[٣٠] لەژینیدا و لەچەند ڕۆژگاری جویدا تووشی گیروگرفتی دابەزینی پلـەو فـەرمانی بووە، بەلام هەتا سەر هەر نیشتیمانپەروەرێکی دلسۆز ناسراوە.

مێژوونووسیی عێراق عەبدوڕڕززاق ئەلحەسەنیی سـێ جـار نێـوی بـردووە، جـارێ کـە ساڵی ١٩٣١ز ئەنـدامێکی دامـەزرێنی (کۆمـەڵی پشـتیوان) ی سیاسـیی و نهێنیـی بـووە. جاری دووەم – دوای نێـوی ڕەفیـق حیلمیـی– دووەم کەسـی نێـو دەسـتەی دامـەزرێنی (پارتی هیوا– ١٩٣٩ز) بووە[٣١] جاری سێهەم کە ساڵی ١٩٣٥ز نوێنەری هەولێر بووە لە پارلەماندا.[٣٢]

عیززەددین فەیزیی هاوڕێی گێڕاویەتیەوە: (لە هەرایێکی مانگی مایسی ١٩٤١ز.دا کـە لە هەولێردا لە دژی ئینگلیز ڕووی دا، ئەگـەر سـالح زەکـی سـاحێبقرانی موتەسـەڕڕیف و ئەمین ڕواندزیی فەرماندەی فەوجی سوپا نەبوونایە، کارەساتێکی گەورە دەقـەوما و زۆر کەس دەکوژرا و٦ی ئەیلوولی١٩٣٠ی سلێمانیی لە هـەولێردا دووبـارە دەبـووەوە !).[٣٣]

ئەمین ڕواندزیی، عەشقێکی گیانی گیانیی لەگەڵ خوێندەواریی، پێشکەوتنی ڕۆشـنبیریی هەبووە.. بۆ وێنە لەسەردەمی حوکمڕانی حەفیدزادەدا، دوای مـانگی تەشـرینی یێکـەمی ٩٢٢ ز – کە بە جارێ چوار قوتابخانە لە سلێمانییدا کراونەتەوە– ئەو و عەزیز قـەززازی ئەفسەر، یاریی، مەشقی سەربازییان فێری قوتابیان کردووە.[٣٤] وێنـەیێکی دی ئەوەیـە کە – وەکو چەند سەرچاوە باسیان کردووە – ساڵی ١٩٣١ لە دەستەی ڕێبەریی (یانەی سەرکەوتن) ی ڕۆشنبیریی کورداندا بووە لە بەغدادا.[٣٥]

پەرۆشیی بۆ خوێندەواریی و پێ گەیشتن، کارێکی ئەوتۆی کردووە، لە ئـەو ڕۆژگـارە ناسکانەدا کە باری خوێندەواریی ئاسان نەبووە و گوزەرانی خوێندکاران سـەخت بـووە، گەلێ خوێنـدکاری وەکـو منـداڵی خـۆی، لـەماڵی خۆیـدا پـێ گەیانـدووە و هـەرکاتێکیش یێکێکیان سەرکەوتبێ لە خۆشییدا گریاوە.

نەوەی خۆی کە ئەو باسانەی بۆ نووسیوم، پتر دەڵێت: ئەمین ڕواندزیی نەیاری هێندێ نەریتی کۆن و توند و تیژ بووە، بۆ وێنە لە ئەو ڕۆژگارانەدا خاتو "هێوی" کیژی، یێکەم مامۆستای سوفوور بووە لە ڕواندزی مەڵبەندیاندا، لەلاییێن هێندێ پیاوی بازێڕۆکەکەوە "عابایێك"ی بۆ هاتووە و بابیشی خەڵکەکەی کۆکردووەتەوە و پێی گوتوون: (کیژە کورد پێ ویستیی بە عابا نەماوە و کاتی خوێندن و ڕاپەڕینە و دەبێت بۆ بەرزیی ڕوو بکەنە قوتابخانەکانی هەولێر و بەغداد و پێ بگەن و خێر بدەنەوە بە نەتەوەکەیان). هەر ئەم باوەڕیشی کاری تێ کردووە کە کوڕ و کیژی خۆی هان بدات بۆ بڵاوکردنەوەی گوتار لە ڕۆژنامەی دووەمی هەولێردا: (هەولێر– ١٩٥٢و١٩٥٣). {٣٦}.

گەلێ کەس– وێڕای نەوەی خۆی– دەگێڕنەوە کە ئەم پیاوە، وێڕای پایە و نێونیشانیی، کەسێکی بێ فیز و خۆمالیی بووە و لەگەڵ هەرکەسێکی ڕەشۆکیی هەڵساوە دانیشتووە. هەروەها هەموو شتێکی کوردەواریی پێ خۆش و جوان بووە، هەر لە دیمەنی کوردستانەوە تا دەگاتە جل و بەرگ، خواردەمەنیی، کەرەستەکانی خۆماڵی گەل، هەتا دەگاتە چای سەماوەر. زۆریش دۆستی خوێندەوە، دەنگی خۆش و دەنگ خۆشان بووە، بەتایبەتیی گوێندەکانی وەك (مەلا کەریم، ڕەشۆڵ عەبدوالله) کە چەند جارێ داوەتی کردوون بۆ هەولێر! {٣٧}

پێوەندیی ئەمین ڕواندزیی بە ڕۆژنامەنووسیی کوردییەوە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دووەم شۆڕشی حەفیدزادە شێخ مەحموود لە دژی ئینگلیز و ساڵی ١٩٢٣ز کە لە ئەشکەوتی جاسەنە– سلێمانییدا، لەلاییێن لیژنەیێکی یێکەم ڕۆژنامەی شۆڕشگێڕیی (بانگ حەق– س١٩٢٣) دەکراو ڕواندزییش یێکێ بووە لەڕیزی لیژنە نێونەبراوەکەدا. {٣٨}

دوای دەرکەوتنەوەی نێوی لەڕیزی سوپای عێراقدا، چ پێوەندییەکی ئاشکرای دیار نییە، بەڵام زۆر وێ دەچێ وەکو ڕۆشنبیرێکی گوتارنووس و بەنێوی نادیارەوە چەشنی (مووسڵ – ڕواندزیی)، هەروەها بەنێوێکی نێو ئاشکراوە وەك: (ئەمین کوردیی – لە عەشیرەتی جبران. بەغدا) گوتاری بڵاوکراوەی لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە– س١٩٢٥) دا{٣٩}، گوتاری هەبوبێ. دیسان لە گۆڤاری (ڕووناکیی – س ١٩٣٦)ی{٤٠} هەولێردا گوتاری

هەیە کە بە نێوێکی کورت و ونەوە بڵاوکراونەتـەوە و یێکێکیـان بـە نێونیشـانی (زبانـانی گێتیی-عالەم)ەوە -با هێندێ دەستکارییشـی پێـوە دیـار بـێ- سـەروبەر بـە زمـان و شێوازەوە وەکو گوتارێکی گۆڤاری (گەلاوێژ -س١٩٤٣)ە[٤١] کە بـە نێونیشـانی (زبـانی عالەم) ەوە بە ئیمزای " أ. رواندزی " یەوە بڵاوکراوەتەوە.

هەرچـەندە نـەوەی خۆیشـی دەگێڕێتـەوە کـە لـە ڕۆژنامەنووسـیی نهێنییـدا دەسـتی هەبووە، بەڵام لای من چ بەڵگەیێ بەدەستەوە نییە و هەرە پێوەندیی دیـاری دەرکردنـی ئەم ڕۆژنامەیەیە! سەرگوتاری ڕۆژنامەکەشی ڕۆشنایی دەدات کە زووتـر نیـازی ڕۆژنامـە دەرکردنی هەبووە کە بێ گومان ئەمە بەڵگەی پەرۆشیەتی بۆ ڕۆژنامەنووسیی کوردیی.

وەکو سەرنجم داوە، دواتر چ گوتارێکی دی لە ڕۆژنامە و گۆڤـارە کوردییەکانـدا دیـار نییە و دوانووسینێکیش کە دیار بێ ئەو نامە عەرەبییە بڵاوکراوەی ڕۆژنامـەی (هـەولێر-س ١٩٥١)ە کـە بـەرەو ڕووی وەزیـری نێوخـۆی کردووەتـەوە.[٤٢] ئـەمین ڕوانـدزیی یانزەهـەمین کەسـی کوردسـتانی باشـوورە -لەعێراقـدا- خـاوەنی ڕۆژنامـەی سـەربەخۆ بووە.

## ٢. مودیری مەسئوول: مەحامیی ناجیی؟

(ژیننامەیم بۆ ڕوون نەبووەتەوە. ئـەنجامی هـەموو پرسـێکم ئەوەیـە، نێـوبراو یێکـی بووە لە"جوو"ە ناسراوەکانی هەولێر!).

## بەشی چوارەم

### لێکۆڵینەوە

### ١. نووسەری بابەتەکان:

لەڕایەڵەی ئاشناکردنی بابەتەکاندا، نێوەکانی (ئەحەی جاو؟)، (پیرەمێرد)، (نالیی)، (گۆران) مان لا ئاشنا بووە. بەڵام لەلایێکەوە لەهەموو ئەدەبییات و ڕۆژنامەنووسیی کوردییدا، نووسەر (ئەحەی جاو؟) نادیترێ!! لەلایێکی دیەوە، بابەت و گوتارە بە ئیمزاکان، بێ خاوەن و شایانی ناسینن! کێن؟

١/١: خاوەنی گوتارەکانی "سەرەتا"و " ڕەوشت و ئامانجی غەزەتەکەمان – ل١ "؟

وەك لەکاری ڕۆژنامەنووسییدا باو بووە خاوەن ڕۆژنامە گوتار بنووسێت، بۆییێکا چاوەنۆڕ دەکرێ کە ئەوانە بەری قەڵەمی ئەمین ڕواندزیی خۆی بن! ڕاستییەکەی دوای بەراووردی گوتارەکە و شیی کردنەوەی شێوازی گێڕانەوە و وردبوونەوە لە مەبەستی گوتارەکە و ڕەوانیی زمانەکە و وشە بەکار براوەکانی، بەدڵنیاییەوە بە یێکێ لە نووسراوەکانی (پیرەمێرد)ی ڕۆژنامەنووس دەژمێردرێ. باوەڕیش دەکەم ئەمین ڕواندزیی خۆی ئاماژەی چەند سەرە قەڵەمێکی بۆ کردبێ بەتایبەتی لە گوتاری " ڕەوشت و ئامانجی غەزەتەکەمان" دا.

بۆ دڵنیایی خوێندەوارانیش، ئەم چەند کەرتە گوتارانەی (پیرەمێرد) لەبەرامبەر نووسراوە باس کراوەکاندا ڕادەگرین:

١/١/١: (چەند خۆشە قەڵەمڕەوی حوکوومەتێك کە عەناسیری موختەلیفەی تیابێ و ئەم قەومانە لەلێ قەومانا و لەتاڵیی و خۆشییدا یێك وجوود و یێك ماڵ و دۆست و ئاواڵ و هاوحاڵ بن. پار ئەم سەردەمە کە پێنجوین تووشی ئەو فەلاکەتە هات، لەهەموو خوتتەی عێراقدا دەنگی دایەوە!...." گوتاری: یێك ماڵیی"). {٤٣}

١/١/٢: (یادیان بەخێر، بەدرخانیەکان کە چوونە جەنەوە و – جنیف– داخوازییان بۆ هەستی قەومەکەیان کرد، یێکەمین ئەسبابێ کە بە دەستیانەوە بوو، وتیان ئێمە بە زبانی خۆمان غەزەتەمان هەیە. ئەوسایە بۆ ژیانی کوردەواریی تەنها "ژیان" مان بوو کە ئەویش غەزەتەیێکی بەستەزبانی ئەدەبیی بوو، نەی ئەتوانیی لە سیاسەت بدوێ!..." گوتاری: سەحافە سەقافەیە!"). {٤٤}

١/١/٣: (ئێمە هەر ئەڵێین و ئەرێسین و بای ئەدەینەوە کە سەقافەی قەومیی و ئاساری مەتبووعەمان بمانهێنێتە ناو ناودارانەوە و ئارەزووی ئەکەین لاوە بەهۆشەکانمان هەرییێکە دەست بدەنە قەڵەم بنووسن و بنووسن و تەبعی بکەن، سا بەهەر ڕەنگێ ببێ لە کتێبخانەی میللییدا ڕەفەیێ پڕ بکاتەوە و کە هاتە سەر ژماردنی ئاساری کوردیی، دانەییێکمان بۆ زیاد بکا و بڵێین هەمانە!.. " گوتاری: خەیاڵپلاو!"). {٤٥}

١/١/٤: (خوا لیمان نەستێنێ، وا گۆوارێکی ناوداری بە ویقارو پڕ لە گوڵدەستەی ئەشعاری ترمان لە مەئاباد – مەهاباد – دەرچوو، ناوی "کوردستان"ە.. وا "ژین" ی پیرەمێردیش دوابەدوای یێك خوا نەتەوەی لەخۆی باشتر لێ ئەخاتەوە و بەوە "ژین" ژیانی تازە ئەبێتەوە. "ژین" سەراپا ئەم چەند ساڵە دادخوازی غەزەتە و ئەدەبییاتی قەومیی بووە کە زانیویە هەر خوێندەواریی و ئەدەبە، میللەتێك دەبا بەڕێوە و سەری ئەخا. هەر ئاساری کوردیی چراییێکە و هەر بەیتێ براییێکە، تیغ و تفەنگ پیشەی شەڕ و شۆڕە و پیاو سەری شۆڕە، سەربەرزیی لە ئەدەبدایە و یێکیەتیی یێکە سیلاحی دەعوایە!... " گوتاری: مژدە!"). {٤٦}

٢/١. خاوەندی " ئامۆژگاریی ئایینیی –ل٢"؟

هەر بەخوێندنەوەی ئەو (هەڵبەستە پەندە) کە بە ئەو نێونیشانەی بڵاوە، خوێندەوار بۆی هەیە یادی سەدان هاوتای بکاتەوە کە پیرەمێردی شاعیر و ڕۆژنامەنووس بەسەردێری " پەندی پێشینیان " ەوە لە گەلێ ژمارەی ڕۆژنامەکانی (ژیان) و تەرزە

ئەدەبە جوان و نەستەقە، بۆخۆی مۆرێکی هونەری هۆش و بیری پیرەمێردە کە هاوتای نییە.

جێگەی خۆیێتی هەر لەئێرەدا وێنەیێکی ئەو بابەتە یادبکەینەوە کە ٣ ڕۆژ پاش دەرچوونی ئەم (هەتاو)ە، لە ڕۆژنامەی (ژین) دا[٤٧] بڵاوی کردووەتەوە:

**٢. پەندی پێشینیان**

دنیـــا وا شـــێوا بەکـــەس چـــا نـــابێ
ســـا مەگـــەر دەوری مەهـــدیی پەیـــدابێ
ســێ چشــت کــۆن بــوو بــوو کەوتوونــەکار
درۆ و دوو ڕوویـــــی و بلـــــۆف قومـــــار
ئـــەم ســیانە هەرچـــەند هیچـیان چـا نییـــە
هـــیچ نـــەبێ قەســـدی گیـــانی تیـــا نییـــە
هەنـــدێك هـــەن كـــەوا بێگومـــان زۆڵـــن
دەســـتیان بـــوو، چـــاوی چـــاك هەڵـــدەکۆڵن
بەســـەرزاریی دۆســـت، کەچـــیی بـــەدزیی
کاتێکـــت زانیـــی وەك مـــار پێـــی گـــەزیی
ئەوانـــە تـــەنیا بـــەپیاو چـــاك فێـــرن
لەڕاســـتی دووپشـــك، حیـــزن نـــاوێرن.
مـــن لـــەم دواییـــەدا ییکێکـــی وام دیـــی
کردەوەیێکـــــی وای لـــــێ هاتـــــە دیـــــی
لەگـــەڵ ییکێکـــدا دۆســـتی ســـەرزاریی
لـــەپڕ لێـــی کەوتـــە گەســـتنی مـــاریی
گەســـتنێکی وا قەســـدی گیـــانی بـــێ

حـــــەرامزادەیی و نائینســـــانیی بــــێ
نـــازانێ ئەمـــە دێتـــەوە ڕێیـــی خـــۆی
ئـــەبێ بەلەکـــەی لـــەخۆی پیســـتر بـــۆی
خـــوا، چـــۆن پـــاك ئـــەدا بـــەدەم پیســـەوە؟
هاکـــا نالآنـــدی بـــــەدەم لیســــەوە.

"تەواو"

٣/١: خاوەندی گوتاری "ڕەبەن"، ئەحەی جاو؟ ل٣.

ئەم بابەتە چیرۆك ئامێزە ناسکە کە پەخشانێکی ڕۆژنامەنووسیی پتەو و ڕەوانە و یێکێ لە دوو کەسی گۆیا (شاعیرێکی خەیاڵپەروەرە!) لەبەردەمی نێوی نووسەر (ئەحەی جاو) ڕاماندەگرێت و چاومان دەکاتەوە بۆ ناسینەوەیی! ڕاستییەکەی نێوێکی ئەوتۆ — وەك لێی گوترا — لە ئەدەبییات و ڕۆژنامەنووسیی کورددا بەرچاو نەکەوتووە و نییە.. هێندەی هەیە— وەکو پرسم کردووە — ئەم نێوە نێوی کابراییێکی سافیلکەی قسەخۆشی خەڵکی گەڕەکی کانیئاسکانی سلێمانیی بووە و ئاودامانی (کەواو کراس و دەرپێی جاو) بووە و بەتەنێ هەر گەزۆ فرۆش بووە، تەنانەت هێندێ دەبێژن کە هێندە سافیلکە و ڕاستگۆ بووە، وەکو کەراماتیشی هەبووبێ ئەوها بووە. دەشڵێن هەموو کەسێ — حەفیدزادە شێخ مەحموودیش ئەو کەسانەدا بووە — قەدریان گرتووە کە تا سەرەتای ساڵانی پەنجاکان ژیاوە!!

کەواتە (ئەحەی جاو) ی نووسەری ئەم گوتارە، لەبن سێبەری تەبەقە گەزۆی (ئەحەی جاو) ی ڕاستەقینەدا خۆی شاردووەتەوە! بۆچی؟ یان ئەوەتە سڵ لە کرچ و کاڵیی و بێ پێزیی گوتار و باسەکەی دەکاتەوە کە ئەمەش ڕاست نییە، یان ئەوەتا ئارەزووی هەیە — بەقسە خۆشیی و ڕاستگۆیی ئەحەی جاوەوە — خۆی دەربخات کە بێگومان مەلامەتێکی دی هەیە!!

بەکورتیی دەڵێم، هەتا ئێستە لە ڕۆژنامەدا باوە – بەتایبەتیی لەبەر بێ نووسەریی – نووسەرێك پتر لە یێك بابەت بڵاوبکاتەوە، بەلام بێ دووبارە بوونەوەی (نێو) ی خۆی! بۆ وێنە (پیرەمێرد) کە زۆربەی گوتارەکانی خۆی بەشی زۆری ڕۆژنامەکانی گرتووە، بەدەگمەن نێوی خۆی نووسیوە، تەنانەت شیعرێکی زۆریشی بە نێوێکی خواستەمەنییەوە بڵاوکردووەتەوە، وەکو: قەلەندەر، پیروەیسی خلك، کونەماسیی، گورگودەریی، مەلاهایاسی، کوێخا ڕەمەزانی ورمزیاری، بێسارانیی، ئەبولوەفای کوردیی.[٤٨]

ئەم باسەیشمان بۆیێکا هێنایەوە تا بەدڵنیایی تەواوەتییەوە بڵێم، پیرەمێرد کە گوتار و بابەتەکانی "سەرەتا" و "ڕەوشت و ئامانجی غەزەتەکەمان" و "ئامۆژگاریی ئایینیی" و لە "هەولێر کۆنتر"ی لەیێك ژمارەدا نووسیوە، ناشێت بۆ بابەتی "ڕەبەن" یش نێوی خۆی ئاشکرا بکات، بەڵکو پەیڕەوی نەریتی ڕۆژنامەنووسیی کردووە کە یێك جار نێوی خۆی ئاشکرا داناوە.

کەواتە (ئەحەی جاو) نێوی هەر (پیرەمێرد)ە کە بەڵگەیش هۆش و بیر، زمان و شێوازیی جوانی پەخشان و پاراویی و شەکانە و بەراوردیش پتر ڕاستیی دەسەلمێنێ. ئەم چەند کەرتە گوتارە لەچەند گوتارێکی (ژین)ەوە وەردەگرین کە بۆ "ڕەبەن" دەخوێنن:

١/٣/١: (ئۆف ئەو کچە کوردە پچکۆلانەی کە وەك فریشتەی ئاسمانیی بە گۆرانیی کوردیی و یاریی خۆش، بەلەنجەولار بە بەردەمما ئاهاتن و ئەچوون، ڕۆحێکی بەختیاریی و سەربەرزیی ئاییندەی کوردیمان ئەبەخشی! "گوتار: نەورۆز"!).[٤٩]

٢/٣/١: (باوکی تۆفیق وەهبیی – مەعرووف وەهبیی – دیتە منی خۆش ئەویست، هەرچەند ئەچوومە ئەوێ، ئەم کوڕەی تازە پێی گرت بوو، جووتێ پاوانەی زیوی لەپێدا

بوو، بەخلەخل و خرنگەی پاوانە، ڕاست ئەهاتە باوەشی من! " گوتار: من و تۆفیق وەهبیی! "). [٥٠]

بەکورتیی، دەردەکەوێ کە پیرەمێرد نووسەری زۆربەی گوتار و بابەتەکانە!

## ٢. چابخانەی چاپکردنی؟

یێکێ لە ئەو باسانەی سەرنج ڕادەکێشن، ئاشنا نەبوونی چاپخانەی چاپ کردنیەتی!! بەرۆشنایی ئەوەش کە ڕۆژنامەی (ژین)ی سلێمانیی، خۆشیی بۆ دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیە دەنوێنێ و دەشلێ، (نوسخەییێکمان بۆ هاتووە!) من باوەڕم ئەوەبوو کە ڕەنگبێ لە (چاپخانەی کوردستان — هەولێر) چاپ کرابێ کە عەبدوڕڕحمان — گیوی موکریانیی خاوەندی بوو. بەلام نوێترین لێپرسینەوە و وردبوونەوەم لەباسی چاپ کردنی، دلنیام دەکەن کە بێگومان لە (چاپخانەی ژیان)ی چاپکەری ڕۆژنامەی (ژین)ی [٥١] سلێمانیی چاپ کراوە و بەلگەی دلنیابوونیشم ئەمەیە:

١/٢ کیژی خاوەند ڕۆژنامەکە — لە پاییزی ١٩٨٦ دا — بۆ منی گێڕایەوە کە بابی، پێوەندیی لەگەلێ خاوەندی (چاپخانەی کوردستان) خۆش و چاك نەبووە! تەنانەت هێندێ تانووتی لێ دەدا!!

٢/٢ بۆ تووش نەبوونی سزاییێکی قانوونیی — ئەوە ئەگەر لە چاپخانەی کوردستان چاپ کرابا — خاوەندی چاپخانەکە هەرگیز نێوی چاپخانەکەی لەسەر ڕۆژنامەکە فەرامۆش نەدەکرد!

٣/٢ خاوەندی چاپخانەی کوردستان، هەمیشە پەرۆشی دەرکەوتن و نووسینی خۆی بووە لە ڕۆژنامەنووسیی کوردییدا، ئەوجا ئەگەر (هەتاو) بە چاپخانەکەی چاپ کرابێ، دەبوو لەنێو ئەو گوتار و بابەتانەدا، شتێکی بلاوبکردایەتەوە. کە ئەمەش ڕووی نەداوە، دیارە پێوەندیی بە ڕۆژنامەکە و چاپ کردنیەوە نبووە!

٤/٢ تیپەکانی چاپخانەی کوردستان، ئەو کاتانە – تەنانەت لەڕووی شێوەی شانەکانی چاپەوە – جودا بوون لەگەڵ تیپەکانی چاپخانەی (ژیان)ی سلێمانیی.

٥/٢ خاوەندی ئەو چاپخانەیەی هەولێر، شەش ساڵ دوای دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەی ـەتاو)ە، مافی دەرکردن و بەڕێوەبردنی (گۆڤاری هەتاو) ی وەرگرت و نێوی ئەم ـەتاو) ەیشی بەکاربرد، کەچیی لەسەر گوتاری یێکەم ژمارەی (گۆڤاری هەتاو) دا، ـرگیز نێوی ئەم ڕۆژنامەیەی نەبردووە کە لە ڕایەڵەی سەرگوتارەکەی، (نازانم بۆچی تا ستا ئیمتیازم نەدەدرایە؟) دا دەڵێت: (لە١٩٤٧وە تا ئەم ساڵ چەند جارێ ئیمتیازی جەللە و ڕۆژنامەم هەر جارەی بە یێکێك لەم ناوانە: کوردستان، سۆران، دەنگیی ستیی، ئەستێرە، سەردەشت، هەولێر داوا کردووە. هەموو جارێکی دەمنووسیی گشت ـایێك مەجەللە و ڕۆژنامەی هەیە، هەولێر نەبێ!) {٥٢}

٦/٢ وێڕای ئەوەی کەپتر سێ بەشی ئەم ڕۆژنامەیە، بەری بیر و قەڵەمی ـیرەمێرد)ە، هەروەها وێڕای ئەوەی لە شێوە و قەبارە و ڕەنگ ڕشتندا، هەروەها لە ـپ و نیشانەکاندا، وێ چوونێکی زۆری لەگەڵ (ژین) هەیە، ئەوە ئەم ڕۆژنامەیە دیسان ـندێ (تیپی شێوەداری چاپ) ی پێوەیە چەشنی دوو گوڵ، چوار ئەستێرە (بۆ جوێ ـدنەوەی گوتارێ لە یێکێکی دی) کە ئەمانەش لەهەمان تیپی شێوەدار و بەکاربراوی ـژنامەی (ژین)ی پیرەمێرد دەچن و لە ئەو هەلانەشدا (ژین)یش بەکاری بردوون! ـئەوانەش گرنگتر، ڕۆژنامەی (ژین)یش نێوی چاپخانەکەی کە لەسەر یێکەم و ـەڕەکانی دی چاپ نەدەکرد. ئائەمەیش لە دوو باسمان نزیك دەکەنەوە: یان ئەوەتا ـچنەکانی چاپخانەی (ژیان) هەمان شێوازی فەرامۆش کردنی نێوی چاپخانەکەیان لە ـپ کردنی ڕۆژنامەی (هەتاو) یشدا بەکاربردووە، یان ئەوەتە پیرەمێرد ویستوویەتی بە ـرامۆش کردنی نێوی چاپخانەکەی لەسەر ئەم ڕۆژنامەیە، سەر لە خوێندەوار تێك بدات ـئەوە بنوێنێ کە ڕۆژنامەکە (تەواو هەولێری) یە و لەڕووی ئامادە و چاپ کردنەوە (چ

پێوەندییەکی بە سلێمانییەوە نییە) وەك چۆن لە (ژین) دا لاف لێداوە گۆیا (نوسخەیێکی بۆ هاتووە ! !). ڕاستییەکەیشی هەردوو باس چاوەنۆڕ دەکرێ.

٧/٢ ساتێ چاوم بە (یێکەم ژمارەی هەتاو) کەوت کە لەنێو چەند ڕۆژنامەی دیدا دانرابوو، چ جێ قەدکردنێ، یان شێوەییێکی پۆستەم پێوە نەدیت. ئەمانەش کارم لێ دەکەن بڵێم کە لە نزیکەوە– بەدەستیی و لە پیرەمێردەوە — ئەم ڕۆژنامەیە گەییشتووەتە دەستی محەممەد خاڵی دۆستی نزیکی پیرەمێرد. مامۆستا محەممەدی خاڵیش دڵنیای کردم کە ڕۆژنامەکەی بە دەستیی پێ گەییشتووە.

٨/٢ پیرەمێردی پیری وشە و ڕۆژنامەنووسیی و ئەدەبیی کوردیی، هەمیشە پێشڕەو بووە بۆ چاپی هاوتای ئەم ڕۆژنامە کوردییە بە خەرجیی خۆی ئەوەتە هەمان ئەتواری لەگەڵ یێکەم گۆڤاری سلێمانیی (زانستیی — س ١٩٣٨) نواندووە. بە ئەم ڕۆشناییەش زۆر وێ دەچێ لەپێناوی هەڵکەوتنی ڕۆژنامەیێکی هەولێر و بۆ ڕێزی ئەمین ڕواندزیی دۆستی، ڕۆژنامەکەی بە خەرجیی خۆی چاپ کردبێ!

### ٣. دەنگ دانەوەی دەرچوونی؟

ئەگەرچیی بەڵگەیێ بەدەستەوە نییە داخۆ ڕۆژنامەکە کەوتووەتە بەردەستی خوێندەواران و ڕۆشنبیران، هەروەها ئەگەرچیی سەرسامیی لەبەرچاوانە کە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی ڕۆژگارەکە، وەکو (گەلاوێژ)، (نزار) نە زوو نە درەنگ چ هەواڵێکیان لێ نەنووسیوە، ئەوە تاکە پزیسکی ڕووناکیی لەمەڕ دەرکەوتنی، هەر لە (ژین) ی پیرەمێردی دڵسۆزدا دەبینین کە پێنج ڕۆژ دوای چاوهەڵهێنانی ئەم ڕۆژنامەیە، بەخۆشییەوە ئەوهای لێ نووسیوە، (ئۆخەی وا لە هەولێریش غەزەتەی " هەتاو " دەرچوو، نوسخەیێکمان بۆ هات.. تیشکی ئەو هەتاوە هەتا چاو کار ئەکا، مەڵبەندی کوردەواریی پێ رووناك کردەوە. ئافەرین بۆ ئەمین ڕواندزیی کە لە شەڕا شێری لە خێرا بێری بەکارهات. شیری دایکی ڕواندزیی حەڵاڵ بێ و غەزەتەکەیشی بە پەڕ و باڵ بێ!

بەڕاستیی سەراپا غەزەتەکە جوانە، بەڵام " گۆران " تەمەڵ و کەم توانە، ئەگینە
م دەورەدا " گۆران " چ ئیحتیاجێکی بە " بێسارانیی " ە، چیی لەو کەمترە؟)[٥٣]

**٤.باری دەرچوون و چارەنووسی؟**

٤/١: باری دەرچوونی؟

ڕۆژنامەی (هەتاو) ی یێکەمی هەولێر کە یانزەهەمین ڕۆژنامەیە لەڕیزی ڕۆژنامە و
ۆڤارە سەربەخۆکانی کورددا و لە مەملەکەتی عێراقی سەربەستدا، لەدوای ڕاوەستانی
ەرخی ڕۆژنامەنووسیی هەولێرەوە هەڵکەوتووە، واتە دوای ڕاگیرانی گۆڤاری
ووناکیی– ١٩٣٦) کە هەردووکیشیان بەڕۆشنایی دەسەڵاتی (قانوونی چاپەمەنیی
ارە: ٥٧ی ساڵی ١٩٣٣ ی دەستکاری کراو بە قانوونی چاپەمەنیی ژمارە: ٣٣ی ساڵی
١٩٢ ز) هەڵکەوتوون!

کەشی ڕۆشنبیریی کوردیش لە ئەم مەملەکەتدا– پێش ئەم ڕۆژنامەیە و پێش گۆڤاری
زار – خاو و خلیچك بوو، هەموو ڕەنگ و ڕوو و دەنگ و توانای هات بووە سەر
ناسەدانی گۆڤاری (گەلاوێژ) ی بەغداد و (ژین) ی سلێمانیی و دوو سەعاتە ڕۆژانەکەی
ادیۆی کوردیی بەغداد)[٥٤] و بڵاوکراوە پروپاگەندەییە زمان کوردییەکەی مەسڵەحەتی
ڵوگۆڕی خوێندەواریی ئەمریکا لە بەغداددا: (ئاگا و ڕووداوی هەفتەیی).[٥٥]

ئایا باری دەرچوونی (هەتاو) ئاساییە؟ ڕاستییەکەی بار و ڕۆژگاری دەرچوونی گەلێ
یما و واتەی سیاسیی و ڕۆژنامەنووسیی دەنوێنن! جارێ (هەتاو) خۆی یێکێکە لەڕیزی
ێ ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردیی و کوردیی و عەرەبیی کە لە ماوەی شەش مانگدا، واتە
نێوان مارت – ئەیلوولی ١٩٤٨ ز.دا دەرچوون! گۆڤاری (نزار)ی کوردیی و عەرەبیی لە
رتی ١٩٤٨ دا و ڕۆژنامەی عەرەبیی خاوەن کورد (السلیمانیە) پێش نیسانی ١٩٤٨
رچوون. ئەوەتە پیرەمێرد لەگەڵ پیرۆزبایی لێ کردنی (نزار) ئەوهاش خۆشیی خۆی
ۆ دەرچوونی ڕۆژنامەی (سلێمانیی) نواندووە و دەبێژێت: (هیوامان بە غەزەتەی

سیاسیی " سلێمانیی " خۆمانە کەوا مەعرووف عارف ئیمتیازی وەرگرتووە ! ئوستادی دانیشمەند سدیق نەققاش — عەرەب. — مودیری مەسئوولیەتی و لە چاپخانەی "ژیان" ی خۆمان چاپ ئەدریێ. پیرەمێردیش بەهەموو توانای تازەی خۆیەوە یاریدەیان ئەدا. خوابکا لەهەموو کوێرە دێیەکمان بە کوێرایی چاوی دوژمن سەرچاوەیێکی ڕوونی مەتبووعات هەڵقوڵێ ! ). {٥٦}

هەڵبەت ئەم باسەش مانای زۆری هەیە. لەلایێکی دیەوە مەیدانە نیشتیمانیەکانی عێراق لەنێوان هەردوو مانگی کانوونی یێکەمی ١٩٤٨–١٩٤٩ز.دا گڕەی باسی سیاسیی عێراقیی و عەرەبیی گرنگ و ترسناکیان تێدا خرۆشابوو. لەڕیزی پێشەوەش سووتاندنی دۆستیی پەیمانێکی بریتانیایی داگیرخوازی ناسراو بە(پەیمانی پورت سمۆس) کە بە شێوەییێکی ڕەسمیی لە١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ دا لەگەڵ حوکوومەتی عێراقی مۆر کراو هەموو گەلیش — بە عەرەب ە کوردەوە — لە باشووری عێراقەوە تا کوردستان، لە بازێڕە گەورەکاندا پەلامار و قوربانییان دا و بە ڕاپەڕینی ناسراو — وەسبە — حوکوومەتیان ناچار کرد پەشیمان بێتەوە و سەرەك وەزیرانیش بەشێوەییێکی ڕەسمیی و لە ڕادیۆوە، لە ٤ ی شوباتی ١٩٤٨ دا، (هەڵوەشاندن)ەوەی ڕاگەیاند ! {٥٧}

لەلاییێکی دیەوە — وێڕای کێشە زۆرەکانی نێوخۆ — کێشەییێکی نەتەوەیی عەرەب هەڵکەوت بوو، کە باسی جەنگی فەلەستینە !

باری گەلی عێراق بەرامبەر بە ئەم باسە و لە ئەو ڕۆژگارانەدا، شایانی یادکردنەوەیە !

عەبدوڕڕەززاق ئەلحەسەنی مێژوونووسیی عێراق، وێنەی گرتووە و دەبێژێت، (ڕای گشتیی عێراق پەرۆشی باسی فەلەستین بوو، حوکمڕانەکانی شەرمەسار دەکرد بۆ خۆ گێل کردنیان لە ئاستی فریاکەوتنی فەلەستینیەکان کە دووچاری پەلاماری سامناکی جوو بوون ! ). {٥٨}

ئا لە ئەم بارودۆخەدا کە هەستی جەماوەر دژی پیلانی داگیرکەران خرۆشا بوو، ەزارەتی عێراقیی، بەنێوی (باری نائاسایی فەلەستینەوە ! !) لە ١٢ ی مایسی ١٩٤٨ ا، " دەسەلاتی عورفیی " سەپاند و هەموو قانوونێکی لە کار خست و سەربەستی ۆبوونەوە و ڕۆژنامەنووسیی تەنگ کرد و خستنیە ژێر چەپۆکی چاوەڕوانییەوە ! {٥٩}

هەر لە ئەم هەلەشدا باری گرانیی و تاڵیی گوزەران بەسەر تەواوی گەلدا کشابوو. بۆ ێنە لە ڕۆژی ١٧ ی ئەیلوولی ١٩٤٨ و لە نێوچەی " کازمییە " ی بەغداد دا، ۆنیشاندانی جەماوەر لەدژی وەزارەت ڕاپەڕی و داوای خۆراك و پۆشینی دەکرد و لە ەنجامدا ٩٨ کەس پێکران و ٢٥٠ ی دیش گیران. {٦٠} شایانی باسە هەر لە ئەو هەلەدا اواری تەنگانە لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی بەغداد دا دەنگی دەدایەوە، تەنانەت ەسەر لاپەڕەی (ژین) ی سلێمانیشدا. {٦١} سەیر و ڕێکەوتیش نییە کە (هەتاو) ی ێکەمی هەولێریش تیشکی پلاری تێ گرتبێ !

بەکورتیی ئەمەیە بارودۆخی ڕۆژگاری هەڵهاتنی (هەتاو) ی هەولێر.. بەلام داخۆ هێنیی دەرخستنی چیی بێ ؟ هەرچەندە وەلام ڕیزکردن و بڕیاردان هەرگیز ڕەوا و اسان نییە، بەلام هێندێ نیشانەی دیار و گرنگ کنە لە نهێنیی دەکەن و دەور و خولی ەلام دەدەن.. بۆ وێنە کە (هەتاو) خۆی لە١١ی ئەیلولی ١٩٤٨ دا دەرچووبێ، دەبێت ێشتر ڕێگەی ئاسان بووبێ و ئیزن درابێ. پێشتر کەی دەگرێتەوە ؟ ئایا هەلێکی ێکەوتی پاش وەزارەتی چل و یێکەمینە کە لە ٢٦ ی حوزەیرانی ١٩٤٨ دا دامەزرا {٦٢} -ڕۆژێك پاشتر-سەرەك وەزیران لە هۆڵی ئەنجوومەنی وەزیراندا کۆبوونەوەی ەگەڵ ڕۆژنامەوانان-بەتایبەتیی-ڕێك خست و ڕایگەیاند گۆیا خۆی لە سەردەمی وسمانییەکاندا ڕۆژنامەوان بووە و ئامادەشە بە ئەو هەستەوە گوێ لە گیروگرفتیان گرێت ! ! {٦٣} یان هەلەکە ڕێکەوتی پێش ئەم وەزارەتەیە ؟

ڕاستییەکەی من باوەڕم هەیە کە هەڵکەوتنی ئەم ڕۆژنامەی (هەتاو) ە، لەنێو ئەڵقەییێکی دیدایە کە بەرچاو ڕوون کردنەوە و هێورکردنەوەی کوردانە لەدوای ڕاپەڕینە – وەسبە – نیشتیمانییەکە کە تێیدا بەشدار بوون.[٦٤] هەربۆییێکا لەماوەی شەش مانگدا –بەدەرچوونی هەتاویشەوە– ڕێگە درا سێ ڕۆژنامە و گۆڤار هەڵبکەون. کەواتە هەڵکەوتنیشیان کەمێ پێش یان پاش ڕاپەڕینەکەیە!

٢/٤: چارەنووسی؟

ڕۆژنامەی (هەتاو) دوای ئەم ژمارەیەی، هەرە پرسیاری گرنگ و سەرسووڕمێنی بەجێ هێشت بێ ئەوەیە: ئایا ئەم ژمارەیەی یێکەم و دوا ژمارەیە و بۆچیی؟

من خۆم لەسەرەتادا – بەڕۆشنایی نامەییێکی کیژی خاوەند ڕۆژنامەکە سەبارەت بەشداریی بابی لە جەنگی فەلەستیندا–[٦٥] باوەڕم هەبوو کە هۆی ئاوابوونی ئەم ڕۆژنامەیە بەشداریی خاوەنەکەیەتی لە جەنگەکەدا. بەڵام وردبوونەوەم لە ئەم باسە – بەشدارییەکەی – دڵنیای کردم کە چ سەرچاوەییێکی ڕەسمیی یان باوەڕ پێ کراو پشتی ناگرێ.. تەنانەت یێکێکی وەکو کاك عەبدوڕڕەحمان موفتیی ئەفسەری خانەنشین– بەشدار بوو– نێوی ئەمین ڕواندزیی لەڕیزی بەشدارەکان و خۆبەخشە عەرەب و کوردەکاندا نیشان نەداوە[٦٦] هەروەها ئەفسەری خانەنشین – بەشدار – کاك ئەسعەد بابان[٦٧]، ئەویش پشتی بەشداربوونی نەگرتووە. خۆ ئەگەر باسی (بەشدار) ییەکەیشی بەڕاست وەربگرین – وەکو وەڵامی دووەمی کیژەکەی[٦٨] دیسان باسی بەشداربوونی دەکات و دەڵێت لەسەرەتای جەنگەکەدا بەشداربووە و هەر زووش گێڕاویانەتەوە – ئەوە ئەم ئاخاوتنەی واتەی ئەوەیە، (بەشدارییەکەی ڕێکەوتی دوای دەرچوون و ئاوابوونی ڕۆژنامەکە نییە!)، چونکە (سەرەتای ڕووتێ کردن و بەشداری نێرووەکانی عێراق) ڕێکەوتی مانگی مایسی ١٩٤٨ـە و (گێڕانەوەی ئەمین ڕواندزیی) ش لەچەند مانگێکی کەم پێش دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیە تێ ناپەڕێ!

کەواتە (بەشدارییەکە) ی وەك (هۆییێ بۆ ئاوابوونی ڕۆژنامەکە)ی جێگەی باوەڕ نییە و دەشێت کە (هۆی دی هەبن) بۆ داخستن یان ئاوابوونی ڕۆژنامەکە ! ئەوجا ئایا ڕۆژنامەکە سەرپێچییەکی بەرامبەر بە قانوونی چاپەمەنیی باس کراو نواندووە ؟ ڕاستییەکەی سەرپێچیی ئاشکرای ئەوەیە کە (نێوی تەواوی ڕێبەری بەرپرس و نێوی چاپخانەکەی چاپ کردنی نەنواندووە !). بەڕۆشنایی ئەوانە و قانوونەکەش ئەوە: (فەرمانەکانی ماددە: ٢١) ی بەسەردا دەسەپێ کە سزاکەی لە ٣ دینار پتر تێ ناپەڕێ!

ئایا بابەتەکانی باسی ترسناکی ئەوتۆیان تێدا هەیە کە شایستەی هەڕەشە لێ کردنی بن بەبیانووی ئەوەی (باسەکان ڕك و کینەیان تێدا هەیە، یان شتی ئەوتۆیان لە دوو توێدا هەیە کە ناڕاستن و مەبەستیشی ورووژاندنی ڕای گشتییە؟ / ماددە: ١٢). یان ئایا شایستەی سزای هەڵوەشاندنەوەی ڕوخسەت دانەکەیەتی بەبیانووی ئەوە گۆیا (لە سنووری ڕوخسەتەکەی – وەك ڕۆژنامەییێکی ئەدەبیی کۆمەڵیی – دەرچووە؟ / ماددە:١٣).

خوێندنەوە و وردکردنەوەی بابەت و باسەکانی – بەباوەڕی من – دڵنیایی دەبەخشن کە هیچ کام لە ئەم بڕوبیانووانەیان بەسەردا ناسەپێ، قەیدی نییە ئەم چەند دێڕەی (سەرەتا) کەی کە دەبێژێت: (موشکیلێکمان هەیە... ئەمانەوێ ئەربابی فیکر و ئیختیساس ئەوەمان بۆ حەل بکەن، بە کەمالی وسووق و ئیتمیئنانەوە زانرا کە نانی سێ ساڵ لە لیوای هەولێردا دەغڵ و دان هەیە، کەچیی بەهەموو مەعنایێکەوە گرانییە ! ! ئەم موعەممایەمان بۆ حەل بکەن و چارەی چییە؟ لەهەموو لایێکەوە بۆمان بنووسن!) خراپ لێك بدرێتەوە ! ! بەڵام ئەم دێڕانە و بەراوورد کردنیشیان لەگەڵ گەلێ گوتاری ڕۆژنامەنووسیی عێراقیی ڕەخنەگرانەی ئەو هەل و ساتانە، چ بایەخێکیان نییە. هەر بۆ وێنەش ئەوە ڕۆژنامەی (ژین) ی سلێمانیی بە ئاشکرا لەسەر گرانیی و ڕەخنەگرتنی ئەوانەی نووسیوە کە دەسەڵاتی حوکوومەت بۆ کەڵکی خۆیان بەکاردەبەن![٦٩]

کەواتە مەلامەتی (دەرچوونی یێک ژمارە) ی ئەم ڕۆژنامەیە و (داخستنی و ئاوابوونی ! !) چییە ؟

بەکورتیی، دوای لێکۆڵینەوەی هەموو لایەنێکی ئەو پرسیارە، باوەڕ دەکەم کە سێ هۆ لە پشت ئاوابوونی ڕۆژنامەکەوە هەبن:

١. یان هۆییێکی تایبەتیی لەنێوان خاوەن ڕۆژنامەکە و ڕێبەرە بەرپرسەکەیدا مەلامەتە !

٢. یان لەکاتی چاپ کردن و بڵاوبوونەوەدا، ڕۆژنامەکە مەرجێکی گرنگی خۆی دۆڕاندووە و بووەتە مایەی (ئاوابوون) ی بەپێی دەسەڵاتی قانوونی باس کراو کە دەبێژێت، (لە هەلی پێشکەش کردنی تەئمیناتەوە و بۆماوەی شەش مانگ، ئەگەر هەر چاپ کراویَ بڵاونەبووەوە، ئەوە بە هەڵوەشاو دەژمێردرێت !/ مادده:٤، بەند: ٢)، بەڵام ئەم ڕۆژنامەیە نیشانەییێکی پێوە دیار نییە کەی بنوێنیَ مۆڵەتی بڵاوکردنەوەی لە تەواوبووندایە ئیدی پەلەی بڵاوبوونەوەی کردووە، وەکو چون (گۆڤاری زانستیی — ٢٥ شوبات ١٩٣٨) کارێکی ئەوتۆی کردبوو! هەروەها خاوەند ڕۆژنامەکە و خاوەند چاپخانەی (ژیان) ی سلێمانیی — پیرەمێرد— هێندە نەفام و نەزان نین کە دەسەڵاتەکانی قانوون نەناسن و هەرەمەکیی دەست بدەنە چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەییَ کە (مەرجی چاپ و بڵاوبوونی دۆڕاندبیَ) و لە خۆڕاش خۆیان تووشی شێوانی نێوبانگ و زیانی دارایی بکەن و ژمارە چاپ کراوەکانی ڕۆژنامەکەش تووشی (دەست بەسەرداگرتن) بکەن !

٣. یان ئەوەتە دوای ژمارەی یێکەمی، بەپێی (دەسەڵاتە فراوانەکانی عورفیی) و بەهەر بڕوبیانووییَ ڕاگیراوە و لەکار خراوە و ئاوابووە.

جێگەی باسیشە ڕۆژنامەوان فائیق بەتتی دەستمان دەگرێت بۆ ناسینی کردەوەکانی دەسەڵاتی عورفیی ئەو هەل و ساتانە. ئەوەتە (٤١ ڕۆژنامە و گۆڤاری عێراقیی —

عـەرەبیی و کـوردیی — لـەکار خـراون و مۆڵـەتیان قەدەغـەکراوە !)[٧٠] و لەنێویشـیاندا ڕۆژنامەی (بەلەدی / بلدی کوردستان)ی[٧١] مستەفا پاشا و (لیوائولجیهاد / لواء الجهاد) ی فائیق تۆفیق.[٧٢]

بـۆ پـتر تـێ گەیشـتنی چارەنووسـی ئـەم ڕۆژنامـە — هەرچـەندە دووبـارەش بـێ — دەڵێین کە دەستگیرنەبوونی چ دانەیێکی دی (ئەم تاکە ژمارەیە) لە هیچ کتێبخانەیێکدا و نێـو نەهاتنیشـی — بەمێـژووی دەرکـەوتن و ئاوابوونیـەوە — لـە چ سەرچـاوەیێکی ڕۆژنامەنووسیی و ئەدەبییدا، هەروەها سەرسڕمانی ڕۆشنبیرەکان لـە دەرکەوتنی و ئـەو ئاخاوتنە سەیرەی (دووەم ڕۆژنامـەی هـەولێر — هـەولێر: س ١٩٥٠) کـە لـە سـەرگوتاری یێکەم ژمارەیدا — بە عـەرەبیی و کـوردیی — ڕادەگـەیێنێ کـە (خـۆی یێکـەم ڕۆژنامـەی هەولێرە ! !)[٧٣] هەروەها سەرسـڕمانی نووسـەری هـەرە دیـاری لاپـەڕەی کـوردیی ئـەو دووهەم ڕۆژنامەیە کە کـۆچ کـردوو عیـززەددین فەیزییـە و خـۆی هـاوەڵی نزیکـی ئـەمین ڕواندزیی بووە و ڕۆژنامەکەیش هەر دوو ساڵێ لـە (هـەتاو) دوور بـووە، ئەمانـە هـەمووی نیشانە و بەڵگە و هاندەرن تا بێ سڵەمینەوە بڕیـار بـدەم: (هـەتاو — یێکـەم ڕۆژنامـەی هـەولێر، ئـەو تاکـە دانەیـەی بـە بـازاڕدا بڵاونەبووەتـەوە و نەکەوتووەتـە بەردەسـتی خوێندەواران و ڕۆشنبیران و یان ئەوەتە لـەنێوبراوە، یـان دەسـتی بەسـەردا گـیراوە !). هەروەها ئەم تاکە ژمارەیە، (یێکەم و دواییینە) و ژمارەی دی بە دوادا نـەهاتووە و لـە چ سەرچاوەیێکی دیدا ئاشنا نەکراوە.[٧٤]

**ئەنجام**

(هەتاو)ی یێکەم ڕۆژنامەی سـەربەخۆ و کـوردیی، حـەوتۆی هـەولێر — بـە ئـەم تاکـە ژمارەیـەوە — پـەڕەیێکی ونـە لـە پـەڕە ونـەکانی ڕۆژنامەنووسـیی کـوردیی مەملەکـەتی عێراقـی عـەرەب. هـەروەها تـاقی کردنـەوەیێکی ڕۆژنامەنووسـیی کـوردانێکی باشـوورە کەوشەی شەریف و ڕۆژنامەنووسیی پاکیـان کردبـووە دەسـکەلاو مەبەسـت بـۆ خزمـەتی

ڕۆشنبیریی و پێشکەوتنی کۆمەڵایێتی و یێکیێتی ڕۆڵەکانی (عێراقی خۆشەویست!!) و بە تایبەتیش لە بازێڕێکی وەك هەولێردا کە دوانزە ساڵ بوو چەرخی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی تێدا لەکارخرابوو!

(هەتاو) لە کەش و بار و ڕۆژگارێکی دژوار و سەخت و ناسکدا کەوت، کە چ خۆی و چ خوێندەوارانیشی هۆشیار دەرکردەوە لەسەرقاڵ بوون بە کێشە سیاسییەکانەوە!! هەروەها کێشەی نووسین و چاپ کردنیشی لەبەردەمدا بوو بۆییێکا ڕووی کردبووە سلێمانیی کە لە ئەوێدا تەواو پشتیوانیی لیێ کراو بەتایبەتیش پیرەمێردی ڕۆژنامەوانی گەورە و دڵسۆز بەپیریەوە چوو، کە بە پشتییوانی لێکردنیشی دەوری کارامەی خۆی بۆ خزمەتی بزاقی ڕۆژنامەنووسیی و ڕۆشنبیریی کوردیی سەلماندووە.

وێڕای ئەوەی ئەم ڕۆژنامەیە باری گرانی مۆڵەت وەرگرتن و خەرجیی چاپ و بڵاوکردنەوە و خەونەکانی پاشەڕۆژی هەڵگرت، مخابن — بەهەر بڕوو بیانوویێ بوویێ!! — دوای یێکەم ژمارەی لەکار خراوە و ڕاگیراوە!

بە ئەم جۆرە (هەتاو) وەك تاقی کردنەوەی ڕۆژنامەنووسیی، بیێ خواستی خۆی، سەرنەکەوتنی پیێ برا... بەڵام هەر ئەم سەرکەوتنەیشی گەلیێ واتەی بەنرخ دەگەیێنیێ، لەڕیزی پێشەوە باری سەخت و کێشەکانی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی — با خوویشی دابێتە کاروباری ئەدەبیی و کۆمەڵایەتیی — پیێ دەناسرێتەوە.. تەنانەت هەر ئەم ڕۆژنامەیە تاقی کردنەوەیێکی پێشینێکی خۆی، یێکەم گۆڤاری سلێمانیی (زانستیی — س١٩٣٨) مان دەخاتەوە یاد کە ئەویش دوای یێك ژمارەی، بیێ هیچ بیانوویێکی قانوونیی، لەکار خراوە!

دەشتوانم بڵێم کە دووبارە بوونەوەی بارێك لەماوەی دە ساڵدا — وێڕای نەرمیی نواندنێکی دەمەکیی حوکوومەت — واتەی ئەوەی هەیە کە بزاقی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی ئاسان و بەهێز نەبووە، بەتایبەتیی ئەگەر پتر بنۆڕین و ڕشوداوەکان

وردبکەینەوە. ئەوەتە گۆڤاری (نزار) لە ١٥ ی شوباتی ١٩٤٩ دا[٧٥]– پێنج مانگ دوای ڕاگیرانی ڕۆژنامەی هەتاو – ڕاگیراوە! هەروەها دواتر (گەلاویژ)ی[٧٦] دەستە خوشکیان لە مانگی ئابی ١٩٤٩دا ڕاگیرا و ئیدی لە مەیدانی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی چاپ کراودا هەر (ژین) ی سلێمانیی بەتەنێ مایەوە!

کەواتە دەتوانین بڕیار هەڵبهێنجین و بڵێین، بزاقی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی، هان دان و پشتگیریی حوکوومەتەکانی عێراقی پێ نەبڕاوە و خوێندەواری کوردیش لە تەواوی مافی ڕۆشنبیریی خۆی بێ بەش بووە و تێری لێ نەخواردوە!

## پاشکۆ

(لاپەڕەیێك لە تەئریخی ئەدەبی کوردیی) نووسراوی "گۆران" کە دەڵێت (ماویەتیی!!) و، مخابن ئەو پاشماوەیەش بەختی بەر ژمارەی داهاتووی بڵاونەکراو نەکەوتووە، هانمان دەدات کە دڵنیا بین ئەو بابەتە بازنێکی نێو ڕستێ لێ کۆڵینە چ سەبارەت بە (بێسارانیی) یان شاعیرێکی دی... گەڕانیش بۆ نیشانەییێکی دی ئەو ڕستەیە، ئەنجامەکەی ناسینی وێنەییێکی دی لێ کۆڵینی هەمان نووسەرە لەمەڕ شاعیری گەورە، (مەولەویی) کە بڵاوبوونەوەیشی سێ ساڵ دوای ئەو (لاپەڕەیە تەئریخییە!) هاتووە. بە ئەو پێیە و بۆ خزمەتی خوێندەواران و ناسینی بیر و توانای گۆران، پێ ویستم زانیی ئەو نووسینەش بخەمە ڕوو کە لە (هەولێر) ی دووەم ڕۆژنامەدا بڵاوە.[٧٧] ئەمە مەتنەکەیەتی:

### مەولەویی و شیعری موناسەبەت

شیعری موناسەبەت لە ئەدەبی هەموو نەتەوەییێکا هەیە، بەڵام نەك بەو زۆرینەی کە لە ئەدەبی ئێمە و گەلەکانی دراوسێمانا بەرچاو ئەکەوێ... دەستووری گشتیش لەم پێناوەدا ئەوەیە کە موناسەبەت، ڕەنگە بتوانین هی بابەتی دڵداریی لێ دەرئەکەوێ، شیعر گەلێ پێپلیکە لە قوللە زێڕینەکەی ئەهێنێتە خوارەوە، تا ئەیگەیێنێتە شوێنێك کە

لەگەڵ قسەی ڕەشۆکیی سەر زمانی ڕۆژانەمان جیاوازییەکی ئەوتۆی نەمێنێ. ئەمە هەرچەند لە سەرێکەوە پیاو لە شیعری موناسەبات بێزار ئەکات، لەسەرێکی ترەوە تەرازوویێکی سووك و خۆشبەزی ئەداتە دەست بۆ هەڵسەنگاندنی نرخی ئەدەبیی ئەو شاعیرانەی توانیویانە لە بوارێکی وا کەم، ئاوا بە مەلەوانی تەکانی پەڕینەوە بدەن. لەگەڵ ئەوەش لە زۆر زمانا جار جارێك بەهرەداری وا هەڵکەوتووە لەباتیی ئەوەی نرخی بەدیعیی شیعر بە موناسەبات نزم کاتەوە، موناسەباتی ئەوەندە هەڵبڕیوە، گەیاندوویەتیە ئەو ئاسمانە بەرز و جوانە کە پەڕیی شیعر ئەتوانێ تیا بژی و ماوە بدۆزێتەوە بۆ پەڕ بازی بە شاپەڕە نەخشینەکانی.

لە زمانی ئێمەدا (مەولەویی) شاعیری بەناوبانگی شێوەی هەورامیانە، یان گشتیی تر بلێین " شێوەی گۆران " لەو چەشنە بەهرەدارانەیە. ئەم شاعیرە بلیمەتەی کورد کە ڕەنگە لەبەر دووریی شوێنەواریی باری شێوەی زمانەکەی (لە ناوچەی هەولێردا کەمتر ناسرابێ!)، بەشی زۆری شێوە هونەرییەکانی لە داێکی موناسەبات زاون، گەلێ جار موناسەباتی بێ ڕەنگ و ڕوواڵەتیش.

زۆر دوور نەڕۆین، مردنی کوڕی کوێخاییێکی عەشیرەتی جاف، وەرگرتنی تەسبیحەییێك بەدیاریی لەلایێن ئاشناییێکەوە، وەرگرتنی نامەیێك لە هاوڕێییێکی دوور، چەنگ کەوتنی شووشەییێکی گوڵاودان.. بەڵام بۆتەی وەستاکارانەی مەولەویی هەرگیز شتێکی تیا نەتواوەتەوە کە ڕەوا نەبێ لە قاڵبی بێ گەرد و ساغی شسعری ڕاستەقینەدا دابڕێژرێ بەمانای سەرەوە بۆ کوڕی کوێخای جاف — کوڕی مەحموودی یاروەیس — شیوەننامەییێکی درێژی داناوە، ئەگەرچیی لە دوو بەرگەکەی دیوانی چاپ کراویا بڵاونەکراوەتەوە، بەڵام هیچ گومانم نییە لە هەڵبەستە هەڵبژاردەکانی، ئەوە هەر وەك لە نموونە هەرە بەرزەکانی شێوەننامەیە لەسەر پاکی ئەدەبی کوردییدا.

داخم ناچێ کە لەم کاتەدا هەڵبەستی ناوبراو لە وزەی دەستەڵاتما نییە تا بۆ ساغ کردنەوەی قسەم بیخەمە پێش چاوی خوێندەوارانی خۆشەویست. بەناچاریی ئەمەوێ لەڕێگاییێکەوە بۆ بەڵگە هێنانەوە بچم کە زۆرتر لەیاریی هەیبەخت " یانەسیب " ئەچێ، ئەگەرچیی لەسایەی گیانە بەرزەکەی مەولەوییەوە بردنەوە تیایا سەدی سەد کەمتر نییە. ئێستا ئەوا (هەردوو بەرگی دیوانەکەی لەبەردەستمایە بەڕێکەوتی ڕووت بەرگێکم هەڵگرت!)، بەرگی دووەم دەرچوو، هەر بەهەمان ڕێکەوت کتێبم کردەوە، دەستم کرد بە چاوگێڕان بۆ پارچەیێك کە بۆ نێرراو (زیائوددین) نا، هاوێیێکی تەریقەت و شیعری قەلەندەر مەشرەبی مەولەویی بووە. کاك ئەحمەد ناو لە دێی " پریس " ی نزیك هەڵەبجە دانیشتووە.

هەرچۆنێك بێ ملپێچێك ئەوەندەی دەستە سرێك کەتان یان بلووریی مەگەر لەناوەندی دڵدارانی وەك (مەم و خاتوونە زین) یان (فەرهاد و شیرین) یان (شەم و دێوانە) دا هات و چۆی کردبێ، ئەمجا هەڵبگرێ بەدڵیا بێت. بەو ڕەنگە وردە نیگاری ڕەنگینی شیعر و ئیلهامی بچنێ. بەڵام بڕوانن نیگارخانەی خەیاڵی مەولەویی بە چ وردە هونەرێکی شیرین و دلگیر ئەم پارچە بلووریە ئەڕازێنێتەوە: (ئەوا بێك دانە پەتیەی نایابم بۆ ناردی، دەستکردی هونەری وەستاکانی بەغدایە، پەتیەیێك کە تان و پۆی بە تای خۆشەویستیی چنراوە، لەپەڕەی جەرگم سپیی ترە کە لەناو لافاوی مەینەتا شۆڕاوەتەوە، نازك ترە لەنازی ئەو کەسەی کە جیگای نیازمە. وەکو کەوڵەکەی مەجنوون بیدە بە شانتا بە دەشت و هەردەکان سەری بۆ هەڵگرە، بەو گشت باری دەردەوە "!!!" کە هەقەبە ئێسکی ڕەق و تەقی باڵا بەرزەکەتەوە بگەڕێ و جار جار هەناسەی ساردی بۆ هەڵکێشە باپیرە پەتیە بەدەم باو هەناسەوە بشەکێتەوە، وەك ئەو بەیداخانە کە بە با لە بەرزەکانەوە لەسەر قسن و گۆڕستانی مردووەکان ئەشەکێنەوە!).

ئەمە ئەزموونی هەڵبەست بە پەخشان پاش سووکە دەستکارییەکی زۆر کەم لەلایێن خۆمەوە.

ئەم پارچە پەتیە لە کونجی دوکانی پەست و تەنگی بازرگانەوە، لەناو هەوای خنکاو و تاریکیی ژێر گومەزی ناو بازاڕەوە بە نووکی قەڵەمی (مەولەویی) گەییشتە سەلای دەشت و دەر. گەییشتە بەرەچۆمێکی وا تێرە شیعر و تێرە خەیاڵ کە بێ ئەوەی هەست بە پەلکێشانی ڕاستەوخۆی مەولەویی بکەین، خۆمان ئەبینین باڵە و باڵ، شوێن دێوانەی هەردەگێلی (پریس) کەوتووین، هەروەکو فڕە فڕەی باڵە سپییەکانی پەپوولەی گەڕۆك ئەکەوێ. دوایی ئەبینین (مەولەویی) بە یێك دوو سەرە تەشوێی هونەر بەژن و بالاییێکی بۆ دێوانەی هاوڕێی تاشیوە، کە ئەوەندە شاعیرانە و ڕووناك و دیارییە، نە دێوانە هەرگیز بە ئێسقانە ڕەق و تەقەکەی خۆیەوە دیوە، نە ئێمەش لەپێش خوێندنەوەی (مەولەویی) دا بە قامیشی ئالایی سەر گۆڕستان و قسنەکانەوە هەستمان پێ کردبوو کە لە کوردستانا زۆرتر جێگایان یالێکی بەرزە یان گردێکی سەوز لە نزیکی ئاوەدانییەوە. (ئەم پەیام و ڕاسپێرییەش ئێمە لە هونەری شیعری ڕووت، نەك " شیعری ئامانج و ئایدیال " چاوەڕێی ئەکەین!) لە وەرگرتن و پڕ بەدڵ چەشنی ئەم هەستە جوانە بەلاوە نییە کە (مەولەویی) تەنانەت لە شیعری موناسەبا دێت وا بەزاڵیی وە بە وەستاکاریی پێمان ئەگەیێنێ! {٧٨}

"تەواو"

## پەراوێز - تەماشاکراو

{١}. عەبدولجەبار محەممەد جەباریی– مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیی– چاپخانەی ژین، سلێمانیی ١٩٧٠.

{٢}. مودیرییەت ئەلئیعلام– دەلیل ئەلسەحافە ئەلعیراقییە، ئەلسیلسیلە ٢٤، مەتبەعەت ئەلجومهەورییە، بەغداد ١٩٧٤.

{٣}. جەمال خەنەدار– ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردیی، مەتبەعەت ئەلجومهوورییە، بەغداد ١٩٧٣.

{٤}. فائیق بەتتی– ئەلمەوسووعە ئەلسوحوفییە ئەلعیراقییە، بەغداد ١٩٧٦.

{٥}. در. کەمال مەزهەر ئەحمەد – تێگەییشتنی ڕاستیی، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغداد ١٩٧٨.

{٦}. ڕووناکیی، گوارێکی هەفتەیی، عیلمیی، ئیجتیماعیی، ئەدەبیی کوردییە. مودیری مەسئوول مەحامیی محەممەد شیت مستەفا، (بێ ئاشکرا نێو: حسێن حوزنی موکریانیی سەرنووسەر). سالی یێکەم، ژمارە: ١، هەولێر، پێنجشەممە ٢٤ ی تەشرینی یێکەم ١٩٣٥/ ٢٦ ی ڕەجەب ١٣٥٤ (یێکەم ژمارەی لە چاپخانەی ئەلمووسل ئەلحەدیسە چاپ کراوە و دوا ژمارەیشی: ١١ لە ١٦ ی مایسی ١٩٣٦ دا دەرچووە !).

{٧}. هەتاو– گۆڤارێکی کوردیی و وێژەیی – ئەدەبیی– یە. جارێ هەر لە پازدە ڕۆژدا جارێکی پەخش دەکرێت.. خاوەندی ئیمتیاز و مودیری ئیدارە و نووسین گیو موکریانیی. مودیری بەرپرسیار، مەحامیی ئیبراهیم عەزیز ئاغا دزەیی– دواتر– پارێزەر محەممەد شەهابوددین دەباغ.. س١، ژ١، گولان–مایس١٩٥٤... دوا ژمارە: ١٨٨ ی ٣٠ تەشرینی یێکەمی ١٩٦٠.

جێگەی باسە، (دەلیل ئەلسەحافە ئەلعێراقییە – س ١٩٧٢، مێژووی ڕەسمیی ئیجازەوان و سەندنەوەی لەنێوان ١٩٥٤/١٢/٢٢ و ١٩٦١/٨/٢١ داناوە. هەروەها زاهیدە ئیبراهیم خاوەنی " کەششاف ئەلجەرائید وەلموجەللات ئەلعێراقییە – س ١٩٧٦، ل١٤٣ " بەجۆرێکی دی و بە (ڕۆژنامەی هەتاو) نێوی بردووە کە خاوەندەکەیش هەمان کەسە. پتر دەلێت: لە ١٩٥٤/١٢/١٧ دا ئیمتیازی هەلوەشایەوە و لە١٩٥٤/١٢/٢٢ دا ئیمتیازی پێ درایەوەو لە١٩٦١/٨/٢١ دا لەبەر دەرنەچوونی ئیمتیازی هەلوەشایەوە. بە ئەم ڕۆشنایییەش دەردەکەوێ کە بە هەلە نێوی " ڕۆژنامە " ی لەبریی " گۆڤار " بەکار بردووە. هەروەها دیارە کە گیوی موکریانیی لە١٩٥٤/١٢/٢٧ دا ئیجازەی لێ سەندراوە و لە ١٩٥٤/١٢/٢٢ دا وەریگرتووەتەوە.

خوێندەواریش دەبێت نێوبردنەکەی زاهیدە ئیبراهیم (ڕۆژنامەی هەتاو) بە (هەتاو) ی ئەمین ڕواندزیی تێ نەگات، چونکێ وێڕای ئەو هەڵەیەی، گۆڤاری هەتاو لە ١٩٥٤ دا دەرچووە !

{٨}. بۆ وێنە بنۆڕە: جەمال خەزنەدار– ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردیی !

{٩}. وەك لە هاوینی ١٩٨٥ و ١٩٨٨ دا پرسم بە مامۆستای کۆچ کردوو عیززەددین فەیزی و عەلی مەکتەبی ڕواندزیی کردووە !

{١٠}. ئەم ئاشناکردن و لێ کۆڵینەم لە گۆڤاری: کاروان– س ٤، ژ ٤٨، ئەیلوول ١٩٨٦و مەردیی و بە عەرەبیش لە: ڕۆژنامەی ئەلعێراق– ژ٤٨١٢، سێ شەممە– ئەلسەلاساء٥/١١/١٩٩١ دا بڵاوکردووەتەوە. هەروەها لە٢٢/٤/١٩٨٦ و لەڕۆژی ڕۆژنامەنووسیی کوردەوارییدا وەك موحازەرەیێ پێشکەشم کرد. ئەمەی ئێرەش– لە ١٩٩٧ دا– دوا ورد بوونەوە !

{١١}. هەرچیی ڕێنووسی گوتار و بابەتەکانە گۆڕیونی بۆ ڕێنووسی باوی ئەم ڕۆژگارە. لێ کۆڵەکانی زمان و ڕێنووسیش پەکیان نەکەوتووە کە فۆتۆکۆپیی ڕۆژنامەکەیان لەبەر دەستە !

{١٢}. گۆران، عەبدوڵڵە سلێمان (١٩٠٤ هەڵەبجە – ٨/١١/١٩٦٢ سلێمانیی– گردی سەیوان). تالاوی یێکەم جەنگی گێتیی چێژتووە. بابی لە ١٩٤٩ دا کۆچیی کردووە. خوێندنی سەرەتاییشی لە هەڵەبجەدا بڕیوە. بەهاندانی چەند هاوڕێیەکی لە ١٩٢١ دا چووەتە (فێرگەی عیلمییە) ی کەرکووك، دوای ماوەیێکی کورت لەبەر بێ دەرامەتی – کە برا گەورە و سەرپەرشتیشی مردووە – دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە. لە ساڵی ١٩٢٥ – ١٩٣٧ دا هێندێ باری سووك بووە کە مامۆستای قوتابخانەکانی نێوچەکە بووە. دواتر لە دەزگەکانی دەوڵەتدا چەند جۆر کار و فرمانی دیتووە. لە دووەم جەنگی گێتییدا – سەرەتای ساڵی ١٩٤٢– تا مایسی ١٩٤٤ ڕێبەری بەشی کوردیی، ڕادیۆی شەرقولئەدنا– ناسراو بە ڕادیۆی کوردستان– لە یافادا بووە. دەڵێن هەر لەبەر هەستی نیشتیمانپەروەریشی لە ڕادیۆکە دوورخراوەتەوە. دوای هاتنەوەی بۆ عێراق– وەك خۆی گێڕاویەتیەوە– ناچار کراوە لە هەولێر دابنیشێت ! ! لە ئەم هەلانەدا و ساڵی ١٩٥١ لە دەزگەی ئەشغال چاودێر بووە و – گۆیا تووشی مایە پووچیی بووە – گیراوە و تا ساڵی ١٩٥٢ لە بەندیخانە بووە.

دوای بەربوونی بووە بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ژین) ی سلێمانیی. لەنێوان ١٩٥٤-١٩٥٦ شدا، لەسەر سیاسەت دیسان کەوتووەتە بەندیخانە. دوای ئازادبوونی، زۆر نابات لەسەر پشت گرتنی گەلی میسری عەرەب بۆ خەباتی و بەرپەرچ دانەوەی دەستدرێژیی ئیمپریالیزم، دیسان لە بەندیخانەدا توند کراوە چ لە کەرکوك و چ لە باقووبەدا. دوای هەڵگەڕانەوەی سوپای عێراق لە ١٤ / ٧ / ١٩٥٨ دا، ئەویش ئازاد بووە و ئیدی چەند ساڵێ بووە بە مامۆستا بەشی کوردیی کۆلیجی ئەدەبییاتی زانکۆی بەغداد. لە ساڵی ١٩٦٢ دا تووشی نەخۆشیی بووە و ڕووی کردووەتە وڵاتی سۆڤیاتی جاران. نەخۆشیی شێرپەنجەی لێ دیاریی داوە و دوای دوو مانگ دڵشکاوانە دەگەڕێتەوە بۆ نیشتیمانیی و کۆچیی ماڵئاوایی دەکات. دو ژنی هێناوە. دوو کوڕ و کیژێکی هەن کە نووسەرن.

گۆران، شاعیرێکی گەورەی کوردە. لە پێشڕەوەکانی شیعر و پەخشانی نوێی کوردییە. ژین و هونەری کۆمەڵێ ئەڵقەی پێکگرتووە... ناهەمواریی ژین و گوزەران.. ڕەنج دان و نەخۆشیی.. ئافرەت و جوانیی پەرستیی و شیعر.. سیاسەت و گرتن و نیشتیمان پەروەریی و پێشکەوتن خوازیی و شیعر.

گۆران، هەتا خۆی مابوو چەند کۆمەڵە شیعر و چاپ کراوی دی بڵاوکردەوە. گرنگەکانیان، (بەهەشت و یادگار—س١٩٥٠) و (فرمێسك و هونەر—س١٩٥٠) و (هەڵبژاردە لە چیرۆکی بێگانە—س١٩٥٢) و (پەیامی کورد —س١٩٥٤). دوای خۆیشی، (سروشت و دەروون —س١٩٦٨) و (لاوك و پەیام — س١٩٦٩) و (دوو هاوینە گەشت — س١٩٧١).

گۆران وەك فێرگەیێکی شیعری نوێ باسی کراوە و زۆر بایەخی پێ دراوە. یێکێ لە ئەو نووسینە چاکانە دانراوی حسێن عەلی شانۆڤە کە بە زمانی ئازەریە و مامۆستا شوکوور مستەفا کردوویەتی بە عەرەبیی: (شیعر ئەلشاعیر ئەلکوردی ئەلموعاسیر / شعر الشاعر الكردي ألمعاصر: عەبدوالله گۆران — مەتبەعەت دار ئەلجاحیز، بەغداد ١٩٧٥)

{١٣}. بێسارانیی، مەلا مستەفا مەلا ئەحمەدی بێسارانیی (١٦٤١ ز. گوندی بێساران — ١٧٠٢ ز!!). مامۆستا عەلائەددین سەججادیی— کە مێژووی ژین و مردنی داناوە— بە شاعیرێکی گەورەی کلاسیکی غەزەل خوێن و فەلسەفەخوازی ئایینی ژماردووە.. شیعرەکانی

بەشێوەی گۆرانە. کەیومەرس نیک ڕفتار لە ساڵی ١٩٨٢ دا (دیوانی بێسارانیی) لە بەغدادا چاپ کردووە.

{١٤}. مەولەویی، سەیید عەبدوڕڕەحیمی مەلا سەعید. (١٨٠٧ ز. گوندی سەرشاتەی تاوەگۆزیی – ١٨٨٣ ز. گوندی شانە) ناسراویشە بە "مەعدووم" و "مەولەویی" ش لەلای خەڵك. ڕیشەیشی دەچێتەوە سەر خانەدانی پیرخدری شاهۆیی. ئیجازەی خوێندنی لە حاجی مە ئەحمەدی نۆتشیێ وەرگرتووە. لە ئاوایی "تەوێڵە" شدا بووە بە لایەنگیری شێخ سیراجوددین. بەهۆی بەربوونەوە لە وڵاخ و پشت شکاندن، کۆچی دوایی کردووە.

مامۆستا عەلائەددین سەججادیی لە (مێژووی ئەدەبیی کوردیی) دا لێی گوتووە: مەولەویی یێکێکە لە شاعیرە هەرەگەورەکانی کورد و زانایێکی ئایینیی و سۆفیی بووە! پێوەندیشی بە ڕێبازی نەقشبەندییەوە توند بووە!

مەولەویی لە زانستی زماندا (عیلمولکەلام / علم الكلام) لە ساڵی ١٨٦٩ دا دانراوی (ئەلفەزیلە/الفضیلة) ی بە ٢٠٣١ تاکە شیعری عەرەبیی داناوە. هەروەها (ئەلعەقیدە ئەلمورزییە/ العقيدة المرضية)ش کە ٢٤٥٢ شیعری کوردییە، لەگەڵ (ئەلفەوائیح / الفوائح) کە ٥٢٧ شیعری فارسییە و لەساڵی ١٩٣٤ دا لە وڵاتی میسردا چاپ کراون.

پیرەمێردی شاعیر، یێکەم جار (ڕۆحی مەولەویی) چاپ کردووە کە شیعرەکانی لەشێوەی (گۆران) ەوە هێناوەتە سەر شێوەی سلێمانیی. مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس لە ١٩٦١ دا (دیوانی مەولەویی) چاپ کردووە و لێی کۆڵیوەتەوە.

{١٥}. نالیی، خدری ئەحمەد شاوەیسی ئالی بەگی میکاییلێ، (١٨٠٠ ز. گوندی خاك و خۆڵێ – شارەزوور– ١٨٦٥ز. ئەستەنبووڵ). خوێندەواریی لە مزگەوتەکان و فێرگەکاندا دەستگیر بووە. دوای ڕمانی دوامیرنشیینی بابانی سلێمانیی، ئەم بازێڕەی بەجیچ هێشتووە و چووە بۆ حەج، لە ئەوێشەوە گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەنبووڵ و ئیدی نەگەڕاوەتەوە. ژنی نەهێناوە وەجاخ کوێرە. شاعیرێکی گەورەی کلاسیکە و فێرگەییێکی هونەری شیعرە لە شیعر و زمانی عەرەبیی و فارسییشدا دەست ڕەنگین بووە. لە ١٨٥٧ ز. دا، خۆرهەڵاتناس (خۆدزکۆ) لە ئەحمەدی خانی بابانەوە هەواڵی (نالیی) وەرگرتووە.

بە شیعرەکانیدا دیارە کە عاشقی (حەبیبە) نێوێکی زەردیاوایی بووە و وێ دەچێ پێی نەگەیشتبێ.

لە ١٩٣١ ز.دا یێکەم جار مستەفا سابیب – کوردیی – و تاهیر بەهجەت – مەریوانیی – دیوانیان چاپ کردووە. تا ئێستە چەند جار دیوانی چاپ کراوەتەوە. کۆکترینیان چاپ و لێك دانەوەکەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیسە!

{١٦}. ئەم شیعرەی نالیی لە هەردوو (دیوانیی نالیی – مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد، بەغدا ١٩٧٦، ل ٩٧–١٠٠) و (نالیی – د. مارف خەزنەدار، چاپخانەی دارولحورییە لیلتیباعە، بەغدا ١٩٧٧، ل٥٣) دا بڵاوکراوەتەوە. وێڕای جودایی ڕێنووسیان لەگەڵ ڕێنووسی ئەم ڕۆژنامەیە (جوداییش لە وشەی نێو تاکەکانی شیعرەکەدا هەیە) و پێ ویستم زانیی نیشانی بدەم *.

| ڕۆژنامەکە | م.ع | م.خ |
|---|---|---|
| بەندە | بەندە | بەندەی |
| حەظی" حەزی" | خەططی | خەتتی |
| ئیراك | ئیراك | ئەراك |
| ئەم، ئەو | ئەوەم | ئەم، ئەو |
| باسی | بەحثی | بەحثی |
| گیاوگوڵ | گیاه و گڵ | گیاهو گول |
| مودەنە | موودەنە | مۆدەنە |
| لۆمەی | لەومەی | لەومی |
| زبان ئەکا | زمان دەکەی | زەمان دەکەی |
| دەڵێ | دەوێ | دەوێ |
| غافڵە | غەفلی | غافلی |
| خۆی | خۆی | خۆت |
| خدمەتی | خزمەتی | خزمەتی |

| بەندی قەفەس | داوی طەمەع | بەندی طەمەع |
| --- | --- | --- |
| عەشقی | عەشقی | عیشقی |
| تەغەنیەی | تەغەینەوو | تەغەینەوو |
| ئەلفی | ئیلف | ئولفی |
| هەرزە نویسە | هەرزە نویسە | تەفریقە نووسە |

* م.ع: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

* م.خ: مارف خەزنەدار

{۱۷}. مەلا ئەفەندی: ئەبووبەکری کوڕی حاجیی عومەری کوڕی ئەبووبەکرە، ناسنێوی(کوچك مەلا) ی لە باپیریەوە بۆ ماوەتەوە، (۱۸٦۷ ز. هەولێر –۱۲/۳۱/ ۱۹٤۲. هەولێر) خوێندەواریی لەسەر دەستی بابی زانای لە مزگەوتی قەلا دەستگیر بووە! پیاوێکی زانا و شاعیر و پیاوچاك بووە. مزگەوتی قەلای نوێ کردووەتەوە و فێرگەیشی قیبلەی شاگردانی زانست بووە کە لە میسر و تورکیا و پاکستان و ولاتانی دیەوە ڕوویان تێ کردووە. خاوەنی فەتواش بووە. گەلێ جوامێریی نواندووە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی هۆزەکان لەسەردەمی حوکمڕانیی عوسمانییدا، تەنانەت لە ڕۆژگاری سولتان عەبدولحەمیدا نیشانی (خادیمولحەرەمەین ئەلشەریفەین) ی خەلات کراوە. هەروەها لەسەردەمی مەملەکەتی عێراقدا نیشانی (ئەلڕافیدەین) ی خەلات کراوە.

مەلافەندیی کە بە کوردیی و عەرەبیی و فارسیی و تورکیی شیعری داناوە، چەند دەستنووسی دانراوی زانستیی و ئایینیی هەیە وەکو (عیلمولئەسترلاب / علم الأسطرلاب) و (مەواقیفولئوموور ئەلعاممە / مواقف الأمور العامة) و (تەشریعولئەفلاك / تشريع الأفلاك) و (ئەلفەوائید ئەلحسێنییە فی ئەلروبعولموجیب / الفوائد الحسينية في الربع المجيب) و هتد.*

ڕۆژی پێنجەممەی کۆچی مالئاوایی و ناشتنی لە گوندی (باداوە) ی هەولێر، ڕۆژی ماتەمینی و شین بووە. گەلێ شاعیر بە عەرەبیی و کوردیی بۆیان لاواندووەتەوە. پیرەمێرد پێکێکە لە قەسیدەیێکیدا مێژووی کۆچی – بەحسابی ئەبجەد – ڕاگرتووە:

نیوە شعری دوای تأریخی خشتە

" وا مدرسەی ملای هەولێر بهشتە !"**

(دوا تاك دەكاتە س ١٣٦١ ك / ١٩٤٢ ز)

* بنۆڕە: زبیر بیلال ئیسماعیل– عولەماء وە مەداریس ڤی ئەربیل/ علماء ومدارس في أربيل، ل ٣٢–٣٥، مەتبەعەتولزەهراء، مووسڵ ١٩٨٤

** محەممەد ڕەسووڵ هاوار– پیرەمێری نەمر، چاپخانەی ئەلعانی، بەغداد ١٩٧٠، ل ٣٢٥.

{١٨}. شێخ مستەفای نەقیب، كوڕی شێخ محەممەد كوڕی كاكە ئەحمەدی شێخ كوڕی مارف نۆدێیی!

{١٩}. ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ (١٨٩٨ ز. سلێمانیی – ١٩٦٣/١/١٠ بەغداد) خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە سلێمانییدا دەستگیر بووە. بابی ئەفسەرێكی بەرزی سەردەمی عوسمانیی بووە و لە جەنگی گێتیی یێكەمدا كۆچی كردووە. خۆی گێڕاویەتیەوە كە دوای ئەوەی ئینگلیز لە ١٩١٧/٥/١٧ دا بازێڕی كەركووكی داگیر كرد، خۆی و حەفید زادە شێخ مەحموود نامەیان بۆ ناردوون و ئامادەییان نواندووە كە ئەگەر بەڕێوەبردنی وڵاتی كوردان بخەنە ئەستۆی كوردانەوە، ئامادەن هەریكاریان بن و نێوچەكە چاودێری ئەوان بێ.. بەڵام بەر لە سەرگرتنی ئەم پێوەندییە، ئینگلیز كەركووكی چۆڵ كردووە و لەشكری توركی هاتووەتەوە نێو و باسەكەش ئاشكرا بووە. لەسەر ئەوە ئەو و حەفید زادە گیراون و لە ئەوەدا بووە بكرێن بە سێدارەوە، بەڵام قەوماوەكانی جەنگ و پێویستیی تورك بەدۆستیی كوردان، كاریان كرد كە ببەخشرێن. لەسەردەمی داگیربوونی سلێمانیی لەلایێن ئینگلیزەوە، ١٩١٩–١٩٢٢ ز ڕێبەری ئاواییەكانی سەنگاو، سورداش، قەرەداخ بووە. لە ١٩٢١ دا خۆی هەڵبژاردووە بۆ ئەندامیی بەڕێوەبردنی بازێڕی سلێمانیی و سەرنەكەوتووە. لە ١٩٢٢/٧/٢١ ز وەك ئەندامی دەستەی دامەزرێنی جەمعییەت كوردستان دەركەوتووە. لە ١٩٢٢/٩/٥ دا كە ئینگلیز سلێمانیی چۆڵ كردووە، وەك ئەندامی (ئەنجومەنیی میللیی كوردستان) دەركەوتووە و یێكێ بووە لە ڕیزی یێكەمی پێشوازەكانی حەفید زادە شێخ مەحمووی ئازاد كراو لە بەندیی هێندوستان. لە دووەم سەردەمی حوكمڕانیی حەفیدزادە ١٩٢٢ دا، ڕێبەری پۆلیس بووە لە ١٩٢٣/٦/٧دا– بە

پێشنیازی ئینگلیز– ئەندامی ئەنجوومەنی تەشکیلاتی حوکوومیی بووە، بەڵام دوای سێ ڕۆژ لەگەڵ هاوەڵەکانی دەستیان لە ئەم فرمانە هەڵگرتووە. لە ڕۆییشتنە گشتییەکەی سلێمانیی: ١٩٢٣/٦/١٧ دا بەشدار بووە و تا داگیربوونی سلێمانیی لە ١٩٢٤/٧/١٨ و لەلایێن ئینگلیز– عێراقەوە، نەهاتووەتەوە- ئەو هەڵەش کە هاتووە یاوەری کاروانی لەشکرەکان بووە.

لە ١٩٢٥/٢/١٤ دا دامەزرێنەری جەمعییەتی مودافەعەی وەتەن بووە لە سلێمانییدا و لەدژی داخوازیی تورکیای کەمالیست بۆ گێڕانەوەی هەرێمی مووسڵ. یێکەم موتەسەڕڕیفی سلێمانیی لە نێوان ١٩٢٥–١٩٢٧ و جاری دووەم لە ١٩٣٠–١٩٣٥ دا. ئەوجا موتەسەڕڕیفی هەولێر لەنێوان ١٩٣٥–١٩٣٩ دا. ئەوجا پشکنەری ئیداریی لە وەزارەتی نێوخۆی عێراق لە بەغدادا و دواتر خانەنشین. لەنێوان ١٩٤٣/٨/١٩– ١٩٤٤/٥/٢٣ دا نوێنەری سلێمانیی لە پارلەماندا. دواتر خانەنشین. ئەوجا ناسینی وەك (پیر) ێ لە دەوڵەتی عێراقدا.

زمانەکانی کوردیی، فارسیی، تورکیی، عەرەبیی و هێندی ئینگلیزیی و فەڕەنسیی زانیوە. ژنی هێناوە و نەوەی ناسراوی لە سلێمانییدا دەژین. ئەحمەد بەگ، ئاوەدان کەرەوەی سلێمانیی دوای یێکەم جەنگی گێتیی. دامەزرینی (کۆمەڵی زانستیی کوردان–سلێمانیی، س١٩٢٦) و (کۆمەڵی بژاری زمانی کوردیی–س١٩٢٦) و سەرۆکی ئەنجوومەنی مەعارفی سلێمانیی.

دامەزرێنی ڕۆژنامەکانی (ژیانەوە–س١٩٢٥) و ژیان–س١٩٢٦) و هاندەری هەڵکەوتنی گۆڤاری (ڕووناکیی–١٩٣٥.هەولێر) بووە. چ دانراوێکی سیاسیی یان ئەدەبیی نییە.*

*** سەرچاوەکان...**

١. بەعەرەبیی: ئیدمۆندس– کورد تورك و عەرەب/ کرد ترك و عرب. عەبدورڕەزاق ئەلحەسەنیی– تەئریخ ئەلوەزارات ئەلعێراقییە / تأریخ الوزارات العراقیة– ج ١٠. عەبدولعەزیز یامەڵکێ – موزەککەرات عەبدالعزیز یاملکی، ١٩٥٧. عەلیی سید و ئەلگۆرانیی– مین عەممان ئیلا عەمادییە/ من عمان الی عمادیة.

٢. کوردیی: ڕۆژنامە و گۆڤارەکان... پێشکەوتن – سلێمانیی، ١٩٢٠–١٩٢٢. بانگ کوردستان، ١٩٢٢، ژیانەوە، ژین، ڕووناکیی.

٣. دۆسێی موتەسەرڕیف ئەحمەد تۆفیق.

٤. چەند بەڵگەنامەیێکی کۆن!

{٢٠}. مەبەست ڕۆژنامەوانی پێشکەوتن– سلێمانیی، هەروەها خوشکەزای پیرەمێرد: هادی سابیبە!

{٢١}. ئەحمەد بەگی کۆماسیی، شاعیری کلاسیك– بەشێوەی گۆران– و هاوسەردەمی مەولەوییە. ژینی ڕوون و دیوانی شیعری بەدەستەوە نییە. بەر لە مەولەویی مردووە!

{٢٢}. فێرگەی نێوبراو لە ساڵی ١٨٩٤ز دامەزراوە... بنۆڕە: عەبدورڕەزاق ئەلهیلالی– تەئریخ ئەلتەعلیم فیی ئەلعێراق فیی ئەلعەهد ئەلعوسمانیی/ تأريخ التعليم في العراق في العهد العثماني، شەریکەت ئەلتەبع وەلنەشر ئەلئەهلییە، بەغداد ١٩٥٩، ل ١٨٠

{٢٣}. بوون بە ئەفسەری عوسمانیی هێندەی بردووە، بەڵام مخابن من نەمتوانیی ساڵەکانی خوێندنی بناسمەوە.

{٢٤}. دەرکەوتنی نێو و پلەی، بە فەرمانی پاشای عێراقە و ٢٥٤ هەمین نێویشە... بنۆڕە: ئەلوەقائیع ئەلعێراقییە– س ١، ژ٥,٦,٢١ کانوونی یێکەم ١٩٢٢.

{٢٥}. بنۆڕە: بانگ کوردستان– س١، ژ٨، جومعە ٢٩ ئەیلوول ١٩٢٢.

{٢٦}. بنۆڕە: ئەحمەد خواجە– چیم دی، ب٢، چاپخانەی کامەرانیی، ل١١، ٢٩، ٣٠، ٥٤.

{٢٧}. بنۆڕە: ژیان– س١، ژ٢٣، پێنجشەموو ٨ تەمووز ١٩٢٦.

{٢٨} نامەی یێکەمی کیژی ئەمین ڕواندزیی، هێوی کە دوای پێوەندیی بەستنم لە مانگی١٢/١٩٨٥دا وەڵامی دامەوە.

{٢٩}. هەمان سەرچاوە.

{٣٠}. ناجیە فەتاح کابانی ئەمین ڕواندزیی لە خانەدانێکی کوردی دانیشتووی مووسڵە. ماوەیێ مامۆستا بووە. لە کۆتایی ساڵەکانی حەفتەکاندا کۆچی کردووە. نەوەکانی ٣ کیژ و ٤ کوڕ بوون کە ئەمەن: پیرۆز– مامۆستای کۆچ کردوو. هێوی مامۆستای خانەنشین، لەدوای ١٩٩١ەوە لەندەن نشینە! ژان، کابانی پارێزەرێکی عەرەبی بەغدادە. د.وریا (پزیشك و

نەمسا نشین)، در. زوزك (قانوونناسی دەرچووی فرانسە و لە ولاتێکی کەناری فارسدا دەژی).
چەتو، کۆچ کردوو. ئازاد، نیشتەجێی نیشتیمان.

{٣١}. بنۆڕە: عەبدورڕەزاق ئەلحەسەنیی – تەئریخ ئەلئەحزاب ئەلعێراقییە، دار ئەلتیباعە وەلنەشر، بەیروت ١٩٥٣.ل٣١٤، ٣٥، ١٥!

{٣٢}. بنۆڕە: عەبدورڕەزاق ئەلحەسەنیی– تەئریخ ئەلوەزارات ئەلعێراقییە/ تأريخ الوزارات العراقية، ج١٠، مەرکەز ئەلئەبجەدییە لیلتیباعە وەلنەشر بەیروت ١٩٨٢، ل٢٩٥.

{٣٣}. بنۆڕە: کاروان– س٤، ژ٣٨، تەشرینی دووەم ١٩٨٥، ل٧.

{٣٤}. بۆ باس و نێوی قوتابخانەکان و مامۆستاکان بنۆڕە: بانگ کوردستان – س١، ژ١٣، جومعە ٣ تەشرینی دووەم ١٩٢٢. هەروەها: ڕەفیق حیلمیی– یاداشت، ب٦، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا ١٩٥٨، ل٥٣٦.

{٣٥}. بۆ وێنە بنۆڕە: شاکیر فەتاح– خەباتی ڕۆشنبیران، چاپخانەی ئەلحەوادیس، بەغدا١٩٨٤، ل٣٩.

{٣٦}. بۆ وێنە بنۆڕە: هەولێر– ژ٨٩، ٣٠ ئەیلوول١٩٥٢/ گوتاری: الفيتامينات– وریا ئەمین ڕواندزیی. هەروەها: هەولێر– ژ١١١، ١٧ ئادار ١٩٥٣/ گوتاری: العصا في التربية– هێوی ئەمین ڕواندزیی. (بنۆڕە: مەحموود زامدار– ڕۆژنامەی هەولێر، هەولێر ١٩٨٨، ل٦٩,٧٦).

{٣٧}. بۆ وێنە بنۆڕە: ژیان – س ١٠، ژ٤٤٧، شەموو ٧تەمووزی١٩٣٦. هەروەها: ژین– س١٤، ژ٥٨٨، ١٩٣٩/١٢/١٢.

{٣٨}. ڕۆژانی١٩٨٦/٢/١ و ١٩٨٧/٤/٢٥ پرسم بە مامۆستا ئەحمەد خواجای کۆچ کردوو کرد و پێی گوتم کە: سێ ژمارەکەی ڕۆژنامەی (بانگ حەق) لەلایێن سالح زەکی ساخێبقران و ئەمین ڕواندزیی و فائیقی کاکە مینەوە سەرپەرشتیی کراوە، ئەگەرچیی نێوی کەسیشیان بەسەر ڕۆژنامەکەوە نییە!

{٣٩}. بنۆڕە: ژیانەوە – س١، ژ٢٩، چوارشەممە ١٩٢٥/٧/١ – مووسڵ، ڕواندزیی.

هەروەها: ژیانەوە– س١، ژ٣٢ و ٣٣ و ٣٤ ی ٢٣ و ٣٠ ی تەمووز و ٦ی ئاغستۆسی ١٩٢٥/ گوتاری/ هاوارێکی تر بۆ عالەمی بەشەرییەت و مەدەنییەت– ئەمین کوردیی لە عەشیرەتی جوبران. بەغدا.

هەروەها: (ژیانەوە–س٢، ژ٤٢، پێنجشەنبە١ی تەشرینی یێکەم١٩٢٥/ گوتار: کورد و تورك/ مووسلێ. ڕواندزیی!

لەمەڕ ساغ کردنەوەی ئەو نێو و ئیمزایانەش دەڵێم، بەڕۆشنایی ئەوەی ساڵی١٩٢٦ز ئەمین ڕواندزیی ئەفسەری سوپا بووە لە هەڵەبجەدا– پێشتریش لە مووسڵدا ژنی هێناوە– ئا لە ئەو هەلەدا کە گوتارەکەی ١/٧/١٩٢٥ی بڵاوکردووەتەوە و نێوی (جیاووك کوردیی = مەعروف عەلی ئەسغەر) ی هێناوە کە ئەویش ڕواندزییە. دیاریشە کە خاوەند گوتاری باس کراو هەرگیز (جیاووك) نییە، چونکە لە ئەو هەلەدا (حاکمی جەزای مووسلێ) بووە. هەروەها دیارە (حوزنی موکریانیی)ش نییە کە ئەم لەهەموو نووسەرێ پتر زمان و شێوازی نووسینی ئاشکرا و ناسراوە، ئەگەرچیی بە نێوی (ڕواندزیی) یشەوە گوتاری هەیە.

بێ لە ئەوانە، کەسێکی دی لەنێو ڕۆشنبیرە گوتار نووسەکاندا نییە کە نێوی (ئەمین کوردیی) بێ کە شێواز و زمانی نووسینی نووسەری (مووسلێ — ڕواندزیی) و (ئەمین کوردیی — بەغدا) هەر لەیێك دەچن.

جێگەی خۆیشیەتی ڕوون بێ کە گوتارێکی دەستنووس و بڵاونەکراوەی مستەفا سایبی نەتەوە پەروەری گەورە بەنێوی (بۆ مەبعووسان — ژمارە چواری گوتارەکە) کە بۆ نوێنەرە کوردەکانی نووسیوە و مێژووی ١٦/٢/١٩٢٦ ی لەسەر پەڕەیێکی نووسراوەکە داناوە، نێونیشانێکی لە لاوە داناوە کە بە ئەم جۆرەیە: (مووسلێ. موستەودەع ئەلمەشات، ئەلمولازیم ئەمین ڕواندزیی ئەلکوردیی). هەڵبەت باوەڕم بەهێزترە بڵێم، ئەمین ڕواندزیی بۆ شوێنە ونی — لەبەر فەرمانەکەی لە سوپادا– ئەو نێونیشانەی بۆ خۆی داناوە، (مووسلێ — ڕواندزیی) و (ئەمین کوردیی — بەغدا) ش کە لە یێك دەچن!

{٤٠}. بنۆڕە: ڕووناکیی– س١، ژ ٦ و ٧، چوارشەممە ١٢ ی شوبات و شەممە ٢٨ ی ئادار١٩٣٦ کە بە دوو بەش و بە ئیمزای نەناسراوی (ب. ج) نێوەوە گوتارەکە بڵاوە. ئەم

گوتارەش کە هێندێ درێژترە لە گوتارەکەی نێو (گەلاوێژ – س ١٩٤٣) هەر هەمان بابەتە و زمان و شێوازیشی زۆر لە ئەو دەچێ. پێویستە روونیش بێ کە هەمان گوڤار (رووناکیی – س١، ژ٥، پێنجشەممە ١٦ی کانوونی دووەم ١٩٣٦) بەنێونیشانی (ئاگر پەرست) ەوە گوتارێکی (ب. ج) نێوی بلاوکردووەتەوە و پاشماوەکەیشی لەهەمان گۆڤار: س١، ژ٦ دا بلاوە.

{٤١}. بنۆڕە: گەلاوێژ– س٤، ژ٤، نیسان١٩٤٣. جێگەی روون بوونەوەیە، من وەکو سەرنجم داوە، لە رۆژنامە نووسیی کوردییدا چ کەسێ بە ئیمزای (أ. رواندزیی) یەوە دەرنەکەوتووە. بۆییێکە دلّنیام کە ئەوە ئیمزای ئەمین رواندزییەوە و بلۆ شوێنە ونییش – کە ئەفسەر بووە – ئەو ئیمزایەی داناوە.

{٤٢}. بنۆڕە رۆژنامەی: هەولێر – ژ٧، ١٩٥١/٦/١٩، کیتاب مەفتووح ئیلا وەزیر ئەلداخیلییە/ كتاب مفتوح الى وزير الداخلية، ئەلموقەددەم ئەلموتەقاعید ئەمین بەگ رواندزیی. (مەحموود زامدار – رۆژنامەی هەولێر، ل٥٤)

{٤٣}. بنۆڕە: ژین – س١، ژ٨٨٤، پێنجشەموو ٢٨ ی ئاب ١٩٤٨.

{٤٤}. بنۆڕە: ژین – س ٢٢، ژ٩١٣، پێنجشەموو ٨ ی نیسان ١٩٤٨.

{٤٥}. بنۆڕە: ژین: س٢١، ژ٨٩٠، پێنجشەموو ٩ ی تەشرینی یێکەم ١٩٤٧.

{٤٦}. بنۆڕە: ژین – س ٢٠، ژ٨١٦، پێنجشەموو ١٠ ی کانوونی دووەم ١٩٤٦.

جێگەی باسە، گۆڤاری نێوبراو (کوردستان) ی مەهاباد: ژ١ ی لە ١٥ ی سەرماوەزی ١٣٢٤/٦ی کانوونی یێکەم ١٩٤٥ دا دەرچووە. بلاوکەرەوەی بیری پارتی دیموکراتی کوردستان بووە و تا کۆتایی سالّی ١٩٤٦ چەند ژمارەییێکی لێ بەرچووە. ژمارە: ١و٢ی هەرییێکە٢٠ لاپەرەیە. ژمارە:٣ و٤ی هەرییێکە ٣٨ لاپەرەیە. ژمارە ٦ و ٧ ی یێکەوە ٦٠ لاپەرەن " ٥ و ٢١ X ١٤ سم ". (بنۆڕە: در. کەمال مەزهەر ئەحمەد – تێ گەییشتنی راستیی، چاپخانەی کۆری زانیاریی کورد، بەغدا ١٩٧٨، ل٢٣٨).

{٤٧}. بنۆڕە: ژین – س٢٢، ژ٩٣٥، پێنجشەموو ١٦ ی ئەیلوول ١٩٤٨.

{٤٨}. بنۆڕە: محەممەد رەسوولّ هاوار – پیرەمێردی نەمر (بەرێز لاپەرەکانی: ١٤٧، ٢٢٢، ٢٢٨، ٢٥٨، ٢٩٣، ٢٩٢، ٣٠٨، ٣٨٢).

{٤٩}. بنۆڕە: ژین — س٢٠، ژ٨٢٤، پێنجشەمموو ١١ ی نیسان ١٩٤٦.

{٥٠}. بنۆڕە: ژین — س ٢٠، ژ ٨٤٦، پێنجشەمموو ١٤ ی تەشرینی دووەم ١٩٤٧.

{٥١}. ژین — ڕۆژنامەیێکی کوردیی و ئەدەبیی و کۆمەڵییە — حەوتۆیی — و خاوەن و مودیری مەسئوول حاجی تۆفیق پیرەمێرد (ژ: ١، زنجیرە ژمارەی ٥٥٤ ی ژیان: پێنجشەمموو ٢٦ی کانوونی دووەم ١٩٣٩). پیرەمێرد تا خۆی مابوو، دەریکرد. دوای خۆیشی خزم و وەچەی خۆی کە تا ژمارە: ١٧١٤ — ١٩٦٣/٢/٧ مان لێ دیتووە.

جێگەی باسە، پیرەمێرد — بەئاشکرا— لەساڵی ١٩٣٢ دا بوو بە ڕێبەری ڕۆژنامەی (ژیان) کە بە چاپخانەی بەلەدییە چاپ دەکرا، بەلام لە١٩٣٤/٨/١٤ دا خۆی هەمان چاپخانەی — ڕەسمەن — بەکرێ گرت و ئیمتیازی دەرکردنی وەرگرت. لە ١٩٣٥/٨/٣ دا لاپەڕەکانی لە ٤ لاپەڕەوە کرد بە ٦ و کە ژمارەیشی گەییشتە ٥٣٨ — ١٩٣٧/٨/٣ ئیجازەی بەکرێ گرتنی چاپخانەکەی بۆ نوێ نەکرایەوە.

وەرەی بەرنەدا، خۆی چاپخانەیێکی دەستگێڕی گەورەتری کڕی و نێوی چاپخانەی (ژیان) ی لێ ناو لە ١٩٣٧/٩/٢٠ دا ژمارەی ٥٣٩ ی (ژیان) ی پێ دەرکرد. لە١٩٣٨/٣/١٠— بەبیانووی کوردیی نووسین بە لاتینیی و نەورۆز کردنەوە— لەگەڵ دەرکردنی ژمارە " ٥٥٣ " ڕۆژنامەکەی داخرا. دوای چەند مانگێ پیرەمێرد خۆی ئیمتیازی (ژین) ی وەرگرت و بەیادی ڕەنجی لە (ژیان)! زنجیرەی بڵاوکردنەوەی ئەوی پێ دا... بەکورتیی و هێندێ دەستکارییەوە لە: گەلاوێژ — س ٤، ژ٨، ئاغستۆس ١٩٤٣ـەوە وەرگیراوە.

{٥٢}. هەتاو — س١، ژ١، مایس ١٩٥٤. هەولێر.

{٥٣}. ژین — س ٢٢، زژ ٩٣٥ پێنجشەمموو ١٦ ی ئیلوول ١٩٤٨.

{٥٤}. بەشی کوردیی— ڕادیۆ بەغداد، لە ساڵانی ١٩٤٧و ١٩٤٨ دا، ماوەکەی هێندە سات بووە، بەلام لە مانگی ١٩٤٩/١ بەدواوە بوو بە٣ سات... (بنۆڕە گۆڤاری هونا بەغداد/ هنا بغداد).

{٥٥}. ئەم بڵاوکراوە — گۆڤارە زمانی کوردییە کە هێشتا تەواو ئاشنا نەکراوە، هێندەی من لێی گەڕاوم و سەرنجم لێ داوە ئەوهام هاتووەتە بەرچاو:

١. لەمانگی دێسەمبری ١٩٤٩ دا بەنێوی (ئاگاو ڕووداو) لەچەند پەڕەیێکدا و بەچاپی ڕۆنێو دەرکەوتووە.

٢. بەنێوی (بەکورتیی ئاگا و ڕووداوی هەفتەیی) ەوە، دەزگەی (کاروباری ئاگاداریی وڵاتە یێککگرتووەکانی ئەمریکا لە بەغدا) لە (ژ: ١١٠، دووشەموو ١٠ ی ئەیلوولی ١٩٥١ تا ژ: ١١٥، دووشەموو ١٩٥١/١٠/١٥) هەر بەچاپی ڕۆنیۆ، بڵاوکراوەتەوە.

٣. بەنێوی (پەیام / گۆڤارێکی خوێندەواریی هەفتەییە لەلایێن کاروباری ئالّ و گۆڕی خوێندەواریی ئەمریکاوە –بەغدا) لە (ژ ١٣٧، بەرگ ٤، دووشەممە ٢٨ ی نیسانی ١٩٥٢) بە قەبارەی ١٧ X ٢٣ سم و بە چاپخانەی مەعاریف لە بەغداد چاپ کراوە و بە ئەم شێوەیە ماوەتەوە تا (ژ: ١٩٣، بەرگ ٥، ٨ ی حوزەیران ١٩٥٣).

٤. (پەیام / دوو هەفتە جاریّ لەلایێن کاروباری ئالّ و گۆڕی خوندەواریی ئەمریکاوە – بەغدا – دەرئەهێنریّ) لە (ژ: ١٩٤، ب٥، دووشەموو ١٥ ی حوزەیران ١٩٥٣) تا (ژ: ٣٣٥، ب٨، دووشەموو ٢٧ ی شوبات ١٩٥٦) بە قەبارەی ١٥ X ٢١،٥ سم و چاپخانە مەعاریف – بەغداد بلاوکراوەتەوە. بەڵام لە (ژ: ٣٣٦، ١٩ی مارت ١٩٥٦) تا (ژ: ٣٩٠، ب١٠، ١ی حوزەیران ١٩٥٨) بە هەمان نێوی (پەیام) و بەقەبارەی گەورەتر ٢٧ سم X ٢١،٥ سم بڵاوکراوەتەوە.

{٥٦}. بنۆڕە: ژین – س٢٢، زژ ٨١٣، پێنجشەموو ٨ ی نیسان ١٩٤٨.

ئەم ڕۆژنامەی (ئەسلێمانییە) ی عەرەبیی و حەوتۆیی، لەلای (کەششافولجەرائید وەلموجەللات ئەلعێراقییە/ كشاف الجرائد والمجلات العراقية – ل٣٢٥) بەهەڵە بێژراوە گۆیا لەساڵی ١٩٤٧ دا لە بەغدادا دەرچووە و (چەند ژمارەیێك) ی لیّ بڵاوبووەتەوە. سەرچاوەی دیش لێمان ڕوون ناکەنەوە کە (چەند؟) ی لیّ دەرچووە.

ڕۆژنامەی: ژین – س٢٢، زژ ٩٤٤، پێنجشەموو ٢٥ ی تەشرینی دووەم ١٩٤٨ لەسەر گفتارێکی (ئەو ڕۆژنامەیە) گوتارێکی بچووکی بەنێوی (هەڵبەست) ەوە وەکو لیّ خوێندنیّ – تەعلیقیّ – بڵاوکردووەتەوە و دەڵێت: (لە جەریدەی " ئەسلێمانییە " ی ڕۆژی جومعەی ٢٦ ی تەشرینی سانیی کە مەعرووف عارف ئوستاد "!! " دەریکردووە، نووسراوە کە لە بابەت

ئەوقاف سلێمانیی هەندێ تەخریباتی عەلەنیی و ئیهمالی بەعزێ مەساجیدی موهیممە شیکایات و مەزابیت دراوە بەو جەریدەیە.. هتد

بە ئەم جۆرە، ئەم ڕۆژنامەیە (هەتا ئەم هەل و ڕۆژە) لەبەرچاومانە کە مخابن پیرەمێرد (ژمارەکەی ئەو قسە هەڵبەستەی ئاشکرا نەکردووە ! !) تا ژمارەی ڕۆژنامەی دیاربێ!.

جێگەی گوتنە بێ لە ئێمە کەسێکی خۆ و سەرچاوەیێکی کوردیی، لەمەڕ ئەم ڕۆژنامەیە نەئاخاوتووە.

{٥٧}. بنۆڕە: عەبدوڕڕازاق ئەلحەسەنیی – تەئریخ ئەلوەزارات ئەلعێراقییە، ج ٧، مەنشوورات ئەلیەقەزە ئەلعەرەبییە، بەیروت ١٩٨٢ " مەوزووع ئەلوەسبە/ موضوع الوثبة "، ل ٢٠٩ – ٢٨٧.

{٥٨}. هەمان سەرچاوە، ل٣٠١.

{٥٩}. هەمان سەرچاوە (ل٣٠٠، پەراوێز ٢) پتر دەگێڕێتەوە کە ئەو دەسەڵاتە عورفییە نزیکەی ٢٠ مانگێکی برد و لەسەردەمی وەزارەتی (ئەیووبیی) دا لە ١٩٤٩/١٢/١٧ دا لابرا کە هەموو چینەکانی گەل لێی بێزار بوون، بەڕادەیێ پارتە سیاسییەکان یێك بە یێکی وەزارەتەکانی عێراق تاوانبار دەکرد گۆیا بۆ مەبەستی دی و دوور لە کارەساتی فەلەستین بەکار دەبرێت، بۆ وێنە بۆ مەبەستی تایبەتی لە هەڵبژاردنی گشتییدا. لەئەمەش پتر (حیزبی ئەلئەحرار) ئەو دەسەڵاتەی تاوانبار کردووە گۆیا بەکار براوە بۆ پاکۆدانی شوێنەوارەکانی ڕاپەڕین – وەسبە.

{٦٠}. هەمان سەرچاوە، ج٨، ل١٥

{٦١}. ژین – س٢٢، زژ ٩٣٠، پێنجشەموو ١٩٤٨/٨/١٢، / کاربەدەستان چۆن بەڕێمانەوە ئەبەن؟

{٦٢}. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ج ٨، ل١

{٦٣}. بنۆڕە: نزار – س١، ژ٧، چوارشەممە، ٣٠ ی حوزەیران ١٩٤٨، ل٢٤ / گوتاری: کۆبوونەوەی ڕۆژنامەچییەکان لەگەڵ فەخامەتی ڕەئیسوزرا.

لە بن ئەو نێونیشانەشدا پتر باس دەکات و دەڵێت: لەپاشا جەنابی نوورەددین داوود سەرۆکی کۆمەڵی ڕۆژنامەچییەکان هاتە قسە و لەبابەت ڕۆژنامەکانەوە دووا: قانوونی چاپ کراو و ناهەمواری خستە بەرچاو. بەستنی ڕۆژنامە و خراپیی ئەم بەستنەی پێشاندا. ئینجا داوای بەتاڵ کردنەوەی ئەو قانوونە و دانانی قانوونێکی تری بۆ سەحافە کرد.. هتد!

{٦٤}. تەئریخ ئەلوزارات– ج ٧٠، ل٢٥٤– پەراوێز ٢، ل٢٦٩– پەراوێز٢/ بۆ وێنە باسی ئەو بەشداربوونەی سلێمانیی دەکات و دەڵێت: لەسلێمانییدا– لەژوورەوودا– خۆنیشاندەرەکان پەلاماری (دارولعیلاقاتی بەریتانیایی) یان داو دەرگاو پەنجەرە و کورسیی و کەرەستە و (ڕادیۆی بڵاوکردنەوە) یان* تێکشکاند. ئەم ماڵەیەش بوبووە لانەیێ بۆ پروپاگەندە کردن بۆ ئینگلیز و بۆ بەربەرەکانێی گیانی وڵاتپارێزیی. لەئەنجامدا جێگری کونسوڵی بەریتانیا لە کەرکووکدا لەسەر ئەم کردەوانە شکاتی لەلای موتەسەڕریفی سلێمانیی کرد و خۆپیشاندانی جەماوەرەکەی بەکاری چەوت و نەیاری کەڵکەکانی بەریتانیا ژمارد کە ئەمەش لەنامەی موتەسەڕریفی سلێمانییدا هاتووە، ل١٢٩ – ٢٠ ی شوباتی ١٩٤٨ / تەواو.

جێگەی ڕوون بوونەوەیە، ڕاپەڕین– وەسبە خۆی پشتگیری عەرەبایەتیی فەلەستین و دژی دابەش بوونی بوو هەروەها دژی پەیمانی (پورت سمۆس) بوو ئەوی نوێ کردنەوەیێکی پەیمانی نێوان هەردوو حوکوومەتی بەریتانیا و عێراق بوو کە لە٣٠/٦/ ١٩٣٠ دا مۆرکرا. هەر لە ئەو ڕۆژگارەشدا گەلی عێراق – بەکوردیشەوە– لێی ڕاپەڕی. ئاشکراشە ئەنجامێکی ئەو پەیمانە نەگریسە کارەساتی ٦ ی ئەیلوولی ١٩٣٠ ی سلێمانیی بوو.

* ڕادیۆی بڵاوکردنەوە، مەبەست لە ئەو دوو ئامێرە دەنگ زلەیە–موکەببەرە– کە بە مایکرۆفۆن پروپاگەندەی پێ دەکراو دوو ئامێرەکەش لەبەردەرکی سەرای سلێمانییدا هەڵاواسرابوون.

{٦٥}. نامەی هێویی ئەمین ڕواندزیی بۆ من. لەمانگی ١٢/١٩٨٥ دا.

{٦٦}. بنۆڕە: هاوکاریی– ژ١٠٧٤، ١١/٥/١٩٨٩.

{٦٧}. لەپاییزی ١٩٨٩ لە سلێمانییدا پرسم پێ کرد!

{٦٨}. لەپاییزی ١٩٨٩ دا لە بەغداد دا پرسم پێ کرد!

{٦٩}. بنـــۆڕە دوو گوتـــاری: ژیـــن–س٢٢، زژ٩٣٠و٩٣١ ی پیَنجشـــەموو ١٢/٨/ و ١٩٤٨/٨/١٩.

{٧٠}. بنـۆڕە: فـائیق بـەتتی– سـەحافەتولعیراق، تـەئریخ و کیفـاح ئـەجیالیها/ صـحافە العراق، تاریخ وکفاح أجیالها، مەتبەعەت ئەلئەدیب، بەغداد ١٩٦٨.

{٧١}. پیَم وەیە (بەلەدی کوردستان / بلدی کوردستان) هەڵەی نووسـەر بیَ و ڕاستەکەی (بانگ کوردستان) بیَ.. بەڵام ئەم ڕۆژنامەیە کە لە١٩٢٦ دا سیَ ژمارەی لە بەغداد دا دەرچوو، هـەروەها مستەفا پاشا لـە١٩٣٦ دا مـردووە، چۆن تـا ئـەم هەلـە ئیمتیازەکـەی بڕی کردبـوو بەمەرجیَ چ ژمارەییَکی دی – دوای ١٩٢٦ – دەرنەچووە؟

{٧٢}. فائیق تۆفیق خەڵکی سلیَمانییە و پیَشتر– لـە سـاڵی ١٩٤٧ دا– خـاوەن ئیمتیـازی گۆڤاری (دەنگی گیَتی تازە) ی بەغداد بوو کە حوزنی موکریـانییش سەرنووسـەری بـوو. مخـابن تـا هـەلی ئـەم دیَـڕە نووسـینە چ کەسـیَ لەسـەر خـۆی و ڕەوتـی ڕۆژنامـەوانیی و لەسـەر (لیوائولجیهاد)یش چ شتیَکی نونووسیوە!!

{٧٣}بنۆڕە: هەتاو– س١، ژ١، مایس ١٩٥٤. هەولیَر.

{٧٤}. نزار جەرجیس عەلی– سەحافەت ئەربیل/ صحافة أربیـل، دارولحورریـە لیلتیباعـە، بەغداد ١٩٨٨، (ویَنەی لاپەڕەی ییَکـەمی ڕۆژنامەکـە و کورتـە باسـیَکی و باسۆچـکەییَکی ژیـنی ئـەمین ڕوانـدزیی) بڵاوکردووەتـەوە. تەنانـەت ڕوواڵەتەکـەی دەنـویَنیَ گۆیـا(خـۆی داریسـی ڕۆژنامەکەیـە!) و خویَنـدەوار– دوای مـن– ناچـار دەکـات کـە ئـەو بڵاوکراوەیـەی ئـەو (بەسەرچاوەی دووەم) تیَ بگات!

ڕاستییەکەی بڵاوکردنەوەکەی و ویَنەی لاپەڕەی ییَکەمی ڕۆژنامەکە لەسەر داخوازیی نامـەی ١٩٨٦/٤/٣٠ی ئەوە کە لە١٩٨٦/٥/٢٢ دا وەڵامم داوەتەوە. مخابن چۆن ڕاستیی شـاردووەتەوە و وەڵامەکانمی – هیَندی ڕستەیشی سەقەت کردووە – بەهیی خۆی دانـاوە. بۆئـەوەی نووسـەر و لیَ کۆڵەکان تا خویَندەواران لەڕاستیی دڵنیابن، ئەمە بەشیَکی نامە عەرەبییەکەیەتی کـە وەك خۆی دەنیَخِەمە ڕوو: (...لایخفی علیکم بـأنني بصـدد کتـابي الموسـوم " صـحافة أربیـل " ومـن أجل أن یصدر الکتاب مکتملاً وخالیاً من النواقص التأریخیة، علیه أرجو التفضل علی کتابه " ٢

صفحة فولسكاب " عن جريدة " هتاو " لصاحبها أمين زكي "!! " والتي صدرت في أربيل عام ١٩٤٨ وارسالها الينا بالسرعة الممكنة لأضافتها الى الكتاب المذكور، علماً انني سأشير الى المصدر في الكتاب "!! " ولن أنسى جهودكم وتعاونكم معنا. كما وأرجو رفق نسخة استنساخ من الجريدة مع الكتابة. ولكم بالغ التقدير.

أخوكم

نزار جرجيس علی

سكرتير التحرير(مجلة الحكم الذاتي)

{٧٥}. نزار – بەشی کوردیی، گۆڤارێکی حەفتەیی سیاسیی کوردیی و عەرەبییە " نزار – مجلة اسبوعية سياسية جامعة تصدر باللغتين العربية والكردية – صاحبها ورئيس تحريرها: علاءالدين سجادي. مديرها المسؤول محمود السنوي": س١، ژ١، ٣٠ مارت ١٩٤٨____ دوا ژمارە: ٢٢، ١٥ مارت ١٩٤٣ / چاپخانەی مەعاریف بەغداد.

{٧٦}. گەلاوێژ، گۆڤارێکی ئەدەبیی سەقافیی مانگیی کوردییە، خاوەن ئیمتیاز و مودیری مەسئوول ئیبراهیم ئەحمەدی مەحامیی (بێ نێوهێنان مامۆستا عەلائەددین سەجادیی سەرنووسەری بووە!): س١، ژ١، ١٢ کانوونی یێکەم ١٩٣٩ – دوا ژمارە: لە ئابی ١٩٤٩/ چاپخانەی نەجاح، بەغداد.

بنۆڕە: هەولێر – س١، ژ٧،٨، ١٠ ی ڕێکەوتی کانوونی دووەمی ١٩٥١.

## فەرهەنگۆك*

خودای فریادڕەس: خوای کار ساز و بەخشندە

پێغەمبەری خەڵعەت پۆش: مەبەست محەممەد پێغەمبەرە (د)

مەزرەعەی ڕۆحی خاتەم: مەزاری محەممەد پێغەمبەرە (د)

وەهەم: بەیێکەوە

جە: لە

نیك: چاکە

مەئال و نیکال: نیاز و زەبر و زەنگ

سەلاح: چاکیی

لەزستان شەبێ لە پیران تەبێ: واتە زستان شەوێکی بمێنێ هەر زەبری خۆی دەنوێنێ و یش بەرگەی هەناسەیێ ناگرێ.

ببیە: ببیستە

بەزەویی: بەزەیی

پیری تەرقەت: شێخی، ڕابەری تەریقەت، ڕێباز نوێن.

مەنزڵ: مەبەست ئاواتە

ناس: خەڵك

بێ پیر: بێ ڕابەر

تناکحو: ژن خواستن. ژن هێنان

لاڕەهبانییە فیلئیسلام/لا رهبانية في

الأسلام: لە ئیسلامدا ڕەبەنیی نییەز

موسەننا: دووان

سەلاس: سیان

روباع : چواران

تەتە: وشەی سەرزاری ساوا کە بە مانای (جوانیی) ئەو شتەیە.

رایبحە: بۆن، بەرامەت.

مەسەڕرە: خۆشیی.

پەردەی زەربەفت: پەردەییٚکە کە تاڵی زێڕینی تیٚ هەڵکێشرابیٚ.

کۆڵان گەڕیی: گەڕۆك بە کۆڵاناندا.

گەنم گرد: خێرا خێرا

سەفالەت: پیسیی

قوبووڵی ماڵان: خوانی ماڵان. زیافەتی ماڵان.

نامی من: نێوی من.

کامی دیگەران: کامی– خۆشیی کەسێکی دی.

های هیتلەر: سڵاوی هیتلەرانە. (نووسەر هێندە پەخشان زان بووە ئەم زاراوەیەی بۆ دوو واتە هێناوەتەوە: کوڕەکەی وەك هیتلەر نییە و دەگیرێت. گرتنیشی دڵ دادەخورپێنیٚ کە لەسەر خۆنیشاندانە. های هیتلەریش وەکو سڵاو!).

بەردەرکی سەرا: مەبەست سەرای سلێمانییە و رووداوی ٦ ی ئەیلوولی ١٩٣٠ی خوێناویی بەردەرکی سەرایە!

تۆقە: دەست گوشین. دەست خستنە نێو دەستی یێکدیی.

ئەحوەل: خێڵ

تەفریقە: جوێیی.

نەزەر: تەماشا.

تەقوییە: بەهێز.

سەبەب: هۆ.

عاریف: دانا. زانا

وەحدەت: تەنیایی.

قسە: ئاخاوتن. گفتار.

ئەدەب ئەکا: شەرم ئەکا.

ئەزەل: هەر هەبووە و هەیشە. ئەوی سەرەتا دوایی نییە.

حەز: ئارەزوو.

قابیل : شایستە.

قیسمەت: دابەش.

ئیقتیزا: پێویستیی.

عەمەل: کردەوە.

تەڵەب: داخواز.

داری ئیراك: جۆرە دارێکی بۆن خۆشە و لە تەلاشی داتاشین. " سیواك– فرچەی ددان" ی لێ دروست دەکرێ و لەکاتی دەستنوێژ هەلگرتندا دەم و ددانی پێ خاوێن دەکرێتەوە.

داری هیند: داری بوخوور.

عوود: دار.

ئیسم: نێو.

هەمدەم: هاودوم. هاوسەر. هاورێ.

سوننەت: فەرماییشت و ئەتواری محەممەد پێغەمبەر (د).

مەیل: داکشان.

ئەبوولەهەب: نێوێکی ئاگرە. ئیمایە بۆ ئەبوولەهەبی مامی محەممەد پێغەمبەر.

سەهم : تیر. (لێرەدا بەمانی بەش).

نەسیب: بەش.

ئەسڵ : ریشە. بنەچە.

خەرج : بەش.

موودەنە: مۆدەنە. دارجگەرە.

لەب: لێو.

لۆمە: گلەیی.

غافل: بێ ئاگە. بێ هۆش.

تووتیی: باڵندەیێکی ئێسکسووکی زمانزانی لاسایی کەرەوەیە.

حیرس: لەکوردییدا بەواتای چاوچنۆکیی و رژدیی.

بەندی قەفەز: گیرۆدەی قەفەز.

تەغەنییە: گۆرانیی گوتن.

تەرەب: ئاهەنگ.

حەریف: هاوتا.

ئەلف: تیپی ئەلیف.

ئەلیف: ماڵیی. دەستەمۆ.

ڕەدیف: هاوشان. بەرامبەر.

هەرزەنویس: نووسەرێکی هەرزەکار.

گەپ: گاڵتە. گەمە.

هام چەشمی: هاوچەشنی. بەهەمان چاوەوە.

* ئەو شیعرانەی کە لەشێوەیێکەوە هێنراونەتە سەر شێوەیێکی دی بەر ئەو فەرهەنگۆکە نەکەوتوون و ئەوی پیَویستیشە بەرکەوتووە !

**تێبینیی**

١. وێنەکانی ئەمین ڕواندزیی لە هێویی کیژیەوە.

٢. وێنەی ڕۆژنامەکە لە کتێبخانەی محەممەد خاڵەوە.

٣. وەرگرتن و وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی وێنەکان و نووسراوەکان و ڕۆژنامەکە، بەبیَ پرسی خۆم یا نەوەم بۆ کەس نییە !

# ١٦

## هونەری درامای ڕادیۆی کوردیی

### پێشەکیی

هونەرە جوانەکانی سەدەی بیستەم کە بەشێکیان پێوەندیی بە زانستیَ پیشەوە– تەکنەلۆژیا– هەیە، لە خۆرئاواوە درەنگ و زوو پێمانگەییشتوون. ئەوجا یان سست، یان گەرم و گوڕ پێشوازیمان کردوون، لەگەڵیان خرۆشاوین، کەڵکمان لێ وەرگرتوون!

یێکیَ لەنێو ئەو هونەرانەدا –دەتوانم بڵێم زوو– کە وەرمانگرتووە، هونەری درامای ڕادیۆییە کە تا ئەم هەلە لەسەرانسەری دنیادا هەر کاریگەرە.

دەی کەی و چۆن و چەند تێکەڵیمان هەبووە؟ ئەڵقەکانی مێژوویشی، شێوەی یادگارە ئەدەبییەکانی ئەم هونەرە، توانای پێشڕەو و یێکەمەکان لە چ چێوەیێکدا دەنوێنن؟

من خۆم وێڕای ئەوەی –درەنگانیَ لە شەستەکاندا– تێکەڵ و پەرۆشی بووم، دەتوانم بڵێم لە ئەو تێکەڵییە پتر خولیای ناسینەوەی بنچینەی مێژووی ئەم هونەرە بووم. سوپاسی هەرە جوانم بۆ خوای باڵادەست کە هەناسەمی درێژکردەوە و فریای ئەم بابەتەی خستم و یادگارە بەنرخەکانی ئەم هونەرەم– تاڕادەیێکی چاك – پیَ کۆکرایەوە. هەروەها پێشڕەو و یێکەمەکانیشم ناسینەوە، هیوام زۆرە کەلێنێکی مێژووی هونەرمانم گرتبیَ!

## بەشی یێکەم

### ١. سەرنجێکی خێرا لە هەڵکەوتنی ڕادیۆی کوردیی.

زانای ئیتالیایی، مارکۆنی MARCONI (١٨٧٤–١٩٣٧ز) کە دەزگەی بێتەلی داهینا، کردەوەییێکی مەزن و دەروازەییێکی بێهاوتای کردەوە بۆ دروست بوونی پێوەندیی و لەییێکحاڵی بوونی خەڵکانی وڵاتان. هەر ئەمیش بوو بەهۆی هەڵکەوتنی دەزگەی گرنگ و ناسراو بە ڕادیۆ، RADIO.

ئەم باسە مەزنە– هێندەی لەلای من لێ وردبوونەوەی پێویست بێ لەنێوان ساڵانی (١٩٢٧–١٩٤٠ز) دا گرنگترین قۆناخی بەخۆیەوە دیتووە کە (قۆناخی پێ گەییشتن)ەو لە ئەم هەل و هەڵکەوتەشدا هەر نزیکەی" ٢٥ " وڵاتێ خاوەندی ڕادیۆ بوون و مەملەکەتی عێراقیش یێکێ بوو لەنێودا کە لە حوزەیرانی ١٩٣٦ دا بەنێوی (وێستگە/ ئیستگەی بێتەلی عێراق " دار الاذاعة اللاسلكية العراقية)ەوە دامەزراو دەستی بە بڵاوکردنەوەی بەرنامەکانی کرد. ئێمەی کورد – لە ئەو قۆناخە ناسکەدا – بەهۆی ئەو ویستگەیەوە{١} کە بەرنامەکانی عەرەبیی زمان بوون، لە ڕۆژی یێکشەممە، ١٩ ی تەشرینی دووەمی ١٩٣٩ دا{٢}، ڕووداوێکی گەورە و گرنگی مێژوویمان لێقەوما کە لە ڕاییڵەی بەرنامەکانی ڕادیۆی باس کراودا و لەنێوان ١٠–١٥دەقیقەی ڕۆژانەدا، (بەرنامەی کوردیی زمان) بۆ دەنگ و باسەکانی گێتیی و نێوخۆ و گۆرانییەك بڵاودەکرایەوە.

بە ئەو ڕۆشنایییە، ئەم ڕووداوە دەناسرێت بە ڕووداوی ڕۆژی دامەزراندنی (یێکەم ڕادیۆی کوردیی) لە گێتییدا{٣}.

گرنگیی ئەم ڕووداوە – بێگومان قەومانی دووەم جەنگی گێتیی مەلامەتێکی بەهێزە بۆ هەڵکەوتنی– لەئەوەدایە کە تا ئەو هەلە چ دەزگەییێکی پێوەندیی و ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریی ڕەسمییانەی دەوڵەتی عێراقی عەرەب لە چاکەی جەماوەری گەلی کورددا لەئارادا نەبوو.. ئەویی خایە و مایە بوو، ڕۆژنامەکانی خۆ بوون، بەتەنێ ڕۆژنامەی (ژین)

ی سەربەست و (زبان) ی حەوتۆیی– نارێك لەدەرچووندا– کە بەلەدییەی سلێمانیی دەریدەکرد و گۆڤاری مانگانەی (گەلاوێژ) ی بەغدادیی بوون. ئەمانەش پتر دەکەوتنە بەردەستی چینی خوێندەوار و ڕۆشنبیر و سنووری بڵاوبوونەوەیان هەموو شوێنێکی نیشتیمانی گەورەمانی نەدەگرتەوە.. بەڵێ ئەوانە بابەتەکانی هەواڵەکانی نێوخۆ و هەندەران و شێوەکانی ئەدەبییات و کۆمەلایتییان ئاشنا کردووە، بەلام ڕۆژ بە ڕۆژ دەرگەی قەوماوەکانی گێتییان لە (بیری گوێگری کورد) نەدەکردەوە. بە ئەم پێیە هەڵکەوتنی ڕادیۆی کوردیی – لە ئەو ڕادیۆیە – برووسکەیێکی نوێ و بەهێز بوو کە بەر هۆش و بیری کوردان کەوت و لەبریی سووتاندن ژیر و هۆشیارتری کردن.

وێستگەی بێتەلی عێراق – ڕادیۆ – لەسەرەتادا سەر بە وەزارەتی ئاموشۆ و بەچاودێری وەزارەتی نێوخۆ بووە، بەلام دوواتر، بەتایبەتیی لە دووەم جەنگی گێتییەوە خراوەتە سەر دەزگەی گشتیی پروپاگەندەی سەر بە وەزارەتی نێوخۆ کە بێگومان ڕاوێژکاری وەزارەتەکە مێجەر ئێدمۆندز **EDMONDIZ** ی کوردیزان سەرپەرشتی بەشە کوردییەکە، بگرە– لە ڕۆژگاری ئەو جەنگەدا و لەدوورەوە – ڕەنگبێ سەرپەرشتیی بەشە عەرەبییەکەیشی کردبێ.

دووای کوژاندنەوەی ئاگری ئەو جەنگە لە ساڵی ١٩٤٥ دا، لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٦ بەدوواوە[٤]، باری بەرنامەکانی کوردیی ڕووی لە پێشکەوتن کردووە و شەپۆلی بڵاوکرنەوە و ماوەی تایبەتی بۆ داندراوە و کارگێڕیشی – وەك ماوەکەی – پتر بووە و دەرگەیش بۆ گۆرانیبێژەکان کراوەتەوە، تەنانەت وەك گۆڤاری عەرەبیی (هونا بەغداد – هنا بغداد/ ئێرە بەغدادە)[٥] لەبەردەستمە، بەرنامە کوردییەکە بووە بە (بەشی کوردیی) سەربەخۆ، ئەگەرچیی هەر ڕێبەری گشتیی ڕادیۆ و دەزگەی باس کراوی وەزارەتی نێوخۆ سەرپەرشتی بوون!

وردبوونەوە لە گۆڕینەکان و مەودا جۆربەجۆرەکانی و ژمارە و توانای شەپۆلەکانی و ماوەکانی بڵاوکردنەوە و هەڵکەوتنی بەرنامەی بەیانیان و سنووری بڵاوکردنەوە و ژمارەی ڕۆشنبیرانی بەشدار و تێکەڵییان و هتد... ئەمانە هەموو بۆ ئێرە زۆرن و کتێب هەڵدەگرن، بۆیێکا لە ئەوانە وردنابمەوە و بۆ ئێرە هەر هێندە پێویستە کورت بدوێم و بڵێم تا ١٩٥٨/٧/١٤ (بەشی کوردیی ڕادیۆی بەغداد) هەموو جۆرە بەرنامە و گۆشە و ئاهەنگ و هەواڵ و لێدووان و گوتار و هونەری ڕۆژنامەنووسیی هەوایی بەخۆوە دیتووە. تەنانەت لەنێوان ساڵەکانی١٩٤٨—١٩٤٩شدا کردەوەی (درامایی) و بەتایبەتی لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٠ دا (تیپی تایبەتی تەمسیل — دراما) ی کوردیی لە ئەم ڕادیۆیەدا — نەك لە دەرەوەیدا — بەکرێی هەفتانە دروست بووە و لە ئەوەش پتر بەهۆیەوە، گوێگری کورد بەڕاستیی پێشکەوتنی هاتووەتە ڕێگە و ڕەنگی ڕووناکیی بەسەر هۆش و بیری جەماوەریشدا ڕژاوە!

### ٢. تاریفی دراما — نمایش، تەمسیل — ی ڕادیۆیی

درامای ڕادیۆیی هونەرێکی جوانی ئەدەب و نمایشە و بابەتێکی ڕەوان و کورتی نمایشخواز، ڕووداو و بەسەرهاتێ، (ئەدەبیی، کۆمەڵیی، سیاسیی، مێژوویی) بەسەر دەکاتەوە و لەدەوروخولی دەگەڕێ.. سا یان لە چەند دەقەقەییێکدا، یان بەچەند ڕست و لەچەند سەعاتێکدا خۆی دەنوێنێت و پێوەندیی خۆوڕاستان لەگەڵ گوێگری نێو جەماوەر دروست دەکات کە مەبەستی گەورەیشی خولقاندنی ژیریی هۆشە و خۆش کردنی ئارەزووە.

دراما — تەمسیل—ی ڕادیۆیی لە هونەری داستان و ڕۆمان، بەکورتیی و بەنمایشێکی نادیار خۆی جوێ کردووەتەوە و پتر پێوەندیی لەگەڵ شانۆ بەهێزترە کە خۆی ئەسڵەن لەسەر (شانۆی ڕادیۆ) ی نادیار دەنوێنێت.. دەشێت داستان و ڕۆمانیش بخرێنە سەر

ڕێگەیی و لەگەڵ پەیڕەو کردنی مەرجەکانی ئەم، ئەوانیش لە جەماوەر نزیك بخرێنەوە.
هونەری دراما– تەمسیل– ی ڕادیۆیی لە ئەم ڕەگەزە بنچینەییانە پێك دێت:

١. چیرۆك.
٢. نمایش و دەربڕین و مۆسیقا و فێڵی هونەریی!
٣. ئاکتەر و دەرهێنەر!
٤. ڕادیۆ و بڵاوکردنەوە!
٥. جەماوەر و بیستن!

## ٣. بنچینەی درامای ڕادیۆیی کوردیی

گوێگر چ خوێندەوار کە باسی درامای کوردیی ڕادیۆیی دێتە بەر گوێ و چاو، بێگومان بەهەستێکی ساکارەوە یان ژیرەوە، پرسیارێکی گرنگی بەبیردا دێت کە ئەوەیە: (درامای ڕادیۆیی لەنێو کورددا چۆن هەڵکەوتووە؟).

ڕاستییەکەی ئەگەر–هەموومان– لەئەدەبی کوردیی و ڕۆژنامە بڵاوکراوەکانمان وردببینەوە، ئەوە بەر لە هەر شتێ لێمان ڕوونە کە وشەکانی (تیاترۆ، پیەس، کۆمیك – قۆمیك، هەزەلییات، تەمسیل، تەمسیلی گەمە و هتد..) ئەمانە پتر وشەی فەرەنگیی و بێگانەن و هاتوونەتە بەرچاو و زمان و ئەدەبییات و ڕۆژنامەکانەوە.. بۆ وێنەی ڕاستیی، ئەوەتە یێکەم وێنەی درامای کوردیی کە سەرچاوەی بڵاوکردنەوەیشی (ڕۆژنامەی کوردییە!)، ئەو درامایەی نووسەری کورمانجیی (باکوور ع.ڕەحمییە) کە لە گۆڤاری (ژین– س ١٩١٨) دا[٦] بە ئەم شێوەیە ئاشنای کردووە، (مەمی ئالان– تیاترۆی کوردان، دوو پەردە پیەس) کە وشەی "تیاترۆ"ی لەبریی شانۆو "پیەس"ی لەبریی شانۆنامە– دراما بەکاربردووە!

ئەگەر پتر وردببینەوە، دەبینین ڕۆژنامەی (ژیان – س١٩٢٦)[٧] لەمەڕ یادگارەکانی شەکسپیرSHKESPEAREی درامانووسیی بەنێوبانگی گێتیی و دامەزراندنی شانۆ بۆ

نمـاییش کـردن، هــەواڵێکی بڵاوکردووەتــەوە و وشــەی "تیـاترۆ"ی لــەبریی "شــانۆ" بەکاربردووە.

لــەلاییێکی دیــەوە حســێن حــوزنی موکریــانیی ڕۆژنامــەوان لــە گۆڤــاری (زاری کرمانجیی)دا[٨] وشەی (تەمسیلی گەمـە) ی بـەکاربردووە. هـەروەها لـە هـەواڵێکی دی ڕۆژنامەی (ژیان) ی سلێمانییدا و لەمەڕ نواندنی نمایيشیّ لە دەشتی " ئەحمەدی ئاغا"و لەسلێمانیی ١٩٢٧ دا، وشەی (یاریی و قۆمیك — کۆمیك، موزەحیك) ی لەبریی نماییشـی گاڵتەجاڕی بـەکاربردووە.[٩] هـەروەها ئـەو ڕۆژنامەیـەی سـلێمانیی (فـەننی تەمسـیل) و (فیرقەی تەمسیل) و (تەمسیلییە) ی لە بڵاوکرنەوەی هـەواڵێکی ئەفگانسـتاندا و خـەریك بوونی بە هونەری نماییشەوە، بڵاوکردووەتەوە[١٠]. دیسان هەمان ڕۆژنامە، لە هەواڵێکدا لەمەڕ هونەرمەند شارلی شاپلن، وشەی (فەننی تەمسیل) و (هەزەلییات) ی بەکاربردووە و بڵاوکردووەتەوە.[١١]

کەواتە وشەکان تا هونەرەکە لە زمـان و هونـەر و ڕۆشـنبیریی بێگانـەوە، بەتایبـەتی بەهۆی کوردە ڕۆشنبیرەکانی تێکەڵی سـەردەمی عوسمـانیی پێمانگەییشـتوون و هێـدی هێدی سیوامان بووەتەوە!

ڕاستییەکەیشی بەرهەمەکەی ع. ڕەحمی، وەك یێکەم درامای نماییش کـراو و گەڵاڵـە کراوی قوتابخانەی سەرەتایی سلێمانییە کە شەوی سێشەممە ١٩٢٦/٧/٢٤ لە سلێمانییدا بـەنێوی (نەتیجـەی سـەفاهەت و سـەعی) یـەوە پێشـکەش کـراوە.[١٢] هـەر ئەمانـەش چاکترین بەڵگـەن کـە بـە چـاو لێکردنـی عوسمانییـەکانو عەرەبـەکانی بەغـداد — وەکـو پێشرەوی نماییشگێڕان فوئاد ڕەشید بەکر بۆ منی گێڕایەوە— بەڕاستیی ئەو پێوەندییـە دروست بووە!

ئێمە ئەگەر لەمێژووی ناتەواو نووسراوی هونەری شانۆ و ئـەدەبی نمایيشی کـوردیی وردببینەوە و لەلایێکی دیشەوە لە هەڵکەوتنی درامای ڕادیـۆیی بکۆڵینـەوە، پرسـیارێکی گەورەمان لێ ڕاست دەبێتەوە، درامای ڕادیۆیی کوردیی لەسەر چ بنچینەیێ هەڵساوە؟

بەبڕوای من– وەکو باوەڕم بەهێزە– هونەری درامای ڕادیۆیی بەری هونـەری شـانۆی ڕۆژنامە و شانۆی قوتابخانەیە کە ئەمانە و شانۆی ڕادیۆییش بنچینەی بزاڤی شـانۆنمایی هاوچەرخی کوردن! ڕەنگە هێندێ کەس لەڕستەی (شانۆی ڕۆژنامە) سڵ بکاتەوە و بڵێت کە ع. ڕەحمی درامەکـەی بـۆ هونـەری نمایيشـی شـانۆ نووسـیوە– خۆیشـی دەرچـووی هونەرە جوانەکانی ئەستانبووڵ بووە — و ئیدی ئەم نێو لێنانە چییە؟

من وەك هەموو نووسراوێکی ئەوتۆ– بەهونەری پەخشان– دەخەمە بۆتەی ئەدەبەوە و نکوولّی لە هونەر و بزاڤی شانۆش ناکەم، دەڵێم کە کورد لە سەردەمی نووسـینەکەدا و بەتايبەتی لە (کوردستانی باشوور) دا تا ساڵی ١٩٢٦ز هونەری درامای شانۆی نەدیتووە و تاقـە سەرچـاوەيێکی خوێندنـەوە و تێگەییشـتنی درامـای کـوردیی– بـە یادگارەکـەی ع.ڕەحمیشەوە– هەر (ڕۆژنامە) بووە!

ڕۆژنامەش چییە؟ ئایا هەر کاغەز و مەرەکەبە؟ یان نووسەر و هۆش و بیر، کرێکـار و چـاپخانە و هـەڵس و کـەوتی هونەرانەیـە..هتـد کـە بەشـێوەيێکی تـەواو پـاك، ڕووداو بەسـەرهات و هـەر بابـەتێکی ئـەقڵ و سـۆز دەخاتـە بەرچـاوی خوێنـدەوار و لەگـەڵ خوێندنەوەی کاری تێ دەکات کە هەست بە (بینین) ی وێنە و (بیسـتن) ی قسـە بکـات، تەنانەت خۆیشی– بەئەندامێ– تێدا ببینێتەوە؟

خوێندەواری (ڕیپۆرتاژ) ێكەو وتو وێژەی نێوان کەسێکی ڕیپۆرتاژەکە و ڕۆژنامەوانێ، ئایا کارێ لە ئەو کەسە ناکات تا هەست بکات لەسەر (شانۆییێ) دەژییێ؟ لەئـەوەش پـتر ئایا هەست ناکـات کـە خۆیشـی نوێنـەرە– نمایيشـگێڕ– ئاکتـەرە؟ دەی ئەگـەر بابـەتێ بەشـێوەيێکی هونەرانـەو ئەدەبییانـە هاتـە سـەر ڕۆژنامـە وەك (مـەمی ئـالان)، یـان

(موحاوەرەییێکی ئیقتیسادیی)[١٣] ئەحمەد حەمدی- ئەحمەدی عەزیز ئاغا و هاوتای لە ڕۆژنامەنووسییدا، ئایا وێنەیێ نین کە خوێندەوار وا لێ بکەن هەست بکات چیرۆکێکی نماییشی لە ڕۆژنامەدا دەبینێت و نووسەر و خۆی -خوێندەوارەکە- بەتایبەتی خۆی دەوری نواندن دەگیرێت، تەنانەت ڕایی- ئیخراجیش دەکات؟ بەچیی؟ بەخوێندنەوەی بابەتە(نووسراو)ەکە بەچاوی هۆش و ئەقڵەوە!

ڕوونیشە، نووسین هۆییێکە- هەروەك دەنگی ئاکتەری ڕادیۆ- بۆ ڕاگەیاندن. ئەو چیرۆکەش کە لەسەر ڕۆژنامە یان لەسەر ڕادیۆدا دەبینرێت، دەبیسترێت، هەردووکیان لەسەر یێك بنچینە ڕاگیرن کە (مەرجی نادیاریی) ە.. نادیاریی شانۆ و ئاکتەرەکان. هەر بۆییێکا چ خوێندەوار، چ گوێگر بەچاوێکی دیەوە دەبینن کە پێچەوانەی چاوی تەماشاکەری شانۆ و تەلەفزیۆن و سینەمایە!

بە ئەم پێیە، هونەری درامای سەر شانۆی ڕۆژنامە - بێ لە پەسنە ئاساییەکانی- چەشنی هونەری درامای شانۆی ڕادیۆیە!

---

## بەشی دووەم

### ١. ڕادیۆی کوردیی و هەڵکەوتنی پێوەندیی هونەرانە

یێکەم ڕدیۆی کوردیی– دوور لە کوردستانەوە– لەنێوجەرگەی بەغدادی پێتەختدا ڕوواو بەرەبەرە نەش‌ونماو گەشەی کرد و گوێگرەکان، ڕۆشنبیرەکان، هونەرپەروەرەکان لێی نزیك و کۆبوونەوە! هەڵبەت چۆن بەرە بەرە گۆرانیبێژەکان – لەکوردستانەوە– لێی نزیك بوونەوە و ماندوویی و ئەرکێکی زۆریان بۆ پێوەندیی کردن چێژت و کێشا، هەر بەهەمان شێوەش ڕۆشنبیرەکانی بەغداد و دەرەوەی بەغدادی لێ نزیك بووەتەوە. من وەك لێم ڕوونە کە لەبەر تەنگانەی گووزەران و کێشەکانی ئاوەدانیی، بەتایبەتی بێ کارەبایی لەزۆربەی باژێڕۆچکە و گوندەکانی کوردستاندا– هەتا بازێڕە گەورەکانیش– تا درەنگ، دەشتوانم بڵێم تا دەمەو کۆتایی پەنجاکان، هەموو ماڵە کوردێ کارەبای پێ نەگەییشت بوو. هەروەها ئامێری ڕادیۆش – وەك ئەمڕۆ– بەدەست هەموو کەسێکەوە نەبوو! لەلاییێکی دیەوە بزاڤی هونەری شانۆنمایی کوردیی پتر پشتی بەست بوو بە شانۆی قوتابخانە کە گشت بزاڤەکە تا نێوەندی پەنجاکانیش سست و لاواز و کەم یان بێ بەرهەم بووە و هەرگیز تیمێکی تایبەتیی نماییشی کردن نەبووە. کەواتە باری هەڵکەوتنی دراما و شانۆی ڕادیۆش تەسك و تەنگ بووە.

دەتوانم بڵێم لەبەختی کورددا بەغداد جێگەی کۆبوونەوەی خوێندکارە کوردەکان بوو... چ شاگردەکانی کۆلیجەکان چ شاگردەکانی فێرگەی مامۆستایان و کوردە ڕۆشنبیرەکانی دی بەغداد کە بوو بوونە سەرمایەییێکی گەورە بۆ نەش و نما و پێشکەوتنی ئەو ڕادیۆیە. بەپێچەوانەشەوە خەڵکانی دی – وەك گۆرانیبێژەکانی کوردستان– لەبەر تەنگانەی دارایی، بەدەگمەن ڕوویان لە بەغداد و ئەو ڕادیۆیە دەکرد و پێوەندییان لەگەڵ دروست دەکرد.

مـن لـە ئێـرەدا دوو وێنـەی پێوەنـدیی هونەرانـەی خـەڵکانی دەرەوە و نێـو بەغـداد دەنوێنم کە بە دوو شێوەی هونەر تێکەڵی بوون:

١/١. تیمـی سەرپەرشتانی قوتابخانـە– مورشـیدات مەدرسـە– ی سـدیقەی کیـژانی سلێمانیی لە ئاهەنگی نموونەیی زانستدا، لەساڵی ١٩٥٤ دا هاتووەتـە بەغداد و، لەسـەر قـەوانی تـیرە ١٦و جـۆری (یۆنایتـد ئـاژانس)ی ڕادیـۆیی، بەشـێوەزاری سـۆرانی ئـەم سروودانەیان تۆمار کردووە:

١/١/١. سروودی: تا دەست لەمل هیوا نەکەم!

٢/١/١. سروودی: وەتەنی من کوردستانە!

(ڕستی ٤٣ لەسەر٣)[١٤]

٢/١. قوتابیـانی سـلێمانیی– لەسـەر قـەوانی تـیرە ١٦ ی جـۆری یۆنایتـد ئاژانسـی ڕادیۆیی– بەشێوەزاری سۆرانیی ئەم سروودانەیان بۆ ڕادیۆ گوتووە و تۆمار کردووە:

١/٢/١. سروودی: ئێمە نەتەوەی مەردین!

٢/٢/١. شاخی ڕەنگا و ڕەنگی گۆیژە!

(ڕستی ٤٤٥ لەسەر ١٦)[١٥]

١/٢. تیمـی فێرگـەی هونەرەجوانـەکان– مەعهـەدی فونـوونی جەمیلـەی بەغـداد– بەشێوەزاری سۆرانیی و لەسەر (سیموایەر) کردەوەییێکی نواندووە:[١٦]

١/١/٢. تەمسیلییە!!(نمایش/بێ نێونیشان و دیاری کردنی مێژوویی و ماوەکەی!!).

(ڕستی ١٩)[١٧]

کەواتە ئەم دوو شێوە بەڵگەیە بۆ ئێرە بەسە کە قسە و باسمان لەمەڕ شێوەی پێوەندیی بە ڕادیۆوە بسەلمێنن! بەڵام ئایا ئەم بارە تاسەر درێژەی کێشاوە و بەرەو پێشەوە نەچووە؟

ووردبوونەوە لە نووسراوی بڵاوکراوە و بەڵگەنامەی ڕەسمیی و پرس کردن بە کەسانێکی بەشداری بزاڤی شانۆی ڕادیۆ، دەیسەلمێنن لە قوتابیانی هونەرە جوانەکانەوە فێرگەی مامۆستایان و کۆلێجەکانەوە تا دروست بوونی (تیمێکی تایبەتی نمایشی ڕادیۆیی)، چەند تیمیێ بۆ ئەم هونەرە هەڵکەوتووە و تیێکۆشاوە و چەسپاندوویە. بەشێوەییێکی تایبەتیش (تیمە تایبەتەکەی ڕادیۆ) خۆی کارامەتر و خاوەند یادگاری کۆمەڵێ درامای ڕادیۆییە کە لە ئێرەدا نێوی خۆیان و نووسەر و وەرگێڕو مێژوویان ئاشنا دەکرێن.

بەکورتیش — وەك چەند ساڵێ لە بزاڤی تیمەکان وردبوومەتەوە— بۆم دەرکەوتووە کە لە نێوان ساڵانی ١٩٤٨ — ١٩٥٥ دا (سێ) تیمی نمایشی ڕادیۆیی بنچینە و هەڵکەوتوون کە ئەمەن:

١. **تیمی ساڵح یەحیا** (قوتابیانی فێرگەی مامۆستایانی بەغداد)

٢. **تیمی شەماڵ سایب** (قوتابیانی کۆلێجەکانی بەغداد)

٣. **تیمی ڕەفیق چالاك** (تیمی تایبەتی ڕادیۆی کوردیی!).

## ٣. تیمەکان/دەستەکان

### ٣/١: تیمی ساڵح یەحیا

لە ١٨/٥/١٩٧٩ دا— لە ماڵی خۆم و لە سلێمانییدا— بەدیمانەی نێوبراو و هاوەڵێکی ئەندامی ئەو تیمە کۆنە گەییشتم و گفتوگۆم لێوەرگرتن و تۆمارم کرد.

کۆچکردوو ساڵح یەحیا سەردەستە— ڕێبەر— ی تیمەکە لە باس کردندا گوتی: (لە مانگی تەشرینی یێکەمی١٩٤٧ دا، من و چەند قوتابییەکی کورد لە فێرگەی مامۆستایانی بەغدادا— دارولموعەللمین، بەغداد— گەییشتینە ئەو ڕادیۆیە بۆ پێشکەش کردنی چیرۆکی تەمسیلیی هەفتانە، چ کۆمەڵاییێتی چ گاڵتەجاڕیی! هەتا دەوروبەری

مانگی نیسانی۱۹٥۰ نزیکەی "٤۰" تەمسیلمان پێشکەش کرد کە هەریێکە "۲" دینـاری پاداشت بوو![18]

کۆچکردوو حسێن جەلال، ئەندامی جارانی تیمەکە گوتی: (لە سەرەتادا ئێمە بەنێوی گێڕانەوەی سروودی کوردییەوە چووینە سەر ڕادیۆ و لەشیعری شاعیرانی وەك زێوەر و بێکەس و هتد.. سروودمان دەخوێندەوە!)

هەردووکیان– بەبیرەوەریی ساتی گفتوگۆکەوە– گێرایانەوە گۆیا بەرهەمەکانیان بەر تۆمارکردن نەدەکەوتن و گۆیا لەکاتی نمایشی دراماکەدا لە ستۆدیۆدا ئەوها دراماکـەیان پێشکەش کردووە، (گوێگرە بەڕێزەکان، سالح زەنگەنـە و قوتابیـانی دارولموعـەللیمینی ڕیفیی لەبەغدادا، ئەم تەمسیلە پێشکەش دەکەن.. یێکیان دارێکی لە ئامیر –سەنج–ی مۆسـیقا دەدا و بـەینیان دەخسـتە وتـو وێرەیانـەوە. ئـەوجا ئـەم و ئـەو لەهاوەڵەکـەی دەنۆڕیی بۆ گێڕانەوەی دەورە نووسـراوەکەی خـۆی.. تەنانـەت خۆیـان لاسـایی هێنـدێ دەنگە دەنگیان کردووەتەوە!!).[19]

وەك خۆیشیان گێڕایانەوە، هاوەڵەکانیان– ئەندامەکانی تیمەکەیان ئەمەبوون:

١. سالح یەحیا: (سەرپەرشت و ڕێبەری تیمەکە).
٢. حسێن جەلال (ئەندام).
٣. عەبدوول محەممەد قادر (ئەندام).[20]
٤. محەمەد سەعید بێبەش (ئەندام).
٥. موعرووف حسێن بەرزنجیی (ئەندام).
٦. عەبدولوەهاب ئیسماعیل!! (ئەندام).
٧. عەبد محەممەد فەهمی!! (ئەندام). ناوبەناو.
٨. بەدرەدین!!! (ئەندام). ناوبەناو.

**وێنەی دراما پێشکەش کراوەکانی:** [٢١]

١.شاییەکەی شارەزوور.

٢ قۆپییە.

٣. ئەلە ورگە و دکتۆر.

٤. حوجرە و قوتابخانە.

٥. لە مەیخانەدا.

٦. دڵداریی و پەیمانپەروەریی. (ئە.بێ.هەوری)

٧. پیسکەی تەرپیر. (مۆلێر)

جێگـەی باسـە ڕەفیـق چـالاك لـە یاداشـتنامەی خۆیـدا نووسـیویێتی، (سـاڵی ١٩٥٠ لەبەندیی بەرەڵا کرام.. هەموو هەفتەیێك تەمسیلیی نیوسەعاتیم ئامادەکرد– گۆڕاو یـان داندراو– ئەمدا بە ئیستگە بەرامبەر ٣ دینار.. لەوکاتەدا تیمێکی تەمسیلیی لە ئیستگەی کوردییدا دامەزرا بوو لەلایێن "ساڵح یەحیا"وە.. ئەو چیرۆکانە بۆ ئەو بوون!).

**٢/٣: تیمی شەماڵ سایبب**

لەچەند دیدەنییدا باسی ڕابردووم لەگـەڵ کـۆچ کـردوو شـەماڵ سـاییب کـردووە و لـە کردەوەیانم پرسیوەتەوە و هەر هێندەی دەگوت گۆیا (شتی وا!!) تەمسیلیان کـردووە. تەنانەت لە١٦/٦/١٩٨٣ دا ئەوەیشی هاتەوە یاد کـە سـاڵانی ١٩٤٨–١٩٤٩ لـە تەمسـیل کردندا (نازدار و ئەسمەر فەرهاد)ی هەردوو جووتە خوشکی گۆرانییبێژی ڕادیۆ بەشدار و هاوکاریان بوون!

ڕاستییەکەی ئەو چەند وشانە زۆر تروسکاییان نەدەدا بە هەسـت و مەبەسـتم بۆیێکـا لـە دیمانـەیێکی ١٢/١/ ١٩٨٣ دا و لـە ڕاییڵـەی گفتوگـۆییێکی سـەرزاریدا لەگـەڵ در. عیززەددین مستەفا ڕەسووڵ باسـی ڕەوانـترم دەسـتگیر کـرد کـە گـوتی: (لەدەمـەدەمی

دوایی هاتنی ساڵی ١٩٤٨ دا و هاتنی ساڵی ١٩٤٩- تەشرینی یێکەم بۆ کانوونی دووەمی ١٩٤٩- ئێمە یێکەم تیمی تەمسیلی ڕادیۆمان دانا کە ئەمانە بووین:

١. شەماڵساییب- میحوەر بوو- ڕێبەری تیم (لە سانەویی ئەعزەمییەدا بوو. تەمسیلەکان زۆری شەماڵ دەینووسین وەك لە یادمدا مابێت " ورگە گا " و " ژیانی قوتابیی " تەمسیلمان بوون.

٢. عیززەددین مستەفا ڕەسووڵ. (قوتابیی کۆلیجی شەریعەت).

٣. جەمال عەبدولقادر بابان. (قوتابیی کۆڵیجی حوقووق).

٤. محەممەد سەعید کانیمارانیی. (قوتابی کۆڵیجی حوقووق).

٥. عەلی مەردان. (گۆرانیبێژ).

٦. نازدار و ئەسمەر فەرهاد. (گۆرانیبێژ).

٧. ڕەئووف کەریم بەگ-ئەلخالیدی (قسەزان).

٨. عەبداللە عەززاوی. (ڕێژەر/موخریج).

هەروەها بەهاریکاریی مۆسیقەی ئەحمەد خەلیل و غانم حەددادی کەمانجەژەن).

در. عیززەددین پتر لەمەڕ بابەتی دراماکان گوتی: (تەمسیلەکان لەڕووی باری تەندروستییو خوێندەوارییەوە، هەروەها بەگشتیی کۆمەڵایێتی بوون. نزیکەی "دە" تەمسیلێکمان پێشکەش کرد و هەرییێکەی "دوو" دینار پاداشتی بوو!).

لەمەڕ چارەنووسی تیمەکەش گوتی، (شەماڵ ساییب گیراو فەسڵ بوو لە خوێندن. تیمەکەش هەڵوەشایەوە. هەر دووای دوو هەفتە ساڵح یەحیا پەیدا بوو. هات بەشوێن منیشدا بەڵام من نەچووم!!)[٢٢].

### ٣/٣. تیمی ڕەفیق چالاک

ڕەفیق چالاك لە یاداشتنامەی نووسراوی خۆیدا دەگێڕێتەوە: لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٥٠دا هەتا ساڵی١٩٥٥ لەڕادیۆی کوردییدا بە-موزیع- قسەزان دامەزراوەو لەگەڵ

چوونە ڕادیۆش (تیمی تەمسیل) ی دامەزراندووە و وەك سەردەستەی بووە. هەروەها — بەلێکدانەوەی چیرۆکی حەوتۆیی لەماوەی پێنج ساڵدا– تیمەکەی نزیکەی (٢٠٠) تەمسیلی پێشکەش کردووە، چ لە نووسینی خۆی یان گەلالە و ئامادەکراوە، یان وەرگێردراوی، یان نووسراوی هاوەلانی.

ڕاستییەکەی ئەو ژمارەیە– وەك لە ڕادیۆدا کارگێڕ بووم– نەماوە و بەتەنێ درامای (باوەژن) کە یادگاریێ ماوەتەوە ! ! قسە وەرگرتن لە ئەندامە زیندووەکان لە١٩٧٩/٥/١١ دا– کاتی قسە وەرگرتن فائیق چالاك زیندوو بوو–[٢٣] ئەوە ساخ بووەتەوە کە تیمەکە (یێکەم تیمی ڕەسمیی) بووە کە ئەمەیش بەلگەنامەی ڕەسمییانە دەیسەلمێنێت، بۆ وێنە بەلگەنامەی (ڕێبەرایەتیی پڕوپاگەندی گشتیی بەغداد/ مودیرییەت ئەلدیعایە ئەلعاممە– بەغداد، ژ ٣٦٣٧ی ١٩٥١/٩/١٨)[٢٤] بڕیاری داوە کە (تیمی تایبەتی تەمسیل — دراما– لەڕادیۆی عەرەبیی و کوردییدا پێك بێت و بەکرێی هەفتانە ئەم کەسە کوردانەش لەنێو دامەزراوەکاندان:

– نووری عەنبەر، ٢ دینار.

– ئەحمەد دلاوەر، ١,٥٠٠ فلس.

– فائیق چالاك، ١,٥٠٠ فلس.

بەلام ئەو زاتانە هەموو ئەندامەکانی تیمەکە نین و هەموو ئەمەن:

**ئە: هەمیشەییەکان.**

١. ڕەفیق چالاك. (ئەندام / نووسەریش).

٢. ئەحمەد دلاوەر. (ئەندام / نووسەریش).

٣. نووری عەنبەر. (ئەندام).

٤. ئەحمەد مەحموود. (ئەندام / گۆرانییبێژیش).

٥. فائیق چالاك / دلزار. (ئەندام).

٦. عەبدالله عەززاوی.            (ڕێژەر/موخریج).

**بێ: هاریکارەکانی ناوبەناو:**

١. قادر دیلان.    (ئاکتەر / مۆسیقەژەن لە ڕادیۆدا!).

٢. عەلی مەردان.    (ئاکتەر / گۆرانیبێژ).

٣. عەلی ئیبراهیم.    (ئاکتەر).[٢٥]

٤. تاهیر تۆفیق.    (ئاکتەر / گۆرانیبێژ).

سەرنجیشم لە یادگارەکان – مەتنەکان – دراماکانی تیمەکەش داوە. هێندەی لەبەردەستدان مێژوویان لەنێوان٢٦/٦/١٩٥٠–٢٩/٣/ ١٩٥٥ دایە.

## ٤. وردبوونەوە لە تیمەکان.

ڕاست ناسین و لێك جویٚ کردنەوەی سنووری مێژوویی تیمەکانی یێکەم و دووەم مەبەستم بوو، بۆییێکا پشکنین و بەراووردی هەربەلگە نووسراوێکم پێویست زانیی و ئەنجامیشی ئەمەیە:

١/٤: ڕاستە–حسێن جەلال گوتەنیی– ئەندامانی تیمی سالْح یەحیا، لەسەرەتادا بەنێوی (سالْح یەحیاو تیمەکەی– گۆرانیو سروود/صالح يحيى وفرقتە–غناء وأناشيد)ەوە لەڕادیۆدا دەرکەوتوون نەك بەنێوی (تەمسیل–نماییشەوە).

ئەو تیمە یێکەمە ئەوەتە یێکەم جار لە١٨/نیسان/١٩٤٨دا[٢٦] هەتا٩/مایس/١٩٤٨[٢٧] لەڕۆژانی یێکشەممە داو سەعات (٥,٢٠–٥,٥٠) و بۆ ماوەی (٢٠) دەققە دەرکەوتووە. جارێکی دی لە٣/٣/١٩٤٩ دا[٢٨] هەتا٣٠/٦/١٩٤٩[٢٩] لە ڕۆژانی پێنجشەممەدا سەعات (٥,١٥ – ٥,٤٥)[٣٠] بۆماوەی (٣٠) دەققە دەرکەوتووە، بەلاْم ئەم جارەیان بەنێوی (بەرنامەی سالْح یەحیا و تیمەکەی / منهج صالح يحيى و فرقتە!) ئەوی سەرنج ڕادەکێشێت، نێونیشانی (گۆرانیی و سروود / أغاني وأناشيد) لەگەلْ

نێونیشانی (بەرنامە/ منهج) جودایی هەیە و دەشێ لە (بەرنامە) دا کە ماوەکەی نیو سەعات بووە، (نماییشێ / تەمسیلێ) پێشکەش کرابێت!

جێگەی باسە بۆ یێکەم جار لە بەرنامەکانی ڕادیۆی کوردییدا و سەعات (٥,٤٠— ٦)ی ڕۆژانی هەینیی١٠و ١٩٤٩/١١/٢٤[٢١] نێوی (تەمسیل / نماییش) هاتووە بەبێ ڕوون کردنەوەی نێوی تیمەکە و نێونیشانی نماییشەکە!

٢/٤: بۆ تیمی شەماڵ ساییب ڕاستیی ئەوەیە لە سەعات ٦تا٦,٣٠ ی ڕۆژی پێنجشەممەی ١٩٤٨/٨/٤ داو تا ١٩٤٨/٨/٢٥ نێو و باسی (شەماڵ سایب و تیمەکەی — تەمسیلی حەوتۆیی/شمال صائب وفرقتە— تمثیلیة الاسبوع) دەرکەوتووە.[٢٢]. دواتریش لە١٩٤٩/١١/١٩دا[٢٣] بەنێو و باسی (شەماڵ سایب و تیمەکەی—سروود/ شمال صائب وفرقتە— أناشید) تا١٩٤٩/١/٢٧.[٢٤] جارێکی دی بەنێوی (بەرنامەی شەماڵ سایب و تیمەکەی/ شمال صائب وفرقتە) لە ١٩٤٩/٢/٣دا[٢٥] تا ١٩٤٩/٩/٢٩[٢٦] لەڕۆژانی پێنجشەممەو سەعات ٦,١٥ تا ٦,٤٥ و بۆ ماوەی (٣٠) دەققە دەرکەوتووە. لە ئەمەش گرنگتر لە ١٩٤٩/٩/١ هەتا ١٩٤٩/٩/٩ بەنێوی (تۆمارکراوەکانی شەماڵ سایب و تیمەکەی/مسجلات شمال صائب وفرقتە)[٢٧] دەرکەوتووە. بەلآم ئەوە لە١٩٤٩/١٠/١٣دا بۆ سەعاتی ٦,١٥ تا ٦,٤٥ نووسراوە (گۆرانییەکانی شەماڵ سایب و تیمەکەی/ أغاني شمال صائب وفرقتە) کە تا ٩٤٩/١٠/٢٧ ی خایاندووە.[٢٨].

پتر جێگەی سەلماندنە کە (نماییشی حەوتۆیی شەماڵ سایب و تیمەکەی / تمثیلیة الأسبوع— شمال صائب وفرقتە) لەڕۆژانی پێنجشەموو ٤و١١و١٨و١٩٤٩/٨/٢٥ دا دەرکەوتووە و دووبارە بووەتەوە.[٢٩].

جێگەی سەرنجە دوواتر نێوی (ساڵح یەحیا) و (شەماڵ سایب) نەهاتووە و بۆ وێنە لە یێکەم هەفتەی مانگی نیسانی١٩٥٠ دا، واتە لە١٩٥٠/٤/٦دا تا دووا حەوتۆی کە ڕێکەوتی ١٩٥٠/٤/٢٧یە[٤٠]، ڕۆژانی پێنجشەموو نێو و باسی (نماییشی حەوتۆیی/

تمثيلية الاسبوع) بۆ سەعات ٥,٠٠ –٥,٣٠ بڵاوکراوەتەوە بەبێ ئەوەی نێوی یێکێ لە ئەو دوو کەسە و تیمەکەیان هاتبێ! من لەگەڵ بەراوورد کردن و هەلی دامەزراندنی ڕەفیق چالاکو دەرکەوتنی (مەتنەکانی بەردەستم) باوەڕ دەکەم کەڕەفیق چالاکو تیمەکەی بێ، ئەگەرچیی گفتارەکەی در. عیززەددین لە ئەم ئاستەدا گومانێ دەبەخشێت!!.

دووا تێبینیشم لە ئەم بارەیەوە ئەوەیە، ئەگەرچیی سروود و گۆرانییەکانی شەماڵ سایبب و تیمەکەی (بەر تۆمارکردن کەوتبن!!) ئەوا گومانیشم نییە بەلایێنی کەمەوە (هێندێ نماییشیان بەر تۆمارکردن کەوتووە!) و ڕەنگبێ وێنەیان لەنێو ئارشیفی مەڵبەندی کەلەپووری مۆسیقا –وەزارەتی ڕاگەیاندندا هەبێت.

جێگەی گوتنە لەمەڕ یادگاری ساڵح یەحیا و تیمەکەی هەواڵی باوەڕ پێکراو هەیە کە تۆمار و دووبارە کراونەتەوە، وەك (سروودی تاج / نشيد التاج) کە لە٤/٤/ ١٩٤٩ دا بڵاوو لە ١٩٤٩/٦/٦ دا دووبارە کراوەتەوە. {٤١} . لەگەڵ ئەم ڕاستییانەش دڵتەنگم بڵێم کە گەنجینەی ڕادیۆی کوردیی بەغداد –وەك ئاگاداریم– چ یادگارێکی لەمەڕ جم و جووڵە هونەرانەکانی هەر سێ تیمەکە هەڵنەگرتووە، لە سروودەوە تا نماییش و ئەوی هەیشە و نیشە، نماییشی (باوەژن) ی تیمی ڕەفیق چالاکە.

### ٥. یادگارەکانی تیمەکە

دوو جۆرە یادگار لەبەر چاو و دەستمدان کە ئەمەن:

٥/١: **یادگاری سەر قەوان**/ مەڵبەندی کەلەپووری مۆسیقای سەر بە وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراق. بەشێوەی سۆرانیی و لەسەر قەوانی تیرە (١٦) ی جۆری یۆنسکۆ {٤٢}

٥/١/١: نماییش/ تەمسیلییەی (جەژن لە لادێ/ العيد في الريف).

(ڕستی ٤٤٦/٢١) {٤٣}

٢/١/٥: نمایيش/ تەمسیلییە(بەزۆر بووەتە دکتۆر!/طبیب رغماً عنه).
(ڕستی ٤٤٦/٢٢)[٤٤]

٣/١/٥: نمایيش/ تەمسیلییە (پەرداخی یێکەم / الكأس الاول!)
(ڕستی ٤٦٠/٣٥)[٤٥]

٤/١/٥: نمایيش / تەمسیلییە (پارە و شەیتان / المال والشیطان!)
(ڕستی ٤٦٠/٣٥)

٥/١/٥: نمایيش / تەمسیلییە (سەری مانگ / رأس الشهر)
(ڕستی ٥١٨/٩٢).[٤٦]

٦/١/٥: نمایيش / تەمسیلییە (میوان / الضیف)
(ڕستی ٥١٨/٩٢)[٤٧]

**٢/٥: یادگارەکانی تیمی ڕەفیق چالاك:**[٤٨]

١/٢/٥: لەڕێی پارەدا (نووسینی ئەحمەد دلاوەر — ١٩٥٠/٦/٢٦)[٤٩]

٢/٢/٥: ژان بوو ژن نەبوو. (نووسینی ئەحمەد دلاوەر — ١٩٥٠/٧/٤).

٣/٢/٥: پیاو نەبوو (نووسینی ئەحمەد دلاوەر — ١٩٥٠/٧/١٣).

٤/٢/٥: خەسوو (نووسینی ئەحمەد دلاوەر — ١٩٥٠/٧/١١و١٩٥٠/٧/١٤.

٥/٢/٥: تاسەی بەنگ کێشان. (ئامادەکردنی ڕەفیق چالاك)— ١٩٥٠/٨/٢.

٦/٢/٥: دراکیۆللا. (ئامادەکردنی ڕەفیق چالاك) — ١٩٥٠/٨/٩.

٧/٢/٥: خزمی خراپ. (نووسینی ڕەفیق چالاك) — ١٩٥٠/١٠/٢٩.

٥/٢/٨: نەخۆشیی سەفلس. (نووسینی ڕەفیق چالاك) – ١٩٥١/١٢/١٠.

٥/٢/٩: گوڵی خوێناویی. (ئامادەکردنی ڕەفیق چالاك). – ١٩٥٢/٢/٤.

٥/٢/١٠: ئامۆژگاریی مایکرۆفۆن{٥٠} (نووسینی ڕەفیق چالاك) – ١٩٥٢/٢/١١.

٥/٢/١٠/١: شەکراو خواردنەوە.

٥/٢/١٠/٢: پاشتێلانە.

٥/٢/١٠/٣: ناوکەبڕانە.

٥/٢/١٠/٤: لە کۆڵان دانیشتن.

٥/٢/١١: باوەژن. (نووسینی ئەحمەد دلاوەر) – ١٩٥٢/٣/٢.

٥/٢/١٢: دەردی هاریی. (نووسینی ڕەفیق چالاك). – ١٩٥٢/٣/١٦.

٥/٢/١٣: ئیبن سینا. (ئامادەکردنی ڕەفیق چالاك) – ١٩٥٢/٣/٣

٥/٢/١٤: نەخۆشیی سیل. (نووسینی ڕەفیق چالاك) – ١٩٥٢/٦/١٧

٥/٢/١٥: جەژنتان پیرۆزبێت. (نووسینی ڕەفیق چالاك) – ١٩٥٢/٦/٢٤

٥/٢/١٦: پیاوی دووا ڕۆژ. (نووسینی ڕەفیق چالاك) – ١٩٥٢/٧/٦

٥/٢/١٧: هەوێساریی. (نووسینی ئەحمەد دلاوەر) – ١٩٥٢/٨/٣٠

٥/٢/١٨: کاری بەکەڵك. (نووسینی ڕەفیق چالاك) س ١٩٥٣."**چاپکراوە**".

٥/٢/١٩: پاداشتی چاکە. (نووسینی ڕەفیق چالاك) – ١٩٥٤/٢/٢٦

٥/٢/٢٠: هاوسەری ژیان(نووسینی قاسم خەتتات وەرگێڕانی ڕەفیق چالاك) – ١٩٥٤/٣/٢٩

٥/٢/٢١: ئامۆژگاری مایکرۆفۆن (نووسینی ڕەفیق چالاك) – ١٩٥٤/٤/٣٠

٥/٢/٢١/١: کوێخاو پیرێژن.

٥/٢/٢١/٢: کوڕی گەورە.

٥/٢/٢١/٣: ئەجری دراوسیێ.

٥/٢/٢٢: کرێ گرتەیی. (نووسینی ڕەفیق چالاك) — ١٩٥٤/٧/١٦

٥/٢/٢٣: هەندێك نارێکی کۆمەڵ. (نووسینی ڕەفیق چالاك) — ١٩٥٤/٩/٢٣.

٥/٢/٢٣/١: جلی بووك.

٥/٢/٢٣/٢: هاوڕێی بێوەفا.

٥/٢/٢٣/٣: دەروونی خەڵقیی.

٥/٢/٢٤: ئاوازی ماتەم./مۆزارت[٥١] (نووسینی ڕەفیق چالاك) — ١٩٥٤/١٠/١٧

٥/٢/٢٥: تەلەفوون. (نووسینی ڕەفیق چالاك). — ١٩٥٤/١٢/١٠
١١

٥/٢/٢٦: دادی ئاسمان. (نووسینی ڕەفیق چالاك) — ١٩٥٤/١٢/٢٤

٥/٢/٢٧: مامی چاك {٥٢}. (نووسینی ڕەفیق چالاك) — س١٩٥٤

٥/٢/٢٨: ئۆپەرێتی دڵداریی کورە شوان. (نووسینی محەممەد ئەحمەد تەها/ کامەران موکریی — دەستکاریی و ئامادەکردنی، ڕەفیق چالاك) — ١٩٥٥/٣/١٩

٥/٢/٢٩: {٥٣} هاوڕێ گورگەکان. (نووسینی ڕەفیق چالاك). "بێ مێژوو!!"

٥/٢/٣٠: هاتە ڕیزی خەڵقیی. (نووسینی ڕەفیق چالاك). "بێ مێژوو".

٥/٢/٣١: ئەنجامی زۆرخۆری. (نووسینی ڕەفیق چالاك). "بێ مێژوو".

٥/٢/٣٢: ژن هێنان. (نووسینی ڕەفیق چالاك). "بێ مێژوو".

٥/٢/٣٣: تۆبەکردن. (نووسینی قاسم خەتتات — ئامادەکردنی ڕەفیق چالاك). "بێ مێژوو!!".

٥/٢/٣٤: کچەکەم نەبووایە. (نووسینی رشەفیق چالاك). "بێ مێژوو".

٥/٢/٣٥: دایکێکی خراپ. (نووسینی ڕەفیق چالاك). "بێ مێژوو".

٥/٢/٣٦: ژنی لاڵ. (نووسینی رشەفیق چالاك). "بێ مێژوو".[٥٤]

٥/٢/٣٧: ئامۆژگاریی مایکرۆفۆن. (نووسینی ڕەفیق چالاك). "بێ مێژوو".

٥/٢/٣٧/١: ناپاکیی.

٥/٢/٣٧/٢: هێوەر ژن.

٥/٢/٣٧/٣: حەقی کێیە؟.

٥/٢/٣٨: مێردی خەڵەتێنراو. (نووسینی ڕەفیق چالاك). "بێ مێژوو!! ".[٥٥]

٥/٢/٣٩: داد لە دەست هەژاریی. (نووسینی ڕەفیق چالاك). " بێ مێژوو ".

٥/٢/٤٠: گڵکۆی تازەی لەیل بووکێکی ناکام (ئامادەکردنی ڕەفیق چالاك).
" بێ مێژوو ".

٥/٢/٤١: مارەیی. (نووسینی رشەفیق چالاك). " بێ مێژوو ".

٥/٢/٤٢: حاجیی قادری کۆیی. (نووسینی ڕەفیق چالاك). " بێ مێژوو ".

٥/٢/٤٣: بیتهۆڤن. (نووسینی:؟؟ — وەرگێڕانی فائیق چالاك).[٥٦]

## ٦. هەڵسەنگاندن

گومان نییە کە هەر دوو دەستە– تیمی ساڵح یەحیاو شەماڵ سایب لەنێوان ١٩٤٨ — ١٩٤٩داو لەیێك باری تەکنیکیی چ ڕۆشنبیریی ڕادیۆکەدا تۆوی هونەری درامای ڕادیۆیان چاندووە و وێکڕا یێك قۆناخی کاروانی ئەو هونەرەیان پێکهێناوە. بەڵێ ئەوانێکی خوێندکار پتر چاویان لە خزمەت نەك پارە بووە و ئەویی کردوویانە — بەر تۆمارکردن کەوتبێ یان ڕاستەوخۆ بڵاوبووبێتەوە — بەری هۆش و بیر و دڵی گوێگری کوردیان ڕوون کردووەتەوە و شتێکی (نوێ) یان بەهۆی دەزگەیێکی نوێوە — بەهۆی ڕادیۆوە — پێ ڕاگەیاندوون. ڕاستییەکەی کارەکەیان بەردی بنچینەیە.

دەستە — تیمی سێیەم کە بە(تیمی تایبەتی ڕادیۆ) و (تیمی ڕەفیق چالاك)[٥٧] ناسراوە، لەلای من دووەم قۆناخ و دروستکەری تەلاری هونەرەکەیە لە ڕادیۆی کوردییدا. ئەمەیش بەهۆی دەستگیربوونی مەتنەکانییەوە نییە، بەڵکو لەبەر پێوەندیی ڕەسمییانە و تایبەتیانەی و لەبەر کارامەیی قەڵەم و هونەری دەستەکە و لەبەر درێژیی ماوەکەیە کە

نزیکەی پێنج ساڵ هەموو چینەکانی گوێگرە کوردەکانی ڕاکێشا بوو بۆ لای ڕادیۆ و بەتایبەتی بۆ لای هونەرەکە و جێگەی خۆشیی و باوەڕی جەماوەر بووە بەتایبەتی کە دراماکانی چاکە خوازی ژین و گووزەرانی خەڵك و مەبەستی گۆڕین بووە بەرەو پێشکەوتن!

ئەگەر لە ئەو چەند کەسەی دەستەکە وردببینەوە، دیارە کەسیان خاوەندنی خوێندنێکی باڵای هونەر نەبووە، کەچیی — بە مەتنەکانیاندا و بەگوێگرتن لەچەند وێنەییێکی بەر دەست و گوێم — لێم ڕوونە کە کردەوەکەیان وێکرا لەڕووی ئەدەب و هونەرەوە تەواو ژیر و توانا بووە.... زمانیان پاراو و ڕەوانبێژییان لە کانیی زمانی گەلەوە بووە و ئاخاوتن و پێوەندییان بۆ خەڵك بووە. لەڕووی هونەری نواندنیشەوە ئەوە هەر لە ئەدای ژیر و دەنگ دەربڕینی هونەرانەوە، هەمیشە جڵە و گیربوون و لە پەشۆکان و زمان تەتەڵەکردن بە دووربوون و (دەنگ گۆڕینیان بۆ لاسایی کردنەوە) چ بۆ (پڕکردنەوەی دەنگی پیاوان) و بە تایبەتی زاڵ بوون بەسەر کێشەی (تێکەڵ نەبوونی ئافرەت) لە ئەم هونەرەیاندا، ئەمە بۆخۆی وێنەی توانا و زیرەکییە!

لەڕووی فیڵی ڕادیۆیشەوە، دەنگی کاریگەری جۆر بەجۆریان بەکارهێناوە، هەروەها بۆ بەشەکانی بابەتەکە —هەتا ڕادەییێکی باش— مۆسیقای جودا و پەسەندی هەڵبژاردووە کە لەگەڵ ئارەزوو و چێژی گوێگری کورد گونجاون!

بابەتەکانی ئەم دەستەیە — وێنەییێکی لەئێرەدا بڵاوە — بە ژیرییەوە لە ئەو ڕۆژگارە ناسکەدا هەڵبژێردراون و لە قەوماوەکانی مرۆڤ و کۆمەڵەوە هاتوون و لایێنگیری کێشەکانیان بووە. ئەمەش هەر لە نیشانەکردنی بار و دۆزی کۆمەڵ و نەریت و دەردەکۆنەکانی کۆمەڵەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە ئاشناکردنی دەوری چاکی مرۆڤ بۆ بنیات نانی پێشکەوتن چ بە وشە و ئاواز و توان و زانست چ بە کردەوەی چاك. چیرۆکەکانی (دراکیۆللا.. ئیبن سینا، حاجیی قادری کۆیی، بیتهۆڤن) بەڵگەی ڕاستی ئەم

قسەیەن. هەروەها ئەو دەستەیە ژیرانەش پێوەندیی جەماوەری بە ڕووە چاکەکەی کەلەپووری ڕۆشنبیریی کوردەوە بووژاندووەتەوە. بۆوێنە (گلکۆی تازەی لەیل) بەڵگەی ئەم گوتنەیە. لەلایێکی دیەوە، ئەویی زۆر گرنگە ئەم دەستەیەی (ڕەفیق چالاك) کە خۆی لە ئەوە و بەردا تێکەڵی (ڕادیۆی یافا) و ئاشنای مۆسیقە ژەنەکانی عەرەب و بێگانە بووە، توانیوییێتی لە هونەری شانۆی ڕادیۆدا (هونەری ئاواز و گۆرانیی) دابرێژێت کە چەند چیرۆکێ ئەم مۆرەیان پێوە دیارە و هەرە وێنەی بەرزیش یێکەمین ئۆپەرێتی کوردیی، (دڵداریی کورە شوانە !).

لەڕووی ڕێژەریی —ئیخراج—ەوە، بە ئەو ڕۆشناییەی کە لەلاییێکەوە خۆم ڕێژەری ڕادیۆ بووم و لەلاییێکی دیەوە بە تیشکی ئەو بەڵگە زیندووانەی بەردەستم، ئەوە دڵنیام کە دەستەی ئاکتەرەکان و ڕێژەرە عەرەبەکە و تۆمارکەر و بڵاوکردنەوەی نماییشەکە، بەڕاستیی توانابوون، چونکە وەك کۆلیومەتە (خۆوڕاستان) بڵاوکراوەتەوە و لەهەمان هەلدا ڕێژەرکاریی خۆی — بەتێکەڵ کردنی دەنگە کاریگەرەکانەوە — ڕاپەڕاندووە و ئەمەش بۆ ئەو ڕۆژگارە و ئامێرە سادە سەرەتاییەکان و بۆ ڕێژەرێکی عەرەبی لە کوردیی نەگەییشتوو، دیسان بەڵگەی توانایە.. بەڵام بە وردبوونەوەی خۆم — لەڕووی ڕاستییەوە — ڕەفیق چالاك خۆی هاریکاریی هونەرانەی کردووە و گەلێ جار جۆری مۆسیقە یان گۆرانیی یان دەنگە کارگەرەکانی لە جێگەی خۆیاندا وەك پێویست ئاشنا و نیشانە کردووە. ڕاستییەکەی چەند لە (مەتنە یادگارەکان) ی ئەم دەستەیە و لە وێنەی (دەنگەکان) یان ورد دەبمەوە، هەر ئەوە تێ دەگەم کە ئەم دەستەیە و (درامای ڕادیۆیی) باڵا دەست بوون بۆ چەسپاندن و ڕەواج پێ دانی هونەری شانۆ نەخوازەلا هەر شانۆی ڕادیۆ. من وەك سەرچاوەییێکم بەدەستەوە نییە — هەرگیز نیشە — ڕێژەی گوێگرەکانی ئەم هونەرە و کاری ئەم دەستەیە لەسنووری ئەو پێنج ساڵەدا بنوێنێت، بەڕاستیی جێگەی خۆییێتی — بەیادی جارانەوە یادی ئەم ئاخاوتنەی ڕەفیق چالاك خۆی

بکەینەوە کە لە یاداشتنامەییدا نووسیوییێتی، (... ئەم تەمسیلانە ئەوەندە کاریگەر بوو، تەنیا بە شارەوە نەوەستا، قەزا و لادێکانیشی ڕاهێنا و بزواندنی. چێژو تاوێکی ئەوتۆی هەیوو کە بە هەزاران نامە لە هەموو گۆشەییێکی کوردستانەوە ڕووی دەکردە ئیستگە! هەندێ ماڵ گوێسوانەکانیان ڕووخا – خەڵك دەچووە سەربانی دراوسێ ڕادیۆ دارەکان/ کەمال – هەندێك شتومەکی نێو ماڵی فرۆشت و ڕادیۆی کڕیی. هەرچیی دەردێکی نێو ئەم کوردەوارییە هەیە، هەرچیی ئاوات و ئازارێکی هەیە، هەمووی کرا بە تەمسیل، بە مێژووی ژیانی گەورە پیاوەکانیشەوە.. تەمسیلیەکان هەموو گۆشەییێکی ژیانی کوردیان چارەسەر دەکرد!)[٥٨]

خۆمیش بۆ مێژوو شایەتیی دەدەم کە لە ساڵی١٩٥٠ دا بۆ گوێگرتن لە ئەو تەمسیلانە دەچوومە ماڵی پووری بابم و لە کۆتاییی١٩٥٤ دا ناچار ڕادیۆمان کڕیی.

دیسان هەر بۆ سەلماندنی کاریگەریی ئەم تیمە، ئەوە بەڵگەییێکی زیندوو– شریتێکی ساڵی١٩٦٠ـە لە بازاڕدا بڵاوبووە– دەستگیرم بووە کە گۆرانیبێژ ئەحمەدی خولە سنەیی و چەند هاوەڵێکی نەخوێندەواری لەماڵی خۆیاندا و بە ماگنێتەفۆن/ تەسجیلی خۆیان، دراماییێکی گاڵتەجاڕیان لەبەر و لە خۆڕاوە– نەك بەتەماشای کردنی نووسینەوە– لەمەڕ (شارەزوورییەکی نەخۆش) نواندووە و بەسەرەتا و کۆتایی –ڕادیۆ ئاسا– دراماکەیان پێشکەش کردووە. وێڕاش فێڵی هونەریی، دەنگی عارەبانە، هۆڕنی ئوتوموبیل، زەنگ لێدانیشیان لاسایی و تێهەڵکێش کردووە! هەروەها کارەکەیان بە ماڵاندا، تەنانەت لە بازاڕدا بڵاوبووەتەوە!

### ئەنجام

بەتەواوەتیی ڕوونە کە لە یێکەم ڕادیۆی کوردیی بەغدادا – یێکەم دەزگەی ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەی کوردیی– لەنێوان ساڵانی ١٩٤٨– ١٩٥٥دا، تەلاری شانۆی ڕادیۆیی بەرزکرایەوە. ئەم کارەش وەنەبێ هەر مایەی فەرمانێکی ئاسایی و ساکاری

کاربەدەستەکانی دەوڵەت بوویێ، بەڵکو بەری هۆش و بیر، ڕەنج و کردوکۆش و ماندووبوونی لاوانی کوردی دڵسۆزی پێشکەوتنە!

هەر سێ دەستەکە لەئەم کارەدا کە بەڕاستیی مێژوویییە، شوێنیان دیارە چ بە ڕستەیێ نێوهێنان یان بە زیندوویی یادگاریان. شوێنی دەستەس سێیەمیش- با لە سەرێکەوە زۆر خۆی بەڕستە درامای چەند سەعاتییەوە خەریك نەکردبێ، هەروەها زۆر توخنی کێشەکانی نەتەوە و قەوماوەکانی مێژووی نەکەوتبێ- ئەوە هێشتا بە ئەو توانا دارییە کەمەیانەوە، بە ئەوە چەند کەسە هونەرمەندەوە (کردەوەییێکی ستراتیژییان) بۆ هۆشیاریی جەماوەری کورد بەکار بردووە و درامایان کردووە بە دەسکەلا.. لەسەرێکی دیەوە هونەری دراماشیان ڕەواج پێدا و بەهێزتر کرد. هەروەها خزمەتی کێشەکانی کۆمەڵیان کرد. من زۆر شادم بە ئەوەی کاری ئەم سێ دەستە هونەرپەروەر و هونەرمەندە لە ئەم ڕادیۆ بێکەمەدا، بەتایبەتی تیمی سێیەم، پێش هێندێ وڵات کەوتووە کە خاوەند دەوڵەتو ئالان.

بۆ مێژوو شایەتیی دەدەم-نەك لەبەر سۆز و تەمەن- کە تا ئەوڕۆ چ دەستەیێکی نمایشخوازی ڕادیۆ، وەك دەستەی سێیەم کارامە نەبووە. بەڕاستیی تیمێکی ئەنتیکەیە! {٥٩}

**پاشکۆ**

(وێنەی درامای ڕادیۆیی)

(ئامۆژگاریی مایکرۆفۆن) {٦٠}

نووسینی: ڕەفیق چالاك

١٩٥٢/٢/١١

گوێگرە خۆشەویستەکان!

لەسەر داواکردنی هەندێ لە خوشکەکانی سلێمانییەوە، ئەم هەفتەیە باسی نارێکیی شەکراو خواردنەوە و پاشتێلانە و ناوکەبڕانە و لەبەردەرگا دانیشتنی هەندێ ئافرەت ئەکەین، هەروەها لەسەر رێ بە کچان گرتنیش ئەدوێین لەگەلّ پاك و تەمیزیی ناو حەمامەکان، وە ئەم باسانەمان کردووە بە چیرۆکی پچووك پچووك لەناو چیرۆکێکی گەورەدا و لەو نارێکییانە دوواوین. هیوامان وایە چیرۆکەکەمان جێگای کەلّك بێت.

## شەکراو خواردنەوە[٦١]

عەلی : ئەزانیی کاکە حەمە مالّی میرزا رەشید پارچەییێك شەکری پچووکیان بۆ ناردووین بەشی "دە" چای تیا نابێت؟

حەمە : شەکری چیی؟ شەکریان بۆ ناردوویت؟

عەلی : شەکری شەکراو! ئاخر سەعەی کوڕی میرزا ڕەشید کچی حاجی عەلیی هێنا.!

حەمە : خوا موبارەکی کات! کارێکی زۆر بەجێیە! زۆرم پێ خۆش بوو.

عەلی : خوا لێیان موبارەك نەکات ئاوا... مالّی حاجی فەتاح کەللەییێکی تەواویان بۆ ناردووین، کەچیی ئەم

سەرسوالّکەرانە هیچ نەبێ نیوکەللەشیان بۆ نەناردووین!!

حەمە : ئەی من بۆ هیچیان بۆ نەناردم؟ یاهوو هەر بانگیشیان نەکردم..

عەلی : ئاخر ئەوەتە بێوێلّ و ئوسوولّییەکەیان لەوەدایە! لای خەلّقیش ئەلّێن دە فەردە شەکرمان بۆ شەکراو بەشیوەتەوە...

حەمە : خۆیان هەلّئەکێشن... بەقوربانی خوابم، هەتا دوێنێ بوو میرزا ڕەشید بە شوێن نالّی کەری تۆپیوا ئەگەڕا...

عەلی : ئەوە بەچیی وا هەلگەڕا بۆ خاتری خوا؟

حەمە: چووزانم بەخوا تێناگەم هەندێ کەس چۆن وا لەپڕێکا هەڵئەگەڕێن و ئەبنە خاوەنی هەموو شتێك!

عەلی: وەالله ئەڵێی کاکە حەمە شەکرەکەی بۆ بنێرمەوە! گوایە بۆچیی من ئەو پارچە شەکرە قوبووڵ بکەم؟ موناسەبە چییە؟

میکرۆفۆن: سەلامون عەلەیکوم!

عەلی: عەلەیکە سەلام.. تۆ کێی کابرا؟ بۆچیی بە دیارمانەوە وەستاوی گوێ لە قسەمان ئەگریی؟

میکرۆفۆن: من میکرۆفۆنم! میکرۆفۆنی بەشی کوردیی ئیستگەی عێراق..

حەمە: میکرۆفۆن مەعنای چیی؟ چیت ئەوێ لە ئێمە؟

میکرۆفۆن: ئەمەوێ چەند قسەیێکتان لەگەڵا بکەم! ئەرێ کاکە حەمە و جەنابی کاك عەلیی بۆ قسە بە خەڵقیی ئەڵێن؟ بۆ غەیبەت ئەکەن؟ حەقتتان چییە بەسەر خەڵقییەوە؟

عەلی: ئینجا تۆ حەقت چییە بەسەرەوە؟

میکرۆفۆن: من حەقم زۆرە! من باسی کەم و کوڕیی ناو کۆمەڵ ئەکەم.. من شوێن پێی هەموو کاروبارێك و هەموو ناڕێکییەك هەڵئەگرم و ئاشکرای ئەکەم و لێی ئەدوێم بۆ ئەوەی خەڵقیی چاوی بکرێتەوە! لە خراپە و ناڕێکیی و نەریتی خراپ لابدات! من زانیاریی گشتیی بڵاوئەکەمەوە بە ناو کۆمەڵا..

حەمە: ئێستا تۆ چیت ئەوێ لە ئێمە کاکی میکرۆفۆن؟ بۆ ناچی بەلای کاروباری خۆتەوە؟

میکرۆفۆن: ئاخر جارێ کاروباری من وا لای ئێوە! عەییب ناکەن قسەی ناشرین و سووك بە میرزا ڕەشیدی بەسەزمان ئەڵێن! کفری کرد ژنی بۆ کوڕەکەی هێنا؟ کفری کرد شەکری دابەش کرد؟

عەلی: چیی دابەش کردووە؟ تەنیا پارچەیێکی بچووکی بۆ من ناردووە؟

میکرۆفۆن: ئێـی ئینجـا چـیت ئـەوێ؟ داوای پـارەی لێکردوویـت بەرامبـەر بـەو شەکرەی بۆی ناردوویت؟ کەم بـێ یـا زۆر بـۆ پێـی ڕازیـی نیـت لەبـەرت مرم؟

حەمە: بەڵام ئەی من هەر هیچی بۆ نەناردووم!

میکرۆفۆن: ئارەزووی خۆییێتی! ئینجا ئەگەر هـەر کەسـێ شـەکراوی خـواردەوە و شـەکری بـۆ هـەموو شـارەکە و بـۆ هـەموو کەسـێ نـارد، ئـەوا قـوڕ کـرا بەسەریا!! ئەو حەلە لەجیاتیی شـایی ئـەبێ شـین بکـات.. بـەڵام مـیرزا ڕەشید و ئەمسالی مـیرزا ڕەشـید بـێ مـەعنا و بـێ عـەقڵ و ئیـدراکن، بـۆ شەکری کەللە ئەکڕن؟ چوار نوقـوڵ، زەرفێکـی بچـووك، ئەمەتـە شـەکراو خواردنەوەی ئەم چەرخە نەك بە فەردە کەللە شەکر کڕین! ئەو پارەیـەی ئەیدەی بە کەللە شەکرێ و ئەیدەیت بـە یێـك مـاڵ، بەشـی پـەنجا مـاڵ نوقـوڵی تیـا ئـەبێت! بـەڵام ئێـوە کاکـە حەمـە و عەلـە شـان خـوار بەهیچ تێـر نـابن.. لەپاشـا قسـە هـەر ئەکـەن.. قسـەش ئەکـەن چـش! ئەویی گوێتان باتێ لە ئێوە بێ عەقڵترە! جارێ موساعەدەی من بکـەن ئیشم زۆرە، ئەچم بەلای پاشتێلانەوە! بەدووعا. سواڵکەرەکانی شـەکرا خواردنەوە! بەدووعا.. (پێکەنین) منم میکرۆفۆن!/ مۆسیقە

---

## پاشتێلانە{٦٢}

عەلی: ئافرەت ئەوە کوا لیرەکەی تەوقە سەرت؟

ژن: بۆچیتە؟ بۆچیی ئەپرسیی؟

عەلی: چۆن بۆچیی ئەپرسم؟ ئەی نابێ بزانم بۆ لە فێستکەت کردۆتەوە؟

ژن: لێم کردۆتەوە و بڕایەوە!

عەلی: ئاخر لە کوێیە، چییت لێکردووە؟

ژن: ئەوە تۆ بۆ ئەوەندە درێژە بە شت ئەدەی؟ پەنام بە تۆ خوایە!

عەلی: کچێ دەنگم دەرمەهێنە خوا لەناوی دەمت با! پێم بڵێ چیت لە لیرەکە کرد؟

ژن: ئۆ هەر خۆت بە خۆت بی ئاوا! چاوت لەو قیژ و هوڕە بێت کە ئەیکا بەسەرما!

عەلی: خۆمی چیی بە خۆم بم؟ چییە؟ شەلم، کوێرم، قۆڕم؟ چییمە؟ کچێ کوا لیرەکە؟

ژن: توخوا ئەم پیاوە شەڕ نافرۆشێ؟ ئێستا لیرەی خۆمە یان هی تۆ؟

عەلی: هی تۆی چییە؟ لەماڵی باوکتەوە هێنات؟ کچێ کە تۆم مارە کرد، دایکم بۆی نەهێنای؟

ژن: ئێ ئیتر بۆچیی ئەڵێی دایکت بە ڕەحمەت بێ نەیداوە بە خۆم؟

عەلی: کچێ ئێستا خۆم و خۆتی بۆچییە ئافرەت؟ کوا لیرەکەت با داتنەپلۆسم!.

ژن: ئەیهوو.. ئەیهوو.. ئینجا بەزمە بەزم!!

عەلی: بەناموسم پێم نەڵێی چیت لە لیرەکە کردووە تەلاقت ئەدەم!

ژن: ئینجا لە دەستت بێت! هەموو شتێك ئەکەی!

عەلی: قسە ناکەی؟

ژن: لیرەکەم برد بۆ ئافتاو! باشە؟

عەلی: ئافتاو کێیە؟ کام ئافتاو؟ ئافتاوی بووکی میرزا ڕەشید!

عەلی: موناسەبە چییە؟ بەوەعدەی چەند ڕۆژ لات داناوە؟

ژن: بسم الله، وەعدەی چیی؟ بۆچیی لێی خواستووم؟

عەلی: ئەی چۆن؟ بۆچیی بۆت بردووە؟

ژن: ئەی دوێنێ پاشتێلانەی نەبوو؟

عەلی: پاشتێلانە مەعنای چیی؟

ژن: ئەی نەچووین بۆ شایی کە شووی کرد؟ ئەی شەکراومان بۆ نەهات؟ ئەی نەچووین بۆ حەمام؟کوڕە عەیبە پیاوەکە بۆ ئەوەندە لەسەر شت ئەڕۆی، ئەوە تازە وات لێ هاتووە؟

عەلی: چیم لێ هاتووە؟ شێت بووم وەنییە؟ ئاخر بە دەست تۆوە شێت بووم! کچێ تۆ شێتت کردم! بایی سی فلس شەکر و پەنجا فلس نان خواردنی شایی و پەنجا فلس حەمام کە هەمووی ئەکاتە سەدو سیی، لەجیاتیی ئەمە تۆ ئەچیت لیرەکەی تەوقە سەرت ئەبەی بۆ بووکی میرزا ڕەشید! دەك موبارەکم نەکرد ئاوا! ئافرەت گوێ بگرە ئەمە خاتیمەی بێت، سێ بە سێ تەلاقت کەوتبێ، بەهیچ مەزەبێك چاك نەبێتەوە ئەگەر جارێکی تر هیچ شتێك بەری بۆ پاشتێلانەی هیچ کەسێك!

ژن: ئافەرم! دەك موبارەك نەبێ لە عومرت بۆ چ پیاوێکیت!! بەخوا من ئەڕۆم و یێك دەقیقە لەم ماڵە کاوول بووەدا نامێنمەوە..

عەلی: کچێ نامێنیتەوە چش، نارەسەنی بێ مێشکی جرپن.. وا من ئەچم بۆ بازاڕ هەتا یێمەوە لێرە نەمابیت..

ژن: ئەگەر مام لەجێی تۆ بم! (دەرگە بەقایم پێوە ئەدرێ!). با جلەکانم بپێچمەوە و لەم کاوول بووە دەرچم، بەخوا ئیتر لە توانام نەماوە..

میکرۆفۆن: (پێ ئەکەنێ).

ژن: بسم الله الرحمن الرحیم، ئەوە کێیە پێ ئەکەنێ؟

میکرۆفۆن: منم مەترسە! من میکرۆفۆنی بەشی کوردییم، هی ئیزاعە!

ژن: چیت ئەوێ باوکم؟ ئیشت چییە لێرە، نازانی پیاو لە ماڵەوە نییە؟

میکرۆفۆن: من حەقم چییە بەسەر پیاوە کلۆلەکەتەوە، هاتووم یێك دوو قسە لەگەڵ تۆ ئەکەم!

ژن: قسەی چیم لەگەڵا ئەکەی، چیت ئەوێ لە من باوکم؟

میکرۆفۆن: ئەڵێم شتوومەك مەپێچەرەوە و دانیشە لە ماڵەکەی خۆتا و لانە لە خۆت تێك مەدە! کە هاتەوە ئاشتی کەرەوە! تو خوا ئەو مێردە کلۆڵە ناحەقیەتی تووڕە ببێ؟ ئاخر چ موناسەبەت هەیە، لیرەیێك بدرێ بە سەد و سیی فلس لە وەختێکا کە خۆتان موحتاجی ئەو لیرەیەن؟. پاشتێلانەی چیی و کالیاری چیی؟ ئەمە پێی ئەڵێن سواڵکردنی بەئەدەب! ئەوا یێکێکی تر شووی کردووە و کابراییێکی تر ژنی هێناوە، من بۆ ئاڵتوونی بۆ بەرم؟ تەرکی کەن ئەم عادەتە پیسە ناشرینە!

ژن: ئەی عەییب و شوورەیی و هیچ نەبەین بۆ بووك بەرامبەر بەو هەموو حەمام و شایی و شەکراو خواردنەوەیە؟

میکرۆفۆن: نەخێر هیچ مەبەن! با خاوەنی شایی ئەگەر لە توانایا نییە ئەوەندە مەسرەف نەکا! هەر کەسە لە ژن هێنانا بەقەد بەرەی خۆی پێ ڕابکێشێ! تۆ ئەزانیی خوشکێ هەزار ژن هەن بەدزیی مێردەکانیانەوە شت ئەبەن بۆ پاشتێلانە؟ تۆ ئەزانیی هەندێ ژن دزیی لە مێردەکانیان ئەکەن، شتوومەکی ناومالێ ئەفرۆشن و ئەیبەن.. خوا هەڵناگرێ وا لە مالێ و مێردی خۆتان ئەکەن!

ژن: ئاخر باوکم ئەمە ڕەسم و عادەتە و عەیب و شوورەییە، ئینسان شت بۆ ناسیاو نەبات، لەپاشا بە دەستیاویشە.

میکرۆفۆن: دەستیاوی چیێ؟ تەرکی کەن! کە تۆ بۆ خەڵقت نەبردو خەڵق بۆ تۆی نەهێنایەوە، ئەوا ڕەسم و عادەت نەما! شتومەك نەپێچینەوە و نەڕۆیت نەوەکو تەلاقت بدا! مالێ لە خۆت مەشێوێنە خوشکێ! میکرۆفۆن ئامۆژگاریت ئەکا کە شت نەبەی لە پاشتێلانەدا! شت نەبەی ئەگینا تەلاقت ئەکەوێ! بەدووعا خوشکێ، لەبەر خاتری پاشتێلانە مالێ لە خۆت تێك مەدە! دزیی لە مالێ و مێردەکەت مەکە! بەدووعا..

ژن: توخوا ئەگەر بڕۆی! هەتیو باوانت شێوێ قسەکانت زۆر خۆشن!

میکرۆفۆن: ئاخر بەسەری تۆ ئیشم زۆرە! ئەچم بەلای ناوکە بڕانەوە.. بەدووعا...

ژن: خوا ئاگای لێت بێ.. خوا حافیزت بێ! / مۆسیقە

## ئاوکەبڕانە[٦٣]

حەمە: ئافرەت وا تێمگەیانی.. یێك پوول و یێك مەنقڕ لە کەس گل نەدەیتەوە!

ژن: (بە ئەسپایی) ئاخر دەنگ هەڵمەبڕە، باجی ئایشیی مامان وا لەو دیو نوێژ ئەکا!

حەمە: کەیفی خۆیەتی! نابێ یێك پوول لە کەس وەربگیرێ!

ژن: ئاخر باجی ئایشێ ڕازیی نابێ و ئەتۆرێ!

حەمە: ناتۆرێ چاوی دەرئەهات! بۆچیی سواڵە، سەدەقەیە، ئەوا چوار دیناری ئەدەمێ و بڕایەوە.

ژن: ئەگەر ڕازیی نەبوو!!

حەمە: ئەم جارە مومەریزەی خەستەخانە ئەهێنم بۆ منداڵ بوونت! پاکتر و تەمیزتر، باشتر و هەرزانتر، بێ خەتەرتر! مامان، مامان!! باجی ئایشێ!! هەتا ئێستا هەزار منداڵی بەسەزمانیان خنکان، ئەم مامانی لاکۆڵانانە، هەزار ئافرەتیان کوشت و وتیان دایکی ئال هات بەلایا..

ژن: کوڕە دەنگ هەڵمەبڕە با گوێی لێ نەبێت...

حەمە: وا من ئەڕۆم خۆ هیچت ناوێ؟

ژن: نەء خوا حافیزت بێ، زوو بێیتەوە نەوەکو باجێ ئایشێ بڕوات بۆ سەر سەیرانێکی تر...

حەمە: باشە زوو یەمەوە.. باجی ئایشێ وەرە ئەم دیو!

ئایشێ: سبحان ربنا العلي العظيم... (فوو ئەکا بەم لاو بەو لای خۆیا) خوایە توو گەورەیی خۆت ئیمانمان پێ عەتا بکە! خۆ منداڵەکە نەگریا؟

ژن: نەء.. نوستووە!

ئایشێ: قەیناکە با بنوێ! ئەوە حەمە ئەفەندی ئەیووت چیی ڕۆڵە؟

ژن: هیچ! وتی ڕازیم نییە هیچ لەکەس گل بدەنەوە!

ئایشێ: چۆن؟ چۆن هیچ لەکەس گل نەدەیتەوە؟ ئەوە ڕەسم و عادەتە ڕۆڵە! ئەمە چەند ساڵە ناوکە بڕانە هەر هەبووە قابیلە ئێوە ڕەسم و عادەت تێك بدەن عەیب و شوورەیی؟ بەخوا دایکم من ناتوانم دەست بە ڕووی کەسەوە بنێم!!

ژن: ئاخر خۆ باوکی سالار چوار دیناری بۆ داناوی باجی ئایشێ!

ئایشێ: چەند؟ چوار دینار؟ بەزیادبێ خوا!! بەخوا ئەویش قوبووڵێ ناکەم! بەخوا هیچتان لێ وەرناگرم.. ئۆی دوور لە تۆ سەرم هاتە ژان.. ئۆی ئۆی ئۆی! بەخوا بڕۆم، نەختێ بکەوم لە ماڵەوە..

ژن: بۆ کوێ باجی ئایشێ؟ دە لێرە پاڵ کەوە! بەتاقی تەنیا بەجێم مەهێڵە!

ئایشێ: بەخوا دایکم ناتوانم هەر ئەبێ بڕۆمەوە!

ژن: ئەوە لە قسەکەی باوکی سالار عاجز بوویت؟

ئایشێ: نەوەالله! ئۆی من چۆن عاجز ئەبم! هەر ئەڕۆمەوە!

میکرۆفۆن: مەرحەبا باجی ئایشێ، بۆ کوێ؟

ئایشێ: موور محەممەدی شەریف... بسم الله الرحمن الرحيم.. قول ئەحی بیسمی...

میکرۆفۆن: کچێ قول ئەحیەی چیی ئەخوێنی سەر ئاسنینی فەرهاد کوژ، باجی ئایشێ؟ بۆچیی جنۆکەم، شەیتانم؟ دانیشە بۆچیی هەڵساوی؟

ئایشێ: تۆ کێی کابرا؟ ئیشت چییە لێرە؟ تۆ لە کوێ من ئەناسیی؟

میکرۆفۆن: چۆنت ناناسم؟ من میکرۆفۆنی بەشی کوردیی ئیستگەی عێراقم..

ئایشێ: بسم الله ! باسم الله ! ئیزگەی عێراق؟ باسم الله ! توخوا لەوان نیت؟

میکرۆفۆن: لەکێ؟ لە کامانە؟ لە جنۆکەکان؟ نەخێر لەوان نیم باجی ئایشێ! بسم الله الرحمن الرحیم.. لەخۆمانم، بەڵام ماڵی خۆمان بەقوڕ بگیرێ کە تەماعکار و ناپاکین. تۆ دانیشەرەوە باجی ئایشێ! توخوا چوار دینار کەمە؟

ئایشێ: ئینجا باوکم خۆ من مەبەستم ئەوە نییە؟

میکرۆفۆن: ئەی مەبەست چییە؟

ئایشێ: ئەڵێم ئەمە ڕەسم و عادەتە و هەموو کەسێك کە منالی ئەبێ خەڵقیی ناوکەبڕانە هەر ئەهێنن، ئەی مامان ئەم هەموو هیلاکییە، ئەم هەموو شەو نوخونییە بۆچیی ئەکێشێ؟

میکرۆفۆن: توخوا تۆ هیلاکتر ئەبی و عەزێت زیاتر ئەکێشی یان دایکی کلۆڵێ کە نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ منالێ بە پێستی سك هەڵئەگری و لەوەختی بوونیشیا ئەگاتە ڕشادەی مردن؟ تۆ هیلاکتر ئەبی یان کرێکار و جوتیار کە سەد و پەنجا فلس وەرناگرن بەرامبەر بە دە دوانزە سەعات ئیش کردن؟ بۆ هەفتەیێکیش کەمتر چوار دینار کەمە باجی ئایشێ؟ پەڵپ بۆ بەم زەیستانە بەسەزمانە ئەگرێ و خەریکی بەتاقی تەنیا بەم ئێوارەیە بەجێی بێڵی؟

ئایشێ: باوکم کوا پەڵپم گرتووە، هەر سەرم ژان ئەکات؟

میکرۆفۆن: ئەی سەرت بەر گوللە کەوێ ئاوا درۆزن! سەری چیی؟ بۆچیی ناتناسم؟

ئایشێ: چۆنم ئەناسیی، تۆ لەکوێ من ئەناسیت؟

میکرۆفۆن: وات ئەناسم باجی ئایشێ کە تۆ وە ئەمسالی تۆ لە مامانی لاکۆلان هەتا ئێستا بوونەتە هۆی هەزار کارەساتی پڕ کوێرەوەریی. گەلێ ئافرەت و منالّی بەسەزمانتان بەنەزانیی کوشتووە! ئێوە دوژمنی زانیاریی تازەن. ئێوە قینتان لە نەخۆشخانە و لە دکتۆر و لە دەرمانی تازەیە، چونکە ئەتانەوێ هەتا دنیا دنیایە هەر مامان بن. ئێوەن کە نایێلّن خەرافیات نەمێنێ لەم ولاتەدا، بەدرۆ و دەلەسە باسی دایکی ئالّو شەوە بۆ ئافرەتی نەزانی بەسەزمان ئەکەن! ئێوەن هۆی تەرك نەکردنی ئەم عادەت پیسەن کە ناوی ناوکەبڕانەیە!

ئایشێ: تۆ بە قسەکانتا وا دەرئەکەوێ پیاوە چەنەبازەکەی ئیزاعەی؟

میکرۆفۆن: باشت هەلّهێنام باجی ئایشێ! خوا ئەیزانێ وازتان لێ ناهێنم هەتا ئەو عادەتە پیسانەتان پێ تەرك نەکەم!

ئایشێ: ئینجا باوکم تۆ هەقت چییە بەسەر خەلّقەوە؟

میکرۆفۆن: ئەی بۆ تۆ و ئەمسالی تۆیان بەجێ بهێلّم وەك مێردەزمە بچینە قەلاندۆشکانیان، وەك مۆتەکە سواری سەر سنگیان ببی؟ باسی پڕ لە درۆی دایکی ئالّو شەوە و شەو لەبان و قسەی قۆڕیان بۆ بکەی و پارەیان لێ بکێشیتەوە و پارووی چەور بگلێنی و چای شیرین و دیژلەمەی خەستم بۆ بخۆیتەوە؟

ئایشێ: ئینجا کێ بەدەم دەرەقەتی تۆ بێت ئەلّێی چیکەنەی؟!

میکرۆفۆن: ئاخر لەسەر حەقم بۆیێ وا زوو تۆی لەسەر ناحەق ڕۆییشتوو ئەبەزیت! ئیشم زۆرە، جارێ بە دووعا باجی ئایشێ! نەڕۆی، منالّەکە و زەیستانەکە بەجێ نەهێلّی ئەگینا چوار دینارەکەش وەرناگری و ئەم جارە حەمە ئەفەندیی ناشتکات بە مامان، مومەریزە ئەهێنێ!

دانیشە، ڕازیی بە بەو چوار دینارە! بەدووعا باجی گوڵنام.. باجی ئایشێ دایکی ئاڵی، مامانی لاکۆڵان. (پێکەنین–مۆسیقە).

---

## لەکۆڵان دانیشتن[٦٣]

حەمە: توخوا ئەمە حاڵە، عەیب و شوورەیی و حەیاچوون!!

عەلی: چیی قەوماوە حەمە؟

حەمە: کوڕە چیی نەقەومێ؟ ئەم کۆڵانەیان کردووە بە چایخانە!

عەلی: کێ؟ چیی بووە؟

حەمە: ئینجا چیی ماوە نەبێ؟ قوربان باجیی عەدلە و گوڵچینی پوورە هەمین و دووان سیانێکی تر بەم ڕۆژگارە، هەر لە بەیانییەوە هەتا ئێوارێ لەناو ئەم دەرگایانەدا دانیشتوون فیشە فیشی جگەرە و ڕاز و گلەیی و تیر و توانج گرتنە خەڵقییان کردووە بە پیشە.

عەلی: دەك موبارەك نەبێ ئازا! ئەی مێردەکانیان، کەس و کاریان قسە ناکەن؟

حەمە: ئاخر نابێ بپرسنەوە بڵێن ئافرەت بۆ لەناو دەرگا دانیشتوون؟

عەلی: ڕەنگبێ هەر پیر و پیرێژن بن؟

حەمە: کوڕە پیر و پیرێژنی چیی؟ کچە عازەبەکانیش کە وەختی شوویانە.. ئەم کلاش ئەچنێ، ئەو بنێشت ئەجوێ ملچەی دەمی ڕۆژە ڕێیەك ئەڕوا، ئەویان ئەقیژێنێ..

میکرۆفۆن: ڕاستە! قسەکانتان هەمووی بەجێیە! ئافەرم!

عەلی: ئەوە هاتیتەوە میکرۆفۆن؟

حەمە: کێ؟ میکرۆفۆنەکەیە؟ ئا وەرە بەقوربان چارەسەرێکی ئەم عادەتە پیسە بکە! ئەوە باشی هەموو شتێك ئەکەی کەچیی ئەمەت لەبیر چووە؟!!

میکرۆفۆن: هیچ شتێکم لەبیر نەچووە! بێگومان کە نارێکیی نامێنێ باسی لێ نەکەین! ئێستا ئەگەر باجی عەدلەی موبارەك و فیشەکلخ لە دەمەکانی تر هەر لەناو ماڵی خۆیانا دابنیشن و قسە بە خەڵقیی نەڵێن قەیناکا.. بەڵام رێگایان لە خەڵقیی بڕیوەتەوە.. ئەوا کچانی مەکتەب ئەچن بۆ قوتابخانە یان یەنەوە ماڵێ، کەچیی توانجیان تێ ئەگرن و قسەیان پێ ئەڵێن. ئەوا بێکێك بە رێگادا ئەڕوات، جارێ هەر لەپێش ئەوەدا بگاتە عاستیان دەست ئەکەن بەباس کردنی. بەڕاستیی ئەم خووە شتێکی زۆر ناشرینە!

عەلی: ئێستا چارچییە؟

میکرۆفۆن: چار ئەوەیە هەر پیاوە ماڵی خۆی تەمێ بکا کە لەبەر دەرگا دانەنیشن. جارێ لەسەر ئەو عەرزە تەڕە تووشی نەخۆشیی مایەسیریی و ڕۆماتیزم ئەبن، تۆز و خۆڵی کۆڵان ئەچێتە چاو و لووت و دەمیانەوە، جلەکانیان زووتر چڵکن ئەبێ و ئەدڕێ، فێری چاوباشقاڵیی غەیبەت و جنێوی سووك ئەبن. بەکورتیی ئەبن بە ئامەکوڕانیی.(عەلی و حەمە پێ ئەکەنن!)

عەلی: ئەشهەد و باللە ڕاستە! پێویستە لە ئێستاوە ئەمانە لە پیاوی گەڕەکەکە بگەیێنن! بڕۆ حەمە با دەست پێ بکەین!

میکرۆفۆن: ڕاوەستن! شتێکی زۆر ناشرینی تریش ماوە با باسی لێ بکەین!

حەمە: چییە؟

میکرۆفۆن: مەسەلەی هەندێ قوتابیی لە خۆبایی کە لە سەرە ڕێی کچانی مەکتەبا ئەوەستن و ڕێیان پێ ئەگرن. ئەمەش هەتا بڵێی شتێکی ناشرین و بێ مەعنایە!

عەلی: ئەوە مەسەلەی تەلەبە عائیدی مەکتەبەکان و مەعاریفە.. ئەگەر یێك دوو تەلەبە لەسەر ڕێگا بە کچ گرتن جەزا بدرێن و دەریان بکەن، کەسیان ئیتر ئەوە ناکەن!

میکرۆفۆن: بەڵێ پێویستە مەعاریف ئینزیبات دابنێ بۆ موراقەبە و چاودێریی خووڕەوشتی قوتابیی.. بەڵام پێویستە لەسەر دایك و باوکیشیان ئاگایان لە منالەکانی خۆیان بێت جارێ بە دووعا..

عەلی و حەمە: خوات لەگەڵ! (مۆسیقە)

حەمە: ئەزانیی باجی عەدلە ئەڵێ جیوەیش بنێن بە ورگمەوە هەر لەبەر دەرگا دائەنیشم!

عەلی: وا مەڵێ؟

حەمە: وەاللە! زۆر بێ ئابڕووە! هەی هەی لە عەدلە نێرە؟

عەلی: ئینجا مەسەلە ئاسانە بۆ تەمێ کردنی نا عەدلەخان!

حەمە: چۆن؟ چیی بکەین؟

عەلی: بە کاك ساڵحی موختار ئەڵێین.

حەمە: ئینجا ساڵح چیی ئەکات؟

عەلی: چۆن چیی ئەکات؟ بەناموسم هەزار عەدلە نێرەت بۆ ئەکاتە کون، نایێڵێ کەس لەبەر دەرگا دانیشێت.

حەمە: ئاخر چۆن خەڵق لەبەر دەرگا بەزۆر مەنع ئەکرێ؟

عەلی: بەخوا سەیرە؟ چۆن مەنع ناکرێ؟ ئەی موناسەبەت چییە ئەوان تەعەددا بکەنە سەر خەڵقیی؟

حەمە: کەواتە بابچین بۆ لای ساڵح!

عەلی: جارێ بابچین بۆ حەمام، خۆمان ئەشۆین و یەینە دەرەوە ئینجا ئەچین بۆ لای ساڵح!

حەمە: باشە بابڕۆین! (مۆسیقە)

عەلی: خۆت شت حەمە؟

حەمە: ئا، بەڵام هێشتا خۆم بیسمیل نەکردووە!

عەلی: دە بە دوو سێ سەتڵ ئاو خۆت بسمیل کە و بیڕێتەوە!

حەمە: نەء، ئێستا بە حاجی تۆفیق ئەڵێم کلیلی غەزێنەکەم باتێ، ئەچم لەناو غەزێنەکەدا خۆم بیسمیل ئەکەم.

عەلی: ئاخر غەزێنەکەیان مەنع کردووە، نابێ کەس بچێتە ناوێ.

حەمە: بەخوا هەزار مەنعیان کردبێ هەر ئەچمە ناوی. فێر بووم!

میکرۆفۆن: چۆن ئەچیت کاکە حەمە؟ فێری چیی بووی؟

حەمە: ئەوە تۆی؟ لێرەشی، لە حەمامیشا حازری میکرۆفۆن؟

عەلی: کوا، میکرۆفۆنە؟ پێم نەووتی مردووت مرێ باسمان ئەکات؟!

حەمە: من چووزانم؟ وەکو مووی لووت وایە ماڵ بە قوڕ گیراوە!!

میکرۆفۆن: ئەمە لە کن خۆی ئێوە ئامۆژگاریی خەڵقتان ئەکرد و ڕێگا و شوێنی چاکتان پێشانی خەڵقیی ئەدا؟

عەلی: باوکم وەاللە پێم وت بە دوو سێ سەتڵ ئاو خۆت بیسمیل کە، کەچیی ڕازیی نەبوو!

میکرۆفۆن: ئاخر نازانیی کاکە حەمە ئاوی غەزێنەکە کە پیس بوو کە خەڵقی خۆی تیاشت هەزار نەخۆشیی پێست بە خەڵقی تر ئەگات؟ بۆچیی غەزێنەکە بە پاکی نەمێنێتەوە؟

حەمە: ئینجا ئەی تۆ باسی خاولیی حەمام بۆ ناکەی؟ بۆچیی خاولییەکان پاکن؟

میکرۆفۆن: ئینجا کە پاك نین بۆ خاولیی بۆ خۆت ناکڕی و لەگەڵ خۆتا بیبەیت بۆ حەمام خۆتی پیٚ وشك بکەیتەوە.

عەلی: ڕاست ئەکا، بۆ خاولیی ناکڕی خۆ زۆر هەرزانە؟

حەمە: وەاللە حەق وایە هەموو کەسێك خاولیی ببێت! باوکم لەمەو دووا ئەیکڕم!

میکرۆفۆن: ئەی غەزێنەی حەمام؟

حەمە: ناچمە ناوی ئیتر.. ناشهێڵم کەس بچێتە ناوی. هەر ئێستا بە حاجی تۆفیقی حەمامچیشی ئەڵێم کە ئیتر نەیێڵیٚ کەس بچێتە ناو غەزێنەکەوە!

میکرۆفۆن: پێویستە نەهێڵن سیل و دیقاوی و گرویٚ لە حەمامەکانیانا خۆیان بشۆن، چونکە لەمانەوە بەشی زۆری خەڵقی شارەکە نەخۆش ئەکەون! پێویستە هەموو ڕۆژێك حەمام پاك بکرێتەوە و بشۆریٚ! حەق وایو خاولیی لابەرن، پەشتەماڵ نەدەن بە کەس بۆئەوەی کەس لە کەسی ترەوە تووشی نەخۆشیی نەبێت! ئەگەر وا نەکەن تووشی نەخۆشیی ئەبن.. ئەکەون.. ئازار ئەچێژن.. پارە خەرج ئەکەن.. لەدووایيا ئەمرن!! ئەچنە غەزنەی حەمامەوە! بە خاولیی حەمام خۆتان وشك نەکەنەوە! نەچنە حەمامی پیس! (مۆسیقە)

"تەواو"

## تەماشاکراو – پەراوێز

{١} . مـن ئـەم وشـەیە بەڕاسـتتر دەزانم کـە بەرامبـەر (محەتتـە/ محطـة)ی عەرەبییـە.
بەکاربردنی وشەی وێستگە و ئێزگە لەبریی (ڕادیۆ) کە بووە بە باو، بەهەڵەی دەزانم.

{٢} . بنۆڕە ساخ کردنەوەم لەئێرەدا.

{٣} . هەروەها.

{٤} . وەك لە کارگێڕە یێکەمەکانی ئەو ڕادیۆیەم پرسیوە و یاداشتیانم لەلاهەیە.

{٥} . سەرچـاوەکانی ڕۆژنامەنووسـیی – بەهەڵـە – لـەخۆڕا دەنووسـن گۆیـا لـە پـاڵ (هنـا بغداد) ئەم وەرگێڕانە کوردییەش بڵاوە. ڕاستییەکەی ئەمە لە کردەوەی گۆڤارۆچـکەی (پـەیام) ی کوردییەوە داکەوتووە، دەنا خۆی ئەوها نییە!

{٦} . ژین – برنجی سنە، عدد ١٥، ٣٠ مارت ١٣٣٤ " ر " / ١٩١٨ ز.

{٧} . ژیان – س١، ژ١٥، پێنجشەممە ٦ مایس ١٩٢٦.

{٨} . زارکرمانجی – س١، ژ٩، ٢ حوزەیران ١٩٢٧.

{٩} . ژیان – س٢، ژ٨٠، پێنجشەممە ١ ئەیلوول ١٩٢٧.

{١٠} . هەمان سەرچاوە.

{١١} . ژیان – س٣، ژ١٥٠، دووشەممە ١٤ کانوونی دووەم ١٩٢٨.

{١٢} . ژیان – س١، ژ٢٦، ٢٩ تەمووز ١٩٢٦.

{١٣} . بانگ کردستان – س١، ژ ٥، دووشەممە ٤ ئەیلوول ١٩٢٢.

{١٤} . غائیب عەبدولهادی شینۆ– فەهرەس بیلمەواد ئەلموسـەججەلە وەلمـەحفووزە فیـی مەکتەبەت ئەلتوراس ئەلموسیقی (فهرس بالمواد المسجلة والمحفوظة في مكتبة التراث الموسـيقي – المؤسسة العامة للاذاعـة والتلفزيـون – بغـداد) بـێ مێـژوو – چـاپی ڕۆنیـۆ / سـاڵی ١٩٨٩ لـە وەزارەتی ڕاگەیاندن بە ئامۆژگاریی دۆستم مۆسیقەزان مـونیر بەشـیری کـۆچ کـردوو لـە دۆسـتم

کورە کوردی تەنبوورزان کاك غائیبم وەرگرت. مخابن دەزگەی ئامیریان لەبەر دەستدا نەبوو بۆ گوێ ڕادێریی ئەو سروودانە و هێندێ نماییشی ڕادیۆیی سەر " سیم وایەر و قەوانە کۆن ! ! ".

{١٥} . هەمان سەرچاوە.

{١٦} . دیارە بەشدارەکان شاگردانی ئەو فێرگە و کۆلێجەکان بوون و لەخۆڕاوە ئەو نێوەیان بەسەر خۆیاندا دابڕیوە.

{١٧} . غائیب عەبدولهادی شینۆ.

{١٨} . ئارشیفی خۆم - شریتی ١٩٧٩/٥/١٨. (نێوبراو کاتی گفتوگۆ مامۆستای خانەنشین و تەمەنی ٤٩ ساڵ بوو).

{١٩} . کاتی گفتوگۆ مامۆستا و تەمەنی ٥١ ساڵ بوو.

{٢٠} . چەندم کرد نێوبراو - هەر فۆتۆگرافێکی بۆ ناردم - نەهات لە گفتوگۆکەدا بەشدار بێت !

{٢١} . بەقسەی ئەوان !

{٢٢} . دانیشتن لە ١٩٨٣/١/١٢. هەولێر " ئوتێل ! ".

{٢٣} . ماڵی خۆم - سلێمانیی. مێژووی دەنگ تۆمار کردن ١٩٧٩/٥/١١. بەشداران: ئەحمەد مەحموود / ئەحمەد دەنگ گەورە. فائیق چالاك !

{٢٤} . بەڵگەنامەکە لە فائیق چالاکەوە !

{٢٥} . لێم ڕوون نییە کێیە !

{٢٦} . هنا بغداد - ع ٤١، بغداد ١٩٤٨ (مناهج الاذاعة من ١٧-١٩٤٨/٤/٢٠).

{٢٧}. هنا بغداد - ع ٤٢، بغداد ١٩٤٩ (مناهج الاذاعة من ١٢ - ١٩٤٨/٥/٩).

{٢٨} . هنا بغداد - ع٥٦، بغداد ١٩٤٩ (مناهج الاذاعة من ١ - ١٩٤٨/٣/٣١).

{٢٩} . هنا بغداد - ع٥٩، بغداد ١٩٤٩ (مناهج الاذاعة من ١ - ١٩٤٩/١٠/٣١).

{٣٠} . هنا بغداد - ع٦١، بغداد ١٩٤٩.

{٣١} . هنا بغداد - ع ٥٢، بغداد ١٩٤٩ (مناهج من ٣ - ١٩٤٨/١١/٣٠).

{٣٢} . هنا بغداد - ع٦٣. بغداد ١٩٤٩.

{٣٣}. هنا بغداد – ع٥٤، بغداد ١٩٤٩ (مناهج الاذاعة من ١ – ١٩٤٩/٢/٣١).

{٣٤}. هنا بغداد – ع٥٥، بغداد ١٩٤٩ (مناهج الاذاعة من ١ – ١٩٤٩/٢/٢٨).

{٣٥}. هنا بغداد – ع٦٢، بغداد ١٩٤٩ (مناهج الاذاعة من ١ – ٣/٥ م ١٩٤٩).

{٣٦}. هەمان سەرچاوە.

{٣٧}. هنا بغداد – ع٦٣ (مناهج الاذاعة من ١ / ١٠ / ١٩٤٩ – ١٩٤٩/١٠/٣١).

{٣٨}. بنۆڕە سەرچاوەی، ژ٣٢.

{٣٩}. هنا بغداد – ع٦٩، بغداد ١٩٥٠ (مناهج الاذاعة من ١ – ٣٠ / ٤ / ١٩٥٠).

{٤٠}. هنا بغداد – ع٥٧، بغداد ١٩٤٩ (مناهج الاذاعة من ١–١٩٤٩/٤/٣٠ " بەرنامەیێکی
ایبەت بەبۆنەی ڕاگۆستنەوەی تەختی پاشایەتییەوە!".

{٤١}. مخابن دەزگە و ئامێری ئەوتۆ بەدەستەوە نەبوون کە قەوانەکان ببیستم و
یمەکان بناسمەوە و نێونیشان و مەتنیان لێم ئاشنا بن.. بەلام پێم وەیە هەرسیّ تیمەکە
ەشیان لە ئەم یادگارانەدا هەبیّ!!

{٤٢}. غائیب عەبدولهادی شینۆ.

{٤٣}. = = =.

{٤٤}. = = =.

{٤٥}. = = =.

{٤٦}. = = =.

{٤٧}. بنۆڕە مەتنەکەی پاشکۆ، هەروەها مەتنەکەی بابەتی (ئۆپەرێتی کوردی و یێکەم
ۆپەرێتی ڕادیۆیی) بلاوکراوەی ئێرە!

{٤٨}. ئەم جۆرە مێژووە یان مێژووی نووسینە یان بلاوکردنەوەیە کە لەسەر
ەستنووسی مەتنەکانن.

{٤٩}. سیّ چیرۆکن کە لە ژێریدا ڕیزکراون.

{٥٠}. مەتنەکەی لەبەر دەستی مندا نییەو لەلای کۆچکردوو نووری وەشتیە – نەیدامیّ؟

{٥١}. مەتنی دراماکە لەبەر دەستدا نییە و لە گۆڤاری: پەیام – بەرگ ٦، ژ٢٦٩، دووشەممە ١٩٥٤/١٠/٢٢، ل٦١ دا نێوی هاتووە.

{٥٢}. لە ئێرەوە تا٢/٧م ٣٥ ڕەنگبێ نووسراوی ساڵی ١٩٥٤ بێ.

{٥٣}. لە ئێرەوە تا ٣٧/٢/٧ /٣ ڕەنگبێ لە ١٩٥٢ دا نووسرابن.

{٥٤}. لە ئێرەوە تا ٤٢/٢/٧ ڕەنگبێ لەنێوان ١٩٥٠ – ١٩٥٥ دا نووسرا بێ.

{٥٥}. بەڕۆشنایی دیداری ١٩٧٩/٥/١١ لەگەڵ فائیق چالاك. "مەتنەکەی بەدەستەوە نییە!!".

{٥٦}. پەیام – بەرگ ٦، ژ٢٣٢ دووشەممە ١٩٥٤/٣/٨، ل١٠.

{٥٧}. یاداشتەکانی ڕەفیق چالاك– ١٩٧٢ (دەستنووسی لەلای چالاك ڕەفیق چالاك)ـە.

{٥٨}. دەستنووس (بەدەستکاریی ڕێنووسیەوە)!

{٥٩}. چونکە باسەکە گەورەیە و پێوەندیی بە پارچەیێ سامانی ئەدەبیی و هونەریی کورد و ڕادیۆکەشەوە هەیە، ڕەوایە هەرکەسێ سەرهەڵبڕێت و بپرسێت، هەموو یادگارەکان، مەتن و تۆمارکراوەکان چییان لێ بەسەر هاتووە؟

من – وێڕای کە لە نێوەندی شەستەکانەوە کارمەندی ڕادیۆکە بووم– تا ساڵی ١٩٨٩ بەڕۆشی دۆزینەوەی هەر تۆمارکراوێ بووم کە مخابن لە " باوەژن " ەکەی سەر ڕەفەکانی ڕادیۆکە و ئەو چەند قەوان وایور سیمانەی مەڵبەندی کەلەپووری مۆسیقە بەولاوە چیی دیم دەستگیر نەبووە. ڕاستییەکەیشی– وەك وردبوومەتەوە– چ ساتێ لێ پرسینەوەی ڕەسمییانە لەمەڕ ئەم (ناتەواوی) یەی بەشێکی کەرەستەکانی ڕادیۆکە ڕووی نەداوە و بەهۆیەوەتوانای وەڵام دانەوەیان هەبێت! دەی ئیدی چیم بەدەستەوە نییە هێندە نەبێت– بەئەمانەتەوە – لێك دانەوەی خۆم بنوێنم و بڵێم، چەند هۆیێ دەبینم بۆ لەنێوچوونی ئەو تۆمارکراوانە:

١. ڕەفیق چالاك کۆمۆنیست بوو.. لەسەرەتای ١٩٥٠ دا گیرا و ناچارکرا دەست بەرداری پارتەکەی بێت. ئەمەیشی کرد و دوایی هاتەسەر ڕادیۆ و ئەو هونەرەی نواند. لە ١٩٥٨/٧/١٤ دا ڕژێمی پاشایەتیی پاکۆ بوو. کۆمەنیستەکان باریان خۆش و لە دەزگەکانی دەوڵەتدا، هەروەها لە ڕادیۆدا باڵا دەست بوون. ئەوجا من پێم وەیە هەر کادیرەکانی ئەم پارتە لە

ڕادیۆیی کوردییدا – وەك تۆڵەکردنەوە لە ڕەفیق چالاك – دەستیان چووبێتە ئەو هونەرە و پاکۆیان دابێت!

٢. وەك خۆم ورد سەرنجم داوە و هێندێ پاکەتە شریتم دیتووە – نووسراوی سەر پاکەتەکە و تۆمارکراوەکەی سەر شریتەکە جودا بوون– لەگەڵ هەڵگەڕانەوە سەربازییەکەی ساڵی ١٩٦٣ ز. دا گەلێ شریتی ڕادیۆی کوردیی بۆ تۆمارکردنی (ئیعتیرافاتی سیاسیەکان) و (گوتاری کاربەدەستەکان) بەکاربراون. وێ دەچێ کە یادگارەکانی ئەو هونەرەش بەرکەوتبن! !

{٦٠}. ڕەفیق چالاك خۆی دەورەکانی ئەوها دابەش کردووە:

مایکرۆفۆن: ڕەفیق چالاك

عەلی: فائیق / دلزار (فائیق چالاك)

حەمە: نووریی عەنبەر

{٦١}. ڕەفیق چالاك خۆی دەورەکانی ئەوها دابەش کردووە:

مایکرۆفۆن: ڕەفیق چالاك

عەلی: فائیق / دلزار

ژن: ئەحمەد مەحموود.

{٦٢}. ڕەفیق چالاك خۆی دەورەکانی ئەوها دابەش کردووە:

مایکرۆفۆن: ڕەفیق چالاك.

حەمە: نووریی عەنبەر

ژن: ئەحمەد مەحموود

ئاییشێ: ئەحمەد دلاوەر.

{٦٣}. دەورەکان نیشانە نەکراون.

# ١٧

# ئۆپەرێتی کوردیی و

# یێکەم ئۆپەرێتی ڕادیۆیی

## سەرەتاییێکی پێویست

کەبازێڕی قوستەنتینە/ ئەستەنبوولی ئێستە-ی پێتەختی بیزنتییەکان ساڵی ١٤٥٢ ز لەلایێن تورکە عوسمانییەکانەوە داگیرکرا و شارستانیی ڕما، گەلێ زانای یۆنانیی- وڵاتی خۆیشیان مەڵبەندی نمایش و مۆسیقە بوو- ناچارمان بەپڕتاو چۆڵی بکەن و سەرهەڵبگرن و ڕوو لە وڵاتانی خۆرئاوا بکەن.

ئیتالەکان جوان پێشوازییان کردن و جێگەیان بۆ خۆش کردن، تەنانەت دەوڵەمەندەکانیان تا ڕەبەنەکانی کڵێسەکان باوەشیان بۆ کردنەوە، بگرە پارەیشیان بۆ ڕشتن تا کەڵکێکی چاکیان لە زانست و هونەرەکانیان وەرگرت.

مایەی ئەم پێوەندییە لەلاییێکەوە، دامەزراندنی ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی فیرەنزە -فلۆرەنسە- لەلاییێکی دیەوە، هەڵکەوتنی هونەرێکی نوێ بوو کە لە دەوروبەری ساڵی١٦٠٠ز بەدوواوە و هەتا ئێستە نێوبانگی بە: (ئۆپێرا/Opera) دەرکردووە و لە ئەو هەلەشەوە گۆڕینێکی مێژوویی گەورەیشی بەسەر مۆسیقەی خۆرئاوادا هێنا، بەتایبەتی لەڕووی داهێنانی هونەری یێکخستنی ئاوازۆکەکانی دەنگەکانەوە، (هارمۆنییە/ Harmonie)!.

ئۆپیرا بە هەردوو جۆری کارەساتاوی و گاڵتەجاڕییەوە، داستانێکی هۆنراوەیی شانۆیی گۆرانیی ئامێزە. هونەرەکانی نواندن، گۆرانیی و مۆسیقەی دەستەی نوێنەرە گۆییندەکان و ئاهەنگی کۆمەڵەسازی ڕیزکراو (تیمی مۆسیقە/ ئۆرکێسترا Orchestra)

ەپەڕێنن. وێڕاش بەکاربردنی پەردەدەنگی هەرەبەرزی پیاوی گۆییندە (چریکەم
ۆر Tenor) و پەردەدەنگی هەرەناسکی ئافرەتی گۆییندە (زریکە – سوپرانو
Sopr) بەهایێکی جیاواز و شیرینی دەنگچڕینی دەدەنێ!
ئەم هونەرە جوان و بالایە کە لە خۆرهەلاتدا هێشتا شوێنێکی ئەوتۆ گەورەی نییە
ناپانی باس بێ، هونەرێکی دی لێ بووەتەوە کە نێوی (ئۆپەرێت Operetta) ەو
وەی سەدەی هەژدەمدا داکەوت و پتر لە ولاتی فرانسەدا پەرەی سەند.
بنچینەی ئەم هونەرەش چیرۆکێکی شانۆیی هۆنراوەیی گۆرانیی ئامێزە کە بەدەم
یش و گۆرانیی و مۆسیقەوە پێشکەش دەکرێت، بەلام ئەم سەروبەر مەرجەکانی
ێرای بەسەردا ناسەپێت چ لەڕووی بابەتی داستانەوە چ لەڕووی پشت بەستنی
وەتیی بە ئاواز و مۆسیقە، هەروەها لەڕووی جۆری پەردە دەنگی باس لێ کراوەوە.
بۆیی هەیە لە هەلی نواندنی سەر شانۆدا وتو وێرە، (حوار/ دیالۆگ Dialog) ی بێ
انیی و مۆسیقەی تێ بکەوێت. هەرگیزیش چڕینی گۆرانییەکی دوو قۆلی – بێ چیرۆك
ـە شێوەی وتو ویرەیشی هەبێ، ئۆپەرێت ناگرێتەوە ئەگەر چیی وتو وێرە
ەسەیێکە لە کەرەسەکانی!
هونەری ئۆپەرێت لەدەمەو یێکەم چارەکی سەدەی بیستەمدا لە خۆرئاوای ولاتی
ەبیشدا سەری هەلدا، بۆ وێنە لە ولاتی میسردا بەهۆی هێندێ شاعیر و
یقەزانەوە داکەوت.
شاعیرێکی بەنێوبانگی – باب کوردی – وەك ئەحمەد شەوقیی "١٨٦٨– ١٩٣٢ز"
بندکاری پێ گەییشتووی فرانسە و خاوەندی چەند چیرۆکە شانۆیی هۆنراوەیی وەك
ۆپاترا، مەجنوون لەیلا) هەروەها مۆسیقەزانێکی لێ هاتووی وەك سەیید دەروێش "
١٨–١٩٢٣ز" خاوەندی نزیکەی دووانزە ئۆپەرێتی وەك (شەهرەزاد، بەرۆکە،
پاکان) ئەمانە پێشرەوی ئەم هونەرە بوون و کەسانی دیش دوواتر هەلکەوتوون.

# بەشی یێکەم

## ١. ئۆپەرێت و کورد

پێچەوانەی ئەدەبی چینی خوێندەوارە، لەکۆنەوە لەنێو کورددا ئەدەبی گەل- میللیی- بابەتی داستان و بەیت و لاووك و هەڵبەستی گۆرانیی لە ئامێزگرتووە کە زۆریش بەسەرزاری گۆیینەدەکانی نێو کۆمەڵەوە بوون و گەلیش خۆی بە جۆش و خرۆشەوە گێڕاویەتیەوە.. (مەم و زین، خەج و سیامەند، لاووکی قایغان، لاس و خەزاڵ، دەرویشی عەبدی، گەنج و خەلیل و حەفسەد) هەروەها هاوتایان وێنەی ئەو بابەتانەن کە زۆریان بەدەم ئاواز و مۆسیقەوە ئەدا کراون. ڕاستییەکەی ئەم یادگارە شیرینانە – هەرچەندە بەشێوەی نواندن، هەروەها بەشدارنەبوونی تەواوی کەسانی نێو بابەتەکە وەك ئافرەت – نەخراونەتە بەرچاو، شایانی ئەوەن بە (شێوەی ئۆپەرێتی میللیی) نێوببرێن! بەلام بۆ (ئۆپەرێتی هاوچەرخ) ئەوە بەڕۆشنایی خوێندنەوەی بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردیی سالانی١٩٢٠–١٩٥٨ز، ئەم هونەرە لەنێو کورددا –بەگشتیی– لەبەر دوو هۆی گرنگ شوێن و بایەخ پێدانی دیاری پێ نەبڕاوە: لەلایێکەوە لەبەر دوواکەوتنی ئەدەبی کوردیی لە کاروانی ئەدەبی گێتیی و هونەرەکانی خۆرئاوادا، لەلایێکی دیەوە لەبەر درەنگ هەڵکەوتنی هونەری شانۆ و ڕۆشنبیریی مۆسیقەی هاوچەرخ کە خوێندنیان باو بووە و مۆسیقەزانی ورد و زاناش هەڵ نەکەوتووە!

بەڵگەیێکی گەورەش بۆ ئەو ڕاستییانە، ئەو یێکەم کۆششە (شێوە ئۆپەرێت)ەیە کە ساڵی ١٩٢٧ز بەنێوی (دلێران)ەوە لەلایێن شاگردانی قوتابخانەی یێکەمی سلێمانییەوە پێشکەش کراوە. بنچینەی بابەتەکەیشی پەخشانێکی فڕانسەویی وەرگێڕدراوی ڕۆشنبیری نەتەوەپەروەر مەحموود جەوەتە کە نووریی شێخ ساڵحی شاعیر خستوویەتە قالبی هۆنراوی سروودی نیشتیمانیی و مامۆستاییێکی مۆسیقەی سوپایی و فێرکەری شاگردانی قوتابخانەی یێکەمی سلێمانیی عەبدولواحیدی ئاغا مستەفای کۆیی لەسەر

ئاوازی فارسیی بێگانە، (دیشب کە مرا وضع وطن در نظر آمد/ دوێ شەو کە ئێمـە بـاری نیشتیمانمان هاتە بەرچاو).

بەڵگـەییێکی دیـش ئەوەیـە، وەك چـۆن ئـەو کۆششـەی بـاس کـرا لەڕاپێڵـەی وریابوونەوەییێکی ڕۆشنبیرانەی بازێڕی سلێمانیی ساڵی ١٩٢٥ز.دا و گـوڕێکی ئـەدەبیی و هونەریی شانۆپەروەریدا هەڵکەوتووە، ئـەوە هەرچیی بەرهـەمێکی ئـەدەبی شـانۆیی — داندراو و وەرگێڕدراو— هەیە تا سەرەتای پەنجاکانیش پتر بە پەخشـانی ئەدەبییـەوە — نەك بە هۆنراوەوە— لەگەڵ هونـەری شـانۆدا ئاخـاوتوون! وێـڕاش ئـاواز و مۆسـیقەش چ کردەوەییێکی هەست پێ کراو و کارامـەی نـەبووە. هەرچـۆنێ بێـت، وێـڕای ئـەو باسانە، پێویستە دانْ بە ڕاستیشدا بنـرێ کـە ئـەو گـوڕە ئەدەبییـە بـەرە بـەرە بووەتـە هـەوێنی هاندەر بۆ داهێنانی بیر و تـەرزە هـۆنراوەی نـوێ و (ئـەدەبی نۆپـەرێت) کـە ڕەگـەزێکی یێکەمی ئەو هونەرەیە!

## ٢. گۆران — ڕابەری ئەدەبی نۆپەرێت

کردەوە یێکەمەکەی نووری شێخ ساڵح— لەئەو ڕۆژگـارە ناسـکەدا— وێنـەییێکی کـەڵك بـەخش بـووە بـۆ ئـەدەبی کـوردیی، بـەڵام ئـەو و پیرەمێـرد و ڕەشـید نـەجیب کـە لـە ئەدەبییاتو هۆنراوی نوێخوازیدا لـەڕیزی ڕابەرەکانـدا بـوون، وەك (عەبدوالڵـە گـۆران) ی شاعیری نوێخواز، کارامەو بەگوڕ نەبوون — تاسەر — بۆ ئـەدەبی نۆپـەرێت کـە بێگومـان ئەمیش هەنگاو بە هەنگاو بۆی چووە و تێی گەییشتووە تا پێی گەییشتووە.

یێکەم هەنگاوی گۆران— لای من دامـەزرینی ئـەم ئەدەبەیـە— وتـووێژەی هـۆنراوەیی (گوڵی خوێناویی—س١٩٣٤)ـە کە هەتا ساڵی ١٩٤٦ز لە شانۆکانی سـلێمانییو هـەولێردا — وەك ڕەفیق چالاکی هونەرمەند دەگێڕێتەوە، هەر بەشێوەی وتو وێژە — دیالۆگ — ی شـانۆیی پێشـکەش کـراوە، تەنانـەت وەك سـەرنجم داوە، لـەدووای سـاڵی١٩٥٠ز ئـەوجا بەدەنگی —تاکی—مەحموود محەممەدو بە ئاوازی ڕەفیق چالاکەوە بەشێوەی " گـۆرانیی

